زنجیرەی ١٠٠ کتێبی کوردی
٧٧

# سەردەمی ئەمیری باوەڕداران
# " عومەری کوڕی عبدالعزیز( رضي الله عنه )"



نووسینی:
د/ علی محمد صلابی

وەرگێڕان:
جمیـل قـادر



# سەردەمی ئەمیری باوەڕداران

# " عومەری کوڕی عبدالعزیز( رضي الله عنه ) "


نووسینی:

د/ علی محمد صلابی

وەرگێڕان:

جمیــل قــادر

پێداچوونەوەی:

لهــۆن قـــادر

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێناسی کتێب

ناوی کتێب: سەردەمی ئەمیری باوەڕداران " عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) "

بابەت: مێژوویی

نووسینی: د/ علی محمد صلابی

وەرگێڕان: جمیل قادر

پێداچوونەوەی: لەوێن قادر

تایپ: فەرهاد هەوارمی

دیزاین: ابراهیم معروف

شوێنی چاپ: دارالفکر- بیروت- لبنان

ژمارەی سپاردن ( ١١٤٦ )ی ساڵ (٢٠٠٩ )ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە

# پێشەكی

سوپاس و ستایش هەر بۆ خوایە، سوپاسی ئەكەین و پشتی دەبەستین، و پەنای پێ دەگرین لە خراپەی دەرون و كردەوەكانمان، هەركەس خوا ڕێنوێنی بكات ئەوە گومڕا نابێت و هەركەسیش گومڕا بكات ئەوە ڕێنموونی كەس فریای ناكەوێت، شایەتی ئەدەم كە هیچ خوایەك نیە جگە لە﴿اللَّهُ﴾ و محمدیش(ﷺ) بەندە و نێردراوی خوایە:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَـٰنِكُمْ كَـٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾ وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَـٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾ آل عمران: ١٠٠ – ١٠٢).

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴾ النساء: ١). ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَقُولُوا۟ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَـٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴾ الأحزاب: ٧٠ – ٧١).

خوایەگیان سوپاس و ستایش بۆتۆ بەوشێوەی كە شیاوی گەورەیی و مەزنی و دەسەلاتی تۆیە، سوپاس بۆ تۆ هەتاوەكو ڕازی ئەبیت و پاش ڕازی بوونیشت، پاشان ئەم كتێبە بەشێكە لە كتێبی " الدولة الاموية عوامل الازدهار و تداعيات الانهيار " و باس لەسەردەمی چاكسازی دەكات و تیایدا باسم لە ژیان و زاستخوازی و كارەمەزنەكانی نوێگەری(مجدّد) بەناوبانگ " عمری كوڕی عبدالعزیز " لەسەردەمی وەلید و سولەیمانی و خەلیفایەتی عومەر و بەیعەت و ڕێبازی بۆ بەڕێوەبردنی دەولەت و گرنگیدانی بە شوراو ڕاوێژ و سیاسەتی بۆ ڕەتكردنەوەی ستەم و گێڕانەوەی مافەكان بۆ خاوەنەكانیان و لەسەر كارلابردنی سەرجەم والیە ستەمكارەكان و نەهێشتن و هەلگرتنی ستەم لەسەر ئەهلی ذیمە و مەوالیی و خەلكانی غەیرە عەرەب وە كە وەك خزمەتگوزار لە كۆمەلگەدا كاریان دەكرد – ئەهلی زیمە و بەرپاكردنی دادگەری و مامەلەی دادگەرانەی لەگەل خەلكی سەمەر قەند. هەروەها باسم لە ئازادیەكان كردووە لە دەولەتەكەیدا وەك ئازادی بیروباوەڕ و ئازادی سیاسی و تاكەكەسی و ئازادی بازرگانی و كاسبی كردن، هەروەها باسی گرنگترین سیفەتەكانی كردووە وەك ترسی زۆری لە پەروەردگار و پاڕانەوە و نزا و دونیانەویستی و پارێزكاری و لێبوردەیی و میهرەبانی و ئارامگری و دامەزراوی و یەكلاكردنەوە و دادگەری و نزاكانی و گیرا

بوون نزاكانی لەلایەن پەروەردگارەوە، پاشان باسم لە ڕواڵەتەكانی نوێگەری لای عومەری كوڕی عبدالعزیز وەك شوراو ڕاوێژ و پاراستنی ئامانەتی دەسەڵات و حوكمڕانی و دانانی جێنشین و بریكار و زیندووكردنەوەی بنەمای فەرمان كردن بە چاكە و قەدەغەكردنی خراپە و دادگەری و مەرجەكانی كەسی نوێگەر – مجدّد – وەك ئەوەی كە ناسرابێت بە پاكی بیروباوەڕ و دروستی ڕێباز و خاوەنی لێكۆڵینەوە و موجتەهید بێت نوێگەر یەكەشی بواری فیكر و سلوك بگرێتەوە و سوودی گشتگیر بێت و هەموان بگرێتەوە، هەروەها باسم لە گرنگی دانی عومەری كوڕی عبدالعزیز كردووە بە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لە بواری یەكتاپەرستی و ئولوهیەت و ناو و سیفەتەپیرۆزەكانی پەروەردگاردا، هەروەها باسم لە چەمكی باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی و مەسەلە غەیبیەكان كردووە وەك باوەڕ هێنان بەسزا و پاداشتی ناو گۆڕ و زیندوو بوونەوە و ترازوو حەوز و پردی سیرات و بەهەشت و دۆزەخ و بینی پەروەردگار لەبەهەشتدا لەلایەن باوەڕدارانەوە و بانگەواز كردنی بۆ دەست گرتن بە قورئان و سوننەت و ڕێبازی خەلیفەكانی راشیدین و هەڵوێستی عومەر بەرامبەر بە هاوەڵانی ئەو ناكۆكیەی كە لە نێوانیاندا ڕووی داوە و هەڵوێستی سەبارەت بە ئالوبەیت، هەروەها باسم لە مامەڵەی لەگەڵ خەواریج و شیعە و قەدەریە و ئاماژەی بە ژیانی كۆمەڵایەتی و گرنگیدان بە منداڵ و خێزان و ڕێبازی پەروەردە و فێركردنیان داوە وەك دیاری كردنی كات و شتە لە پێشەكان بۆ فێر بوون و هەڵبژاردنی مامۆستا و پەروەرشیاری باش و دیاری كردنی پرۆگرامی زانستی و شێوازی پەروەردە و فێركردنیان و ڕەچاوكردنی كاریگەری زانستی و ئاكامەكانی لەسەریان و كاریگەر بوونی عومەر بە عبدالملكی كوڕی، هەروەها باسم لە ژیانی عومەر كردووە(ﷺ) لەگەڵ خەڵكیدا و گرنگیدانی بە چاكسازی كردن لەكۆمەڵگەدا و بیرخستنەوەی قیامەت بۆ خەڵكی و ڕاست كردنەوەی چەمكەهەڵەكان و ڕەتكردنەوەی دەمارگیری خێڵەكی و بەرزڕاگرتنی لەخەڵكی خاوەن فەزڵ و چاكە و دانەوەی قەرزی قەرزاران و ئازادكردنی دیلە موسڵمانەكان و دەوڵەمەند كردنی هەژاران و دروو خستنەوەیان لە دەست پان كردنەوە و سواڵ كردن – دەرۆزەكردن – دابین كردن و پێدانی مارەیی لە بەیتولمال و هەوڵەكانی بۆ نزیككردنەوەی چینەكانی كۆمەڵگە لە ڕووی بژێوی و كۆمەڵایەتیەوە و مامەڵەكردنی لەگەڵ شاعیران و گرنگیدانی لە ڕادەبەدەری بە زانایان و بەشداری كاریگەر و چالاكانەیان لەگەڵیدا لە پێناو سەرخستنی پرۆژەی چاكسازی و پشتگیری و كۆمەكی و هاندانی بۆ بەردەوام بوون لەسەر ڕێبازی نوێگەری و بەردەوام

بوون لەسەر ئامۆژگاری کردن و وەبیرهێنانەوەی بەرپرسیارێتی و ئامادەبوونی خۆیان دەربڕی بۆ لە ئەستۆگرتنی سەرجەم پۆست و ئەرکە دەوڵەتیەکان.

هەروەها باسی لە خوێندنگە زانستیەکان لەسەردەمی عومەر(ﷺ) دەوڵەتی ئەمەویدا کردووە وەك خوێندنگەی شام و حیجاز و عیراق و میسر و... هتد.

هەروەها ئاماژەم بە ڕێبازی شوێنکەوتوان – تابیعین – کردووە بۆ ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز و هەوڵەکانیان بۆ خزمەتکردنی سوننەت و ڕۆڵی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە نووسینەوەیدا هەروەها ئاماژەم دا بە ڕێبازی تەزکیە و پاکسازی لای شوێن کەوتوان کردووە و قوتابخانەی حەسەنی بەسری(ﷺ) وەك نموونە وەرگرتووە باسم لێوە کردووە و ئاماژەم بە قوتابیەکانی داوە وەك ئەیوبی سختیانی و مالیکی کوڕی دینار و محمدی کوڕی واسع و پاکێتی و بێبەری بوونی حەسەنی بەسری لە ئیعتیزال و موعتەزیلە بوونم. سەلماندووە و باسم لە پەیوەندی حەسەنی بەسری(ﷺ) بە عومەرەوە کردووە و ئەو نامانەم هێناوە کە بۆی ناردووە کە تیایدا باس لە سیفەتەکانی پێشەوای دادگەر ئەکات لە دیدی خۆیەوە و پاشان باسی هەڵوێستی عومەری کوڕی عبدالعزیز و هۆکارەکانی هەڵگرتنی گەمارۆی سەر قوستەنتینە و گرنگیدانی بە بانگەوازی هەمەلایەن و دانانی یاسای تەفەڕوغ و یەکلابوونەوەی بانگخواز و زانایان بۆ بانگەواز و بڵاو کردنەوەی زانست و هاندانیان بۆ ڕوون کردنەوەی گرنگی بۆ ئوممەت و ڕێنموونی کردنیان بۆ وەرگرتن و فێربوونی و ناردنی زانایانی خواویست بۆ باکووری ئەفریقیا و شوێنەکانی تر بۆ فێرکرن و پەروەردە و فێرکردنی خەڵکی لەسەر قورئان و سوننەت و بانگهێشتکردنی پاشاکانی هیند و شوێنەکانی تر بۆ موسڵمان بوون لە ڕێی ناردنی نامەوە بۆیان و هاندانی خەڵکی غەیرە موسڵمان بۆ موسڵمان بوون.

هەروەها باسێکم تایبەت کردووە بە چاکسازیە داراییەکان وسیاسەتی دانایانەی لەو بوارەدا و سوور بوونی لەسەر چەسپاندنی بەهاکانی ڕاستی و دادگەری و نەهێشتنی ستەمە و ئامانجەکانی سیاسەتی ئابووریم لای عومەر(ﷺ) ڕوونکردۆتەوە لەسەر لەنوێ دابەشکردنەوەی داهات و سامان بە شێوەیەکی دادگەرانەو بەدی هێنانی گەشەپێدانی ئابووری و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی، هەروەها ئاماژەم بە بەدیهێنانی ئەو ئامانجانە داوە وەك دابینکردنی ژینگەی گونجاو بۆ پەرەپێدان و گێڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان و دەستە بەرکردنی ئازادی ئابووری مەرجدار و پەیڕەوکردنی سیاسەتێکی کشتوکاڵی نوێ کە ڕێگر بوو لە فرۆشتنی زەوی خەراج و گرنگی دەدا بە کشتیاران و باجیان

لەسەر سوك دەكات و هانی خەڵكی دەدات بۆ چاكسازی و ئاوەدانی و زیندووكردنەوەی زەویە مردوو فەرامۆشكراوەكان و دەستەبەركردنی پرۆژەكانی ژێرخانی ئابووری.

هەروەها باسی سیاسەتی گشتیم لای عومەر(ﷺ) كردوە وەك خەرجیەكانی بۆ چاودێری كۆمەلایەتی و كەمكردنەوەی خەرجی بۆ كاروبارەكانی دەوڵەت وەك بڕینی ئیمتیازە تایبەتەكانی خەلیفە و ئەمیرە ئەمەویەكان و كەمكردنەوەی خەرجی ئیداری و سەربازی، هەروەها باسی دادگا و دادوەریم كردووە لەسەردەمی عومەردا و هەندێك لە بۆچوونە فیقهیەكانی وەك بۆچوونی سەبارەت بەو دیاریانەی كە پێشكەش بە والیی و كاربەدەستان دەكرێت و هەڵوەشاندنەوەی حوكم و بڕیارەكان ئەگەر پێچەوانەی دەقە شەرعیەكان بوو، جگە لە چەندین بۆ چوون و ئیجتیهادی فیقهی و قەزایی تر، هەروەها باسم لە سیاسەتی ئیداری و بەناوبانگترین والیەكانی و سووربوونی لەسەر هەڵبژاردنی والیەكانی لە خەڵكانی خواناس و چاكەكار و سەرپەرشتیكردنی ڕاستەوخۆی بۆ كاروبارەكانی دەوڵەت و تواناكانی لە بواری پلاندانان و ڕێكخستن و شێوازی خۆپاراستنی لە گەندەڵی ئیداری وەك فراوانكردنی ئازوقە و موچەی كاربەدەستەكانی و سوور بوونی لەسەر پاراستنی خەڵكی لە درۆ و وەرنەگرتنی دیاری و و خەلات و نەهی كردنی لە زیادەڕەوی و دەستبلاوی و ڕێنەدان بە بازرگانی كردنی كاربەدەست و والیەكان و كردنەوەی كەناڵەكانی پەیوەندی نێوان هاولاتیان و كاربەدەستان و لێپرسینەوەی لە كاربەدەستانی پێش خۆی - ئەوانەی كە سەرپەرشتی بەیتولمالیان دەكرد -.

هەروەها باسم لە چەمكی مەركەزی بوون و لامەركەزی بوون لە ئیدارەی عومەری كوڕی عبدالعزیزدا و گرنگیدانی بەبنەمای مرونەت و نەرمی نواندن و سودوەرگرتن لە كات بۆ خزمەتی دەوڵەت و هاولاتیان و مومارەسە كردنی بنەمای دابەشكردنی كار لە ڕووی ئیداریەوە كردووە و جەختم لەسەر ڕوونكردنەوەی پاڵنەرەكانی عومەری كوڕی عبدالعزیز كردۆتەوە لە چاكسازی و نوێگەریە دارایی و سیاسەتە و ئیداریەكانیدا.. هتد.

ئاماژەشم داوە بە سوور بوونی لەسەر جێبەجێ كردنی حوكمەكانی شەریعەت لە دەوڵەت و ئومەت و كۆمەڵگە و تاكەكاندا و ئاسەوارەكانی دەستگرتن بە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پاكی پێغەمبەر(ﷺ) و ڕێبازی خەلیفەكانی ڕاشیدین لە دەوڵەتەكەیدا خستۆتە ڕوو، لە تەمكین و پایەدار بوون و هێمنی و ئاسایش و سەركەوتن و سەروەری و شەرەف و بە پیتی ژیان و خۆشبوونی، پاشان

لە ڕۆژەکانی کۆتایی ژیانی ئەم موسڵیح و ڕیفۆرمخوازە مەزنەدا لەگەڵیدا ژیاوم هەتاوەکو کۆچی دوایی خوای گەورە ڕەحمەت و میهرەبانی خۆی بەسەردا ببارێنێت.

بێ گومان دەرکەوتنی عومەری کوڕی عبدالعزیز لەو قۆناغە مێژووییە ناسکەی مێژووی ئوممەتدا و هەوڵدانی زۆری بۆ گێڕانەوەی حوکم کردن بەشەریعەت و خەلافەتی ڕاشیدین و پابەند بە قورئان و سوننەتەوە دیاردەیەکی ناوازە و دەگمەنە و بەڵگە یە لەسەر توانای ئیسلام بۆ گەڕانەوە بۆ ڕابەرایەتی کردنی ژیانی سیاسی و یاسادانان و شارستانی و دارشتنەوەی بە جۆرێك کە بگونجێت لەگەڵ بنەماسەرەکیەکان دا[1].

بێگومان خەلافەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز بەڵگەیەکی مێژووییە بەسەر ئەو کەسەی کە بەردەوام ئەم وتەیە دووبارە دەکاتەوە کە دەڵێ: ئەو دەوڵەتەی کە لەسەر شەریعەتی ئیسلام دامەزرابێت هەمیشە ڕووبەڕووی کێشە و گرفت دەبێتەوە و ئەگەری ڕووخان و هەرەسهێنانی هەیە لە هەموو ئان و ساتێکدا، و ئەوە دەوڵەتەش تەنها خەوێکە و نایەتە دی، بەڵام مێژوو تەحەدای ئەوانە دەکات و پێیان دەڵێت: ﴿قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾ البقرة: ١١١).

هەروەهاسەرکردەی خواناس نورەدین زەنکی کۆچکردوو لە ساڵی ٥٦٨ ك لەسەر ڕێبازی عومەری کوڕی عبدالعزیز دەڕۆشت و وەك نموونەیەك لێی دەڕوانی و شوێن پێی هەڵدەگرت و هەوڵە چاکسازیخوازیەکانیشی بەرهەمی خۆی هەبوو و ڕۆڵی هەبوو لە هەستانەوە و گەڕانەوەی هۆشیاری بۆی و سەرکەوتنی بەسەر دوژمنە خاچپەرستەکانیدا و توانی بەیتولمەقدیس لەسەر دەستی قوتابیەکەی – سەرکردەی مەزن و قارەمان سەرلاحەدینی ئەیوبی – پاك بکاتەوە خوای گەورە نموونەی لەم سەردەمەدا زیاد بکات، چاکسازیش بەو شێوەیەی کە موسڵمانانی ڕاستگۆ لێ ی تێ دەگەن نەك بەو شێوەیەی کە دوژمنانی ئیسلام ڕەواجی پێ دەدەن – ئامانجی سەرەکی ناردنی پێغەمبەرانە بۆ خەڵك شوعەیب پێغەمبەر(ﷺ) بە هۆزەکەی وت کە نوقم بوو بوون لە گومڕایی و گەندەڵی بیروباوەڕ و هەڵس و کەوتدا: ﴿ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَـٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴾ هود: ٨٨). واتە: شوعەیب ووتی: ئەی قەوم وخزمەکانم هەواڵم بدەنێ ئەگەر منتان

[1] - في التأصيل الاسلامي للتأريخ د. عماد الدين خليل ل ٦٢.

بینی وبۆتاندەرکەوت کەلەسەر بەرنامەیەکی رێك ڕۆیشتم لەلایەن پەروەردگارمەوەوهەر لەلایەن خۆشیەوە رزق و ڕۆزی جوان و باشی داومەتێ، منیش نامەوێت قەدەغەی شتی شتێکتان لێبکەم، کەچی خۆم وەك ئێوەئەکەم(چی بەئێوە بگەیەنم خۆم لەپێشدا ئەنجامی ئەدەم) من هیچم ناوێت تەنها چاکسازی نەبێت بەگوێرەی توانام، ڕێکخستنی کارم بەدەستی کەس نییەبەدەستی خوانەبێت، پشت وپەنام هەربەو بەستووە و هەربۆلای ئەویش ئەگەڕێمەوە.

عومەریش(ﷺ) هەستا بە ئەرکی چاکسازی کردن لە کاروبارەکانی مرۆڤدا - پاش(مصلیح) و چاکسازی گەورەی مرۆڤایەتی محمد(ﷺ) - و لە سەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خەلیفەکانی ڕاشیدین و زانایانی خواویستی ئوممەت. ئوممەتیش ئەمڕۆ زۆر پێویستی بە شارەزا بوون لە ڕێنمایی خەڵکانی موسلیح و چاکسازیخواز هەیە هەر لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) هەتاوەکو نوێگەر و پیاو چاك و چاکسازی خوازانی تر، بەو پێیەی کە تووشی دواکەوتن و سەرگەردانی و لێك ترازان و لاوازی و چۆکداداان بوون. بێگومان بزاوتی مێژووی ئیسلامی ڕێنموونیمان دەکات بۆ هۆکارەکانی هەستانەوە و هۆکارەکانی سەرکەوتنیش زۆرن لەوانە پاکی بیروباوەڕ و دانانی پرۆگرام و حوکمکردن بە شەرعی خوای لە دەوڵەتدا و، بوونی سەرکردایەتی خواویست کە بە نوری خوا لەمەسەلەکان دەڕوانی و توانای مامەڵەکردنی لەگەڵ سوننەت و یاساکانی خوا لە بواری پەروەردەکردنی ئوممەت و بنیاتنان و ڕووخانی دەوڵەتان و پەی بردنی بە کێشە و نەخۆشی کۆمەڵگەکان و قۆناغەکانیان و نهێنیەکانی مێژوو و پلانەکانی دوژمنان لە خاچپەرست و جولەکە و بێ باوەڕ و کۆمەڵە باطنی و بیدعەچیەکان و، مامەڵەکردن لەگەڵ هەر هۆکارێکدا بەو شێوەی کەشیاویەتی، بۆ نموونە مەسەلەکانی بوژانەوە و هەستانەوە و پرۆژەکانی بوژانەوەی درێژخایەن بەیەکدا چوون و تێگەشتن لێی لە توانای هەموو کەسێکدا نیە مەگەر کەسێك بە باشی لە قورئان و سوننەت گەشتیێت و پەیوەست و پابەند بێت بەو تێگەشتنەی ڕاشیدینەوە کە لە پێشنیانی بەرێزەوە بۆمان ماوەتەوە و تایبەتمەندی و ڕوخسار هۆی سەرهەڵدان و نەمانی بزانێت و سود لە مێژووی ئیسلامی و ئەزمونەکانی بوژانەوە وەرگرێت و دڵنیابێت لەوەی کە ئەم ئوممەتە هەرگیز پێشەنگی لە دەست نەداوە و هەتاوەکو وەفادار بێت بۆ خواوە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) و بشزانێت کە شکستە سەربازیەکان کاتیە و تێپەڕ دەبێ، بەلام شکستە ڕۆشنبیریەکان برینێکی کوشندە یە و ڕۆشنبیری ڕاست و دروست مرۆڤی موسڵمان و خێزانی موسڵمان و کۆمەڵگەی موسڵمان پێدەگەیەنێت

ئەگەر لەسەر بناغەی قورئان و سوننەت و ڕێنمایی خەلیفەکانی ڕاشیدین و ئەو کەسانە بێت کەلەسەر ڕێبازی ئەوان دەڕۆن. بێگومان ئەوە مەزنی بونیادی شارستانی ڕاست و دروست بووە کە تا ئەمڕۆ ئیسلامی پاراستووە پاش کۆمەکی و پاراستنی خوا یی.

بێگومان ژیاننامەی عومەری کوڕی عبدالعزیز ئاشنامان دەکات بە حەقیقەتی چەمك و وشەی چاکسازی بەو شێوەیەی کە زانایانی چاکساز – موسلح – لێی تێ گەشتوون و پراکتیزەیان کردووە، نەك تێگەشتنی ڕۆژئاوایی هاوچەرخ کە دژەی کردۆتە هزری هەندێ لە بیریارە سیاسیە لاسایی کەرەوەکانی ڕۆژئاوا بە ڕەواو نارەوایەوە بە جۆرێك کە لە هزری هەندێ لە ڕۆڵەکانماندا واچەسپیوە کە شۆڕش گشتگیر تر و فراوانتر و قوڵترە لە چاکسازی کە لە ڕۆژئاوادا هاو واتایە لەگەڵ گۆڕانکاری هێواش دا کە بەشێوەیەکی پلەبەندی ڕوودەدات بە بێ توندوتیژی لە کاتێکدا کە شۆڕش بەلای ئەوانەوە کودەتایەکی ڕیشەیی توند و کتوپڕ و بێ پێشەکی و پلەوبەندیە، لێرەشەوە نەیانزانیوە کە چاکسازی بە پێی تێگەشتنی قورئانی دروست مانایەکی فراوانتر و گشتگیر تر و گەورەتری هەیە لە شۆڕش و هەمیشە بارودۆخ بەرەو باشتر و تەواوتر دەبات، بەڵام شۆڕش لەوانەیە لە باشەوە بەرەو خراپ بچێت و بە گۆڕینی دەسەلاتێك بە دەسەلاتێك و فەرمانڕەوایەك بە فەرمانڕەوایەك کۆتایی دێت.

دیارە عومەری کوڕی عبدالعزیز نموونەیەکی چاکسازیە بۆ کەسێك کە ئەیەوێت لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خەلیفەکانی ڕاشیدین هەنگاو هەڵگرێت، عومەریش(ﷺ) دڵسۆز بوو بۆ پەروەردگار لە پرۆسەی چاکسازی داو خوای گەورەش بووە پشتیوانی و زمانی خەڵکی والا کرد بۆ ستایش و باش باسکردنی، شاعیری لیبی ئەحمەد ڕەفیق ئەلمەهدەوی ئەڵێ:

فاذا احب الله باطن عبده    ظهرت عليه مواهب الفتاح

واذا صفت لله نية مصلح    مال العبادُ عليه بالرواح

داوا لە پەروەردگاری مەزن ئەکەم کە ئەمکارەم تەنها لە بەر ڕەزامەندی خۆی بوو بێت و دڵسۆزانە لێم وەردەگرێت و سود و کەڵکی هەبێت بۆ بەندەکانی و پاداشتی خۆم و ئەو برایانەم بداتەوە کە یارمەتیان دام بۆ بەچاپ گەیاندنی بە فەزڵ و میهرەبانی خۆی، تکا لە هەموو موسڵمانێکیش دەکەم کە ئەم کتێبەی بەرچاو دەکەوێت کە هەردوو بەندەی هەژار و ئاتاج بە لێبوردەیی و لێخۆشبوون و میهرەبانی و ڕەزامەندی پەروەردگار – نووسەر و وەرگێڕ – بێ بەش

نەکات لـە نزاکـانی: ﴿رَبِّ أَوْزِعْنِيٓ أَنْ أَشْكُرَ نِعْمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنْعَمْتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَٰلِحًا تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِي بِرَحْمَتِكَ فِي عِبَادِكَ ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ النمل: ١٩). خوای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ فاطر: ٢).

هەزاران درووود و سلاَو بۆسەر گیانی پاکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و یار یاوەرانی هەتاوەکو ڕۆژی دوایی.

﴿... وَآخِرُ دَعْوَاهُمْ أَنْ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾

" وَصَلِّ أللهُمَ وَسَلِّم على مُحَمَد وَ على آله وَ صَحبهِ وَ سَلِّم "

خوشك و برایانی خوێنەری بەڕێز: نووسـەری ئـەم کتێبـە خۆشـحاڵە بـە گەشـتنی تێبینیـەکانتان سەبارەت بەم کتێبە و کتێبەکانی تری لـە ڕێ خانەی چاپەوە، داوای نزای پاشملە شـتان لـێ دەکـات بـۆ دڵـسۆزی و پێکـان و دروسـتی کارەکـانی و درێـژەدان بـە کـاروانی خزمـەتکردنی مێـژووی ئومەتەکەمان.

ناونیشانی دانەر: Email: abumohamed٢@maktoon.com

## یەکەم: ناو و نازناو شۆرەت و بنەماڵەی:

عومەری کوڕی عبدالعزیز کوڕی مەڕوان ی کوڕی حەکەمی کوڕی ابی العاص ی کوڕی ئومەییەی کوڕی عبدشەمس کوڕی عبدمناف، پێشەوا و زانای خواویست و دونیا نەویست و تێکۆشەر، گەورە و ئەمیری ڕاستەقینەی باوەڕداران باوکی حەفصی قورەیشی ئەمەوی مەدەنی پاشان میسری خەلیفەی ڕاشید و دونیا نەویست سەر شکاوی بەنی ئومەیە [1]، یەکێك بوو لە زانا موجتەهید و خەلیفە ڕاشیدەکان [2]، زۆر ڕەوشت جوان و ژیر و چاکەکار بوو، سیاسەتی باش و داد گەرانە بوو، خاوەن زانستێکی زۆر و تێگەشتنێکی قوڵ بوو، زیرەك و تێگەشتوو و خواپەرست و گەڕاوە و خواویست بوو، دوور بوو لە خۆشگوزەرانی و ڕابواردن و حەزکردن لە خەلیفایەتی، حەق گۆو و ڕاستڕەو بوو هەر چەند هاوکاری کەم و ئەمیری ستەکاری زۆری لە دەور بوو کە بێزار بوون لە حەقخوازی و دونیا نەویستی و کەمکردنەوەی بەخشین و موچەکانیان و لێسەندنەوەی زۆرێك لەوشتانەی کە لە دەستیاندا بوو و بە ناڕەوا دەستیان بە سەردا گرتبوو، بۆیە لە مەلاسدا بوون بۆی هەتاوەکو ژەهر خواردیان کرد و شەهیدی و خۆشبەختی دەسکەوت و لای زانایانیش بە یەکێك لە خەلیفەکانی ڕاشدین و زانایانی کارا دادەنرێت [3]، و کەسێکی زمانپاراو و ڕەوانبێژ بوو ڕەحمەتی خوای لیّ بێت [4].

١- باوکی: عەبدولعەزیزی کوڕی مەڕوانی کوڕی حەکەمە، یەکێکە لە باشترین ئەمیرەکانی بەنی ئومەییە، کەسێکی ئازاو بەخشندە بوو، بۆماوەی زیاتر لە بیست ساڵ ئەمیری میسر بوو، خواناسی و پاکیشی لەوەدا دەر ئەکەوێت کە کاتێك ویستی هاوسەرگیری بکات بەسەرپەرشتیارەکەی وت: چوار سەد دینارم لە پاکترین پارەی خۆم بۆ بێنە، چونکە من ئەمەویّ خوازبێنی لە بنەماڵەیەکی خواناس بکەم [5].

---

[1] - سير أعلام النبلاء(٥ / ١٤٤).

[2] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١١٤).

[3] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٥٠).

[4] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٣٦).

[5] - الطبقات الكبرى(٥ / ٣٣١)، الجوانب التربوية في حياة الخليفة عمر بن عبدالعزيز، هاني عمر، ل: ١١٠.

پاشان دایکی عاصمی کچی عاصمی کوڕی عومەری کوڕی خەتابی خوازبێنی کرد کە کوڕەزای ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتاب بوو، ئەڵێن ناوی لیلی بووە [1]، دیارە ئەم هاوسەرگیریەش ڕووی نەدەدا ئەگەر بنەماڵەی خەتاب لە چاکی و ڕەوشبەرزی دڵنیانەبوونایە، چونکە ئەو لە لاوێتی دا ڕەوشت بەرز و زانستخواز بوو و گرنگی بە فەرمودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەدا و لە خزمەت ئەبو هورەیرە(رضي الله عنه) و هاوەڵانی تر دا دادەنیشت و فەرمودەی لێ وەردەگرتن، ئەم گرنگیدانەشی بە فەرموودە بەردەوام بوو پاش بوونی بە والی میسر، ئەوە بوو داوای لە کثیری کوڕی مرّة لە شام دا کرد کە ئەو فەرمووددانەی بۆ بنێرێت کە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیستوویەتی جگە لە و فەرمووددانەی کە لە ڕێی ئەبو هورەیرەوە گێڕدراونەتەوە، چونکە ئەوانەی لابوو[2].

هەروەها باوکی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز خاوەن دەروونێکی تامەزرۆی کاری مەزن بوو چ پێش بوونی بە والی لە میسردا یان پاشی، ئەوە بوو کاتێ چووە میسرەوە لە تەمەنی لاویدا ئارەزووی دەکرد و ئاواتی ئەوە بوو کە ببێت بەوالی و ئەو ئاواتەشی هاتە دی [3]، پاشان حەزی لە بەخشین بوو و بوویە یەکێك لە بەخشندە ترین والیەکانی بەنی ئومەییە [4] و هەزار مەنجەڵ بە دەوری ماڵەکەیدا دادەنرا و سەد مەنجەڵ خواردنی بە پشتی وڵاخدا دەنارد بۆ تیرە و هۆزەجیاجیاکان [5]، هەروەها لە بەخشندەییدا ئەیوت: ئەگەر کەسێك بوارم پێ بدات چاکەی لەگەڵدا بکەم ئەوە دەستی ئەو بەلای منەوە لە دەستی من لای ئەو بەلامەوە بەڕێزترە [6]، مێژوو نووسانیش ستایشی زۆریان کردووە بە هۆی بەخشندەییەوە ئەم بەخشندەییەشی لە باوەڕی بەهێزیەوە بوو بەوەی کە خوای گەورە قەرەبووی دەکاتەوە و ئەیوت: سەیرە باوەڕدارێك باوەڕی وابێت کە خوای گەورە ڕۆزی دەدات و قەرەبووی دەکاتەوە چۆن پارە و سامانەکەی لە پاداشتی مەزن و ستایشی پەروەدگار بێ بەش دەکات، هەروەها

---

[1] - عبدالعزيز بن مروان و سيرته و أثره في أحداث العصر ألأموي، ل: ٥٨.

[2] - سير أعلام النبلاء(٤ / ٤٧).

[3] - الولاة و كتاب القضاة للكندي، ل: ٤٥.

[4] - معجز الاسلام، خالد محمد خالد، ل: ٥٥.

[5] - الخطط للمقرمزي(١ / ٢١)، بدائع الذهور(١ / ٢٨).

[6] - عبدالعزيز بن مروان، ل: ٥٥.

زۆر لە خواترس بوو ئەمەش لە کاتی سەرەمەرگیدا بەدی دەکەین کە ئەیوت: خۆزگە من هەر نەبوایەم، حەزم دەکرد ئاو بوایەم یاخود گیایەکی خاکی حجاز بوایەم [1].

٢- دایکی: دایکی عاصمی کچی عاصمی کوڕی عمری کوڕی خەتاب، و کە کچی، عاصمی کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب ی زانا و جوامێر ئەبوو عەمری قورەیشی عەدەوی، بوو لە سەردەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە دایك بووە و لە باوکیەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، دایکشی جەمیلەی کچی ثابت ی کوڕی ئەبی ئەقلەمی ئەنساریە، بالآبەرز و خاوەن لەش و لار بوو یەکێك بوو لە کەسە جوامێر و دیندار و چاکەکان و ڕەوانبێژ و زمانپاراو و شاعیر بوو، با پیرەی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بوو لە دایکیەوە لە ساڵی حەفتای کۆچیدا کۆچی دوایی کرد و ئبن عومەری براشی ئەم هۆنراوەی بەسەردا هۆنیوە:

فليت المنايا كنّ خلّفنَ عاصماً ‌ ‌ ‌ ‌ فعشنا جميعاً أوذهبنا بنا معاً [2]

واتە: خۆزگە مەرگ بواری بە عاصم دەدا و نەدەمرد و پێکەوە دەژیاین یاخود پێکەوە دەمردین.

ئەنکیشی - داپیرەشی - لەسەری دایکیەوە ئەوە هەڵویستەیەکی مەزنی لە گەڵ عومەری کوڕی خەتابدا هەبوو، لە عبدوڵلآی کوڕی زوبیرەوە لە ئەسلەمەوە لە باوکیەوە لە ئەسلەمی باپیریەوە ئەڵێ: لە کاتێکدا کە من و عومەری کوڕی خەتتاب شەوێکیان پاسەوانیمان دەکرد لە مەدینەدا عومەر(ﷺ) ماندوو بوو و لە نیوەی شەودا پاڵی دا بەدیوارێکەوە، لەو کاتەدا گوێمان لە ژنێك بوو کە بە کچەکەی دەوت: کچم هەستە ئاو بکەرە ناو ئەو ماستەوە، کچەکەش وتی: ئەی نازانی ئەمڕۆ ئەمیری باوەڕداران چی وت؟ وتی: چی وت کچم؟ وتی: کەسێکی ناردبوو بانگەواز بکات کە نابێت ئاو بکرێتە ماستەوە، دایکەکەش وتی: هەستە کچم ئاوی تێکە، چونکە تۆ لە شوێنێکدایت عومەر و بانگەوازکەرەکەی ناتبینن، کچەکەش وتی: دایە سوێند خوا هەرگیز لە ناوخەڵکیدا بە گوێی ناکەم و لە پاشملە سەرپێچی بکەم، عومەریش گوێی لەم قسانە بوو، وتی: ئەی ئەسلەم ئەم ماڵە دیاری بکە، پاشان درێژەی بە پاسەوانیەکەی دا، کاتێ ڕۆژ بوویەوە فەرمووی: ئەی ئەسلەم بڕۆ بۆ ئەو ماڵە بزانە ئەو دوو ئافرەتە کێن؟ ئەڵێ منیش چووم و بینینم کچەکە بێوەژنە و مێردی نیە و

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ٥٦ لە البداية و النهاية وة.

[2] - سير أعلام النبلاء(٤ / ٩٧).

دایکیشی بەهەمان شێوە پیاوی نیە، پاشان گەڕامەوە و عومەرم ئاگادار کردەوە، پاشان عومەر کوڕەکانی بانگ کرد و فەرمووی: کێتان پێویستی بە ژن هەیە بۆی بخوازم.

عاصم وتی: من هاوسەرم نیە، عومەریش(ﷺ) ناردی بەدوای کچەکەدا و خوازبێنی کرد و ئەویش لە عاصم کچێکی بوو ئەو کچەش عومەری کوڕی عبدالعزیزی بوو، واتە دایکی عومەر بوو[1].

شایانی باسە کە عومەری کوڕی خەتتاب(ﷺ) شەوێکیان خەوێکی بینی و ئەیوت، هاوار بە ماڵم کاتێك کە ئەو کوڕە خاوەن نیشانەیەم پڕی دەکات لە دادگەری دوای ئەوەی کە پڕ دەکرێت لە ستەم[2]؟ عەبدوڵلاّ ی کوڕی عومەریش ئەیوت بنەماڵەی خەتتاب کاتێ بینیان بیلالی کوڕی عەبدوڵلاّ نیشانەیەك بەدەم و چاویەوەیە وایان زانی کە کەسی مژدە پێدراوە هەتا ئەو کاتەی کە خوای گەورە عەموری کوڕی عبدالعزیز ی نارد[3].

٣- لە دایك بوون و شوێنی.لە دایك بوونی: ٦١ ی کۆچی، مەدینە: مێژوو نووسان جیاوازن سەبارەت بە ساڵی لە دایك بوونی و ڕای بەهێز ئەوەیە کەلە ساڵی ٦١ ی کۆچی بووە، ئەمە ڕای زۆرینەی مێژوونووسانە و پشتگیری ئەوە ڕایە دەکات کە دەڵێ لە چل ساڵی دا کۆچی دوایی کردووە، چونکە لە ساڵی ١٠١ کۆچی، کۆچی دوایی کرد[4]، هەندێ سەرچاوەش باس لەوە دەکەن کە لە میسردا لە دایك بووە، بەڵام ئەم ڕایە لاوازە، چونکە عەبدولعەزیز کوڕی مەڕوانی کوڕی حەکەمی باوکی لە ساڵی شەست و پێنج دا بوو بە والی میسر دوای ئەوەی کە مەروانی کوڕی حەکەم دەستی بەسەردا گرت و لە دەستی کار بەدەستی عەبدوڵلاّی کوڕی زوبەیری سەندەوە، و عەبدولعەزیزی کوڕی کردە والی تیایدا و نەبیستراوە عەبدولعەزیز کوڕی مەڕوان پێش ئەوە لە میسردا نیشتەجێ بوو بێت، بەڵکو ئەو و کوڕانی

---

[1] - سيرة عمر لابن الحكم، ل ١٩ — ٢٠، سيرة عمر لابن الجوزية، ل: ١٠.

[2] - سير أعلام النبلاء(٥ / ١٢٢).

[3] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٢٢).

[4] - البداية والنهاية(١٢ / ٦٧٦).

مەڕوان نیشتەجیّ ی مەدینە بوون [1]، زەهەبیش ڕای وایە کە لە سەردەمی یەزیددا لە مەدینە لە دایك بووە [2].

٤- دیاریکراو یان سەرشکاوی بەنی ئومەییە: عەمەری کوڕی عەبدولعەزیز(ﷺ) نازناوی دیاریکراوی لیّنرا بوو، و پیّیان دەوت دیاری کراوی نەوەی مەڕوان، ئەمەش لەوەوە هاتووە کاتیّك کە عومەری کوڕی عبدالعزیز منالّ بوو، چوو بووە تەویلەکەی باوکیەوە لە کاتیّکدا کە والی میسر بوو بۆ بینینی ئەسپ، بەلاّم ئەسپیّك لیّی داو دەم و چاویان سەری بریندار کرد و باوکیشی لە کاتیّکدا خویّنی دەم و چاوی دەسڕی ئەیوت: ئەگەر تۆ دیاریکراوی نەوەی نومەیە بیت ئەوە خۆشبەختیت [3].

کاتیّ ألأصبغ ی برایشی ئەمەی بینی وتی: الله اکبر! ئەمە دیاریکراوی نەوەی مەروانە کە دەبیّتە گەورە و کاربەدەست، عومەری کوڕی خەتتابیش(ﷺ) ئەیفەرموو: لە نەوەی مندا کوڕیّك دەبیّت کە دەم و چاوی دیاریکراوە و زەوی پڕ دەکات لە دادگەری [4].

هەروەها عومەری فاروق(ﷺ) خەویّکی بینیو و کە ئاماژەی بەوە دەکرد، خەلّکانیّکی زۆری تریش ئەو خەوەیان بینیوو و ئەم مەسەلەیە ناوبانگ ی دەرکرد بوو، بەلّگەش لەسەر ئەمە ئەو قسەیەی باوکیەتی کاتیّك کە دەم و چاوی بریندار بوو، هەروەها وتەی براکەشی کاتیّك لە هەمان شتی بینی، ئەوەبوو هەردوکیان گەشبین بوون بەوەی کە ئەم ئەو دیاریکراوە بیّت کە زەوی پڕ دەکات لە دادگەری [5].

٥- خوشك و براکانی: عبدالعزیزی کوڕی مەروان ی باوکی عومەر(ﷺ) دە کوڕی هەبوو ئەوانیش: ئەبوبەکر و محمد و عاصم بوون، کە دایکیان لیلی ی کچی عاصمی کوڕی عومەری کوڕی خەتتابە، لە غەیری ئەم ئافرەتەش شەش کوڕی تری هەبوو کە ئەوانیش:

---

١ - الآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ٥٤).

٢ - تذكرة الحافظ(١ / ١١٨ — ١٢٠).

٣ - البداية و النهاية، له فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٢٠).

٤ - المعارف لابن قتيبة، ل: ٣٦٢.

٥ - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٢٠) د. محمد شقير.

ألأصبغ و سهل و سهيل و ام الحكم و زبان و أم البنين بوون [1]، عاصميش بوو بوو به شۆرەت بۆ دايكی كه ليلی ی كچی عاصم ی كوڕی عومەری كوڕی خەتتابه و به أم عاصم – دايكی عاصمی – ناسرا بوو [2].

عومەری كوڕی عبدالعزيز(ﷺ) چوارده كوڕی هەبوو: عبدالملك و عبدالعزيز و عبدالله و ابراهيم و ئيسحاق و يەعقوب و بكر و الوليد و موسى و عاصم و يزيد و زبان و عبدالله [3]، لەگەڵ سێ کچدا كه ئەوانيش أمينة و أم عمّار و ام عبدالله بوون.

ڕیوایەتەكانيش جیاوازن سەبارەت به ژمارەی كوڕ و كچەكانی عومەری كوڕی عبدالعزيز و هەندێ ڕیوایەت دەڵێن چوارده كوڕ بوون وەك ئيبن قتيبه دەڵێ: هەندێ ڕیوایەتی تریش باس لە دوازده كوڕ و شەش كچ دەكات وەك ابن الجوزی دەڵێ [4]، بەڵام ئەوەی كه هەموان لەسەری كۆكن ئەوەيه كه دوازده كوڕی هەبووە، كاتێ كۆچی دوایيشی كرد عومەری كوڕی عبدالعزيز(ﷺ) پارەيەكی كەمی بۆ منداڵەكانی جێ هێشت و ئەڵێن كوڕەكانی تەنها نۆزده درهەميان بەركەوتووە ئەمە لە كاتێكدا كه كوڕانی هشام ی كوڕی عبدالملك يەك مليۆنيان بەركەوتبوو، بەڵام دوای چەند ساڵێك يەكێك لە كوڕەكانی عمر كوڕی عبدالعزيز لە ڕۆژێكدا باری سەد ئەسپی لە پێناو خوادا دەبەخشی و هەندێ كەسيش يەكێ لە كوڕانی هشاميان بينی بوو كه خەڵك خێريان پێ دەكردا [5]، دەسا پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگاری جيهانيان...

٦– هاوسەر و خێزانەكانی: عومەر لە مەدينەدا پەروەرده بوو و خوڕەوشتی ئەوانی وەرگرت و كاريگەری زانایانی لەسەر بوو و لە سەردەستی ئەوان زانستی وەرگرت و بەردەوام لە خزمەت بەساڵاچووەكانياندا بوو و خۆی لە لاوانيان به دوور دەگرت، و بەو جۆره ناسرا بوو لە مەدينەدا، كاتێ باوكی كۆچی دوایی كرد مامی واته: عبدالملك ی كوڕی مەروان پێشەوای باوەڕداران بردی و تێكەڵی منداڵەكانی خۆی كرد و پێش زۆر بەيانی دەخست و فاتيمەی

---

[1] – المعارف لابن قتيبة، ل: ٣٦٢.

[2] – فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٢٢).

[3] – هەمان سەرچاوە(١ / ٢٣).

[4] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٣٣٨، فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٢٤).

[5] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٣٣٨.

کچی عبدالملك ی لیّ مارە کرد [1]، کـە ئـافرەتێکی چـاکە خـواز بـوو کاریگـەری عومـەری کوڕی عبدالعزیزی لەسەر بوو پاداشتی خوای لە خۆشیەکانی دونیا بەلاوە گرنگتر بـوو، وەك شاعیر دەربارەی ئەیوت:

بنت الخليفة و الخليفة جدها          أخت الخلائف و الخليفة زوجها

مانای ئەم دێڕە شیعرەش ئەوەیە کە ئەو کچی خەلیفە عبدالملك مەروان و خەلیفە مەروانی کوڕی حەکەمیش باپیرەتی و خوشکی خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملك و سـولەیمانی کـوڕی عبـدالملك و یەزیدی کوڕی عبدالملك و هـشامی کـوڕی عبـدالملك و مێردەکەشـی خەلیفـەی عومـەری کـوڕی عبدالعزیز ە(رضي الله عنه)، تەنانەت وتراوە: تا سـەردەمی ئێمـە هـیچ ئافرەتێـك ی بـەو شـێوە نەناسـراوە[2]، هەروەها عمری کوڕی عبدالعزیز لە فاتیمە ئیسحاق و یەعقوب و موسای بووە لە ام عوسمانی کچی شوعەیبی کوڕی زەییانیش، ئیبراهیم ی بووە و لە لە میسی کچی عەلی کوڕی الحاریـسش عبـدالله و بـەکر و ام عـەممار ی بـووە، لـە ام ولـدیش: عبـدالملك وەلیـد و عاصـم و یەزیـد عەبـدولڵا و عەبدولعەزیز و زەییان و ئەمینە و ام عەبدولڵای بووە [3].

٧- شـێوە و لـەش و لاری: عومـەری کـوڕی عەبدولعـەزیز ئەسمـەرێکی دەم و چاوناسـك بـوو، جەستەی لاواز و ڕیشی جوان بوو، چاوی چوو بوو بە قولـدا و تـەوێلی ئاسـەواری لێـدانی ئەسپی پێوە بوو و خەتێکی سپی تیّ کەوتبوو [4]، هەروەها ئەڵێن:پیاوێکی سپی دەم چاو بچوکی جوان و لاواز بوو و ڕیشێکی جوانی هەبوو [5].

## دووەم: ئەو هۆکارانەی کە کاریگەریان هەبوو لە دروستبوونی کەسایەتی عومـەری کوڕی عبدالعزیزدا:

١- **واقیعی خێزانی:** عومەری کوڕی عبدالعزیز لە مەدینەدا پـەروەردە بـوو، کـاتیّ پێگەشـت و ئەقڵی پەیدا کرد ئەهاتە لای دایکی و ئەیوت: دایە من حەز ئەکەم وەکو خـاڵم بم ـمەبەسـتی

---

[1] – البداية و النهاية(١٢ / ٦٨٠)

[2] – البداية و النهاية(١٢ / ٦٨٠).

[3] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٣١٤ – ٣١٥.

[4] – الآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز ى العقيدة(١ / ٥٨).

[5] – الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(١ / ١١) الآثار الواردة(١ / ٥٨).

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر – بوو، ئەویش ئەیوت: ئۆف لە دەستت لەوانەیە لە خاڵت بچیت، ئەمەی چەند جارێك بۆ دووبارە دەکردەوە، کاتێ کە گەورە بوو باوکی واتە عبدالعزیزی کوڕی مەروان کەوتەڕێ بۆ میسر وەك والی و کار بەدەست، پاشان نامەیەکی نارد بۆ ام عاصمی خێزانی هەتاوەکو لەگەڵ کوڕەکەیدا بچن بۆ لای ئەویش چووە لای عبدالله ی کوڕی عومەری مامی و لەنامەکەی عبدالعزیزی هاوسەری ئاگاداری کردەوە، عبدالله ش پێی وت: ئەی کچی برام ئەو مێردتە بڕۆ بۆلای، کاتێ ویستی بڕوات پێی وت: ئەم کوڕە لای ئێمە جێ بهێڵە – مەبەستی عومەر بوو – چونکە ئەو لە هەمووتان زیاتر لە ئێمە دەچێت، ئەویش بەلایەوە جێی هێشت و نا بەدڵی نەکرد.

کاتێ ام عاصم گەشتە لای عبدالعزیز چاوی بۆ کوڕەکەی دەگێڕا، بەڵام بەدی نەکرد، بۆیە هەواڵی پرسی وتی: ئەی کوا عومەر؟ ئەویش باسی بۆ کرد کە عبدالله داوای جێ هێشتنی کردووە لەبەر ئەوەی کە لەوان دەچێت، عبدالعزیزیش بەوە زۆر دڵخۆش بوو، و نامەیەکی نووسی بۆ عبدالملك ی برای و لەوە ئاگاداری کردەوە، عبدالملك یش نامەیەکی بۆ نووسی و داوای لێکرد کە مانگانە هەزار دیناری بۆ سەرف بکات [1].

پاشان عومەر هات بۆ لای باوکی، بەم شێوەیە عومەر(رضي الله عنه) لای خاڵۆکانی لە مەدینەدا پەروەردە بوو – واتە لای بنەماڵەی عومەری کوڕی خەتاب – بۆیە بە دەرنەبووە لە کاریگەر بوون بەوان و بە کۆمەڵگەی هاوەڵان لە مەدینەدا [2].

٢- **سەرقاڵبوونی بە وەرگرتنی زانست و لەبەرکردنی قورئانی پیرۆز لە منداڵیەوە:** هەر لە منداڵیەوە تامەزرۆیی زانست و حەزی لە خوێندنەوە و خوێندن لە نێو زانایاندا بوو، هەروەك سور بوو لەسەر ئامادە بوون لە کۆڕ و کۆبوونەوەی زانایان لە مەدینەدا کە لە و ڕۆژەدا سەرقافڵەی زانست و خواناسی بوو و ئاوەدان بوو بە زانایان و پیاو چاك و خواناسان، یەکەم شتێکیش کە لە عومەری کوڕی عبدالعزیز دا دەرکەوت سور بوونی بوو لەسەر زانست و ئارەزووی بوو لە ئەدەب [3].

---

[1] – سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٢٤ – ٢٥.

[2] – الآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ٥٦).

[3] – البداية و النهاية(١ / ٦٧٩).

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز ڕەزای خولی لیّ بیّت بە منداڵی قورئانی لەبەر کرد و پاکی دەرون و توانانی بەهێزی لەبەرکردن و خۆیەکلا کردنەوەی بۆ وەرگرتنی زانست و لەبەرکردنی قورئان یارمەتی دەری بوو لەم بوارەدا، زۆر کاریگەریش بوو بە قورئانی پیرۆز و تێڕوانینی بۆپەروەردگار و زیندو بوونەوە بەهەشت و دۆزەخ و قەزا و قەدەر و حەقیقەتی مردن و، هەر بە منداڵی بە باسکردنی مردن دەگریا، ئەمەش گەشتەوە بە دایکی ئەویش ناردی بۆلای و وتی: بۆ ئەگریت؟ فەرمووی: مردنم یادکەوتەوە، ئەوە بوو دایکیشی دایە گریان [1]، تەواوی ژیانیشی لە خزمەت قورئان و سەرنج دانی و جیّ بەجیّ کردنی فەرمانەکانیدا بەسەر دەبرد و لە هەڵوێستەکانیشی لە خزمەت قورئانی پیرۆزدا:

ئەوە بوو عومەر هێندە گریا کە دەنگی دەبیسترا، پاشان لەو مەجلیسەدا هەستا و چووەماڵەوە خەڵکیش بلاّوەیان لیّ کرد [2].

مانای ئەم ئایەتەش ئەوەیە کە کاتیّ ئەو بیّ باوەڕ و بەدرۆ خەرەوانە فڕیّ دەدرێنە ناو ئاگر دەستیان ئەلکیّ بەگردنیانەوە بە کۆت و زنجیر کراوی لەو کاتەدا هاوار دەکەن و پەنجەی پەشیمانی دەگەزن و دۆعای لەناچوون لە خۆیان دەکەن ئەمەش بە هۆی دوورکەوتنەوەیان لە گوێڕایەڵی خوا لە دنیادا و باوەڕ نەهێنانیان بەوەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێناویەتی کە بە هۆی ئەمەشەوە دووچاری سزای خوا بوون [3].

أ- لە کوڕی أبی زیبەوە، ئەڵێ: کەسێك لەوانەی کە لە خزمەت عومەری کوڕی عبدالعزیز دا بوو بوون لە کاتێکدا کە والی بوو لە مەدینەدا بۆی گێڕامەوە کە کابرایەك لە خزمەت عومەردا ئایەتی ﴿ وَإِذَآ أُلۡقُوا۟ مِنۡهَا مَكَانًا ضَيِّقًا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡا۟ هُنَالِكَ ثُبُورًا ﴾ الفرقان: ١٣).

ب- هەروەها لە ابی مودودەوە ئەڵێ: بۆیان گێڕامەوە کە ڕۆژێکیان عومەری کوڕی عبدالعزیز ئایەتی ﴿ وَمَا تَكُونُ فِي شَأۡنٍ وَمَا تَتۡلُوا۟ مِنۡهُ مِن قُرۡءَانٍ وَلَا تَعۡمَلُونَ مِنۡ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيۡكُمۡ شُهُودًا ﴾ یونس: ٦١).

---

[1] – البداية والنهاية(١٢ / ٦٧٨).

[2] – الرقة البكاء لابن ابي دنيا، ژمارە(٨٣).

[3] – دموع القراء، محمد شومان، ل: ١٠٧ لە تفسیری ابن جریرەوە.

خوێندەوە و هێندە گریا کە خەڵکیماڵەوە گوێیان لە دەنگی بوو، پاشان فاتیمەی هاوسەری هات و ئەویش دەستی کرد بە گریان لەگەڵیدا و پاشان خەڵکی ماڵەکە هەموو گریان، دواتر عبدالملك هات و بینی هەموان دەگرین و وتی: بۆچی ئەگریت بابە؟ فەرمووی: خێرە کورِم، باوکت ئاواتی ئەوەیە کە دونیای نەناسیایەو دونیاش ئەوی نەناسیایە، سوێند بەخوا ئەترسم تیابچم سوێند بەخوا ئەترسم لەوەی کە دۆزەخی بم [1]...

مانای ئایەتەکەش ئەوەیە: " کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) ئاگادار دەکاتەوە کە هەموو باردۆخێکی خۆی و ئومەتەکەی دەزانێ و بە ئاگایە لە هەموو دروستکراوەکان لە هەموو کات و ساتێکدا وە هیچ شتێك لە زانین و بینینی ون نابێت با گەردیلەیەکی بچوك بێت لە ئاسمانەکان و زەویدا وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾ الأنعام: ٥٩).

لێرەدا خوای گەورە ئاگادارمان ئەکاتەوە کە ئەو جوڵەی درەخت و شتە بێگیانەکانیش دەزانێت و ئاگادارە لە گیانەوەرە کێوی و بەرەڵاکان ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُم﴾ الأنعام: ٣٨). هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزۡقُهَا﴾ هود: ٦).

جا ئەگەر بەو شێوەیە بە ئاگابێت لە جم و جوڵی شتەکان ئەبێ ئاگاداری لە جموجوڵی بەندە بەرپرسیارەکانی بەرامبەر بەبەندایەتی چۆن بێت؟

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾﴾ الشعراء: ٢١٧ – ٢١٩). واتە: خوای گەورە ئەفەرموێت: کاتێ کە لەسەر ئەوشتانە لێپرسینەوەتان لەگەڵ بکرێت کەواتە ئێمە ئەتان بینین و گوێمان لێتانە [2].

أ- هەروەها لە عبدالأعلى ی کوڕی ابی عبدالله ی عنزیەوە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیزم لە رۆژی هەینیدا بە جلێکی جوانەوە بینی و لە دوایشیەوە حەبەشیەك هەبوو کاتێك گەشتە لای خەڵك حەبەشیەکە گەڕایەوە، عومەریش کاتێك گەشتە لای دوو پیاوەکە وتی: بم شێوەیە

---

[1] – الرقة و البكاء لابن ابي الدنيا، ژمارە(٩١).

[2] – تفسير ابن كثير.

ڕەحمەتی خواتان لێ بێت، هەتاوەکو چووە سەر مینبەر دەستی کرد بە وتار و ئایەتی: ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ التكوير: ١).

خوێندەوە و فەرمووی: خۆر کاری چیە؟﴿وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتْ﴾ التكوير: ٢). هەتاوەکو گەشتە: ﴿وَإِذَا ٱلْجَحِيمُ سُعِّرَتْ ۝١٢ وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ﴾ التكوير: ١٢ - ١٣). پاشان گریا و خەڵکی مزگەوتیش گریان و مزگەوتەکە لە گریاندا دەنگی دەدایەوە و وات دەزانی دیوارەکانی مزگەوت لەگەڵیدا دەگرین[١].

ئەم سورەتەش ئەم وەسفانەی تێدا هاتووە کە ڕۆژی دوایی پێ وەصف کراوە و دڵی مرۆڤ دادەخورپێنێ و چوار پەلی مرۆڤ دەهەژێنێ و ترس و تۆقین دایدەگرێ و مرۆڤە ژیرەکانیش هان دەدا بۆ خۆ ئامادەکردن بۆ ئەو ڕۆژە دەیانگێڕێتەوە لە هەر کارێك کە لۆمەی لەسەر بێت، هەر بۆیە هەندێ لە سەلەف و پێشینان وتویانە: " هەرکەس نەیەوێ ڕۆژی دوایی ببینێ با لە سورەتی ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ ڕابمێنێ[٢]، تەنانەت بە مەرفوعی لە فەرموودەی ئیبن عومەردا(رضي الله عنه) هاتووە کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی:(هەرکەسێك حەزدەکات ڕۆژی قیامەت بەڕاستی ببینێتە بەرچاوی خۆی با ﴿إِذَا ٱلشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾ ، ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتْ﴾ الانفطار: ١)، ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتْ﴾ الانشقاق: ١)[٣]. بخوێنێتەوە.

ب- لە مەیمونی کوڕی مهرانەوە ئەڵێت: عمری کوڕی عبدالعزیز: ﴿أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ﴾ التكاثر: ١). خوێندەوە و گریا پاشان فەرمووی: ﴿حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ﴾ التكاثر: ٢). گۆڕستان نابینم بەسەردان نەبێت، هەرکەسێکیش سەردانی گۆڕ بکات یان بەهەشتیە یان دۆزەخیە[٤].

ئەمە هەندێك بوو لەو هەڵوێستانەی کە کاریگەری قورئانی پیرۆز لەسەر کەسایەتی عمری کوڕی عبدالعزیز ڕوون دەکاتەوە.

---

[١] – دموع القراء، ل: ١١١، ١١٢.

[٢] – تفسير السعدي: ٢ / ٩.

[٣] – ترمذي تەریجی کردووە ژمارە ٣٣٣٣ و حاکم(٢ / ٥١٥)،(٤ / ٥٧٦) بە صحیحی داناوە و زەهەبیش هاوڕایە لەگەڵیدا و ئەلبانیش بەهەمان شێوە لە صحیحە کەیدا هێناویەتی(٣ / ٧٠).

[٤] – الرقة و البكاء لابن ابي الدنيا، ژمارە ٤٢٥.

٣- **واقعی کۆمەلایەتی:** دیارە ژینگەی کۆمەلایەتی و دەوروبەر کاریگەری زۆری هەیە لە دروست کردن و بارهێنانی پیاوان و پێکەوە نانی کەسایەتیاندا، ئەوەتا عمری کوڕی عبدالعزیز لەسەردەمێکدا دەژیا کە لە چاکە و خوا ناسی و زانستخوازی و کارکردن بە قورئان و سوننەت لە کۆمەلگەدا بلاو بووبوویەوە، چونکە هێشتا ژمارەیەك لە هاوەلان لە مەدینەدا مابوون، عمریش ڕەزای خوای لێ بێ لە عبداللە ی کوڕی جعفر و سائیبی کوڕی یەزیدی و سهلی کوڕی سەعدەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە و جامێکی بە دیاری وەرگرتووە لە پێغەمبەری خوا و(ﷺ) ئاوی پێ خواردوەتەوە پێش نوێژی بۆ ئەنەسی کوڕی مالیك کردووە و ئەویش فەرموویەتی کەسم نەبینیوە هێندەی ئەم گەنجە نوێژی لە نوێژی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بچێت [1].

دیارە ئەم مانەوەیەش لە مەدینەدا ئاسەواری دەروونی و مانای ئیمانی و پەیوەست بوونی ڕۆحی هەبووە، ئەو کۆمەلگەیەش کاریگەریەکی بە هێزی هەبووە لە دارشتنی کەسایەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە ڕووی زانستی و.پەروەردەییەوە [2].

٤- **پەروەردە بوونی لەسەر دەستی گەورە زانایانی مەدینە:** عەبدالعزیزی باوکی عومەر سالحی کوڕی کیسانی هەلبژارد وەك پەروەر شیارێك بۆ عومەر، سالحیش ئەرکی پەروەردە کردنی لە ئەستۆ گرت و و پێنج فەرزەکەی لە مزگەوتدا پێ دەکرد، ئەوەبوو ڕۆژێك عومەری کوڕی عبدالعزیز لە نوێژ دواکەوت.

صالحی کوڕی کیسانیش وتی: بۆ دواکەوتی؟ وتی: خەریکی قژ داهێنان بووم، صالحیش وتی: خۆشەویستیت بۆ قژ داهێنان نوێژی لەبیر بردیتەوە؟ پاشان نامەیەکی نووسی بۆ عبدالعزیز و ئەمەی بۆ باسکر، ئەویش کەسێکی نارد و قسەی لەگەل عومەردا نەکرد هەتاوەکو سەری تاشی [3]، هەروەها عومەر(ﷺ) زۆر سور بوو لەسەر ئەوەی کە نوێژی لە نوێژی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بچێت، و ڕکوع و سجودی درێژ دەکردەوە و هەستان و دانیشتنی کورت بوو، لە ڕیوایەتێکی صحیح یشدا هاتووە کە لە ڕکوع و سجود دا دە جار(سبحان ربی...) خوێندووە [4]، کاتێ کە باوکی هات بۆ مەدینە بۆ حەج پرسیاری لە صالحی کوڕی کیسان کرد دەربارەی کوڕەکەی ئەویش وتی: کەسم نەبینیوە

---

[1] – سير أعلام النبلاء(٥ / ١١٤).

[2] – الجوانب التربوية في حياة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٢٣.

[3] – البداية و النهاية(١٢ / ٦٧٨).

[4] – هەمان سەرچاوە(١٢ / ٦٨٢).

هێندەی ئەم لاوە خوا لە دەرونی دا گەورە بێت [1]، هەروەها لەو مامۆستایانەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز کاریگەر بوە پێیان عبیداللە ی کوڕی عبداللە کوڕی عتبەی کوڕی مەسعود، عومەر رێزی زۆری لێ دەنا و عیلم وئەدەبی لێ وەردەرگرت و هەمیشە سەردانی دەکرد تەنانەت لەو کاتەشدا کە بوو بوو بە ئەمیری مەدینە، عومەریش باس لەسەردانی مامۆستاکەی و سەرسام بوونی پێی دەکات و ئەڵێت: دانیشتنێك لە مەجلیسی عبیداللە ی کوڕی عبداللە ی کوڕی عتبەی کوڕی مەسعودی نابینا لام خۆشەویستترە لە هەزار دینار [2]، هەروەها لە کاتی خەلیفایەتیش دا بە هۆی زانیاری دەربارەی ئەو زانستە زۆرەی کە لای مامۆستاکەیەتی ئەیەوت: ئەگەر عوبەیدوڵلا لە ژیاندا بوایە لە ڕای دەرنەدەچووم، حەزیش دەکەم هێندە و هێندە پارەم بدایە بەرامبەر یە یەك ڕۆژ لەگەڵ عوبەیدڵلا دا [3]، دیارە عوبەیدڵلا لە کاتی خۆیدا موفتی مەدینە و یەکێك بوو لە حەوت زاناکە [4]، زوهری دەربارەی ئەڵێ: عوبەیدڵلای کوڕی عەبدوڵلا دەریایەك بوو لە دەریاکانی زانست [5]، هەروەها عوبەیدوڵلا شیعری دەهۆنیەوە، ئەوە بوو ئەم دێڕانەی نارد بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز: -

| | |
|---|---|
| بسم الله الذي أنزلت من عنده السور | و الحمد لله أمّا بعد يا عمر |
| إن كنت تعلم ماتأتي و ماتذر | فكن على حذر قد ينفع الحذر |
| واصبر على القدر المحتوم و أرض به | و إن أتاك بماً لا تشتهي القدر |
| فما صفا لا مرئ عيش يُسرُّ به | إلا سيتبع يوماً صفوه كدر [6] |

واتە: بەناوی ئەو خوایەی کە سورەتەکانمان لەلایەن ئەوەوە بۆ دابەزێنراوە و سوپاس بۆ ئەو پاشیان ئەی عومەر ئەگەر ئەزانی چی بکەیت و چی نەکەیت، ئەوە وریابە، چونکە لەوانەیە وریایی سوودی هەبێت ئارامگر بە لەسەرە قەدەر و ڕازی بە پێی ئەگەر چی شتی ناخۆشیشی پێ بوو بۆت، چونکە خۆشی ژیان تاسەر بۆ کەس نیە و ناخۆشی ڕۆژێك کۆتایی بە خۆشیەکان دێنێت.

---

[1] - هەمان سەرچاوە(١٢ / ٦٧٨).

[2] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ، ل: ٥٩، الطبقات(٥ / ٢٥٠) تهذيب التهذيب(٧ / ٢٢).

[3] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ، ل: ٥٩.

[4] - سير أعلام النبلاء(٤ / ٤٧٥).

[5] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٧٧).

[6] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٧٧).

هەروەها ئەم زانایە لە ساڵی ٩٨ کۆچی و ئەشڵێن ٩٩ ی ك کۆچی دوایی کردوە [١]. هەروەها سەعیدی کوڕی موسەییەبیش یەکێك بوو لە مامۆستایانی عومەر(ﷺ)، باسی ژیانیشیم لەسەردەمی عبدالملك ی کوڕی مەرواندا کردوە، هەروەها سەعید سەردانی هیچ ئەمیر و دەسەڵاتدارێکی نەدەکرد جگە لە عومەر(ﷺ) [٢]، یەکێکی تریش لە مامۆستاکانی سالمی کوڕی عبداللە ی کوڕی عمری کوڕی خەتاب بوو کە سەعیدی کوڕی موسەییەب دەربارەی دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لە هەموو کوڕانی عومەر زیاتر لە عومەر(ﷺ) دەچوو، سالم یش لە هەموو کوڕانی عەبدوڵڵا زیاتر لە باوکی دەچوو [٣]. هەروەها ئیبن عمر سالمی کوڕی زۆر خۆشدەویست و لەسەر ئەوەش لۆمەیان دەکرد و ئەویش ئەیوت:

يلومونني في سالم و ألومهم　　　و جلدة بين العين و الانف سالم

لۆمەم ئەکەن دەربارەی سالم و لۆمەیان ئەکەم　پێستی نێوان چاو و لوتم سالمە [٤]

دایکی سالمیش دایکی کوڕان بوو، ئیبن أبی زناد ئەڵێ: خەڵکی مەدینە حەزیان نەدەکرد هاوسەرەکەیان هەر کوڕی ببێت هەتاوەکو بەڕێزان علی کوڕی حسین و قاسمی کوڕی محمد و سالمی کوڕی عەبدوڵڵا پەیدا بوون و پێش خەڵکی مەدینە کەوتن لە زانست و خواپەرستی و پارێزگاری دا، ئینجا خەڵکی حەزی بەم مەسەلەیە کرد [٥]، هەروەها پێشەوا مالیك دەربارەی ئەفەرموێت: کەسێك نەبووە لە سەردەمی سالمدا هێندەی ئەو لە پیاو چاکان بچێت لە دنیا نەویستی و چاکەدا، جلی دەکڕی بە دوو درهەم و یەك پارچەشی دەکڕی، ئەڵێ: سولەیمانی کوڕی عبدالملك کاتێ سالمی بینی ڕەنگ و ڕووی جوانە وتی: ئەوە چی ئەخۆیت؟ وتی: نان و زەیت، ئەگەر گۆشتیشم دەستبکەوێت ئەیخۆم، عومەریش پێی وت: ئایا حەزی لێ دەکەیت؟ وتی: ئەگەر حەزم لێ نەکرد چاوەڕێ ی دەکەم تا حەزی لێ دەکەم [٦].

---

[١] – هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٧٨، ٤٧٩).

[٢] – الجوابن التربوية في حياة الخليفة عمر، ل: ٢٥.

[٣] – سير أعلام النبلاء(٤ / ٤٥٩).

[٤] – سير أعلام النبلاء:(٤ / ٤٥٠).

[٥] – هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٦٠).

[٦] – هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٦٠).

ڕۆژێکیشیان سالمی کوڕی عبدالله چووه لای سولەیمانی کوڕی عبدالملك و جلێکی زبر و کۆنی لەبەردا بوو، بەڵام سولەیمان ڕێزی زۆری لێناو هێنایە تەنیشت خۆیەوە، لەو کاتەدا عومەری کوڕی عبدالعزیزیش لەو مەجلیە سەدا بوو، پیاوێکیش بە عومەری وت: ئەوە خاڵت نەیئەتوانی جلێکی لەمانە باشتر لەبەر بکات، کاتێ کە دێت بۆلای ئەمیری باوەڕداران؟

ئەم کابرایەش جلی گرانبەهای لەبەردا بوو، عومەریش پێی وت: ئەو جلانەی کە لەبەر خاڵمدایە نەیخستە شوێنەکەی تۆو و ئەو جلانەی تۆش نەیبردیتە شوێنەکەی ئەو [1]، هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز لەسەر دەستی کۆمەڵێك لە زانایان پەروەردە بوو و مامۆستاکانیشی ژمارەیان دەگەشتە سی و سێ مامۆستا، هەشتیان لە هاوەڵان بوون و بیست و پێنجیشیان لە شوێنکەوتوان(تابعین) [2] بوون و زانست و ئەدەب و خوڕەوشتی لێوە وەرگرتن و هەمیشە لە مەجلیسەکانیاندا ئامادەبووو‌ئاسەواری پەروەردەی بەهێزییان بەڕەوشت وهەڵسوکەوتیەوەدیاربوو [3].

ئەوە بوو کەسایەتیەکی بەهێز و جدی هەبوو لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا و هەمیشە سەرقاڵی سەرنجدان و تێڕامان بوو لە قورئان و خاوەن ئیرادەیەکی بەهێز بوو و خۆی بەرز دەگرت لە گاڵتە و گەپ و ڕابواردن [4].

ئەمانە گرنگترین ئەو هۆکارانە بوون کە کاریکەریان لە دروستبوونی کەسایەتیدا هەبوو، لەو پەند و وانانەش کە لە مەوەوەری دەگرین ئەوەیە کە زانایانی خواویست ئەرکێکی گەورەیان لە ئەستۆدایە بۆ گرنگی دان بە منداڵی کار بە دەست و خاوەن پلە و پایە و کەسایەتیە دیارەکان، چونکە چاکی ئەم کەسانە خێرێکی زۆری بۆ ئوممەت لێ دەکەوێتەوە.

## سێیەم: پلەوپایەی لەڕووی زانستیەوە:

ئەوانەی کە لە ژیانی عومەر(ﷺ) دواون کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی کە ئەو لە پێشەوایانی سەردەمی خۆیەتی، و هەریەك لە پێشەوایان، مالیك و سوفیاتی کوڕی عویەینە بە پێشەوا وەسفیان

[1] – هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٦٠).

[2] – هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٦١).

[3] – مسند أمير المؤمنين عمر، ل: ٣٣.

[4] – الجوانب التربوية في حياة عمر بن عبدالعزيز(١ / ٦٧).

کردووه[1]، مجاهدیش دەربارەی ئەڵێ: هاتین فێری بکەین، بەڵام زۆری نەخایاند لێیەوەشت فێر بووین[2].

هەروەها مەیمونی کوڕی مەهران ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز مامۆستای زانایان بوون[3]، زەهەبیش ئەڵێ: پێشەوا و زانا و موجتەهید بوو، شارەزای سونەتەکان و پایەبەرز و پارێزکارو ملکەچ ی پەروەردگار و گەڕاوە بوو، لە ڕەوشت بەرزی و دادگەری داهاوتای عومەری باپیری بوو(رضي الله عنه) و لە دنیانەویستی و خواناسیشدا هاوتای حەسەنی بەسری بوو لە زانستیش دا هاوتای زوهدی بوو[4]، زانایانیش قسە و کرداریان بە بەڵگە داناوە و لەم بارەیەوە نامەکەی الیثی کوڕی سەعد بۆ پێشەوا مالك بەدی دەکەین کە لە چەندین شوێندا بۆ پاڵپشت کردنی ڕاکانی پشت بەوتەی عومەری کوڕی عبدالعزیز دەبەستێت لەبەرامبەر ڕاکانی پێشەوا مالیك دا[5]، لە کتێبی هەر چوار مەزهەبەکەشدا وتەی عومەری کوڕی عبدالعزیز وەك بەڵگە بەدی دەکرێت، ئەوەتا حەنەفیەکان لە چەندین مەسەلەدا بەڵگە بەکار و کردەوەی دەهێننەوە و سیفەتێکیان هێناوە کە بەهۆیەوە لە باپیری دایکی جیادەکرێتەوە – واتە عومەری کوڕی خەتاب – قورەشی لە الجواهر المضیئة دا ئەڵێ: هاوەڵانمان لە کتێبەکانیاندا دەربارەی ئەو مەسەلانەی کە جێی ناکۆکین ئەڵێن: ئەمە وتەی عومەری بچوکە، مەبەستیان عومەری کوڕی عبدالعزیزی پێشەوا و خەلیفەی بەناوبانگە[6].

هەروەها شافیعیەکان لە کتێبەکانیاندا زۆر ناوی دەهێنن، هەربۆیە پێشەوا نەوەوی بەچڕوپڕی باسی لە ژیاننامەی کردوە لە تهذیب الاسماء و اللغات دا و لەسەرەتاکەیدا ئەڵێ: لە المختصر و المهذب دا چەندین جار ناوی دووبارە بووەتەوە[7].

هەرچی مالیکیەکانیشە ئەوەبە زۆری لە کتێبەکانیاندا ناوی دەهێنن، مالیك خۆشی(رضي الله عنه) کە خاوەنی مەزهەبەکەیە لە(الموطأ) دا لە چەندین شوێنیدا بەڵگە بەفتوا وڕاکانی دەهێنێتەوە[1]،

---

[1] – عمر بن عبدالعزيز للزحيلي، ل: ٣٠.

[2] - تهذيب التهذيب(٧ / ٤٠٥) الآثار الواردة(١ / ٦٧١).

[3] – تأريخ أبي زرعة، ل: ٢٥٥، الآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ٦٧).

[4] – تذكرة الحفاظ، ل: ١١٨ – ١١٩.

[5] – الآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ٧٠).

[6] – الجواهر المضيئة(٤ / ٥٥٢) ألآثار الواردة(١ / ٧١).

[7] – المختصر و الهب من كتاب الشافعية المشهورة.

حەنبەلیەکانیش بەهەمان شێوە بەزۆری ناویان هێناوە هەروەها پێشەوا احمد دەربارەی ئەفەرموێت: نەمزانیوە کە قسەی هیچ یەکێك لە تابعین – شوێنکەوتوان – بەڵگەبێت جگە لە عومەری کوڕی عبدالعزیز، ئەممش بەسە بۆ ئەو [٢]، هەروەها فەرمایشتی پێشەوا ئەحمەدی بەسەکە ئەڵێ: ئەگەر کەسێکت بینی عومەری کوڕی عبدالعزیزی خۆش دەویست و باسی چاکەکانی دەکرد و بڵاوی دەکردەوە و ئەوە بزانە لە پشت ئەو کارەوە تووشی خێر دەبێ بە پشتیوانی پەروەردگار [٣].

هەرکەسێکیش دەیەوێ شارەزایی زانست و پلەوپایەی زانستی عومەری کوڕی عبدالعزیز بێت ئەوە با بگەڕێتەوە بۆ ئەم کتێبانە، الآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة، للإستاذ حياة محمد جبر، ئەم کتێبەش دوو بەرگە، و نامەیەکی زانستیە.

هەروەها فقه عمر بن عبدالعزيز، دکتور محمد شقير کە بە هەمان شێوە دوو بەرگەو نامەیەکی زانستیشە کە بە هۆیەوە پلەی دکتۆرای بەدەست هێنا، و موسوعة فقه عمر بن عبدالعزيز، محمد رواس قلعجي، هەروەها لەم لێکۆڵینەوەشماندا ئاشنا دەبین بە تێگەشتنی عمری کوڕی عبدالعزیز لە بیروباوەڕ و پەرستش و سیاسەتی شەرعی و بەڕێوەبردنی دەوڵەت و سیستمی دارایی و دادوەری و بانگخوازی و پابەندبوونی بە قورئان و سوننەت و ڕێنمایی خەلیفەکانی ڕاشیدین لە هەنگاو و هەڵسوکەوتیدا.

## چوارەم: عومەر لەسەردەمی وەلیدی کوڕی عبدالملك دا:

عومەری کوڕی عبدالعزیز بە یەکێك لەو زانایانە دادەنرێت کە نزیك بووە لە خەلیفەکانەوە و ڕۆڵی باشیان هەبوو لە ئامۆژگاری کردن و ئاراستە کردنی سیاسیەتەکانیاندا بە دەربڕینی ڕاو ئامۆژگاری بۆیان، هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز پێگەیەکی تایبەتی هەیە لە بنەماڵەی ئەمەویدا، ئەوە بوو عبدالملك ی کوڕی مەوران زۆر ڕێزی لێ دەنا و سەرسام بوو بە زیرەکی لە گەنجیدا ئەممش وای لێکرد بوو کە پێش زۆرێك لە کوڕەکانی خۆی بخات و کچەکەی خۆشی لێ مارە بکات، بەڵام لەسەردەمی عبدالملك دا بەشداریەکی ئەوتۆی نەبوو بەهۆی کەمی تەمەن و سەرقاڵبونیەوە بە وەرگرتنی زانست لە مەدینەدا، لەگەڵ ئەوەشدا ئبن جەوزی باس لەوە دەکات کە

---

[١] – سەیری: الموطأ الأرقام الآيتة: ٣٠٥، ٥٩٢، ٥٩٤، ٦١٤.

[٢] – البداية و النهاية لة الآثار الواردة(١ / ٧٢).

[٣] – سيرة عم ربن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٦١.

نامەیەکی نووسیوە بۆ عبدالملك و ئەو بەرپرسیارێتیەی بیر خستۆتەوە کە خراوەتە ئەستۆی و تیایدا هاتبوو:

پاشان: تۆ شوانیت و هەموو شوانێکیش بەرپرسە لە ژێر دەستەکانی، ئەنەسی کوڕی مالیك بۆمان باس دەکات کە گوێی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، فەرمووی:(کل راع مسئول عن رعیته)[1]. ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا﴾ النساء: ٨٧). واتە: هیچ پەرەستراوێك نی یە جگە لە خوا سوێند بەخوا بێگومان کۆتان دەکاتەوە بۆ(لێپرسینەوەی) ئەو ڕۆژی دواییەی کە هیچ گومانی تێدا نیە جا کێ لە خوا قسە(و بەڵێنی) ڕاست ترە.

ئەشڵێن کە عومەری کوڕی عبدالعزیز لەلایەن عبدالملك ی مامیەوە چەند کارێکی پێ سپێردراوە هەتا وەکو هەر لەمنداڵیەوە فێری سەرکردایەتی ببێت[2]، ئەشڵێن سولەیمانی کوڕی عبدالملك ئەو کارەی پێ سپاردووە، هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز زۆر کاریگەر بوو بە کۆچی دوایی مامی و دڵتەنگی و خەمێکی زۆر دایگرت، پاشان عومەر لەگەڵ ئامۆزاکەیدا واتە مەسلەمەی کوڕی عبدالملك دا دواو وتی: من لای باوکت دا بووم لە کاتی بەخاك سپاردنیدا و سەیری ناو گۆڕەکەیم کرد و بینیم کە ڕادەستی پەروەردگار کرا زۆر ترسام و ڕاچڵەکام و پەیمانم دا بە پەروەردگار کە وەك ئەو نەکەم ئەگەر بووم بە خەلیفە و هەوڵی زۆریشم داوە[3].

١- **دانانی بەوالی مەدینە:** لە ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٨٧ کۆچی دا خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملك پۆستی ئەمیریی مەدینەی پێ سپارد، پاشان ولایەتی تائیفیشی پێوە لکاند لە ساڵی ٩١ ی کۆچیدا، بەم شێوەیە بوو بە والی هەموو حیجاز، بۆ لە ئەستۆ گرتنی ئەو کارەش عومەر سێ مەرجی هەبوو: -

**مەرجی یەکەم:** بەدادگەری حوکم بکات و ستەم لەکەس نەکات و هەقخوازانە بجولێتەوە و زۆر لە کەس نەکات بۆ سەندنەوەی مافەکانی بەیتولمال لە خەڵك، ئەمەش ئەبێتە هۆی کەمبوونەوەی ئەو بڕەپارەیەی کە بۆ خەلیفە دەنێردرێت.

**مەرجی دووەم:** ڕێی حەجکردنی پێ بدرێت لەیەکەم ساڵدا، چونکە هێشتا حەجی نەکردبوو.

---

[1] - أثر الحاة السياسية، ل: ١٥٩.

[2] - ألآثار الواردة في عمر بن عبدالعزيز(١ / ٩٣).

[3] - السياسية الاقتصادية و الماليتو لعمر بن عبدالعزيز بشير كمال عابدين، ل: ١٠.

**مەرجی سێیەم:** ڕێی پێ بدرێت بە بەخشینی پارە بەخەڵکی مەدینە، وەلیدیش بەم مەرجانە ڕازی بوو، پاشان عومەری کوڕی عبدالعزیز لە کارەکەیدا دەستبەکار بوو و خەڵکی مەدینەش بەمە زۆر دڵخۆش بوون [1].

٢- **ئەنجومەنی شواری عومەری کوڕی عبدالعزیز:** ئەنجومەنی دە زاناکەی مەدینە: لە دیارترین ئەو کارانەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی هەستا پێکهێنانی ئەنجومەنی شورا بوو لە مەدینەدا، ئەوە بوو کاتێ خەڵکی هاتن بۆ سلاو کردن لە ئەمیری نوێ، نوێژی بۆ کردن و، پاشان دە لە زانایانی مەدینەی بانگکرد کە ئەوانیش: عروەی کوڕی زوبەیر، عبیداللە ی کوڕی عبداللە ی کوڕی عتبە و ابوبکری کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی حارث ی کوڕی هشام و ئەبوبەکری کوڕی سولەیمانی کوڕی أبی خیثمە و سولەیمانی کوڕی یەسار و قاسمی کوڕی محمد و سالمی کوڕی عبداللە ی کوڕی عومەر و عبداللە ی کوڕی عبداللە کوڕی عومەری برای و عبداللە ی کوڕی عامری کوڕی ڕەبیعە و خارجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابت بوون ئەوانیش هاتنە خزمەتی و دانیشتن، ئەویش سوپاس و ستایشی پەروەردگاری کرد و پاشان وتی: من بۆ کارێك بانگم کردون کە پاداشتی لەسەر وەردەگرن و دەبنە پشتیوانی حەق تیایدا، من نامەوێ هیچ کارێك بکەم بە بێ پرس و ڕاوێژی ئێوە یان بە بێ ڕای ئەوانەتان کە ئامادە ئەبن، جا ئەگەر کار بەدەستێکی منتان بینی ستەمی کرد یان سنووری کاری خۆی تێپەڕاند، ئەوە گەردنی ئەو کەسە ئازاد نەبێت کە ئاگادارم ناکاتەوە و خوای گەورە تۆڵەی لێ بسێنێت [2].

وەك ئەزانین کە عومەری کوڕی خەتاب بۆ هەموو کارو پێشهاتێك ئەو ئەنجومەنەی کۆ دەکردەوە و ڕاوێژ و شواری بە پێویست دەزانی لەگەڵیاندا، هەرچی عومەری کوڕی عبدالعزیزیشە کە کچەزای عومەری کوڕی خەتتابە ئەوە بە هەمان شێوە ئەنجومەنێکی پێکهێنا و دەسەلاتەکانیشی لە دوو شت دا دیاری کرد بوو:

أ- ئەوان مافی بڕیاردانیان هەیە و ئەو بە بێ ئەوان هیچ بڕیارێك نادات، بەم پێیەش ئەمیر دەستی لە تایبەتمەندیەکانی هەڵگرت لەم ئەنجومەنەدا کە بە ئەنجومەنی دەکەسەکە ناسرا بوو.

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزیز(١ / ٦٣)، سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن الجوزي، ل: ٤١، ٤٢.

[2] - الطبقات(٥ / ٢٥٧) موسوعة فقه عمر، قلمجی، ل: ٥٤٨.

ب- کردنی بە چاودێر بە سەر هەڵسوکەوتی کار بەدەستەکان و کارەکانیانەوە، جا ئەگەر کەسێکیان زانی کە کار بەدەستێکی عومەر ستەمی کردووە ئەوە پێویستە لەسەریان کە ئاگاداری بکەنەوە ئەگینا ئەو کەسە لە بەرامبەر خوادا بەرپرسە، لێرەشدا تێبینی ئەوە دەکەین کە ئەم کارە دوومەسەلەی لە خۆگرتبوو:

- یەکەمیان: ئەمیر عومەری کوڕی عبدالعزیز هیچ موچەیەکی دیاری نەکرد بۆ ئەم ئەنجومەنە، چونکە هەموو موچەیان هەبوو وەك زانا، ئەو کارەش بەشێك بوو لە ئەرکی خۆیان.

دووەم: عومەر - ئەگەری ئامادەنەبوونی هەندێکیانی لەبەرچاو گرتبوو - بۆیە بۆ بڕیاردان ئامادە بوونی هەموویانی بە مەرج دانەنا، بەڵکو وتی:(یان بەڕای ئەوانەتان کە ئامادە ئەبن) [1].

- دیارە ئەم ئەنجومەنە لە هەموو مەسەلەکاندا ڕاوێژی پێ دەکرا [2]، لەم بەسەر هاتەشەوە گرنگی زانایانی خواویستت و پلەوپایەی بەرزیانمان بۆ دەردەکەوێت کە پێویستە لەسەر بڕیار بەدەست کە لە خۆی نزیکیان بکاتەوە و لە کاروبارەکاندا ڕاوێژیان پێ بکات، هەروەها پێویستە لەسەر زانایانیش کە لە دەوری کاربەدەست و خاوەن بڕیارە چاك و ساڵحەکان کۆببنەوە لە پێناو بە دەستهێنانی زۆرترین بەرژەوەندی و کەمکردنەوەی زیانەکان، هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) شورای تەنها لەو کەسانەدا کورت نەکردبوویەوە، بەڵکو پرسی بەزانایانی تری مەدینەش دەکرد وەك سەعیدی کوڕی موسەییەب و زوهری و خەڵکانی تر، و هیچ بڕیار و حوکمێکی دەرنەردەکرد هەتا وەکو پرسیاری لەسەعید نەکردایە، بەم شێوەیە عومەر ڕێز و حورمەتی زانایانی لە مەدینەدا دەگرت، ئەوە بوو جارێکیان کەسێکی نارد بۆلا سەعیدی کوڕی موسەییەب هەتاوەکو پرسیاری دەربارەی موسەلەیەك لێ بکات، سەعیدیش نەریتی وابوو کە هەرگیز نەدەهات بۆلای ئەمیر یان خەلیفە بۆیە پیاوەکە هەڵەی کردو وتی: ئەمیری مەدینە بانگت ئەکات، سەعیدیش نەعلەکانی لە پێ کرد و چوو بۆلای کاتێ عومەر بینی پێی وت: سوێندت دەدەم کە بگەڕێیتەوە بۆ شوێنی خۆت هەتاوەکو لەوێ نوێنەرەکەمان پرسیارت لێ بکات، چونکە ئێمە بۆ بانگکردنی تۆمان نەناردووە، بەڵکو بۆ پرسیارێکمان ناردووە و ئەو هەڵەی کردووە [3].

---

[1] - نظام الحكم في الشريعة و التريخ الاسلامي(١ / ٥٦١، ٥٦٢).

[2] - نظام الحكم في الاسلامي بين النظرية و التطبيق، ل:(٣٩١).

[3] - سيرة عمر بن عبدالعزيز و مناقبه، ل: ٢٣، لابن عبدالحكم.

هەروەها لەسەردەمی دەسەڵاتیدا لە مەدینەدا مزگەوتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بەفەرمانی وەلیدی کوڕی عبدالملك فراوان کرد و لەسەد باڵەوە کردی بە دوو سەد باڵ و هەر بە فەرمانی وەلیدیش جوانکاری تیادا کرد لەگەڵ ئەوەدا کە خۆی حەزی بەڕازاندنەوەی مزگەوت نەدەکرد [1].

هەروەها لەم هەڵوێستەی عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەندێ جار والی ناچار بەوەلاّمدانەوەی بڕیارەکانی سەرەوەی خۆی دەبێت ئەگەر چی بڕواشی پێ ی نەبێت ئەگەر بینی کە بەرژەوەندی لە چەند ڕوویەکەوە تیادایە.

لە ماوەی کارەبەدەستی عومەری کوڕی عبدالعزیز یشدا لە مەدینە و لە ساڵی ٩١ کۆچی دا خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملك هات بۆ حەج و ئەویش بە جوانترین شێوە پێشوازی لێ کرد، وەلیدیش بە چاوی خۆی ئەو چاکسازییە مەزنانەی بینی کە عومەر لە مەدینەدا ئەنجامی دابوو [2].

٣- **ڕووداوێکی دڵتەزێن لەسەردەمی عومەردا:** زانایان لە کتێبی ژیاننامەکاندا " السیر " دەڵێن: خوبەیبی کوڕی عبداللە کوڕێ زوبەیر لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) گێڕ بوویەوە کە فەرموویەتی:(ئەگەر کوڕانی ئەبی العاص [3] بوون بەسی پیاو ئەوە بەندەکانی خوا دەکەن بەکۆیلە و دەست دەخەنە سامان و ماڵی خواوە [4]) ئەمەش فەرموودەیەکی لاوازە، وەلیدی کوڕی عبدالملکیش هەواڵی نارد بۆ مەدینە و فەرمانی بە عومەری کوڕی عبدالعزیز کرد کە سەد قامچی لێبدات و عومەریش سەد قامچیەکەی لێدا و پاشان ئاوی لە کونەیەکدا بۆ سارد کردەوە و پیایدا کرد لە بەرەبەیانێکی سارددا ئەویش تووشی نەخۆشی گەزاز - ڕەقبوون و کرژبوونەوەی ماسولکەکان - بوو بەهۆیەوە گیانی لە دەست دا، عومەریش لە کاتی توندبوونی نەخۆشیەکەیدا ئازادی کرد و پەشیمان بوویەوە لەوکارەی و زۆر دڵتەنگ بوو بۆ مردنی خوبەیب، مصعبی کوڕی عبداللە مصعبی کوڕی عوسمانەوە کە ئەوان خوبەیبیان

---

[1] - تفسیر القرطبي(١٢ / ٢٦٧)، موسوعة فقه عمر بن عبدالعزیز، ل: ٢٠.

[2] - موسوعة فقه عمر بن عبالعزیز، ل: ٢٠.

[3] - أبي العاص: واتە کوڕانی عاص ی بەنی ئومەییە باپیری سێیەمی وەلیدێ عومەری کوڕی عبدالعزیز.

[4] - ئەم فەرموودەیە بەیهەقی لە دلائل النبوەدا گێڕاویەتیەوە(٦ / ٥٠٧)، لە ابی سعید و ابی هریرەوە، ابن کثیر دوای هێنانی چەند ڕێگەیەك کە ئەم فەرموودەیەی لێوەهاتووە: ئەم ڕێگانە هەموویان لاوازن، سەیری البدایة و النهایة لە ألآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزیز في العقیدة(١ / ٩٨).

گواستەوە بۆ ماڵی عمری کوڕی مصعبی کوڕی زبیر لە بەقیعی زبیر و لای مانەوە هەتاوەکو گیانی لە دەست دا، ئەوە بوو لە کاتێکدا کە دانیشتبوون ماجشون هات بۆلایان و داوای مۆڵەتی کرد و خوبەییش خۆی پێچابوویەوە بە جلەکانی، ماجشویش لەگەڵ عومەری کوڕی عبدالعزیز دا بوو لەکاتی والی بوونی دا لە مەدینە، عبدالله ی کوڕی عەروەش وتی: مۆڵەتی بدەن، کاتێ هاتە ژوورەوە وتی: ئەڵێ ی هاوڕێکەتان گومانی لە مردنی هەیە، پیشانی بدەن، ئەوانیش پیشانیان دا، کاتێ کە ماجشون بینی بە جێ ی هێشت، ماحبشن ئەڵێ: چووم بۆ ماڵی مەروان و تەقەم دا لە دەرگا و چوومە ژوورەوە و بینینم عومەر وەك ئافرەتی ژانگرتوو هەڵدەسا و دادەنیشت و پێی وتم: چی بوو؟ وتم: کابرا مرد، عومەریش لە عەزرەتاکەوت، پاشان سەری بەرز کردەوە و ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ﴾ البقرة: ١٥٦)ی کرد و کاریگەری ئەم ڕووداوەی پێوە دیار بوو هەتاوەکو کۆچی دوایی کرد، ئەوە بوو دەستی لە کار کێشایەوە و وازی لە پۆستی والی هێنا و هەر کاتێك بوترایە مژدە بێت لێت ئەو کارەت کردوە ئەیوت: ئەی چی بکەم لە خبیب [1].

هەمیشەش ئەم ڕووداوەی لە یاد بوو و بیری لێ دەکردەوە هەتاوەکو گیانی سپارد [2]، هەروەها لەو بەڵگانەی کە چاکی عومەری کوڕی عبدالعزیز دەسەلمێنێت جگە لەوەی کە باسمان کرد: ئەوەی کە ئەبو عومەری خزمەتگوزاری ئەسمائی کچی ئەبو بەکر ئەیگێڕێتەوە و ئەڵێ: هاتم بۆ مەجلیسی عومەری کوڕی عبدالعزیز دوای نوێژی بەیانی قورئانێکی لە باوەشدا بوو و فرمێسك بە ڕیشیدا دەهاتە خوارەوە [3].

هەروەها کوڕی أبی الزناد لە باوکیەوە ئەگێڕێتەوە کە وتویەتی: عومەری کوڕی عبدالعزیز لە کاتی ئەمیریدا لە مەدینە ئەگەر بیویستایە شتێك ببەخشێت ئەیوت: ماڵێکی هەژارم بۆ بدۆزنەوە [4].

**٤- ئامۆژگاری موزاحمی خزمەتگوزاری عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ عومەر:** عومەر(رضي الله عنه) کابرایەکی لە مەدینەدا زیندانی کردوو ئەو ماوەیەی تێپەڕاند لە زیندانندا کە شیاوی بوو،

---

[1] – سیرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٤٣، ٤٤.

[2] – هەمان سەرچاوە، ل: ٤٢.

[3] – هەمان سەرچاوە، ل: ٤٢.

[4] – هەمان سەرچاوە، ل: ٤٢، الآثار الواردة(١ / ٦٦).

موزاحمیش بۆ ئازاد کردنی قسەی لەگەڵدا کرد و عومەریش وتی: ئازادی ناکەم هەتاوەکو تەمێ نەبێ و لە جاران زیاتر خەمی خۆی نەخوات، موزاحمیش تووڕە بوو وتی: ئەی عومەری کوڕی عبدالعزیز من ئاگادارت ئەکەمەوە لە شەوێك کە قیامەتی تیادا هەڵدەستێ و بەیانیەکەی ڕۆژی دواییە: خەریکە ناوتم لە بیر دەچێتەوە وتی: ئەمیرم، وتی: ئەی ئەمیر، عومەر ئەڵێ: یەکەم کەسێك کە بەئاگای هێنامەوە لەم بارەوە موزاحم بوو و پەردەی لەسەر دەم و چاوم لادا [1]، ئەم چیرۆکەش گرنگی هاوڕێ باش و دڵسۆزمان بیر دەخاتەوە کە لە کاتی غەفڵەتدا خوات بیردەخاتەوە.

٥- **نێوانی عومەری کوڕی عبدالعزیز و حەجاج لە خیلافەتی وەلیددا:** ابن الجوزی باس لەوە دەکات کە عمر وازی لە پۆستی والی مەدینە هێنا، بەڵام خەڵکانی تر باس لەوە دەکەن کەلەسەر کار لابراوە، ئەوە بوو لە ساڵی ٩٢ کۆچی دا خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدالملك لیوای حەجی سپارد بە حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی هەتاوەکو ببێت بە ئەمیری حەج، کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز بەمەی زانی، نامەیەکی نووسی بۆ خەلیفە و داوای لێکرد کە لەسەر کار لایبەرێت ئەگەر حەجاج ئەنێرێت بۆ مەدینە، چونکە زۆر ڕقی لە حەجاج بوو و نەیئەتوانی ببینێت لەبەر ئەوستەمکاریەی کە پێی ناسرا بوو، وەلیدیش وەڵامی داواکەی دایەوە و نامەیەکی نووسی بۆ حەجاج: کە عومەری کوڕی عبدالعزیز داوای لەسەر کار لابردنی کردووە ئەگەر تۆ بچیت بۆ مەدینە تۆش پێویستت بەوە نیە کە بچیت بۆ لای کەسێك کە خۆشی ناوێت، مەڕۆ بۆ مەدینە [2].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی و وەلیدی کوڕی عبدالملك و ئاگاداری کردەوە لەو بارودۆخە خراپ و پرستەمەی کە عێراقی پێگەشتووە بە هۆی ستەمی حەجاجەوە، ئەمەش وایکرد لە حەجاج کە هەوڵی تۆڵەسەندنەوە لە عومەر بدات بەتایبەت کە حیجاز بوو بوویە پەناگەیەك بۆ هەڵاتوان لەزوڵم و زۆری حەججاج، ئەوە بوو حەججاجیش نامەیەکی نوسی بۆ وەلید و تیایدا هاتبوو: هەڵگەڕاوە و یاخیبوانی خەڵکی عێراق هەڵاتون و ڕوویان کردۆتە مەککە و مەدینە و ئەمەش لاوازیە، پاشان داوای لێکرد کە عوسمان ی کوڕی حبان یان خالیدی کوڕی عبداللە ی

[1] – سيرة عمر بن عبدالعزيز و مناقبه، ل: ٢٧ لابن الحكم.
[2] – تأريخ الطبري(٧ / ٣٨٣).

قەسری بکات بەوالی و عومەری کوڕی عبدالعزیز لەسەر کـار لابـات [١]، پـشتیوانی وەلیـدیش بـۆ سیاسەتی حەججاج ئاشکرا بوو و پێی وابوو کە سیاسەتی زەبر و زەنگ تا کە ڕێگەیە بۆ چەسـپاندنی پایەکانی دەوڵەت، هـەر ئەمـەش وایکـرد کـە گـوێ بـۆ ئامۆژگـاری و ڕاکـانی عومـەر نـەگرێت، ڕووداوەکانیش دواتر سەلماندیان کە بۆچوونی عومەر باشتر و ڕاسـتر بـوو لـەوەی وەلیـد، ئەمـەش دوای ئەوەی کە عومەر بوو بە خەلیفە و بۆچوونی خۆی جێبەجێ کرد.

٦- **گەڕانەوەی عومەر کـوڕی عبـدالعَزیز بـۆ دیمەشـق:** عومـەر بـە گریانـەوە لەگـەڵ مـوزاحمی خزمەتگوزاریدا شاری مەدینەیان بە جێ هێشت و ئاوڕی دایەوە بۆ مـوزاحم و وتـی: ئەترسـم لەوانەبین کە مەدینە دووریان دەخاتەوە [٢]، مەبەستی فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بـوو کە دەفەرموێت:(ئاگادار بـن مەدینـە وەك کـورە وایـە خـراپ فـرێ دەداتـەدەرەوە، قیامـەت هەڵناسێ هەتاوەکو مەدینە کەسانی خراپ دوور نەخاتـەوە وەك چـۆن کـورە ئاسـنی خـراپ دوور دەخاتەوە)[٣].

موزاحمیش ئەڵێ: کاتێ کـە عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز لـە مەدینـە دەرچـوو مـانگ بـەدوای ئەستێرەی ثریاوە بوو – دیارە ڕەشبین بووە بەمە – ئەڵێ: حـەزم نـەکرد ئەمـەی پـێ بڵـێم، وتم: بـۆ سەیری مانگ ناکەیت چەند ڕێك بووە ئەم شەوا! عومەریش سەیری کرد بە شوێن ثریاوەیـە و وتـی: ئەتویست بزانم کە مانگ لەو حاڵە تەدایە، ئەی موزاحم، ئێمـە بـەهۆی مـانگ و خـۆرەوە لـە مـاڵ دەرناچین، بەڵکو بە هۆی خوای تاك و تەنهاوە [٤]، پاشان عومەر ڕۆشت تاگەشتە سـوەیداء، و تیایـدا ماڵ و کێڵگەیەکی هەبوو لەوێ لایدا و ماوەیەك و چاتودێری بارودۆخەکەی دەکرد، پاشـان گەشـتە ئەو بڕوایەی کە بەرژەوەنـدی موسـڵمانان لەوەدایـە کـە بـچێتە دیمەشـق و لـە تەنیـشت خەلیفـەدا نیشتەجێ ببێت، بەڵکو لەوێ بتوانێ ڕێ لە ستەمێك بگرێت یاخود بتوانێ حەقێك بچەسپێنێت، ئەوە بوو چووە دیمەشق و تیایدا نەیشتەجێ بوو [٥]، لەوکاتەشـدا عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز نێـوانی زۆر

---

[١] – أثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٦٥.

[٢] – سيرة عمر بن عبدالعزيز و مناقبة، لابن عهبدالحكم، ل: ٢٧.

[٣] – مسلم، كتاب: الحج، باب: المدينة تفقي شرارها.

[٤] – سيرة عمر بن عبالعزيز لابن عبالحكم، ل: ٢٧.

[٥] – البداية والنهاية(١٢ / ٦٨٣).

خۆش نەبوو لەگەڵ خەلیفە وەلیدی کوڕی عبدوللك دا بۆیەنیشتەجێ بوونی لە تەنیشت خەلیفـە وە بێ کێشە بۆنە چووەسەر، چونکە وەلید لە حوکمڕانی دا پشتی بەکار بەدەستی توندوتیژ و دڵ ڕەق دەبەست بۆ چەسپاندنی دەسەلاتی خۆی ئەگەر چی ستەمیشی لێ بکەوێتەوە، لە کاتێکدا کە عومەر(ﷺ) پێی وا بوو کە دادگەری لە نێوان خەڵکدا دەسەلات دەچەسپێنێت و گوێڕایەڵی خەڵك مسۆگەر دەکات و هەربۆیە ئەیوت: وەلید لە شام و حەججاج لە عێراق و محمدی کوڕی یوسف - برای حەججاج - لە یەمەن و عوسمانی کوڕی حیان لە حیجاز و قرّە ی کوڕی شریك لە میسر... زەویان پڕ کردوە لەستەم[١].

٧- **عومەر ئامۆژگاری وەلید دەکات بەکەمکردنەوەی دەسەلاتی کار بەدەستانی لە بواری کوشتن دا:** عومەری کوڕێ عبدالعزیز هەندێ هۆکاری گرتبەر بۆ چاکسازی کردنی لەم بارو دۆخەدا، لەوانەش ئامۆژگاری کردنی وەلید بۆ کەمکردنەوەی دەسەلاتی کاربەدەستانی لەمەسەلەی کوشتن دا، لەسەرەتاشدا سەرکەوتوو بوو لە دەرکردنی بڕیارێك کە ڕێگر بوو لە کوشتنی خەڵکی لەلایەن والیەکانەوە بە بێ مۆڵەتی خەلیفە، ئبن عەبد لحەکەم ئەگێڕێتەوە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز چووە لای وەلیدی کوڕی عبدالملك و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئامۆژگاریەکم هەیە، جا هەر کاتێك ئامادە بوویت بۆ وەرگرتنی پرسیارم لێ بکە بابیلێم، خەلیفەش وتی: ئێستا بۆنایلێیت؟

وتی: تۆ باشتر ئەزانی، ئەگەر ئامادەبیت بۆ وەرگرتنی باشترە، پاش چەند ڕۆژێك وەلید وتی: خزمەتکار کێ لەبەردەرگایە؟ وتیان کەسانێکن و عومەری کوڕی عبدالعزیزیشیان تیایە وتی: بابێتە ژوورەوە، ئەویش هاتە ژوورەوە و خەلیفەش وتی: ئامۆژگاریەکەت بڵێ ئەی باوکی حفص عومەریش وتی: ئەزانیت کە لە دوای هاوەڵ بڕیاردان بۆ خوا هیچ شتێك هێندەی خوێن ڕشتن گوناە نیە و کار بەدەستەکانیش خەڵك دەکوژن و دەنووسن کەسی کوژراو و ئەمە و ئەوە بووە، و تۆش لەبەرامبەر خوادا بەرپرس و لێپرسراویت، جانامەیان بۆ بنێرە باکەس نەکوژن هەتاوەکو تاوانەکەی بنوسن و پاشان شایەتی لەسەر بگرن، پاشان خۆت فەرمان بدەیت پاش ڕوونبوونەوەی مەسەلە کەبۆت، خەلیفەش وتی: خوای گەورە بەرەکەت بخاتە تەمەنتەوە ئەی باوکی حفص و خوا لە ئێمەت نەسێنێت.

---

[١] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ١٤٦، اثر العلماء في الحياة السيلية، ل: ١٦٢.

کاغەزێکم بۆ بێنن، پاشان نامەی نووسی بۆ ئەمیری هەرێم و شارەکان و کەس ئەمەی بەلاوە قورس نەبوو جگە لە حەجحاج کە پێی دڵگران بوو و وایدەزانی تەنها بۆ ئەو نێردراوە، بۆیە بەدوای ئەم مەسەلەیەدا چوو و پرسی: کێ ئەمەی پێشنیار کرد بۆ ئەمیری باوەڕداران؟ وتیان عومەری کوڕی عبدالعزیز، وتی: ئەگەر عومەر بێت ئەوە فەرمانی هەڵناوەشێنێرتەوە، پاشان حەجاج ناردی بەدوای عەرەبێکی دەشتەکی لە حەواریج کە لە هۆزی بەکری کوڕی و ائل بوو و پێی وت: چی دەڵێ ی دەربارەی موعاویە؟

ئەویش قسەی پێ وت، وتی: ئەی دەربارەی یەزید؟ کابرا قسەی بەویش وت، وتی: ئەی دربارەی عبدالمليك، ئەویشی بەستمکار وەسفکرد، وتی: ئەی وەلید؟ وتی: ئەو لەهەموویان ستەمکارترە، چونکە تۆی کرد بەوالی و ئەشزانیٚ چەندە ستەمکاریت.

حەجحاجیش بێدەنگ بوو و ئەم هەڵەی قۆستەوە و ناردی بۆلای وەلید و نامەیەکی بۆ نووسی: من ئاینی خۆم دەپارێزم و ئاگام لەو خەڵکەیە کە لە ژێر دەستمدایە و هەرگیز کەسێك ناکوژم کەشیاوی ئەوە نەبێت، ئەوەتا کەسێکم بۆ ناردوی کەشیاوی کوشتنە، بەلام نەمکوشتووە خۆت بڕیاری لەبارەوە بدە، کابرای خەوارجیش هاتە ژوورەوە بۆلای وەلید و ئەویش پیاو ماقولانی شامی لابوو لەگەڵ عومەری کوڕی عبدالعزیز دا، وەلید وتی: ڕات چیە بەرامبەر بە من؟ وتی: ستەمکار و خۆپەرستی وتی: ئەی بەرامبەر عبدالمليك چی دەڵێیت وتی: ستەکار و سەرکەش بووە، وتی: ئەی دەربارەی موعاویە وتی: ستەمکار بووە، وەلیدیش وتی بە ئیبن ڕەییان: بدە لە ملی، ئەویش لێی دا و کوشتی، پاشان هەستاو چووە ماڵەوە و وتی: بڕۆن عومەرم بۆ بانگ بکەن، ئەوانیش بانگیان کرد و وتی: ئەی باوکی حفص ڕات چیە کارەکەمان ڕاست بوو یان هەڵە؟

عومەریش وتی: حەقی کوشتنی نەبوو، باشتر وابوو زیندانی بکرێت هەتاوەکو پەشیمان دەبوویەوە باخود لە زیندان دادەمرد، وەلیدیش وتی: قسەی بە من و عبدالملك وت و خەواریجیشە ئەوە بەڕەوا دەزانی؟

وتی: سوێند بەخوا بەڕەوای نازانم باشتر وابوو زیندانی بکەی یان لێ ی خۆش بیت، وەلیدشی توورە بوو هەتا، ابن ڕیان یش بە عومەری وت: خوا لێت خۆش بێ ئەی باوکی حەفص هێندە وەلامی ئەمیری باوەڕدارانت دایەوە هەتاوەکو ترسام و فەرمان بکات بە دان لەگەردنت [1]، بەم

---

[1] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ۱۱۹ – ۱۲۱ اثر العلماء في الحياة السياسية ١٦٤.

شێوەیە حەجحاج فێڵی کرد لەوە لید بۆ دوورخستنەوەی لە ڕای عومەر بۆ ڕێگرتن لە ڕۆچوونی حەجحاج لە کوشتنی خەڵکیدا [1].

٨- **ڕای عومەری کوڕی عبدالعزیز سەبارەت بە مامەڵە کردن لەگەڵ خەواریج دا:** سەرباری ئەو هەڵوێستەی کە باسمان کرد بەرامبەر بەوخەواریجەی کە حەجحاج ناردی، چەند ڕیوایەتێکی ترهاتووە کە هەمان هەڵوێست دوو پات دەکاتەوە، لە ئیبن شەهابەوە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆی گێڕاوەتەوە کە وەلید نیوەڕۆیەك ناردویتی بە دوایدا و کاتێ چووە دەبینێ ناوچاوی داوەبەیکدا و تەنها ئیبن ڕەییانی لابوو، ئەڵێ: منیش دانیشتم و وتی: چی دەڵێ ی دەربارەی ئەو کەسەی کە جنێو بە خەلیفەکان دەدا؟

ئایا کوشتنی بەڕەوا دەزانی؟ منیش بێدەنگ بووم، ئەڵێ، ڕای وەشاندم و وتی: چیتە؟ منیش بێدەنگ بووم و دووبارە ڕای وەشاندم، وتم: کوشتوتە ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ وتی: نەخێر، بەلاَم قسەی بە خەلیفەکان وتووە وتم: پێم وایە دەبێ تەمێ بکرێت، ئەویش سەری بەرز کردەوە بۆ ئیبن ڕەیان و وتی: ئەمە سەر گەردانە بەرامبەریان.

٩- **هەستانی بە ئامۆژگاری کردنی وەلید لە کاتێکدا کەویستی سولەیمان لابەرێت و بەیعەت بدرێت بە کوڕەکەی:** دوایەمینی ئەو هەڵوێستانەی کە لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە گێڕدراوەتەوە لە سەردەمی وەلیدی کوڕی عبدالملك دا ئەوە بوو کاتێك کە ویستی سولەیمان لابەرێت و بەیعەتی بە عبدالعزیزی کوڕی بدرێت لە پاش خۆی، عومەریش بە توندی بەرامبەری وەستا و ملی بەداواکەی وەلید نەدا کاتێ ویستی لەگەڵیدا بێت و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، بەیەکەوە بەیعەتمان پێ داون ئیتر چۆن ئەو لابەین و تۆ بهێڵینەوە؟ وەلیدیش لێی تورە بوو و ویستی توندو تیژی بەرامبەر بەکاربێنێت هەتاوەکو ملی پێ بدات بۆیە کردیە ماڵەوە و دەرگاکەی لەسەر هەڵچنی، هەتاوەکو ام البنین خوشکی و خێزانی وەلید دوای سێ ڕۆژ بۆی کردەوە و ئەمەش بە تەواوی لاوازی کردو و ملی لار بوو بوویەوە [2].

---

[1] - اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٦٤.

[2] - سير أعلام النبلاء(٥ / ١٤٨، ١٤٩) أثر العلماء، ل: ١٦٧.

**پێنجەم: عومەر لەسەردەمی سولەیمانی کوڕی عەبدولمەلیک دا:**

لەسەردەمی سولەیماندا هەلی باش بۆ عومەر ڕەخسا و کاریگەری و جێ دەستی لە هەموو بوارەکاندا دەرکەوت، ئەوە بوو هەرکە سولەیمان بوو بەخەلیفە عومەری کوڕی عبدالعزیزی لە خۆی نزیك کردەوە و بوارێکی فراوانی بۆ ڕەخساندو وتی: ئەی باوکی حفص ئێمە ئەم کارەمان پێ سپێردراوە و شارەزاییمان لە هەلسوڕاندنیدانیە، جا هەرشتێك بەبەرژەوەندی دەزانی بۆ خەلك فەرمانی پێ بکە.

هەروەها کردی بە وەرزیر و ڕاوێژکاری خۆی و لەسەفەر و لە کۆشك دا لەگەلێدا بوو [1]، و پێ ی وابوو کە لە هەموو کاروبارەکانیدا پێویستی پێیەتی و ئەیوت: هەر ئەم کابرایەم لانەما ئیتر کەس لێم تێ ناگات [2].

لە شوێنێکی تریشدا ئەلێ: ئەی باوکی حەفص خەمم بۆهەر شتێك خواردبێت و بوبێت بەکێشە بۆم تۆ هاتۆی بەخەیالمدا [3].

١- **هۆکارەکانی نزیك کردنەوەی عومەر لەلایەن سولەیمانەوە:** ئەوەی کە وایکرد سولەیمان بەم شێوەیە عومەر لە خۆی نزیك بکاتەوە چەند شتێك بوو بەڕای من لەوانە:

أ- کەسایەتی سولەیمانی کوڕی عبدالملیك، چونکە وەك وەلید لە خۆبایی و نکولیکار نەبوو و نەکەتبووە ژێر کاریگەری هەندێ لە کار بەدەستانی، بەلکو بە پێچەوانەوە سولەیمان شانازی بەڕای خۆیەوە نەدەکرد و کاریگەری کەسی لەسەر نەبوو.

ب- متمانەی سولەیمان بەڕاو سەرنجە دروستەکانی عومەر.

ج- هەلوێستی عومەر بەرامبەر بە هەولی وەلید بۆ لابردنی سولەیمان ئەمەش وایکرد لە سولەیمان کە سوپاسی عومەر بکات، الذهبي ئاماژەی بەمەداوە و پاش باسکردنی هەلوێستی عومەر و ئەلێ: بۆیە سولەیمان سوپاسی عومەری کرد و دوای خۆی بۆ بوون بەخەلیفە دەستنیشانی کرد [4].

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٦٨.

[2] - المعرفة و التريخ للفسوي(١ / ٥٩٨).

[3] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٢٨ لابن عبدالحكم، اثر العلماء، ل: ١٦٨.

[4] - سير أعلام النبلاء(٥ / ١٤٩).

د- ڕۆڵی عومەر لە دەرکردنی چەندین بڕیاری چاکسازانە لەلایەن سولەیمانەوە: عومەر کاریگەری باشی هەبوولە هاندانی سولەیمان بۆ دەرکردنی چەندین بڕیاری بەسود کە گرنگترینیان، لەسەر کار لابردنی والیەکان وەك حەجاج و چەندین والی تر وەك خالد ئەلقەسری ئەمیری مەککە و عوسمانی کوڕی حبانی [1] والی مەدینە، هەروەها فەرمانداني بە ئەنجامدانی نوێژ لەکاتی خۆیدا، ئیبن عەساکر لە سەعیدی کوڕی عبدالعزیزەوە هێناویەتی: کاتێ سولەیمان بوو بە خەلیفە لەسەر پێشنیاری عومەر نامەی نووسی بۆ هەموو ناوچەکان، کە نوێژ مرێنراوە و زیندووی بکەنەوە [2]، چەند مەسەلەیەکی تریش کە زەهەبی لەم وتەیەدا کورتی کردۆتەوە، لەگەڵ چەند کارێکی پیرۆزی تردا کە لە عومەرەوەبیستبووی [3].

٢- نارازیبوونی بەکارکردنی سولەیمانی کوڕی عبدالملك بەنامەکەی باوکی: عومەری کوڕی عبدالعزیز دەربارەی میراتی هەندێ لە کچانی عبدالعزیز لە کوڕانی عبدالعزیز لەگەڵ سولەیماندا قسەی کرد، سولەیمانیش پێی وت: کە عبدالمليك نامەیەکی نووسیوە و تیایدا بێ بەشی کردوون، عومەریش ماوەیەك لە سولەیمان دوورکەوتەوە پاشان هاتەوە بۆلای، سولەیمانیش وای زانی کە عومەر گومانی لە بوونی ئەو نامەیەی عبدالمليك هەیە و باوەڕ بە سولەیمان ناکات، بۆیە بە خزمەتکارەکەی وت: بڕۆنامەکەی عبدالمليك بێنە، عومەریش وتی: داوای قورئانت کرد ئەی ئەمیری باوەڕداران؟

ئەیوبی کوڕی سولەیمانیش وتی: کەسی واتان تیایە قسەی وا دەکات کە لەوانەیە لەسەری لەگەردنی بدرێت. عومەریش پێی وت: ئەگەر کار بکەوێتە دەستی تۆ ئەوە خراپتر لەوەی باسی دەکەیت ڕوودەدات، پاشان سولەیمان سەرزەنشتی ئەیوبی کرد، عومەریش وتی: ئەگەر نەزانێ بێت ئەوە لێبوردە نەبوین بەرامبەری [4].

ئەمە هەڵوێستێکە لە هەڵوێستە بوێرانەکانی عومەر کەتیایدا قسەی حەق دەکات و سولەیمان ئاگادار دەکاتەوە لەوەی کە نامەکەی باوکی قورئان نیە تا دەستکاری نەکرێت، چونکە تەنها قورئان

---

[1] – اثر العلماء على الحياة السياسية، ل: ١٦٩.

[2] – تأريخ دمشق له اثر العلماء على الحياة السياسية، ل: ١٧٠.

[3] – سير أعلام النبلاء(٥ / ١٢٥).

[4] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٣١.

ناگۆڕێـت و حـوكمی هەڵناوەشـێنرێتەوە، بـەم شـێوەیە ملـهوڕی والـە قوربانیـەكانی دەكـات كـە باوباپیرانی بە گەورە بزانێت و بڕیارەكانیشیان بباتە ئاستی شـەرع بـێ ئـەوەی گـوێ بـەڕای شـەرع بدات، هەروەها ئەمە هەڵوێستێكی باشە بۆ سولەیمان كە سەرزەنشتی كوڕەكەی دەكات لە كاتێكـدا كە هەڕەشە لە عومەر دەكات لەبەرامبەر وتنی حەقدا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر گەڕانەوەی دەستبەجێ ی سولەیمان بۆ حەق لەكاتی ڕونبوونەوەیدا [1].

٣- **ناڕەزایی دەربڕینی بەرامبەر بـەزیادەڕەوی سـولەیمان لـە بەخـشیندا:** سـولەیمانی كـوڕی عبـدالمليك هـات بـۆ مەدینـە و پارەیـەكی زۆری بەخـشیەوە، پاشـان بـە عومـەری كـوڕی عبدالعزیزی وت: ڕات چۆنە بەرامبەر بەو كارەمان؟ ئەویش وتی: پێم وایـە دەوڵەمەنـدەكانت دەوڵەمەندتر كرد و هەژارەكانت وەك خۆیان هێشتەوە [2]، ئەمەش هەڵسەنگاندنێكی باشی ئـەو كارەی سولەیمان بوو، چونكە سولەیمان لەبەر نەشـارەزایی لـە وردەكاریـەكانی بەخـشین لـە ئیسلامدا وایدەزانی كە بە بەخشینی ئـەو پـارە زۆرە بـەو شـێوەیە كـارێكی باشـی كـردووە، عومەریش تێی گەیاند كە بە هەڵەدا چووە، چونكە ئەو پارانەی بەخـەڵكێك ی نەشـیاو داوە و لە خـەڵكانی شـیاو و هـەژاری گرتۆتـەوە [3]، لێرەشـدا ئامـاژەی بـە گرنگـی جیاكردنـەوەی بەخشینی پارە لەگەڵ دانی بەخەڵكانی شیاو واتە ڕادەی بەخشین مـەرج نیـە، بـەڵكو گـرنگ ئەوەیە بەكێ بەخشراوە و چەندە شیاوە و جێ ی گرتووە.

٤- **هاندانی سولەیمانی بۆ نەهێشتنی ستەم:** سولەیمان هاوڕێ لەگەڵ عومـەردا چـووە دەرەوە بۆ ناوچەی گوندنشین و لە ڕێگادا تووشـی زریـان و هـەورە بروسـكە بـوون و سـولەیمان و هاوڕێكانی ترسان، عومەریش فەرمووی: ئەمە دەنگی نیعمەتێكی جا ئـەبێ دەنگـی سـزا چـۆن بێت؟

سولەیمانیش وتی: ئەم سەد هەزار دەرهەمە بەرەبیبەخشە، عومـەریش فـەرمووی: ئەتـەوێ خێـری لەمەباشتر بكەیت ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ وتـی: بـەڵێ مەبەسـتت چیـە؟ وتـی: خـەڵكانێ هـاتوون ستەمیان لەسەر لابەت، ئـەوە بـوو سـولەیمان لەگەڵیانـدا دانیـشت و سـتەمی لەسـەر هـەڵگرتن و

---

[1] – التريخ الاسلامی(١٥ / ٣٠، ٣١).

[2] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لان عبدالحكم، ل: ١٣١.

[3] – التاريخ الاسلامی(١٥ / ٢٩).

مافەکانی بۆ گەڕاندنەوە [1]، لێرەشدا تێگەشتنی عومەرمان بۆ ڕێز بەندکردنی شتە لە پێشەکان(اولویات) دەردەکەوێت، چونکە گێڕانەوەی مافەکان و هەڵگرتنی ستەم لە پێش خێر و بەخشینەوەیە.

٥- **دنیایەك دەبینم کە هەندێکی ئەوی تری دەخوات:** سولەیمانی کوڕی عبدالملك لە کاتێکدا کە ئەمیری باوەڕداران بوو، بە هاوڕێیەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز سەردانی سەربازگەی سولەیمانی کرد کە ئەسپ و حوشتر و هێستر و قورسایی و پیاوانێکی زۆری تیابوو، سولەیمان وتی: ئەی عومەر لە بارەی ئەمەوە چی دەڵێی؟

وتی: دنیایەك دەبینم کە هەندێکی ئەوی تری دەخوات و تۆش بەرپرسی لە هەموو ئەمانە، کاتێ نزیك بوونەوە لەسەربازگە کە قەلەڕەشێکیان بینی کە پارویەکی بە دەنوکی هەڵگرتبوو لە خەرمانی سولەیمان و ئەی قیژاند، سولەیمانیش بە عومەری وت: چی ئەڵێ ی دەربارەی ئەمە ئەی عومەر؟ وتی: نازانم وتی: تۆ ئەڵێی چی ئەڵێت؟ وتی: ئەڵێ: ئەمە لە کوێوە هاتووە و؟ بۆکوێ ئەبرێت، سولەیمانیش وتی: چەند سەیریت؟ عومەریش وتی: لە من سەیرتر ئەو کەسەیە کە خوای گەورە دەناسێ و سەرپێچی دەکات و شەیتانیش دەناسێ و گوێڕایەڵێشی دەکات [2].

٦- **ئەمانە ڕکابەری تۆن لە قیامەتدا:** کاتێ کە سولەیمان و عومەر لە عەرەفەدا وەستا بوون و سەلەیمان سەرسام بوو بە زۆری ئەو خەڵکەی کە لەوێ بوون، عومەریش پێی وت: ئەمانە ئەمڕۆ هاولاَتی و ژێر دەستەی تۆن و سبەینێش تۆ بەرپرسیاری لێیان، لە ڕیوایەتێکی تریشدا ئەمانەڕکابەروسکالاکەری تۆن لەڕۆژی قیامەتدا، سولەیمانیش گریاووتی: پەنادەگرم بەخوا [3].

٧- **زەیدی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی لەگەڵ سولەیماندا:** زەیدی کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی بەدەم داواکەی وەلیدی کوڕی عبدالملیکەوە هات لە مەسەلەی لابردنی سولەیماندا لە ترسی وەلید، بۆ ئەم مەبەستەش لە مەدینەوە لەڕێی نامەیەکەوە ڕەزامەندی خۆی نارد بۆ وەلید، کاتێ سولەیمان بوو بەخەلیفە نامەکەی دۆزیەوە و ناردی بۆلای والی مەدینە و داوای لێکرد کە پرسیار لە زەید بکات دەربارەی ئەو نامەیە، ئەگەر دانی پیادانا با خەلیفەی لێ ئاگادار

---

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٣٣، أثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٧٠.

[2] - البداية و النهاية(١٢ / ٦٨٥).

[3] - هەمان سەرچاوە(١٢ / ٦٨٥).

بکاتەوە، ئەگەر نکۆڵیشی کرد ئەوە لەبەردەم مینبەری پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوێندی بدات کاتێ دانپیادانانەکەی نارد بۆ سولەیمان، فەرمانی دا بە والی مەدینە کە سەد قامچی لێ بدات و بە پێی پەتی بیگەڕێنێت، بەڵام عومەر(ﷺ) نێردرا وەکەی ڕاگرت وتی: نەڕۆیت هەتاوەکو قسە لەگەڵ ئەمیری باوەڕداران دا ئەکەم دەربارەی ئەوەی کە نوسیویەتی، بەڵکو نەرمی بکەم و واز لەوەبێنێت، پاشان نێردراوە کە دانیشت و سولەیمانیش نەخۆش کەوت، دیسانەوە پێی وت: مەڕۆ ئەمیری باوەڕداران نەخۆشە، کاتێ کە سولەیمان کۆچی دوایی کرد و عومەر و بوو بە خەلیفە نامەکەی داواکرد و دڕاندی [1]، بەم شێوەیە عومەری کوڕی عبدالعزیز بە درێژایی ماوەی خەلافەتی لە نزیك سولەیمانەوە بوو و بە ئامۆژگاری و ڕاکانی پشتگیری دەکرد و لە ئەرکەکانی دا هاوکاری دەکرد [2].

هەروەها یوسف العش پێی وایە کە سیاسەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز و بنەماکانی لە سەرەتای خیلافەتی سولەیمانەوە دەستی پێ کرد، بەڵێ سولەیمان جار جار سنوری تێدەپەڕاند لە سیاسەتیدا و چەند ڕێوشوێنێکی ئەگرتەبەر کە بە دڵی عومەر نەبوو، بەڵام سیاسەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز بە هێز و نەگۆڕ بوو [3]، لە دیمەشق یشدا بەهەمان شێوەی مەدینە بوو، بەڵام لە دیمەشق دا دەسەلاتی زیاتر بوو.

کاری گرنگ و سەرەکیش بەلایەوە بریتی بوو لە نەهێشتنی ستەم و ناحەقی، هەروەها تێبینی ئەوە دەکەین کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بە پێ ی بنەمای فرماندان بە چاکەو قەدەغە کردنی خراپە مامەڵەی لەگەڵ سوننەتی تەدەڕوج و پلە بەندی داکردووە، کاتێ گەشتە دەسەلات و بووبە خەلیفە زیاتر سوور بوو لە سەر چەسپاندنی دادگەری و ڕووبەڕووبەنەوەی ستەم، چونکە دەسەلاتی زیاتری لەبەردەست دا بوو، دیارە ئەو ئامۆژگاری عبدالملك ی مامی دەکرد وێڕای ستەمکاری و زۆرداری و ڕۆژی دوایی یاد دەخستەوە و لەسەردەمی وەلیدی ئامۆزاشی دا بێدەنگ نەبوو توانی چەند هەنگاوێك بنێت بۆ پێشەوە و بە پێی تواناش لە سەردەمی سولەیمانیشدا سەرکەوتنی بەدەست هێناو لەسەردەمی خۆشیدا هەلی باشی بۆ ڕەخسا، بۆیە ئێمە نامانەوێ بڵێین ئەوەی لەسەر ئاستی تاکە

---

[1] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكيم، ل: ١٠٤.

[2] – أثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٧٣.

[3] – الدولة الاموية، يوسف العش، ل: ٢٥٤.

کەسی لە عومەر ڕوویدا کودەتا یەك بوو لە کەسایەتی دا، بەڵکو کودەتا کە لە بەرگەڕخستنی دەوڵەتدا بوو خزمەتکردنی شەریعەت لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ئەگەر چی لەسەر حسابی بنەماڵەی دەسەڵاتداریش بو بێت، کە دەسەڵات و ئیمتیازاتی خۆی هەبوو کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بە مافی خەڵك و ئوممەتی دەزانی کە دەبێت بگەڕێتەوە بۆ بەیتولمال یان بۆ خاوەنە ئەسڵیەکانی.

## شەشەم: خیلافەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز:

یەکێك لە چاکەکانی سولەیمانی کوڕی عبدالملك بریتی بوو لە گوێگرتنی بۆ ئامۆژگاری ڕەجائی کوڕی حیوەی کندی لە کاتێکدا کە لە سەرەمەرگیدا پێشنیاری بۆ کرد کە عومەری کوڕی عبدالعزیز لە دوای خۆی دەستنیشان بکات بۆ خەلیفایەتی. هەر بۆیە وەسیەتەکەی پشکی شەیتانی تیادا نەبوو [1].

ئیبن سیرین ئەڵێ: ڕەحمەتی خوا لە سولەیمان لە سەرەتای خیلافەتی دا نوێژی زیندوو کردەوە وبە دانانی عومەری کوڕی عبدالعزیزیش کۆتایی پێ هێنا، کۆچی دواییشی لەساڵی ۹۹ کۆچی دا بوو و عومەری کوڕی عبدالعزیز نوێژی لەسەر کرد و لە ئەنگوستیلەکەشی نووسرا بوو(أؤمن بالله مخلصاً) [2]، چەندین ڕیوایەتیش هاتووە لەمەسەلەی دەستنیشانکردنی عومەر لەلایەن سولەیمانەوە و هەندێکیم لە باسکردنم دا سەبارەت بە سەردەمی سولەیمان هێناوە، یەکێك لەو ڕیوایەتانەش ئەوەیە کە ئیبن سەعد لە طبقاتەکەیدا هێناویەتی، کاتێ ڕۆژی هەینی هات سولەیمانی کوڕی عبدالملك پۆشاکی حەریری سەوزی لەبەرکرد و سەیری ئاوێنەی کرد و وتی: سوێند بەخوا پاشای لاومنم، پاشان چووەدەرەوە بۆ ئەنجامدانی نوێژی هەینی بۆ خەڵك و پێش گەڕانەوەی ئازار لێی دا، کاتێ کە زۆری بۆ هێنا نامەیەکی نووسی و ئەیوبی کوڕی دەستنیشان کرد بە جێنشینی خۆی کە منداڵێك بوو هێشتا باڵغ نەبوو بوو منیش وتم: چی ئەکەی ئەی ئەمیری باوەڕداران، یەکێك لەوشتانەی کە خەلیفە ئەپارێزێ لە گۆڕەکەیدا دانانی پیاو چاکێکە بەجێنشین، سولەیمانیش وتی: نامەیەك نوێژی ئیستیخارەی بۆ ئەکەم و دوایی بڕیار ئەدەم پاشان یەك دوو ڕۆژ لێی وەستا.

پاشان نامەکەی دڕاند و بانگی کردم، وتی: داو:ی کوڕی سولەیمانت پێ چۆنە؟ وتم: ئەو ئامادە نیە و لە قوستەنتینیەیە و تۆش نازانی زیندووە یان مردوو، وتی: ئەی ڕەجا ئەی کێت پێ باشە؟ وتم:

---

[1] – عصر الدولتين الموية و العباسية، ل: ٣٧ للصلّابي.

[2] – سير أعلام النبلاء(٥ / ١١١، ١١٢).

ڕای من لەگەڵ ڕای تۆدایە ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەمویست بزانم کێ ئەڵێ، وتی: عومەری کوڕی عبدالعزیزت پێ چۆنە؟ وتم: سوێند بەخوا ئەوەندەی من بزانم پیاو چاك و موسڵمانە.

وتی: ئەوە ئەو دیاری ئەکەم، بەڵام بەخوا ئەگەر ئەو دیاری بکەم و هیچ کام لە کوڕانی عبدالملك دیاری نەکەم ئەوە ئاژاوەیەك ڕوودەدات و هەرگیز وازی لێ ناهێنن مەگەر دوای ئەو یەکێکیان دەست نیشان بکەم – لەوکاتەشدا یەزیدی کوڕی عبدالملك لەوێ نوو – وتی: دوای ئەو یەزیدی کوڕی عبدالملك دیاری ئەکەم ئەمە بێدەنگیان ئەکات و لێی ڕازی ئەبن.

وتم: خۆت دەزانی، ئەڵێ پاشان بە دەستی خۆی نووسی: ﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾، ئەمە نووسراوی بەندەی خوا سولەیمانی کوڕی عبدالملکی ئەمیری باوەڕدارانە بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز کە من خیلافەتی پێ دەسپێرم دوای خۆم و دوای ئەویش بۆ یەزیدی کوڕی عبدالملکە، جا گوێڕایەڵی بن و لە خوا بترسن و ناکۆك مەبن هەتاوەکو چاوتان تێ نەبرن و تەماعتان تێنەکەن.

پاشان نامەکەی مۆر کردو ناردی بە دوای کەعبی کوڕی حامدی بەرپرسی پۆلیس دا کە فەرمان بدە بەبنەماڵەکەم باکۆببنەوە، پاشان کەعب چوو کۆی کردنەوە و دوای کۆبوونەوەیان بەڕەجائی کوڕی حیوەی وت: برۆ ئەم نووسراوەی منیان بۆ بەرە و ئاگاداریان بکەرەوە کە ئەمە نوسراوی منە و بابەیعەت بدەن بەوکەسەی کە دیاریم کردووە، ئەڵێ: ڕەجائیش ئەو کارەی کرد و کاتێ پێی وتن وتیان: گوێڕایەڵین بۆ ئەو کەسەی کە دیاری کردووە، پاشان وتی: ئەڕۆین و سڵاو ئەکەین لە ئەمیری باوەڕداران، وتی: برۆن، پاشان چوونە لای سولەیمان و ئەویش پیێ ی وتن: ئەو نامەیە – ئاماژەی بۆ دەستی ڕەجاءکرد و ئەوانیش سەیریان دەکرد – ڕاسپاردەی منە و ئێوەش گوێڕایەڵ بن و بەیعەتیان دا بە پیاوێك.

ئەڵێ: پاشان نامەکەی بە مۆرکراوی لە ڕەجاءسەندەوە، ڕەجاء ئەڵێ: کاتێ بڵاوەیان لێکرد عومەری کوڕی عبدالعزیز هات بۆ لام و وتی: ئەی باوکی میقدام، لە نێوان من و سولەیماندا ڕێز و خۆشەویستی دۆستایەتیەك هەبوو و لە گەڵمدا چاك و میهرەبان بوو، بۆیە دەترسم بەهۆی ئەوەوە ئەو کارەی پێ سپاردبم، جا سوێندت دەدەم بە خوا ئەگەر شتێکی وایکردوە و تۆ دەیزانی ئاگادارم بکەرەوە با داوای بەخشین لەوکارەی لێ بکەم هەتا وەکو بوار ماوە و نەگەشتۆتە کاتێك کە نەتوانم، ڕەجائیش وتی: سوێند بەخوا یەك حەرفت پێنالێم، پاشان عومەر بەتوڕەییەوە ڕۆشت، ڕەجاء ئەڵێ: پاشان هیشامی کوڕی عبدالملکم پێ گەشت و وتی: ئەی ڕەجاء من و تۆ خۆشەویستی و

دۆستایەتیمان لە نێوان دا هەیە جا ئەگەر منی دەستنیشان کردوە پێم بڵێ بابزانم و ئەگەر منیش نیم با قسە بکەم، چونکە من هیچم لەو پۆستە کەمتر نیە و کاری وانا بێ لە هاوشێوەی من دوور بێ، جا بەڵکو پێم بڵێی سوێند بێ هەرگیز ناوت ناهێنم.

ڕەجائیش ئەڵێ: منیش ڕازی نەبووم و وتم ناسوێند بەخوا یەك حەرفت پێ نالێم لەوەی کە پێی وتوم - پاشان هشام ڕۆشت... و دەستی دەکێشابەیەکدا و ئەویت: ئەی بۆ کێ ئەبێ ئەگەر بۆ من نەبێت؟ ئاخۆ لە کوڕانی عبدالملك تێپەر دەبێت؟ سوێند بەخوا من چاوی کوڕانی عبدالملکم.

ڕەجاءئەڵێ: چوومەوە بۆلای سولەیمانی کوڕی عبدالملك و بینیم لەسەرەمەرگدایە ئەڵێ منیش هەرکاتێ کە تاوێکی مەرگ بیگرتایە ڕووم دەکردە قیبلە و ئەیوش بەهەناسە سواریەوە ئەیوت کاتی ئەوە نەهاتوە ڕەجاء، ئەڵێ تا دوو جار وای وت کاتێ سێیەم هات وتی: ئێستا ئەی ڕجاء ئەگەر شتێکت ئەوێت، پاشان شایەتمانی هێنا، ئەڵێ: منیش ڕووم وەرچەرخاند و گیانی سپارد، کاتێ چاویم داخست بە قوماشێکی سەوز داپۆشی و دەرگاکانم داخست و خێزانەکەشی کەسێکی نارد تا بزانێت چۆنە، وتم: خەوت و خۆی داپۆشی، ئەڵێ کابراش سەیری کرد و بینی داپۆشراوە و ڕۆشتەوە و خێزانی ئاگادار کردەوە ئەویش باوەڕی کرد و وایزانی خەوتووە، ڕەجائیش ئەڵێ: کەسێکم لە بەردەرگادا دانا کە متمانەم پێی هەبوو و داوام لێکرد کەڕێ نەدات کەس بچێتە لای خەلیفە و بزانێت، پاشان ڕۆشتم و ناردم بەدوای کە عبی کوڕی حامد ی عەنسی دا ئەویش بنەماڵەی ئەمیری باوەڕدارانی کۆ کردەوە لە مزگەوتی دابق دا و وتم: بەیعەت بدەن، وتیان: جارێك بەیعەتمان داوە و دووبارەی بکەینەوە! وتم: ئەمە فەرمانی ئەمیری باوەڕدارانە، بەیعەت بدەن بەوکەسەی کە لەم نامە مۆرکراوەدا دیاری کردووە.

ئەوە بوو ئەوانیش یەك لە دوای یەك بەیعەتیان دا، ڕەجاءئەڵێ: دوای ئەوەی کە بەیعەتیان دا پاش کۆچی دوایی سولەیمان پێم وا بوو کە مەسەلەمەکەم چەسپاندوە بۆیە وتم: هەستن ئەمیری باوەڕداران کۆچی دوایی کردووە، وتیان: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾، پاشان نامەکەم بۆ خوێندنەوە، کاتێ ناوی عومەری کوڕی عبدالعزیزم هێنا هشام هاواری کرد: هەرگیز بەیعەتی پێ نادەین، ئەڵێ وتم: سوێند بەخوا ئەدەم لە گەردنت، هەستە بەیعەت بدە، ئەڵێ هەستا و قاچی بەدوای خۆی دا ڕادەکێشا.

ڕەجاءئەڵێ: پاشان دەستی عومەرم گرت و لەسەر مینبەر دامنیشاند و ئەویش ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ ی دەکرد بۆ ئەو ئەرکەی کە پێی سپێردراوە، هشامیش هەمان شتی دەوتەوە مەبەستی بوو

که ئەو پۆسته له کوڕانی عبدالملك ەوە چووە بۆ عومەر، عومەریش وتی: بەڵێ ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ ، مەبەستی ئەوە بوو که من حەزم لەم کارە نیە[1]، ابو الحسن ی نەدەوی سەبارەت بە هەڵوێستی ڕەجاءەڵێ: ڕەجاءکارێکی کرد بۆ ئیسلام که له یاد ناکرێت، کەسێکیش نازانم لەوانەی که له پاشا و دەسەلاتدارانەوە نزیك بوبێت و هێندەی ئەو بەباشی سوودی لەو نزیکیەی وەرگرتبێت و خزمەتی لەو شێوەی پێشکەش بە ئیسلام کردبێت[2].

دەسا ڕەحمەتی خوا له ڕەجائی کوڕی حیوە که ڕێبازێکی دیاریکرد بۆ ئەو زانایانەی که لەگەڵ پاشاکاندان که چۆن ئیسلام سەربخەن و خوای گەورە یادی سەرۆکەکان بخەنەوە و هەلی گونجاو بقۆزنەوە بۆ خزمەتکردن بە ئاینی پەروەردگار.

١- **پلانی عومەر بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت له ڕوانگەی وتاری یەکەمیەوە:** عومەر چووەسەر مینبەر و له یەکەم دیدارى لەگەڵ ئوممەتدا وتی: من تووشی ئەم کارە کراوم بێ ئەوی ڕام لێ بێت و بیخوازم و بەبێ ڕاوێژکردن بە موسڵمانان بۆیە من ئەو بەیعەتەی ئێوە هەڵدەوەشێنمەوە و داوادەکەم بۆ خۆتان خەلیفەیەك هەڵبژێرن.

خەڵکیش بەیەك دەنگ هاواریان کرد و وتیان: ئەوە تۆمان هەڵبژارد ئەی ئەمیری باوەڕداران ڕازین بە تۆ، تۆش بە پشتیوانی و بەرەکەتی پەروەردگار کاروبارمان له ئەستۆ بگرە.

لێرەدا عومەری هەستی کرد که بواری خۆ دزینەوەی لەبەرپرسیارێتی خیلافەت نیە بۆیە بەرنامە و ڕێبازی خۆی بۆ سیاسەت و بەڕێوەبردنی ئوممەتی ئیسلامی دیاری کرد و وتی[3]: پاشان بزانن دوای پێغەمبەرەکەتان پێغەمبەرێکی تر نیە و دوای قورئانیش کتێبێکی تر دانابەزێ، ئاگاداربن ئەوەی که خوا حەلاڵی کردووە حەلاڵە تا ڕۆژی دوایی ئاگاداربن و من دادوەرنیم، بەڵکو جێ بەجێ کارم و بیدعەچی نیم و شوێنکەوتووی سوننەتم.

ئاگاداریش بن که بۆکەس نیە لەسەر پێچی خوادا گوێڕایەڵی بکرێت منیش باشترین کەستان نیم، بەڵکو یەکێکم له ئێوە، بەلاّم خوای گەورە ئەرکی قورسترى خستۆتە ئەستۆم، خەڵکینە ئەوەی هاوڕێیەتیمان دەکات با پێنج شت ڕەچاو بکات ئەگینا نزیکمان نەکەوێتەوە...

---

[1] - تأريخ الطبري(٧ / ٤٤٥)، الطبقات(٥ / ٣٣٥ - ٣٣٨).

[2] - رجال الفكر و الدعوة للندوي(١ / ٤٠).

[3] - عمر بن عبدالعزيز و سياسة في رد المظالم، ماجدة فيصل، ل: ١٠٢.

یان پێوستی کەسێکمان پێ بگەیێنێت کە خۆی ناتوانێ بێتەلامان یاخود یارمەتیمان بدات بۆ خێر و چاکە و ڕێنماییمان بکات بۆی و بەخراپە باسی ژێـر دەسـتەکان نـەکات و خـۆی هەڵنـەقورتێنێ لـە کارێکدا کە پەیوەندی بەوە وە نیە، وەسیەتتان بۆ دەکەم بە لەخواترسان، چونکە لـە خواترسـان لـە هەموو شتێك باشترە و هیچ شتێك لەو باشتر نیە، کار بۆ قیامەتتان بکەن، چونکە هەر کەس کار بـۆ قیامەت بکات خوای گەورە کاروباری دونیای لە کۆڵ دەکاتەوە، بەنهێنی پـاك بـن بـاخوای گـەورە ئاشکراتان بۆ چاك بکات باش خۆتـان ئامـادە بکـەن پـێش ئـەوەی تێکـدەری خۆشـیەکان یەخـەتان بگرێت...

دیارە ئەم ئوممەتەش جیاوازی لـە مەسەلـەی خوا و پێغەمبەردا(ﷺ)نەبووە، بەڵکو ناکۆکیان لەسەر دنیا و درهەمە، سوێند بە خوا من بەناهەق نایدەم بەکەس و لـە کەسیشی ناگرمەوە کـە حـەقی خـۆی بێت، پاشان دەنگی بەرزکردەوە و هەتاوەکو خەڵك بیستیان و وتی: خەڵکینە، هەرکـەس بـە گـوێی خوا بکات گوێڕایەڵی پێوستە، هەر کەسێکیش سەرپێچی خوا بکات ئەوە گوێڕایەڵی بۆ نیە، بـەگوێم بکەن هەتاوەکو گوێڕایەڵی خوابم، و ئەگەر سەرپێچی خوام کرد ئەوە گوێڕایەڵیم لەسەرتان پێویـستە نیە، شار و ناوچەکانی دەورو بەریشتان ئەگەر وەك ئێوە گوێڕایەڵم بوون ئـەوە مـن والیتـانم، بـەڵام ئەگەر ئەوان یاخی بوون ئەوە والی ئێوەش نـیم [1]، پاشـان هاتـە خـوارەوە، بـەم شـێوەیە لـەم ڕۆژەدا بەیعەت کرا بە عومەری کوڕی عبـدالعزیز، لـە ڕۆژی هـەینی دەی سـەفەری سـاڵی نـەوەدو نـۆی کۆچی[2].

لەم وتارەشەوە ئەو بەرنامە سیاسیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز پـەیڕەوی کردوە لە حوکمڕانیدا کە بریتی بوو لـە:

أ- پابەندبوونی بە قورئان و سوننەت و ئامادە نەبوونی بۆ گۆیگرتن لە هیچ مشتومڕێك لەمەسەلە شەرعیەکاندا بەو پێیەی کە ئەو فەرمانڕەوایەکی جێبـەجێ کـارە و شـەرع حـەڵاڵ و حـەرامی ڕوونکردۆتەوە، هەروەها ڕەتکردنەوەی بیدعەوکاری داهێنراوی ڕاگەیاند.

ب- پێنج مەرج و هۆکاری دیاریکرد بۆ هەر هاوڵاتیەك کە دەیەوێ پەیوەندی پێوەبکات:

---

[1] - ستیری: الطبقات(٥ / ٣٤٠)، سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن عبدالحکم، ل: ٣٥، ٣٦، عمر ابن عبدالعزیز و سیاسته في رد المظالم، ل: ١٠٤.

[2] - البدایة و النهایة(١٢ / ٦٥٧).

● پێویستی ئەو کەسی بگەیەنێتە لا کە دەستی ناگات بەخەلیفە، واتە ئەو خەڵکانی نزیکی کرد بوو بە ئەڵقەی پەیوەندی لە نێوان خۆی و ئەو خەڵکانەی کە ناتوانن بگەنە لای، هەتاوەکو بەم شێوەیە پێویستیەکانی خەڵك بزانێت و بەدوایدا بچێت.

● بە ئەندازەی توانا هاوکاری بکات بۆ خێر، واتە پەیوەندی ئەوان و خەلیفە لەسەر بنەمای خێر و هاوکاری کردنی خەلیفەیە بۆی و ئاگادار کردنەوەیەتی لە خراپە.

● ڕێنمایی کردنی پێویست کرد لە سەر ئەو کەسەی کە دەیەوێ لێی نزیك ببێتەوە بۆ ئەوشتەی کە خێری دین و دنیای خەڵکی تیایە.

● داوای کرد لەو کەسەی کە ئەیەوێ لێی نزیك ببێتەوە کە بەخراپە باسی کەس نەکات.

● هیچ کەسێك لەوانەی کە لیێ ی نزیك دەبنەوە دەست وەرنەدەنە کاروباری حوکم و ئەو شتانەی کە پەیوەندی بەوانەوە نیە.

دیارە کاریگەری دەست و پێوەندی کەسانی دەوروبەری لەسەر دەسەڵاتدار و هاوڵاتیان و شێوازی حوکمڕانی بە باشی دەزانی، و پێ باش کە خەڵك ئاگادار بکاتەوە هەتاوەکو وازی لیێ بێنن کار بە شەرع ی خوا بکات، بێ ئەوەی بە تەواوی خەڵك لە خۆی دوور بخاتەوە، چونکە ئەو ڕێی بەو کەسە نزیکانەدا کە ڕێنمایی بکەن بۆ خێر و هاوکاری بکەن بۆ ئەنجامدانی و پێویستی کەسانی هەژار و بێ دەسەڵاتی پێ بگەیەنن [1].

ج- هەروەها خەڵکی لەسەرئەنجامی دونیا ئاگادار کردەوە ئەگەر خراپەی تیادا بکەن و داوای لێکردن کە نهێنیان چاك بکەن و ئاگایان لە مردن بێت و پەندی لیێ وەربگرن.

د- بەڵێنی دا کە بە ناحەق هیچ شتێك بەکەس نەدات و هیچ حەقێکیش لەکەس قەدەغە نەکات، هەروەها مافێکی خۆی بەسەریانەوە ڕ،ون کردەوە کە ئەویش گوێڕایەڵی کردنیەتی هەتاوەکو پابەند بێت بە فرمانی خواوە و ئەگەر سەرپێچی پەروەردگاری کرد ئیتر گوێڕایەڵی لەسەریان پێویست نیە، ئەمە هێڵە گشتیەکانی سیاسەتی عومەر بوو(ﷺ)، کە لە یەکەم دیدار لەگەڵ ژێر دەستەکان و ئەنجومەنی حلل و عەقددا باسی کرد لە مزگەوتدا دوای بەیعەت پێدانی.

---

[1] – عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ١٠٥.

ئەوە بوو ڕێبازی دەوڵەتی بەپابەند بوون بە قورئان و سوننەتەوە دیاری کرد و پێی باش بوو پاسا و بۆ هیچ کاربەدەستێکی نەهێڵێتەوە دوای ئەوە و ئەم چەند دێرە کورتەی ڕونتر نووسی و ناردی بۆ هەموو کاربەدەستانی لە سەرجەم ناوچەکاندا ئەم نامانەش دوو جۆر بوون:

- چەند نامەیەك بۆ کاربەدەستانی کە تیایدا بەرچاو ڕوونی پێدان دەربارەی ئەوەی کە پێویستە پێوەی پابەندبن وەك هەڵسوکەوتی تاکە کەسی تایبەت – بەرامبەر بە هاولاتیان – کە دواتر باسی لێوە دەکەین بە پشتیوانی پەروەردگار.
- چەند نامەیەکی نارد بۆ کاربەدەستانی کە تیایدا سیاسەتی بۆ دیاری کردن و شێوازی مامەڵەی لەگەڵ هاولاتیانی موسڵمان و غەیرە موسڵماندا بۆ ڕوون کردنەوە لەوانەی کە لە خاکی ئیسلام دا نیشتەجێ بوون – وەك دواتر ڕوون دەبێتەوە – باسی هەڵوێستی خۆی کرد وەك زانایەکی شارەزا لە ئوسولی دین [1].

دواتریش باس لە شێواز و بەرنامەی کاری لە ڕوانگەی کارەکانیەوە دەکەین.

٢– **سووربوونی لەسەر کارکردن بە قورئان و سوننەت:** گرنگترین شتێك کە سیاسەتی عومەر جیا دەکاتەوە بریتیە لە سوور بوونی لەسەر کارکردن بە قورئان و سوننەت و بلاو کردنەوەی زانست لە نێوان هاولاتیاندا و شارەزا کردنیان لە ئاین و ئاشنا کردنیان بە سوننەت، ئەمەش لە ڕوانگەی تێگەیشتن و تێڕوانینی ئەوە وە بوو بۆ خیلافەت کە بریتیە لە پاراستنی ئاین و سیاسەت و هەڵسوڕاندنی کاروباری دنیا بەهۆیەوە [2].

بۆیە عومەر ئاشنا کردنی خەڵکی بەئەرکە ئاینیەکان و هاندانیان بۆ کارپێکردنی بەیەکەمین ئەرکی خۆی دەزانی، لەم بارەیەشەوە لە وتارێکیدا هاتووە و ئەڵێ: دیارە ئیسلام چەند سنوور و یاسا و ڕێسایەکی هەیە، هەر کەس کاری پێ بکات ئەوە باوەڕی تەواوە، هەر کەسێکیش فەرامۆشی بکات ئەوە باوەڕی تەواو نیە، جا ئەگەر بمێنم فێرتانی دەکەم و پابەندتان ئەکەم پێوەی، ئەگەر مردیشم ئیتر خەمی هاوڕێیەتی ئێوە ناخۆم [3].

---

[1] – هەمان سەرچاوە، ل: ١٠٦.

[2] – الاحکام السلطنیة و الولایات الدینیة، ل: ٥.

[3] – سیر عمر بن عبدالعزیز، ل: ٦٠ لابن عبدالحکم.

هەروەها ئەڵێت: ئەگەر مراندنی هەر بیدعەیەك یان زیندوو کردنەوەی هەر سونەتێك لەسەر دەستی من بەرامبەر بە برینی بەشێك لە جەستەم بوایە هەتاوەکو گیانم دەردەچوو ئەوە لە پێناو خوادا بەلامەوە ئاسانە، لە شوێنێکی تریشدا ئەڵێت: سوێند بەخوا ئەگەر لەبەر زیندوو کردنەوەی سونەتێك یان چەسپاندنی حەقێك نەبێت ئەوە حەزناکەم ساتێك بژیم.

هەربۆیە عومەری دەستپێشخەری کرد لە جێبەجێ کردنی ئەم ئەرکە گرنگە دا و زانایانی بەسەر جەم ناوچەکاندا بلاوە پێکرد بۆ فێرکردنی خەڵکی و شارەزا کردنیان و فەرمانی دا بەکار بەدەست و والیەکانی لە هەرێمەکاندا کە هانی زانایان بدەن بۆ بلاوکردنەوەی زانست، ئەوە تا لە نامەیەکیدا کە بۆ کارە بەدەستانی ناردوە هاتووە: فرمان بدە بە زانایان و شەرع زانان با زانست بلاو بکەنەوە لە مزگەوتەکانیاندا چونکەسونەت مرێندراوە[1]، هەروەها تیایدا هاتبوو: فەرمان بدە بە ئەهلی عیلم و فیقە با ئەوەی خوافێری کردون بلاوی بکەنەوە و لە مەجلیسەکانیاندا باسی بکەن[2]، هەروەها فەرمانی کرد بە والیەکانی کە موچە بۆ ئەو زانایانەی کە یەکلابونەتەوە بۆ بلاو کردنەوەی زانست [3] ئەویش یەزیدی کوڕی ابی مالیکی دیمەشقی و حارسی کوڕی یەمجدی ئەشعەری نارد بۆ فێرکردنی خەڵکی بیابان[4]، هەروەها زەهەبی باس لەوە دەکات کە عومەر یەزیدی کوڕی ابی مالیکی نارد هەتاوەکو هۆزی بەنی نەمیر فێری قورئان بکات.

هەروەها نافعی خزمەتکاری ئیبن عومەری نارد بۆ خەڵکی میسر هەتاوەکو سونەتەکانیان فێر بکات[5]، پێشتریش دە زانای نارد بۆو بۆ ئەفریقیە(تونس) بۆ فێرکردنی خەڵکەکەی کە دواتر بە پشتیوانی پەروەردگار باسی لێوە دەکەین، ئەرکی ئەو زانایانەش تەنها فێرکردن نەبوو، بەڵکو هەندێکیان پۆستی تریان پێ سپێرادرا وەك دادوەری و قەزا و زۆربەشیان ڕۆڵیان هەبوو لە بانگەواز و جیهاد لە پێناوی خوادا.

---

[1] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٧٣.

[2] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالجوزي، ل: ٧٦.

[3] – البداية و النهاية لە أثر العلماء في الحياة السياسية وە، ل: ١٧٩.

[4] –مختصر تأريخ ديشق(٦ / ١٧٥) أثر العلماء، ل: ١٧٩.

[5] –سير أعلام النبلاء(٥ / ٤٣٨).

ئەم گرنگی پێدانەش کە ڕێبازی عومەری جیا دەکردەوە بۆ فێر کردن و ئاشنا کردنی خەڵك بە کاروباری ئاینەکەیان چەندین ڕەهەندی سیاسی و ئاسەواری ئەمنیشی هەبوو، چونکە بڵاو کردنەوەی هۆشیاری ئاینی دروست و شارەزا بوون لێی لە نێوان هاولاَتیاندا کاریگەری خۆی هەیە بۆ پاراستنی ڕۆڵەکانی ئوممەت لە گاڵتەجاڕی بیرۆکەکان کە ڕەنگدانەوەی خراپی دەبێت لەسەر سەقامگیری سیاسی و ئەمنی، وەك هزری خەواریج[1] و.. هتد.

٣- **شورا لە دەوڵەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا:** خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ﴾ آل عمـــــران: ١٥٩).
واتە: کەواتە لێ یان ببورە و داوای لێ بوردنیان بۆ بکە لە خوا و ڕاوێژیان پێ بکە لە کاروباردا جا کێ(دوا ڕوێژکردن) بڕیارت دا ئەوە پشت بە خوا ببەستە بە ڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە پشت بەخوا دەبەستن.

عومەری کوڕی عبدالعزیز گرنگی دەدا بە کاراکردنی بنەمای شورا و لەوتە بەناوبانگەکانیشی لەم بارەیەوە: ڕاوێژ و گفتوگۆ دەروازەی ڕەحمەت و کلیلی بەرەکەتە و ڕاوبۆچوونەکان لەلادان دەپارێزێ و دڵگەرمیان بۆ جێبەجێ کردنی زیادتر دەکات[2].

یەکەم بڕیارێکیش کە عومەر لە مەدینەدا دەری کرد دوای ئەوەی کە لەلایەن وەلیدەوە وەك والی ئەو شارە دەستنیشان کرا بریتی بوو لە شوراو ڕاوێژ و کردی بە بناغەی حوکمڕانی و زانایان و مامۆستایانی مەدینەی کۆکردەوە و ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری هەمیشەیی لێ پێك هێنان[3] وەك باسمان کرد.

دیارە کەسێکیش لەو بەرپرسیارێتیە کەمەدا شوراى بە یەکێك لە بنەماکانی حوکمڕانی دانابێت ئەوە حەقی خۆیەتی کە زیاتر پێوەی پەیوەست بێت لەکاتی بەرپەرسیارێتی تەواو و ئەرکی گەورەدا، کە ئەویش ئەرکی سەرپەرشتیکردنی سەرجەم موسڵمانانە، ئەوە بوو بنەمای شورا لە یەکەم ڕۆژی دەستبەکار بوونیەوە دەرکەوت کاتێ بەخەڵکی وت: خەڵکینە، من تووشی ئەم کارە کراوم بە بێ ئەوەی ڕام لێی بێت یاخود داوام کردبێت و بەبێ ڕاوێژ کردنیش بەخەڵك، بۆیە من ئێستا بەیعەتی

[1] - أثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٨٠.
[2] - أدب الدنيا و الدين للماوردي، ل: ١٨٩.
[3] - النموذج الاداري المستخلص من إدارة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٢٨٣.

ئێوە هەڵدەوەشێنمەوە و(کەسێك بۆ خۆتان هەڵبژێرن) ئەوانیش بەیەك دەنگ هاواریان کرد: ئەوە تۆمان هەڵبژارد و پێت ڕازین تۆش بە پشتیوانی و بەرەکەتی خواوە کاروبارمان لە ئەستۆ بگرە [1].

بەم شێوەیە عومەر لە مەسەلەی حوکمی پشتاوپشت دەرچوو کە زۆرینەی خەلیفە ئەمەویەکان کاریان پێ دەکرد بۆشورا و بە هەڵبژاردن لەلایەن ئامادەبووانەوە وازی نەهێنا بەڵکو ڕای موسڵمانانی لەشارەکانی تردا بەلاوە گرنگ بوو، بۆیە لە وتاری یەکەمیدا وتی: شارەکانی دەورو بەریشتان ئەگەر وەك ئێوە گوێڕایەڵ بوون ئەوە باشە، بەڵام ئەگەر ڕازی نەبوون ئەوە گەورەی ئێوەش نیم، پاشان لەسەر مینبەر دابەزی [2].

ئەوە بوو نامەی بۆ هەموو شار و هەرێمەکان نووسی و ئەوانیش هەموو بەیعەتیان دا، یەکێك لەو کەسانەش کە نامەی بۆ نووسی یەزیدی کوڕی موهەللەب بوو کەلە نامەیەکدا دوای ڕوونکردنەوەی حەز نەکردنی لە خەلیفایەتی داوای بەیعەتی لێکرد ئەویش خەڵکی کۆکردەوە و ئەوانیش بەیعەتیان دا [3].

بەم شێوەیەش دەر ئەکەوێت کە ئەو تەنها بەڕاوێژی خەڵکانی دەوروبەری وازی نەهێنا و، بەڵکو ڕای هەموو شار و هەرێمەکانی وەرگرتووە لەمەشەوە ئەگەینە ئەو ئەنجامەی کە:

أ- عومەر پەردەی لادا لەسەر نەگونجانی دانانی خەلیفە ئەمەویەکان بە شێوەی پشتاوپشت لەگەڵ بنەما شەرعیەکاندا.

ب- سوور بوونی عومەر لەسەر پیادەکردنی بنەمای شورا لە مەسەلەیەکدا کە تایبەتە بە خۆیەوە کە ئەویش دانانیەتی بە خەلیفە.

ج- کەسێك کە شورا لە مەسەلەی دیاری کردنی خەلیفەدا پەیڕەو بکات ئەوە لە کاروبارەکانی تریشدا دەیکات.

هەروەها عومەر لە زۆربەی کاروبارەکاندا ڕاوێژی بە زانایان دەکرد، لەو زانایانەش سالمی کوڕی عبداللە و محمدی کوڕی کعب قرظي و ڕەجائی کوڕی حیوە و زانایانی تر و ئەیوت: من ئەم کارەم

---

[1] – سيرة مناقب عمر بن عبدالعزيز، ل: ٦٩.

[2] – البداية و النهاية(١٢ / ٦٥٧).

[3] – تأريخ الطبري، لە النموذج الاداري المستخلص من إدارة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٢٨٥.

توش کراوە، ڕاو بۆ چوونەکانتان بخەنە ڕوو [١]، هەروەها ڕاوێژی بە خەڵکانی بیرتیژ و ڕۆشنبیر دەکرد [٢] و سوور بوو لەسەر چاکبوونی دەست و پێوەندەکەی لە کاتێکدا کە بوو بە خەلیفە و زانایان و پیاوچاکانی لە خۆی نزیک کردەوە و خەڵکی بەژەرەوەندیخواز و دونیا پەرستی دوور خستەوە، تەنها بە پاکسازی کردن لە نێوان دەست و پێوەندەکەشیدا وازی نەهێنا، بەڵکو هانیشی دەدان بۆ ڕاستکردنەوەی، بۆیە بە عومەر کوڕی موهاجری وت:

ئەگەر بینیت لە حەق لامدا ئەوە چمکی جلەکانم بگرە و ڕاموەشێنە، پاشان بڵێ: ئەوە چی ئەکەیت عومەر [٣]؟ ئەم شێوازەش کاریگەری خۆی هەبوو لە ڕاستکردنەوی و سەرخستنی سیاسەتە نوێخوازانەکانیدا، چونکە دەست و پێوەندەکەی ڕۆڵیان هەبوو لە یارمەتیدان و ڕاست و دروستی ڕاکانیدا [٤]، هەروەها لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی عومەری کوڕی عبدالعزیز نزیککردنەوەی خەڵکانی پیاو چاك و زانا و حەزکردنی بەبەشداریان لەگەڵیدا بۆ هەڵگرتنی ئەرك و بەرپرسیاریێتی ئەمەش خێرێکی زۆری بۆ ئیسلام موسڵمانان لێکەوتەوە.

٤- **دادگەری لە دەوڵەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز:** خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ النساء: ١٣٥). واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەمیشە ڕاگری داوەری بن و شایەتی بۆخوابدەن، باشایەتیەکەشتان زیاتر بۆخۆتان ودایك و باوکتان یان خزمانیش هەبێت، ئەگەر کەسێك لەوانە دەوڵەمەند بێت یان هەژار خوابەرژەوەندی ئەوان چاکتر دەزانێت لەئێوە(واتە بەتەماعی دەوڵەمەندی لەداد پەروەری لامەدەن و بەهۆی نەداری وبەزەیی بێ جێ لەحەق لامەدەن) نەکەن شوێن ئارەزوی نەفس بکەون و لەدادپەروەری لابدەن، جائەگەر ئێوە پێچ

---

[١] – سيرة و مناقب عمر بن عبدالعزيز، ل: ١٦.

[٢] – النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٢٨٥.

[٣] – أثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٧٥ هتتاوتکو ١٧٧.

[٤] – أثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٧٨.

لێیدەن (زمان بگۆڕن) و شایەتی ناحەق بدەن یان پشت هەڵکەن ئەوە چاك بزانن خوا ئاگادارە بەکار و کردەوەتان.

دادگەریش دوو جۆری هەیە: جۆرێکی نێگەتیف و سلبی کە خۆی لە قەدەغە کردنی ستەم و هەڵگرتنی لەسەر ستەم لێکراودا دەبینێتەوە، واتە بەرێگرتن لە پێشێل کردنی مافی خەڵکی و نەهێشتنی ئاسەوارەکانی دەستدرێژی و گێڕانەوەی مافەکانیان و سزادانی کەسی ستەمکار [1].

جۆرێکی ئیجابی و ئەرێنیشی هەیە، کە زیاتر پەیوەندی بە دەوڵەتەوە هەیە و خۆی لە دابینکردنی ئازادی و مسۆگەکردنی ژیانیاندا دەبینێتەوە هەتاوەکو کەسی بێدەسەلاتی فەرامۆشکرا و هەژاری پشتگوێ خرا و بێ بەشی نا ئومێد کرا و ترسنۆکی هەڕەشەلێکراو پەیدا نەبێت، هەموو ئەم ئاکارنەش لە ئەرکەکانی دەسەلاتدارە لە ئیسلامدا [2].

عومەری ئەمیری باوەڕدارانیش ئەم پایە گرنگەی بە باشترین شێوە جێ بەجێ کرد، چونکە بەرپرسیارێتی بەڕای عومەر بریتی بوو لە هەستان بە دابینکردنی مافەکانی خەڵك و مەرجەکانی بەیعەتیان و دابینکردنی بەرژەوەندیە ڕەواکانیان، بەو پێیەی کە خەلیفە بەکرێگیراوی ئوممەتە وپێویستە لەسەری کە پێداویستیە ڕەواکانیان جێبەجێ بکات بە پێی مەرجەکانی بەیعەت [3].

هەروەها حەزی لێ بوو کە زیاتر سیفەتەکانی پێشەوای دادگەر لە خۆی دا بەدی بێنێت و هەوڵی دەدا بۆ دەخستنی پێداویستیەکانی ئەو تایبەتمەندیە بە باشە، هەر بۆیە نامەیەکی نووسی بۆ حەسەنی بەسری و پرسیاری لەو بارەیەوە لێکرد حەسەنی بەسریش وەڵامی دایەوە بەوەی کە: پێشەوای دادگەر ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك باوکی بەسۆزدایە بۆ منالە بچوکەکانی کە بە منداڵی هەوڵیان بۆ دەداو بە گەورەیش فێریان دەکات، لە ژیانیاندا بۆیان دەکوشێ و دوا مردنیش شتیان بۆ بە جێ دەهێڵێت، پێشەوای دادگەریش ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك دایکی بەسۆز و میهرەبان و دڵنەرم وایە بۆ منداڵەکەی، بە زەحمەت هەڵیدەگرێ و بەزەحمەت دایدەنێ و بە منالی پەروەردەی دەکات وشەونخونی بۆ دەکێشێ و شیری پێ دەدات و دڵخۆش دەبێ بە خۆشی و خەم دایدەگرێ بەخەمباری، هەروەها پێشەوای دادگەر ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك سەرپەرشتی هەتیو و خەزنەداری

---

[1] – عمر بن عبدالعزيز خامس الخلفاء الراشدين، عبدالستار الشيخ، ل: ٢٢٢.

[2] – هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢٢، نظام الاسلام محمد المبارك،: ٤٥ – ٤٦.

[3] – عمر بن عبدالعزيز، خامس الخلفاء خلف الستار، ل: ٢٢٣.

هەژاران وایە، وەك دڵ وایە لە نێوان جەستە دا و پاکی جەستەی پێوەبەندە و خراپیشی بەهەمان شێوە، هەروەها پێشەوای دادوەر وەك نوێنەری نێوان خوا و بەندەکانی وایە فەرمایشتی خوایان پێ دەگەیەنێ و ڕێبازی خوایان پیشان دەدات و خۆی و ئەوانیش ملکەچی پەروەردگار دەکات جا تۆ وەك ئەو کۆیلە یەنەبیت کە گەورەکەی ماڵ و منالی خستۆتە ژێر دەستیەوە و ئەویش پارەکەی بە فیڕۆ داوە و منالەکانیشی سەرگەردان کردووە بەم پێیەش منالەکانی هەژار و پارەکەشی بەفیڕۆداوە[1].

د- سیاسەتی عومەر بۆ گێڕانەوەی مافەکان: ئەمیری باوەڕداران لە خۆیەوە دەست پێ دەکات، بۆجێ بەجێ کردنی سیاسەتی هەڵگرتنی ستەم و گێڕانەوەی مافەکان پێشەوا عومەر لەخۆیەوە دەستی پێکرد و ئیبن سەعد ئەیگێڕێتەوە:

کاتێك عومەر ویستی ستەم نەهێڵێت وتی: پێویستە لە خۆمەوە دەست پێ بکەم [2]، ئەمەش کردی بە پێشەنگ بۆ خەڵکانی تر، ئەوە بوو هەستا بە گێڕانەوەی ئەو زەوی و کەل و پەلەی کە هەیبوو تەنانەت لە ئەنگوستیلەکەی دەستیشی کۆڵیەوە و وتی: ئەمە وەلیدی کوڕی عبدالملك پێ ی دام ئەو کاتە لە مەغریبەوە بۆی هاتبوو، ئەوە بوو ئەویشی نەهێشت [3]، ئەمەش بەهۆی سووربوونیەوە بوو لەسەر نەهێشتنی گومان بۆ دڵنیا بوون لەوەی کە لە دەستیدایە ئەگەر چی ماڵی میراتیش بوایە، چونکە لەوکاتەدا قسەوباس زۆر بوو سەبارەت بەستەمی خەلیفەکانی بەنی ئومەییە و کاربەدەستەکانیان کە هەریە کە لەسەردەمی خۆیدا کرد بووی، تەنانە هێندی خۆپارێز بوو بەرگی شمشێرەکەشی کە زیو بوو لای برد و بەرگێکی لە ئاسن بۆی دروستکرد [4] عبدالعزیزی کوڕی عومەر ئەڵێ: شمشێرەکەی باوکم بەرگێکی زیوی هەبوو ئەویش لایبرد و بەرگێکی لە ئاسن بۆ دروست کرد نەهێشتنی ئەم کەل و پەل و موڵکانەشی بە چەند ڕێگەیەك بوو، وەك فرۆشتن ئەوە بوو کاتێ بوو بە خەلیفە سەرنجی کەلوپەلەکانی لای کۆیلەکەی و بۆن و جل و بەرگەکانی داو

[1] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشخ، ل: ٢٢٤.

[2] - الطبقات(٥ / ٣٤١).

[3] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٤١ - ٣٤٢).

[4] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٥٥) عمر و سياسته في ردّ المظالم، ل: ٢٠٥.

هەرشتێك لە خۆی زیاتر بوو فرۆشتی و سەرجەمی بیست و سێ هەزار دیناری کرد پاشان هـەمووی لە رێی خوادا دانا [1].

هەروەها بە گەڕاندنەوەی بۆ خاوەنە ئەسڵیەکانی، ئەمەشی بەو پارچە زەویانە کرد کە بنەماڵەکەی پێیان بەخشیبوو، ئیبن جەوزی ئەیگێڕێتەوە لە ئیسماعیلی کوڕی أبی حەکیمـەوە کـە وتویـەتی: لای عومەری کوڕی عبدالعزیزمامەوە پاش ئەوەی خەڵکی بڵاوەیان لێکرد و ئەویش چووە ماڵی خۆیـەوە بۆ خەوی قەیلولە، لەو کاتەدا کەسێك هاواری کرد: الـصلاه جامعـە، ئـەڵێ ئێمـەش زۆر ترسـاین لەوەی کە کارەساتێك ڕووی دابێت، جویریە ئەڵێ: ئەمە ئەوە بوو کە عومـەر مـوزاحیمی بـانگکرد بوو وتبوی: ئەی مزاحم، ئەو کۆمەڵە چەند دیاریەکیان پێداین، نە ئـەبوو ئـەوان پێمـانی بـدەن و نـە ئەبوو ئێمەش وەریبگرین، ئەمە بە من دراوە و جگە لە خوا کەس ئاگای لێ نەبووە.

موزاحیش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ،ئەزانی چەند منداڵت هەیە؟ ئەوان ئەوەندە و ئەوەندەن. ئەڵێ: فرمێسك بە چاوی عومەردا هاتە خوارەوە و ئەیوت: ئەیانـدە مەدەسـت خـوا؟ ئـەڵێ: پاشـان موزاحیم ڕۆشت و چوو بۆ لای عبدالملك و ئەویش بە پاڵکەوتنەوە فەرمووی لێکرد و عبدالملك پێی وت: چی لەم کاتەدا هێناویتی ئەی موزاحیم؟ ئایا شتێك ڕووی داوە؟ وتی: بەڵێ شتێکی گـەورە بـۆ تۆ و باوکت ڕووی داوە وتی: چی بووە؟ وتـی: ئـەمیری بـاوەڕداران بـانگی کـردم و – قـسەکانی عومەری بۆ گێڕایەوە – عبدالملکیش وتی: ئەی تۆ چیت پێ وت؟ وتم ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەزانی چەند منداڵت هەیە؟

ئەوان ئەوەندە و ئەوەندەن وتی: ئەی ئەو چی وت؟ وتی: فرمێسك بەچـاوی داهـات و ئـەیوت: ئەیاندەمە دەسەت خوا. عبدالملکیش وتی: بە ڕاستی تۆ وەزیرێکی خراپی مـوزاحیم، پاشـان هەسـتاو ڕۆشت بۆ ماڵ عومەری باوکی و داوای مۆڵـەتی کـرد، دەرگاوانەکـەش وتـی: بـۆ ڕەحمـی پێناکـەن لەشەو و ڕۆژدا تەنها ئەم کاتەی هەیە؟ عبدالملکیش وتی: مۆڵەتم بۆ وەرگرە لـە بـار دایکـت بـچی، عومەریش گوێی لێ بوو وتی: ئەوەکێیە، وتی: عبدالملك، وتی: بابێتە ژوورەوە، پاشان هاتە ژوورەوە و – عومەریش ڕاکشا بوو بۆ قەیلولە – وتی: کوڕم ئیشت چیە لەم کاتەدا هاتووی؟ وتی: قسەیەکە موزاحیم بۆی باسکردم، وتی: ئەی تۆ ڕات چیە لەسەری؟ وتـی: ڕام وایـە بەوشـێوەیە بکـەیت کـە

[1] – هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٤٥) عمر و سیاسته في ردّ المظالم، ل: ٢٠٥.

وتوته، ئەڵێ: پاشان عومەر هەردوو دەستی بەرز کردەوە و وتی: سوپاس بۆ ئەو خواییەی کە لە نەوەی خۆمدا کەسێکی داناوە کە هاوکاریم ئەکات لە کاروباری ئاینمدا.

بەڵێ کورم نوێژی نیوەڕۆ ئەکەم پاشان ئەچمە سەر مینبەر و بە بەرچاوی خەڵکەوە دیاریەکان ئەگێڕمەوە، عبدالملکیش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، کێ زامنی ئەوەت بۆ دەکات کە تا نیوەڕۆ پەشیمان نەبیتەوە، عومەریش وتی: بەلاَم خەڵك بلاَوەیان لێکردوە و چوون بۆ خەوی قەیلولە، عبدالملکیش وتی: داوا لە بانگەواز کەر بکە کە هاوار بکات الصلاه جامعه و خەڵکیش کۆدەبنەوە، ئەوە بوو بانگەواز کراو منیش هاتنم بۆ مزگەت و عومەریش هات و چووە سەر مینبە رو سوپاس و ستایشی خوای کرد و پاشان وتی: ئەوکۆمەڵە چەند دیاریەکیان پێداین کە نەدەبوو بۆ مانی بهێنن و نەشدە بوو ئێمە وەری بگرین.

دیاریەکانیش بە من دراوە و جگە لە خوا کەس ئاگای لێ نەبووە ئاگادار بن ئەوە من گێڕامەوە و لە خۆم و بنەماڵەی خۆمەوە دەستم پێ کردووە، بیخوێنەرەوە ئەی مزاحیم ئەڵێ دەفریکیان هێنا کە ئەو نامانەی تیا بوو: موزاحیمش نامەیەکی لێ خوێندەوە، کاتێ لێ بوویەوە عومەر لێی وەرگرت و لەو کاتەدا لەسەر مینبەر دانیشتبوو و بەمەقەستێك دڕاندی، پاشان موزاحم نامەیەکی تری خوێندەوە کاتێ لێ بوویەوە دای بە عومەر و ئەویش بەهەمان شێوە دڕاندنی بەم شێوەیە بەردەوام بوون تا بانگی نیوەڕۆ [1].

یەکێك لەوشتانەش کە عومەری گێڕایەوە بۆ بەیتولمال جبل النورس لە یەمەن و چەند پارچە زەویەك [2] لە یەمامە و فدك و خەیبەر [3] و سوەیداء ئەوە بوو وازی لە هەمووی هێنا جگە لە سوەیداء پاشان عومەر وتی: هەرچیم هەیە گێڕاومەتەوە بۆ بەیتولماڵی موسڵمانان جگە لەوکانیەی کە لە سوەیداء دایە، چونکە ئەوەم بە پارە و موچەی خۆم کریوە و بەشی پوشێکی کەسی تیادا نیە و بەروبوومی دووسەد دینار بوو [4]، هەرچی گوندی فدکیشە – کە ئەکەوێتە باکووری مەدینە – ئەوە سالاَنە دەهەزار دینار بەروبوومی هەبوو، کاتێ عومەر بوو بە خەلیفە پرسیاری لەبارەوە کرد و پشکنینی بۆ

---

[1] – سیرة عمر بن عبدالرحمن، ل: ١٠٧ – ١٠٨.

[2] – عمر بن عبدالعزیز و سیاسته في رد المظالم، ل: ٢٠٧.

[3] – هەمان سەرچاوە، ل: ٢٠٧.

[4] – سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن عبدالحکم، ل: ٤٠.

کـرد و ئاگاداریـان کـردەوە لـەوەی کـە لەسـەردەمی پیغەمبـەر(ﷺ) و ئەبوبـەکر و عومـەر و عوسماندا(ﷺ) پێی کراوە ئەویش – بەو پێیە – نامەیـەکی نووسـی بـۆ ئەبوبـەکری کـوڕی محمـدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم و تیایدا هاتبوو: پاشان من سەیری مەسەلەی فدك م کـردوە و بەدوایـدا چـووم و وادەبیـنم کـە بـۆ مـن ناشـێت و ئەمـەویٚ بیگێڕمـەوە بـۆ حاڵـەتی جـارانی لەسـەردەمی پیغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر و عوسماندا(ﷺ) و وازبێنم لەوەی کەدوای ئەوان ڕویداوە، جـا ئەگەر ئەم نامەیەی منت پیٚ گەشت ئەوە سەرپەرشتی بکە و بیدەرە دەست کەسێك کە حـەقی خـۆی پیٚ بدات و السلام [1].

هەرچی الکتیبە شە ئەوە قەلایەك بوو لە قەلاکانی خەیبەر، و کـاتیٚ عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز بوو بە خەلیفە نامەیەکی نووسی بۆ ئەبوبەکری کوڕی حـەزم کـار بەدەسـتی لـە مەدینـە و ئـەیوت: هەواڵی الکتیبەم بۆ بزانە ئایا لە بێنجیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوە لە خەیبـەردا یـان هـەر مـوڵکی تایبەتی پێغەمبەری خوا بۆ(ﷺ) ئەبوبەکریش(ﷺ) ئەڵیٚ: " پرسیارم لـە عمـرەی کـچی عبـدالرحمن کرد و ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێك کە ڕێککەوت لەگەڵ هۆزی أبي الحقيق دا النطاة و الشق ی کرد بە پێنج بەشەوە و الکتیبەش بەشێك بوو لێی، بۆیە عومەریش گێڕایـەوە بـۆ بـاردۆخی جارانی لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) [2].

هەروەها عومەر زەوی ئەو کابرا میسریەی گێڕایەوە کە لە حەلوان دا بوو دوای ئەوەی کە بۆی دەرکەوت کە باوکی ستەمی لە کابرای میسری کردوە تیایدا، تەنانەت ئەو ماڵـەش کـە بـاوکی لـە ڕەبیعی کوڕی خاریجەی کریبوو کاتیٚ کە هەتیو بوو لەلای، عومەر بۆی گێڕایـەوە، چـونکە دەیزانـی کە دروست نیە سەرپەرشتیار ماڵ لەو کەسە بکڕێتەوە کە سەرپەرشتی دەکات.

پاشان ئەو پارەیەی گێڕایەوە بۆ بەیتولماڵ کەلە جبل ئەلوەرس لـە یەمەنـەوە بـۆی دەهـات لەگـەڵ پێویستی زۆری خانەوادەکەی پێی، بەلام ئەو ڕۆژی دوایی بەلاوە گرنگتر بوو هەتاوەکو ژیانی دونیا، هەروەها فەرمانی کرد بە موزاحیم کە ئەو پارە بگێڕێتەوە بۆ بەیتولماڵ کە سـالانە لەبەحرەینـەوە بـۆی دەهات [3].

---

[1] – الطبقات(٥ / ٣٨٩) عمر و سیاسته في رد المظالم، ل: ٢٠٨.

[2] – عمر بن عبدالعزیز و سیاسته في رد المظالم، ل: ٢٠٩.

[3] – هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٢.

بەم شێوەیە عومەر لە خۆیەوە دەستی پێکرد و بوو بە پێشەنگ بۆ ژێر دەستەکانی و هەرشتێك کە بۆنی ستەمی لێ دەهات لە خۆی دووری خستەوە، و هەموو ئەوانەشی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان بامافی خۆشی تیادا بووبێت، لە ڕوانگەی دونیانەویستی و باوەڕی نەگۆڕی بە پێویستی گێڕانەوەی ماف و نەهێشتنی ستەم وەك پارێزگاری و هەوڵێك بۆ چەسپاندنی حەق، پاش ئەمەش ڕووی کردە فاتیمەی کچی عبدالملك ی هاوسەری – کە هەندێ گەوهەری هەبوو – و پێی وت: ئەمە چۆن بوو بە موڵکی تۆ؟ وتی: ئەمیری باوەڕداران پێی دام، عومەریش وتی: یان ئەیگێڕیتەوە بۆ بەیتولمال یان دەبێ مۆڵەتم بدەیت کەلێت جیاببمەوە، چونکە من پێم ناخۆشە من و تۆ و ئەو گەوهەرە لە ماڵێکدا بین [1].

هەروەها عومەر هۆی حەزنەکردنی لەو گەوهەرەی بۆ ڕوون کردەوە و وتی: من ئەزانم مەسەلەی ئەم گەوهەرە چۆنە و باوکت چۆن هێناویەتی، جا ڕات چۆن بیخەینە سندوقێکەوە بیخەنە ئەو سەری بەیتولماڵەوە، ئەگەر هیچ لە بەیتولمال دا نەما ئینجا ئەیبەخشین، ئەگەر منیش مردم ئەوە ئەیگێڕنەوە بۆ تۆ، وتی: چی ئەکەی بیکە، ئەویش بەو شێوەی کرد، بەڵام پێش ئەوەی نۆرەی بەخشینی بێت کۆچی دوایی کرد(ڕەزای خوای لێ بێت).

پاش کۆچی دوایی عومەر یەزیدی کوڕی عبدالملك گەوهەرەکەی گێڕایەوە بۆ فاتمە، بەڵام ئەو وەری نەگرتەوە و وتی: واز لە شتێك ناهێنم و دواتر وەری بگرمەوە، ئەوە بوو یەزید لە نێوان ژن و مناڵەکانی خۆیدا دابەشی کرد [2].

- **هەڵگرتنی ستەمی بەنی ئومەییە**: دوای دەستپێکردنی لە خۆیەوە عومەر بنەماڵە و ئامۆزاکانی لە ئەندامانی بنەماڵەی ئەمەوی بەسەرکردەوە ز هەرکە لە بەخاکسپاردنی سولەیمانی کوڕی عبدالملك ی ئامۆزای بوویەوە، شتانێکی زۆر سەرسوڕهێنەری بینی کە ئەویش ئەوەبوو کە ئامۆزاکانی ڕواڵەتی زۆری دەسەڵات و پاشایەتیان داهێنا بوو کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) یان خەلیفەکانی ڕاشدین دا نەبوو، پارە و پوڵێکی زۆریان سەرف دەکرد لە پێناو خۆ دەرخستن و بەگەورە دەرکەوتن لەبەردەم ژێر دەستەکاندا، لەوانەش ئەو کەژاوانەی خەلیفەکە لە چەند ئەسپ و حوشتر و هێسترێك پێك دەهات و هەر

---

[1] – عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ٢١٢ الطبقات:(٥ / ٢٩٣).

[2] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٥٢، ٥٣.

ولاخێك كەسێكی لەگەڵدا بوو، هەروەها ئەوە هەمووە كۆشك و فەرش و ڕاخەرەنایابەی كە بۆ خەلیفەی نوێ ئامادە ئەكرا.

هەروەها سەرسام بوو بەو پۆشاكە نوێ و شوشە عەتر و كەلوپەلەی كە پێ بەخشرا بەبیانووی ئەوەی كە خەلیفەی پێشوو بەكاری نەهێناوە و ئێستا موڵكی ئەمە، دیارە هەموو ئەمانەش زیادەڕەوی وبەفیڕۆدانی سامانە و، هیچ پاساوێكی شەرعی نیە لە كاتێكدا كە بەیتولمالی موسڵمانان پێویستی بە هەر درهەمێك هەیە كە سەرف دەكرێت بۆیە لێرەدا عومەر فەرمانی دا بە موزاحیمی خزمەتكاری كە هەموو ئەوانەی كە پێشكەشی كراوە بیفرۆشێ و پێشكەشی بكات بە بەیتولمالی موسڵمانان [1].

هەروەها عومەر سیاسەتێكی دیاریكراوی هەبوو بۆ نەهێشتنی ستەم و گێڕانەوەی ئەو شتانەی كە بنەماڵەی ئەمەوی زەوتیان كرد بوو هێڵە گشتیەكانیشی لەگەڵ وەرگرتنی خیلافەتدا بۆ ڕوون بوویەوە، كاتێ كە پاش بە خاكسپاردنی سولەیمان ئەندامانی بنەماڵەی ئەمەوی هاتن و داوای ئەو شتانەیان لێكرد كە خەلیفەكان ڕایان هێناون لەسەری، كاتێ كە عبدالملك ی كوڕیشی ویستی دووریان بخاتەوە لێی عومەر سیاسەتی خۆی بۆ ئاشكرا كرد و وتی: چیان پێ ئەڵێیت؟

وتی: ئەڵێم باوكم سەلامتان لێ ئەكات و ئەڵێت: ﴿ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴾ الزمر: ١٣). واتە:(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ بەڕاستی من دەترسم ئەگەر سەرپێچی پەروەردگارم بكەم لە سزای ڕۆژێكی گەورە(قیامەت).

پاشان ڕوونتری كردەوە بۆی كاتێ داوای لێ كرد كە پەلەبكات لە سەندنەوەی هەموو شتەكان لێیان و گێڕانەوەی مافەكان، ئەویش وتی: كوڕم، ئەوان ئەم مەسەلەیان گرێ لە دوای گرێ و ئەڵقە لە دوای ئەڵقە پێكەوە ناوە ئەگەر پەلەبكەم لە سەندنەوەی لێیان ئەترسم هەموو بچن بەگژمدا و خوێن بڕیژێت، چونكە سوێند بە خوا نەمانی دونیام لەوە پێی باشترە كە بەهۆی منەوە دڵۆپە خوێنێك بڕێژرێت.

ئایا ڕازی نابیت باوكت هەر ڕۆژە سوننەتێك زیندوو بكاتەوە و بیدعەیەك لەناو بەرێت، هەتا ئەو ڕۆژەی كە خوای گەورە خۆی دادوەری تیادا دەكات و هەر ئەویش باشترین دادوەرە [2]؟

---

[1] - عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ٢١٣.

[2] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزی، ل: ٢٦٠، ٢٦٣.

پاشان زیاتر ئەم سیاسەتەی ڕوونکردەوە کاتێ عبدالملك ی کوڕی پێی وت: بۆ ئەوەی کە ئەتەوێت نایکەیت؟ سوێند بەخوا بەلامەوە گرنگ نیە ئەگەر پێکەوە لە یەك مەنجەڵدا بمانکوڵێنن، عومەر وتی: ئەمەت بەڕاستە وتی: بەڵێ، وتی: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لە نەوەی مندا کەسێکی داناوە کە هاوکاریم بکات لە کاروباری ئاییندا، ئەگەر ئەوەی دەیڵێ ی بیکەم ئەترسم پێیان قبوڵ نەکرێت. ئەگەر قبوڵیشی نەکەن ئەبێ شمشێر بەکاربێنم، خێریش لە خێرێکدا نیە کە تەنها لە ڕێ شمشێرەوە بێت، کوڕم من خەڵکی فێری وەرزش و ڕاهێنانێکی قورس دەکەم، جا ئەگەر تەمەن مۆڵەتم بدات ئەوە ئومێدەوارم کە خوای گەورە ویستم بەدی بێنێت، ئەگەر پێش ئەوەش مردم ئەوە خوای گەورە خۆی دەزانێ مەبەستم چی بوو [1].

بەم شێوەیە عومەر شێوازی دانایانە و نەرم ونیان دەگرێتەبەر بۆ جێبەجێکردنی سیاسەتەکانی و ڕێخۆشکەری و زەمینە سازی بۆ هەنگاوی کۆتایی کردووە بە چەند هەنگاوێك کە یەکەمیان ئەوەیە کە لەخۆیەوە دەست پێ بکات و هەرمافێکی لایە بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانی یاخود بۆ بەیتولمال، پاشان ڕووی کردە بنەماڵەی ئەمەوی و کوڕەکانیانی کۆکردەوە و داوای لێکردن ئەو زەوی و سامانەی کە بە ناڕەوا وەریان گرتووە بیگەڕێننەوە [2].

بەم شێوەیە ڕۆژەکانی سەرەتای حوکمی عومەر لێ سەندنەوەی چەندین موڵك و سامانی بەخۆوە بینی کەلای بەنی ئومەییە بوو، و پێشتر لەسەردەمی دەسەلاتی ڕەهایاندا کۆیان کردبوویەوە ئەوە بوو هەموو ئەوانە گێڕدرایەوە بۆ بەیتولمال و بوو بە موڵکی گشتی و هیچ کەس و کۆمەڵ و بنەماڵەیەك قۆرخی ناکات بۆ خۆی، ئەو هەمووە موڵك و سامانە جۆربەجۆرە بە چەندین شێواز کۆکرابوویەوە عومەر هەمووی لێ سەندنەوە و بەڵگەنامەکانیشی یەك لە دوای یەك دڕاند و گێڕایەوە بۆ شوێنی دروستی خۆی، ئەم موڵك و سامانەش هێندە زۆر بوو بەمەزەندەی عومەر(ﷺ) لە نیوەی موڵك و ماڵی بەیتولمال تێپەڕێ کردبوو [3].

بەم شێوەیە پاش چەند ڕۆژێك بەنی ئومەییە خۆیان بەدارنراوی لە هەموو شتێك بینیەوە جگە لە ماڵی ئاسایی و سروشتی خۆیان، بۆیە بەم سیاسەتەی عومەر تەنگاو بوون و نەیاری خۆیان نیشان دا،

---

[1] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٢٦٢، ٢٦٣.

[2] – عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ٢١٥.

[3] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ١١٥.

بەلام ئاخۆ وەلامی عومەر چی دەبێت، ئەوە بوو عومەر پێی وتن: سەیرکەن، سوێند بەخوا ئەمەوێ ستەمێك نەبێت لەسەر زەوی دا هەڵم نەگرتبێت ئەگەر چی بۆ هەڵگرتنی هەرستەمێکیش ئەندامێکی جەستەم لەدەست بدەم [1]، بەلام بەنی ئومەیە لەبەرامبەر ئەم سوور بوون و توندیەیدا بێ ئومێد نەبوون، چونکە بە خەیاڵیاندا نەهاتووە رۆژێ لە رۆژان بەو شێوە دابڕنرێن لەکەل و پەل و ئیمتیازەکانیان بۆیە کۆبوونەوە و داوایان کرد لە یەکێك لە کورەکانی وەلید کە گەورە و ئامۆژگاریکریان بوو، کە نامەیەك بنوسێت بۆ عومەر، ئەویش بۆی نووسی: پاشان تۆ خەلیفەکانی پێش خۆتت لەبیر بردۆتەوە و لە رێبازی ئەوان لاتداوە و کارەکانی ئەوانت بەستەم لە قەڵەم داوە بۆ کەمکردنەوەی کارەکانیان و شکاندنی خۆیان و وەك قسە وتنێك بە کوڕ و نەوەکانیان ئەمەش مافی تۆ نیە، چونکە پەیوەندی خزمایەتیت پچڕاندووە و بەشێوەیەکی ناڕەوا لەگەڵ خزمەکانتدا جولاّیتەوە، هەروەها ماڵ و سامانی قورەیشت بە ناڕەوا هێنایە ناو بەیتولمالی خۆت جا لە خوا بترسە ئەی کوڕی عبدالعزیز، ئەو مافانە بیگێڕەوە ن چونکە تۆ ناتوانی دڵنیا بیت لە مینبەرەکەت ئەگەر بەو شێوەیە خزمەکانت لە خۆت بکەیت، سوێند بەو خوایەی کە رێز و پلەوپایەی بەخشیوە بە(ﷺ) لە خەلیفایەتیتدا تەنها لە خوا دوورکەوتوویتەوە لە کاتێکدا کەوا پیشانی دەدەیت کە وەك بەلا سەیری دەکەیت و تووش کراویت، جا وریابە ئاگات لە ئارەزوو بڕیارەکانت بێت [2] لەم نامەیەشدا رەخنەی ئەمەوییەکان لە سیاسەتی عمر لەم خالانەدا دەردەکەوێت:

- پێچەوەانەی خەلیفەکانی پێش خۆی رەفتاری کردووە و ئەمەش سوکایەتی پێکردن و لە کەدارکردنیانە.
- خراپ رەفتاری لەگەڵ منالّی خەلیفەکانی پێش خۆیدا کردووە.
- کارەکانی لەگەڵ حەق دا ناگونجێن.
- بچڕاندنی پەیوەندی لەگەڵ بنەماڵەکەیدا هەڕەشە لە پۆستی خەلافەتی ئەکات.

گومانیش لەوەدا نیە کە سیاسەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز هەڕەشەیە بۆ پێگەی بنەماڵەی ئەمەوی و دەسەلاتی بەرەو لاوازی دەبات و لەوانەشە وایان لێ بکات هەڵوێستی توند بەرامبەر بە

---

[1] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ١٤٧ – ١٥١.

[2] – هەمان سەرچاوە، ل: ١٢٦ – ١٢٧، عمر بن عبدالعزيز صالح العلي، ل: ١٩٤.

خەلیفە وەرگرن، ئەمەش مەترسیەکی گەورەیە بۆ سەر عومەر و پۆستی خیلافەتیش [1]. وەلامی عومەریش بلێسەی ئاگری حەق و گرکانێك بوو بەڕوویاندا و نووسی: وەیل بۆ تۆ و بۆ باوکت چەند دوژمن و سکالاکەرتان زۆرە لە ڕۆژی قیامەتدا... پەلەمەکە ئەگەر تەمەن مۆڵەتی دام و خوا حەقی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانی ئەو کاتە دەستم بۆ تۆ و بنەماڵەکەت خاڵی دەبێت و ئەو کات هەموو ناحەقیەکان دەخەمە ڕوو، چونکە ئێوە هەمیشە حەقتان پشت گوێ خستبوو... [2]

• **بەنی ئومەییە پەنا بۆ شێوازی گفتوگۆی هێمنانە دەبەن:** هەر کە بەنی ئومەیە دڵنیا بوون لە خۆڕاگری عومەر لەبەرامبەر نەیاری و بەرهەڵستکاری بەکۆمەڵیاندا، پەنایان برد بۆ شێوازی گفتوگۆی هێمنانە، بەڵکو لە ڕێی ئەمەوە بە ئامانجەکانیان بگەن، ئەوە بوو ڕۆژێك لە ڕێ خزمایەتی و دۆستایەتیەوە دەهاتن و ئەویش وەلامی ئەوە بوو: کە ئەگەر پارەی خۆمتان دەوێ باشە، بەلام ئەم سامانە – بەیتولمال –پشکی ئێوە تیایدا وەك پشکی هەرتاکێکی ترە لە موسڵمانان، سوێند بەخوا ئەگەر خەڵکی زەوی وەك ئێوە بیریان بکردایەتەوە ئەوە سزای خوایان بۆ دادەبەزی [3].

ڕۆژێکیشیان هشامی کوڕی عبدالملك هاتە لای و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من نێردراوی خزمەکانتم بۆلات، ئەوان ئەڵێن: تۆ بەڕای خۆت کار بکە لەوەی کە لە ژێر دەستدایە، بەلام واز لەوشتانە بێنە کە خەلیفەکانی پێش تۆ بەخشیویانە، عومەریش زۆر بەسادەیی وەلامی دایەو وتی: ئەگەر دوو تۆمارم بۆ بێنن یەکێیان هی موعاویە و ئەوی تر لە عبدالملیکەوە بێت، پێت وایە دەبێ کامیان ڕەچاو بکەن؟

وتی: ئەوەیان کە کۆنترە، عومەریش وتی: دەی من کار بە قورئانەکەی پەروەردگار دەکەم کە پێش هەموو شتەکان هاتووە و خۆم و ئەوانەی پێش خۆشم ی پێوە پابەند دەکەم [4].

---

[1] – عمر بن عبدالعزيز صالح العلي، ل: ١٩٥

[2] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ١٤٧ – ١٥١.

[3] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزى، ل:١١٤ - ١١٥.

[4] – هەمان سەرچاوە، ل: ١١٨ – ١١٩، ملامح الانقلاب الاسلامي في خلافة عمر بن عبدالعزيز د. عمادالدين خليل، ل: ١١٧، ١١٨.

**• بەنی ئومەیە پوری عومەری کوڕی عبدالعزیز دەنێرن:** کاتێ کە پیاوانی بەنی ئومەیە دەستە و سان بوون لە بەرامبەر عومەردا و نەیانتوانی چاوترسێنی بکەن یاخود نەرمتر ببێت لەبەرامبەریاندا، پەنایان برد بۆپوری – فاتیمەی کچی مەروان – ئەم پورەشی بەبێ مۆڵەت دەچووەلای خەلیفەکان و هیچ داوایەکی ڕەت نەدەکرایەوە هەموویان ڕێزیان لێ دەنا عومەریش پێش بوونی بە خەلیفە بەهەمان شێوە بوو لەگەڵیدا، کاتێ چووە ژوورەوە بۆ لای عومەر ڕێزی لێناو پێشوازیەکی گەرمی لێکرد و ڕاخەرێکی بۆ ڕاخست، ئەویش وتی: خزمەکانت گلەیی ئەوەت لێ دەکەن کە تۆ خەیری کەسانی ترت لێ سەندونەتەوە، عومەریش وتی: شتێکم لێ قەدەغە نەکردوون کە مافی خۆیان بوو بێت، ئەویش وتی: من گوێم لێ بوو باسیان دەکرد و ئەترسم ڕۆژێك لێت یاخی بن، عومەریش وتی: هەر ڕۆژێك کە لێی بترسم جگە لە ڕۆژی دوایی خوای گەورە لە شەڕی نەمپارێزێت، ئەڵێ: پاشان داوای دینارێك و ئاگردانێکی کرد و دینارەکەی خستە ناویەوە تا گەرم بوو و سووربوویەوە پاشان فڕەی دایە سەر سکلێ و کزەی هات و وتی: پوورە ئەمە زۆرینە بۆ برازاکەت [1] ؟!

دیارە پوریشی بەم دیمەنە کاریگەر دەبێت و ئاوەڕدەداتەوە لە عومەر و داوای لێ دەکات کە بەردەوام بێت لە قسەکردندا، عومەریش وەك ئەوەی تابلۆیەکی هونەری جوان بۆ ئەودادگەریە کۆمەڵایەتیە بکێشێت کە ئیسلام هێناویەتی هەتاوەکو خێرو خۆشیی بۆ هەمووان دەستبەر بکات و وتی: خوای گەورە محمدی وەك ڕەحمەتێك نارد وە بۆ خەڵك نەك وەك سزا، پاشان بردیەوە بۆلای خۆی و ڕووبارێکی لە پاش خۆی بەجێ هێشت کە هەمووان وەك یەك لێ ی دەخۆن پاشان ئەبوبەکر بوو بە خەلیفە وڕووبارەکەی وەك خۆی هێشتەوە، پاشان عومەر بوو بەخەلیفە و بەهەمان شێوەی ئەوانی کرد، پاشان یەزید و مەوران و عبدالملك و وەلید و سولەیمانی کوڕی لێیان هەڵگۆزی، هەتاوەکو کار گەشتە دەستی من و ڕووبارەگەورەکە وشکی کرد و شوێنەورای نەما هەتاوەکو بۆی بگەڕێنەوە، پوریشی وتی: بەسە، ئەم ویست قسە بکەیت جا ئەگەر ئەم مەقسەی تۆ بێت ئەوە من هیچ ناڵێم، پاشان گەڕایەوە بۆ لایان و قسەکانی بۆ گێڕانەوە [2].

---

[1] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل:١١٤ - ١١٥.

[2] – الكامل في التأريخ(٣ / ٢٧٠).

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە: کە پێی وتوون: ئێوە خۆتان واتان لە خۆتان کرد، هاوسەرگیریتان لەگەڵ نەوەی عومەری کوڕی خەتابدا کرد و ئێستا نەوەکەی لە باپیری ئەچێت، ئەوانیش بێدەنگ بوون [1].

**•نەمانی بەرهەڵستکاری بە کۆمەڵی بەنی ئومەیە:** هەر زوو بەرهەڵستکاری بەنی ئومەیە بە شێوەی بە کۆمەڵ کۆتایی پێ هات دوای ئەوەی توندی عومەریان بینی لەبەرامبەر سامانی ئومەتدا وتیان: دوای ئەمە هیچمان پێ ناکرێت [2].

پاشان هەریەکەیان بە جیا هەوڵی دەدا بۆ گێڕانەوەی بەشێك لەو سامانەی کە هەیبوو، بەڵام ئەو عومەرەی کە بە کۆمەڵ ڕووبەڕوویان بوویەوە، هەرگیز تاك تاك نەرمیان بەرامبەر نانوێنێت، چونکە بەلای ئەوە وە ماڵی گشتی جێی موساوەمەو مامەڵە پێوە کردن نیە [3].

أ- گێڕانەوەی ماف بۆ خاوەنەکانی: عومەر تەنها بە سەندنەوەی پارەو پوڵ لە بەنی ئومەییە وازی نەهێنا، بەڵکو هەنگاوێکی تری ناو ڕایگەیاند کە هەرکەسێك مافی بەسەر یەکێك لە ئەمیرەکانی بەنی ئومییەوە هەیە یاخود توشی ستەم بووە لەسەر دەستیان ئەوە با بەڵگە بێنێت و مافەکانی بۆ بگێڕێتەوە، ئەوە بوو کۆمەڵێك خەڵك سکالا یان تۆمار کرد و عومەریش یەك لە دوای یەك مافی بۆ دەگێڕانەوە، چ زەوی بوو بێت یان سامان کێڵگە یان خود کەل و پەل [4].

جارێکیشیان والی بەسرە کابرایەکی نارد بۆلای کە زەوی داگیر کرا بوو عومەریش بۆی گێڕایەوە، پاشان پێی وت: چەندت خەرج کردووە تا هاتوی بۆ ئێرە، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران پرسیاری خەرجیم لێ دەکەیت لە کاتێکدا کە تۆ زەویەکەت بۆ گێڕاومەتەوە کە لە سەد هەزار باشترە؟

عومەریش وتی: من تەنها مافی خۆتم بۆ گێڕاویتەتەوە، پاشان فەرمانی دا بە سەرف کردنی شەست درهەم لەبری خەرجی سەفەرەکەی [5]، ئیبن موسا ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز بەردەوام

---

[1] – هەمان سەرچاوە(٣ / ٢٧١).

[2] – عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٥٨، ٥٩، ملامح الانقلاب الاسلامي في خلافة عمر بن عبدالعزيز، ل: ١١٩.

[3] – ملامح الانقلاب الاسلامي في خلافة عمر، ل: ١٢٠.

[4] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ١٤٦، ١٤٧.

[5] –

بوو لە گێڕانەوە ماف و شتە زەتکراوەکان لەو ڕۆژەوە کە بوو بە خەلیفە هەتا ئەو کاتەی کە کۆچی دوایی کرد [1]، ئەوە بوو ڕۆژێکیان چەند کەسێك هاتنە لای کە کێشەیان لەگەڵ ڕۆحی کوڕی وەلیدی کوڕی عبدالملك دا هەبوو لەسەر چەند دووکانێك، و بەڵگەی ئەوان بەهێزتر بوو، عومەریش فەرمانی دا بە گێڕانەوەی دوکانەکان بۆیان، بەڵام بەدوادا چوونی بۆ مەسەلەکە نەکرد ئەوە بوو ڕۆحیش هەڕەشەی لە پیاوەکان کرد و یەکێك لە پیاوەکان عومەری ئاگادار کردەوە، عومەریش فەرمانی دا بە یەکێك لە پاسەوانەکان کە شوێن ڕۆح بکەوێت و ئەگەر دووکانەکانی نەگێڕایەوە بۆ خاوەنەکانی ئەوە بدات لە ملی، ئەوە بوو ڕوح ترساو دەستی لە دووکانەکان هەڵگرت [2]، هەروەها عومەر زەویەکی گێڕایەوە کە کۆمەڵێ عەرەبی دەشتەکی چاند بوویان و پاشان وەلیدی کوڕی عبدالملك لێی سەندبوون و دابووی بە یەکێك لە خزمەکانی، عومەریش وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ:(هەرکەس زەویەکی مردوو زیندوو بکاتەوە – واتە بیچێنێت – ئەوە ئەبێت بە موڵکی) [3].

هەروەها ئالوبەیتی خۆش دەویست و مافەکانیانی بۆ گێڕانەوە و جارێکیان بە فاتیمەی کچی علی کوڕی ئەبو تالیبی وت: ئەی کچی عەلی سوێند بەخوا لەم سەر زەویەدا خێزانی تیادا نیە هێندەی ئێوە خۆشەویست بێت لام و ئێوەم لە خیزانەکەی خۆشم خۆشتر دەوێت [4].

ب- هەستانی بە لابردنی سەرجەم فەرمانڕەوا و کاربەدەستە ستەمکارەکان: کاتێ کە عومەری کوڕی عبدالعزیز کرا بە خەلیفە هەستا بە لابردنی سەرجەم کاربەدەست و والیە ستەمکارەکان لەسەرکارەکانیان لەوانەش خالیدی کوڕی ڕەیان و بەرپرسی پاسەوانەکانی سولەیمانی کوڕی عبدالملك کە لە گەردنی هەرکەسێکی دەدا کە سولەیمان بیوتایە، لە جێی ئەویش دا عەمری کوڕی موهاجیری ئەنساری دانا.

هەروەها عومەر وتی: ئەی خالید واز لەم شمشیرە بێنە، خوایەگیان ئەوە من خالیدی کوڕی ڕەییانم دابەزاند لەبەر تۆ خوایە هەرگیز بەرزی نەکەیتەوە، پاشان وتی بە عەمری کوڕی موهاجیر،

---

[1] – الطبقات لابن سعد(٥ / ٣٤١).

[2] – سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٦٠

[3] – صحيح الجامع للالباني ژمارە: ٢٧٦٦.

[4] – سيرة و مناقب عمر لابن الجوزى، ل: ١٣١ السياسية الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٤٥.

سوێند بەخوا تۆ ئەزانیت ئەی عەمر، کە لە نێوان من و تۆدا هیچ خزمایەتیەك نیە جگە لە ئیسلام، بەڵام من زۆر گوێم لە قورئان خوێندن و چاوم لە نوێژ کردنی تۆ بووە لە شوێنێکدا کەوات دەزانی کەس ناتبینێت و نوێژەکەتم بەلاوە پەسەند بوو، ئەم شمشێرە بگرە ئەوە کرد میت بە بەرپرسی پاسەوانەکانم [1]، بەم شێوەیە عومەر ستەمکارانی لەسەرکار لادەبرد و ئەم شێوازەی پەیڕەو دەکرد بۆ هەڵبژاردنی والی و داد وەر و نووسەر و هتد.

ئەو بە دوای باشترین کەسدا دەگەڕا لە ڕووی دینداری و پاکیەوە، کاتێ کە ڕەخنەشی لە یەکێك لە کار بەدەستەکانی گرت، دارێکی هێنا بە نێوان هەردوو چاوی داو وتی: ئەمەت منی خەڵەتاند مەبەستی ئاسەواری کڕنوش بردن بوو لە دەم و چاوی دا، کە نیشانەیە کە لە نیشانەکانی چاکی مرۆڤ و بەڵگەیە لەسەر زۆر کڕنووش بردن بۆ پەروەردگار، لەبەر ئەم هۆیەش عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەم کابرایەی هەڵبژارد، هەروەها عومەر تەنها بەڕواڵەتی کەسێك وازی نەدەهێنا، بەڵکو تاقیشی دەکردەوە ئەوە بوو کابرایەکی بینی کە زۆر نوێژی دەکرد و ویستی تاقی بکاتەوە بۆ ئەوەی کارێکی پێ بسپێرێت، بۆیە لە کەسە نزیکەکانی خۆی نارد و پێی وت: ئەی فلان تۆ دەزانی کە من چ پلەوپایە یەکم هەیە لەلای ئەمیری باوەڕداران جا ئەڵێی چی ئەگەر وای لێ بکەم کە بتکات بەوالی یەکێك لە شوێنەکان؟

کابراش وتی: موچەی یەك ساڵت دەدەمێ، پاشان کابرا هاتەوە و عومەری ئاگادار کردەوە ئەویش وازی لێ هێنا، چونکە لە تاقیکردنەوەدا دەرنەچوو [2].

هەروەها لە ناو ئەو کەسانەدا کە عومەر ی کوڕی عبدالعزیز لەسەر کار لایبردن: ئوسامەی کوڕی زەیدی تەنوخی کە بەرپرسی خەراج بوو لە میسردا، چونکە ستەمکار و فێڵزان بوو و دەستدرێژی دەکرد سەر خەڵك و بە ناحەق سزای بەسەردا دەسەپاندن دەست و قاچی پێچەوانە دەبرین – بە بێ ئەوەی مەرجی بڕینی تیابێت – عومەریش فەرمانی کرد بە کۆت و بەند کردن و زیندانی کردنی ساڵێك لە میسر و ساڵێك لە فەلەستین دا بە مەرجی کە لە کاتێ نوێژدا دەستی والآ بکرێت پاشان عومەر کۆچی دوایی کرد و یەزید بوو بە خەلیفە و ئوسامەی گێڕایەوە سەر کارەکەی

---

[1] – سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن الجوزی، ل: ٥٠.

[2] – فقه عمر بن عبجالعزیز د. محمد شقیر(١ / ٩١).

خۆی له میسردا [١]، هەروەهاعومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی و فەرمانی دا بە لەسەر کار لابردنی یەزیدی کوڕی ابی مسلم لە ئەفریقیە کـە بەرپرسـێکی سـتەمکار بـوو هـەموو فەرمانـەکانی سوڵتانی دەسەپاند و گوێی بە دادگەری و حەقڕەوی نەدەدا، و زۆر تەسبیحات و زیکری دەخوێند و فەرمانی دەکرد بە ئازاردانی خەڵکی و ئەیوت: ﴿ سبحان الله والحمد لله ﴾ هـەروەها سـزای تونـدتر دەکرد و ئەیوت: ﴿ لا اله الا الله و الله اکبر ﴾ و ئەمەش خراپترین کاری بوو، عومەریش بەنامەیـەك لەسەر کار لایبرد [٢]، بەم شێوەیە عومەر بەردەوام بوو لەسەر لابردنی کار بەدەسـتە سـتەمکارەکان و دامەزراندنی خەڵکانی باش لە شوێنیاندا، دواتریش بـاس لـە مامەڵـەی عومـەر لەگـەڵ والیەکانیـدا دەکەین بە پشتیوانی پەروەردگار.

ج- هەڵگرتنی ستەم لەسەر خزمەتکارەکان(مـوالي): خزمـەتکارەکان پـێش عومـەر(ﷺ) تووشـی ستەمی زۆر دەبوون و سەرانە لەسەر موسڵمانەکانیشیان دانرا بوو، و کـۆچ کردنیـشیان لـێ قەدەغە کرا بوو وەك لە عێراق و میسر و خوراسـان لەسـەردەمی عبـدالملك دا ڕووی دا و حـەججاجیش سـتەمێکی زۆری لـێ کـردی و هەسـتا بـە سـەپاندنی سـەرانە بەسـەر موسڵمانەکانیاندا و ڕێنەدان بە کۆچکردنیان لە گوندەکانیانـەوە ئەمـەش وایلێکـردن کـە لـە ڕاپەڕینی ئیبن ئەلئەشعەث دا بەشداری بکەن، هەروەها لـە میـسر و خوراسانیـشدا ستەم لـە خزمەتکار و - موالي - یەکان دەکرا، بۆیە کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز کـرا بـە خەلیفـە ستەمی لەسەر هەڵگرتن و نامەیەکی نووسی بۆ کار بەدەست و والیەکانی کە تیایدا هاتبوو:.. هەر کەسێك - جولەکەیان گاور یاخود ئاگر پەرست - موسڵمان ببێت لە خـەڵکی جـەزیرە و تێکەڵاوی موسڵمانان بکـات و شـوێنی خـۆی بـە جـێ بهێڵێـت ئـەوە ئـەرك ومـافی وەك موسڵمانان وایە و پێویستە لەسەر موسڵمانەکانیش کە تێکـەڵاوی و دڵنـەوایی بکـەن، بـەڵام زەوی وماڵەکەی کە جێ ی هێشتووە دەبێت بە فەیئ و لە پێنـاو خـوادا سـەرف دەکرێـت، بەڵام ئەگەر پێش ڕزگار کردنی ئەو ناوچەیە موسڵمان بووبن ئەوە موڵکی خۆیانە [٣].

---

[١] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٣٢.

[٢] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٣٢ - ٣٣.

[٣] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٧٨ - ٧٩.

هەروەها نامەیەکی نووسی بۆ کار بەدەستی خۆی لەمیسردا حەبیبانی کوڕی شورەیح و تیایدا ئەیوت: سەرانە لابەرە لەسەر هەر کەسێك کە موسڵمان بووە، چونکە پەروەردگاری باڵا دەست ئەفەرموێت: ﴿ قَٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلْحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعْطُوا۟ ٱلْجِزْيَةَ عَن يَدٍ وَهُمْ صَٰغِرُونَ ﴾ التوبة: ٢٩).
واتە: جەنگ بکەن لەگەڵ ئەوانەی کە بڕوا ناهێنن بەخوا و بەڕۆژی دوایی وە بەرحەرامی دانانێن ئەوەی کە خوا و پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە وە مل کەچ ناکەن بۆ ئاینی ڕاست لە ئەوانە کتێبیان پێ بەخشراوە هەتا باج و سەرانە دەدەن بە دەستی خۆیان و بە مل کەچی لە کاتێکدا ئەوان سەرشۆڕ و ڕیسوان.

بەڵام ئەم کاربەدەستە نامەیەکی نووسیەوە بۆ عومەر و ئەیوت: پاشان: ئەو مەرجی موسڵمان بوونە زیانی گەیاندوە بەسەرانە و بەڕادەیەك کە من لە حارسی کوڕی ثابتەوە بیست هەزار دینارم قەرز کردوە، جا ئەگەر ئەمیری باوەڕداران ڕازی بێت بابۆی بگێڕنەوە [1]، وەڵامی عومەریش بەم شێوە بوو: پاشان نامەکەتم پێگەشت، من کاتێ بە کار بەدەستی میسرم دانایت ئاگاداری لاوازیت بووم، ئێستاش فرمانم بە نێردراوەکەم کردوە کە بیست قامچی بدات لەسەرت، و سەرانە هەڵگرە لەسەر موسڵمانان خوا ڕاکەت سەرکەوتوو نەکات، خوای گەورە محمدی(ﷺ) بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵك ناردوە نەك بۆ پارە کۆکردنەوە، جا ئەگەر ئەم نامەی منت بە دەست گەشت ئەوە سەرانەیان لێ وەرنەگریت، چونکە عومەر هێندە خۆشبەخت نیە کە هەموو خەڵك لەسەر دەستی موسڵمان بن [2].

لە ڕیوایەتێکی تریشدا لای ئیبن سەعد هاتووە، پاشان خوای گەورە محمدی(ﷺ) بۆ ڕێنماییکردنی خەڵك ناردووە نەك وەرگرتنی سەرانە، جا هەرکە ئەم نامەیەت بە دەست گەیشت ئەوە ئەگەر ئەو ئەهلی ذیمانە موسڵمان بوو بوون ئەوە بڕیارەکەت بدڕێنە و سەرانەیان لەسەر لابە [3].

---

[1] – الخطط للمقريزى(١ / ٧٨) عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ٢٣٣.

[2] – الخطط للمقريزى(١ / ٧٨) عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ٢٣٣.

[3] – الطبقات(٥ / ٣٨٤).

دیاره ئەم کاربەدەستەی عومەر لە میسردا تاکە کار بەدەستێك نەبوو کە ئەو داوایە پێشکەش بە عومەر بکات، بەڵکو کار بەدەست و والی کوفەش عبدالحمیدی کوڕی عبدالرحمن داوای لێکرد کە مۆڵەتی پێ بدات بۆ وەرگرتنی ئەو سەرانەیەی کە کەڵەکە بوو بوو لەسەر ئەو جولەکە و گاورانەی کە موسڵمان بوو بوون.

لێرەشدا عومەر زۆر بەڕاشکاوی وەڵامی دایەوە: نامەیەکت بۆ نووسیوم سەبارەت بە خەڵکانێکی گاور و جولەکە و ئاگر پەرستی خەڵکی حیرە کە موسڵمان بوون و سەرانەیەکی زۆریان لەسەر کەڵەکە بووە و ئەتەوێ مۆڵەتت بدەم بۆ وەرگرتنی سەرانە لێیان، لە کاتێکدا کە خوای باڵا دەست موحەمەدی وەك ڕێنمونیکار ناردووە نەك پارە کۆکەرەوە، جا هەر کەسێك لەوانە موسڵمان بووە تەنها زەکاتی لەسەرە و میراتیشی بۆ خزمەکانیەتی ئەگەر میراتی موسڵمانیان بۆ دەشیا، ئەگەر میراتگریشی نەبوو دەدرێت بە بەیتولمال و بەسەر موسڵماناندا دابەش دەکرێت ئەگەر شتێکیش لە دەستی ڕوویدا ئەوە لە بەیتولمال بۆی قەرەبوو دەکرێتەوە و السلام [1].

هەروەها کار بەدەستی عومەر لە بەسرەدا – عدی کوڕی ارطاة – بۆی نووسی: پاشان خەڵکێکی زۆر موسڵمان بوون و ئەترسم باج و سەرانەکەم بکات، عومەریش وەڵامی دایەوە: لە نامەکەت گەیشتم، سوێند بەخوا حەز دەکەم هەموو خەڵك موسڵمان بن و من و تۆش ببین بە جوتیار و بەرهەمی دەستی خۆمان بخۆین [2].

ئەمە لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی قەدەغە کردنی کۆچکردن کە حەججاج بەسەر – موالی – و خزمەتکارەکانی عێراقدا سەپاندبووی، بەم شێوەیەش عومەر هەموو جۆرە ستەمێکی لەسەر خزمەتکار و مەوالیەکان هەڵگرت و مافە زەوتکراو و ئاسودەیی دەروونی بۆ گێڕانەوە و دووبارە لەگەڵ ڕۆڵەکانی تری ئوممەتی ئیسلامیدا لە یەکسانی و دادگەری بەهرەمەند بوون [3].

د- هەڵگرتنی ستەم لەسەر ئەهلی زیممە – خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان –: عبدالملك سەرانەی لەسەر خەڵکی قوبرس زیاد کرد و موعاویش کە خۆی هێرشی کردبوویە سەر قوبرس و ڕزگاری کرد و لەگەڵیاندا ڕێککەوتنی مۆر کرد لەسەر حەوت هەزار دینار و دڵسۆزی

---

[1] – الخراج لابي يوسف، ل: ١٤٢، عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ٢٣٤.

[2] – سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٩٩ — ١٠٠ لابن الجوزي.

[3] – عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ٢٣٤.

نواندن و ئامۆژگاری کردنی موسڵمانان، خەڵکی قوبرسیش لەسەر ئەم ڕێککەوتنەیان مانەوە هەتاوەکو سەردەمی عبدالملك ی کوڕی مەروان کە هەزار دیناری بۆ زیاد کردن و ئەمەش تا سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز بەردەوام بوو، بەڵام ئەو هەزار دینارەکەی لابرد [1].

هەروەها ئەم زیاد بوونە سەرانەی ئەهلی کیتابی عێراقیشی گرتەوە، بەڵام عومەر بەهەمان شێوە ئەمەشی نەهێشت، ئەمەش وەك سیاسەتێکی گشتی کە پێوەی پابەند بوو بۆ هەڵگرتنی ستەم لەسەر ئەهلی کیتاب هەتاوەکو بە ئاسودەیی و ئارامی لە ژێر سایەی دەسەڵاتی میهرەبان و دادگەری ئیسلامدا بژین، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کەلەنامەکەیدا بۆ کار بەدەستی بەسرە عەددی کوڕی ارطأة نووسیبوی: پاشان، خوای گەورە سەرانەی بۆ ئەو کەسانەدا ناوە کەپشت لە ئیسلام دەکەن و بێ باوەڕی هەڵدەبژێرن، تۆش سەرانە تەنها لەسەر ئە و کەسانەدا بنێ کە لە توانایاندا هەیە و وازیان لێ بهێنە بازەوی ئاوەدان بکەنەوە، چونکە ئەمە باشە بۆ گوزەرانی موسڵمانان و هێزێکە بۆیان لەبەرامبەر دوژمناندا، سەرنجی ئەو ئەهلی زیممانەش بدەکە لەلاتن، ئەگەر بەساڵا چوو و لاوازیان تیا بوو کە توانای کاسپی نەما بوو ئەوە لە بەیتولمالی موسڵمانان یارمەتی بدە، ئەگەر یەکێك لە موسڵمانان کۆیلەیەکی هەبوو توانای کاری نەمابوو ئەوە پێویستە لەسەری یارمەتی بدات هەتاوەکو دەمرێت یان ئازادی دەکات، چونکە بیستوومە کە ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتتاب بە لای پیاوێکی بەساڵاچووی ئەهلی زەیمەدا تێپەڕیوە کە سواڵی کردووە و فەرموویەتی: دادگەر نەبوین لەگەڵتا ئەگەر لە لاوێتی دا سەرانەمان لێ وەرگرتبێت و لە پیری دا دەست لێ هەڵگرین.

ئەڵێ: پاشان بە پێی پێویست لە بەیتولمال یارمەتی دا [2]، هەروەها سیاسەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ هەڵگرتنی ستەم لەسەر خەڵکی گەشتبووە ڕادەیەك کەلە نامەیەکیدا بۆ کار بەدەستی لە کوفەدا نووسی: بزانە کێ سەرانەی لەسەرە توانای بەسەر پارچە زەویەکەیدا ناشکێت و یارمەتی و سولفەی پێ بدە هەتاوەکو بتوانێ بەرهەمی هەبێت، چونکە ئێمە بۆ ساڵ و دوو ساڵ نامانەوێن [3].

هەروەها عومەر(ﷺ) داوای لە والیەکانی کرد کە بە بەزەیی و میهرەبان بن لەگەڵ ژێر دەستەکانیاندا و ڕێی نەدا بە ئازاردانی خەڵکی بەسرە بۆ سەندنی خەراج لێیان، ئەوە بوو کاتێ

---

[1] – فتوح البلدان، ل: ١٥٩، عمر سیاسته في رد المظالم، ل: ٢٤٠.

[2] – الاموال لابي عبيد، ل: ٥٧.

[3] – الاموال لابي عبيد، ل: ٣٢٠ عمر و سیاسته في رد المظالم، ل: ٢٤١.

عەددی کوڕی ارطأة کار بەدەستی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە بەسرەدا بۆی نووسی کە: خەڵکانێك لای ئێمە ئەو خەراجەی کە لەسەریانە نایدەن هەتاوەکو سزا نەدرێن، عومەریش وەڵامی دایەوە: کە بەڕاستی زۆر سەیرە بەلامەوە کە تۆ داوای مۆڵەتم لێ دەکەیت بۆ ئازاردانی خەڵك وەك ئەوەی من ببمە پارێزەر بۆ تۆ لە سزای خوا، وا دەزانی کە ڕەزامەندی من لە سزای خوا ڕزگارت دەکات، جا ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێ گەشت ئەوە هەرکەس پێی دایت لێ ی وەرگرە و ئەگەرنەشیدا و سوێندنی خوارد ئەوە وازی لێبێنە، چونکە ئەگەر ئەوان بەو تاوانانەوە بە خزمەتی خوا بگەن پێم خۆشترە لەوەی من بە ئازاردانی ئەوانەوە بەخزمەت خوا بگەم، والسلام [1].

هەروەها لەو ستەمانەی کە پێش عومەری کوڕی عبدالعزیز کرا بوو فڕاندنی کچ و ژنانی لواتە بوو لە باکووری ئەفریقیە – تونس – بەلام عومەر ئەم ستەمەی نەهێشت و ئەو ئافرەتانەی گێڕایەوە بۆ شوێنی خۆیان، ابو عبید باس دەکات و ئەڵێت: عومەری کوڕی عبدالعزیز دەربارەی لواتیەکان نووسی: هەرکەسێك هەر یەکێك لەوانەی ئازاد کردووە ئەوە هیچ نرخ و پارەیەکی لە سەرنیە، هەر کەسێکیش ئافرەتێك لەوانەی لایە ئەوە بالای باوکی خوازبێنی بکات، ئەگینا دەبێ بیگێڕێتەوە بۆ خزمەکانی، هەروەها ابو عبید ئەڵێ: کە ئەڵێ لەواتیەکان ئەمە لە لەواتەوە هاتووە کۆمەڵێکن لەبەربەرەکان کە پێیان دەوترا لەواتە پێشتر پەیمانیان لەگەڵ موسڵماناندا هەبوو، ئەوانەن کە ئین شەهاب باسی دەکردن و ئەیوت: عوسمان سەرانەی لەبەر بەرسەند، پاشان هەڵگەڕانەوە وژن و منالیان برا، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش بەهەمان شێوەی عوسمان(ﷺ) سەرانەی لەسەردانان [2].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز هەموو پارچە زەوی و کڵێسا و ماڵێکی بۆ گێڕانەوە کە پێشتر لێیان سەندرا بوو [3]، پاشان یەکێ لەوستەمانەی کە عومەری(ﷺ) نەیهێشت ئەوە بوو کە کۆتایی هێنا بە کارپێکردنی ئەهلی زیمە – ئەهلی کیتاب – کە پێشتر موسڵمانان پێیان وابوو کە دروستە ئەوان ئەهلی کیتاب بە کاربێنن بۆ بەرژەوەندی خۆیان، چونکە لە ڕێککەوتنی نێوانیاندا هیچ خالێکی وای تیادا نەبوو [4].

---

[1] – الخراج لابي يوسف، ل: ١٢٩.

[2] – فتوح البلدان، ل: ٢٢٦ – ٢٢٧.

[3] – عمر بن عبدالعزيز و سياسيته في رد المظالم، ل ل: ٢٤٥.

[4] – هەمان سەرچاوە، ل: ٢٤٥.

هەروەها نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستانی و ئەیوت:.. پێمان باشە کە خەڵکی خاوەن زەوی کاریان پێ نەکرێت بۆ موسڵمانان، چونکە ئەمە ئەچێتە بازنەی ستەمکردنەوە [1]، بەم شێوەیە عومەری کوڕی عبدالعزیز ستەمی لەسەر ئەهلی کیتاب هەڵگرت و هێمنی و ئارامی بۆ گێڕانەوە و بۆی ڕونکردنەوە کە ئەوان لە ژێر سایەی ئیسلامدا بە دڵنیایی و ئارامی بژین و دادگەری و لێبوردەیی ئیسلام دەیانگرێتەوە، و ئەتوانن کاروبارەکانیان لە ژێر سایەیدا بە باشی بەڕێوەببەن و ستەم و زیان و کۆیلایەتی نایانگرێتەوە و ماف و ئەرکیان پارێزراوە و شەرع بۆی دیاری کردوون و قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبەرچاوی گرتووە [2].

هـ- دادگەری لەگەڵ خەڵکی سەمەرقەند دا: کاتێ کە هەواڵی دانانی عومەری کوڕی عبدالعزیز بە خەلیفە گەشتە خەڵکی ئەوە بوو لەودیو دەریاوە – ماوراء النهر – خەڵکی سەمەرقەند کۆ بوونەوە و بە سولەیمانی کوڕی أبی السری یان وت: قوتەیبە نا پاکی لەگەڵ ئێمەدا کردووە و وڵاتی داگیر کردوین، ئێستاش خوای گەورە دادگەری باڵادەست کردووە، تۆش ڕێمان پێ بدە باوەفدێکمان بچێت بۆ لای خەلیفە و سکاڵای مانی پێ بگەیەنێت، جا ئەگەر حەقێکمان هەبوو پێمان دەدرێت، چونکە پێویستمان پێیەتی، ئەوە بوو سولەیمانیش ڕێ پێ دان، ئەوانیش وەفدێکیان پێکەوەنا و چوونە لای عومەری عبدالعزیز، عومەریش نامەیەکی نووسی بۆ سولەیمانی کوڕی السری وتیایدا هاتبوو:

خەڵکی سکاڵای ستەمێکیان هێناوەتە لام کە لێیان کراوە و قوتەیبە زەوی لێ زەوت کردوون جا هەرکە ئەم نامەیەی منت بە دەست گەیشت ئەوە دادوەریان بۆ دابنێ با لە کێشەکەیان بکۆڵێتەوە ئەگەر دادوەر لەبەرژەوەندی ئەوان بڕیاری دەرکرد ئەوە موسڵمانان لە شار دووربخەرەوە بۆ سەربازگەکانی پێشوو یان پێش ئەوەی قتیبە هێرشیان بۆ بکات.

ئەوە بوو سولەیمانیش جومەیعی کوڕی حازری داناو ئەویش بڕیاری دا کە عەرەبی سەمەرقەند شارەکە بە جێ بهێڵن و سەر لەنوێ هێرشی بۆ بکەنەوە یاخود ڕێککەوتنێکی تازەیان لەگەڵدا بکەن، خەڵکی صُغْدیش وتیان [3]، نەخێر ئێمە ڕازین بەمانەوە یان و لەگەڵیاندا ناجەنگێین [1]، ئایا چ

---

[1] – سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن عبدالحکم، ل: ٨٣.

[2] – عمر بن عبدالعزیز و سیاسته في رد المظالم، ل: ٢٤٨.

[3] – خەڵکانێکن نیشتەجێ ناوچەی پشت دەریان – واتە ئەو دیو دەریای خەزەر.

دەوڵەتێك لە سەدەی سیستەم دا بەم شێوەیە سەری بۆ دادگەری نەوی دەكات هەتاوەكو دادگەری ڕێڕەوی خۆی وەرگرێت و حەق بگەڕێتەوە بۆ خاوەنەكانی؟ یاخود چ فەرمانڕەوایەك هەبووە لە مێژووی گەلانی بێ باوەڕدا كە بەو شێوەیە بەدەم ئەو خەڵكە ستەملێكراوە وە هاتوون كەمافیان پێشێل كراوە و بەو خێراییە وەڵامی داونەتەوە؟

دیارە ئەمە تەنها لەو بەرپرسە باوەڕدارە دەوەشێتەوە كە خۆی تەرخان كردووە بۆ بەرگری كردن لە بەهاكانی دادگەری و حەق لەسەر ڕووی زەوی دا، چونكە بە بێ ئەو دووانە شەرعیەتی پەروەردگار باڵا دەستی و پێگەی بە هێزی خۆی لە دەست دەدات [٢].

ئەمە نموونەیەكی بەرزی دادگەری عومەرە و ئێمەش تێبینی چەند شتێك لەم ڕووداوەوە دەكەین:

- كاتێك كە فەرمانڕەواكان دادگەر بوون خەڵكی ڕوودەكەنە سكاڵا كردن و داواكردنی مافەكانیان، چونكە دەزانن كە داواكانیان بەجدی وەردەگیرێت و دادگەرانە بڕیاری لەسەر دەدرێت، ئەوەتا ئەو خاوەن سكاڵایانە لەسەردەمی وەلید و سولەیماندا بێدەنگ بوون، بەڵام كاتێك كە دادگەری عومەریان بینی كێشە و سكاڵاكانیان خستە ڕوو.
- ئەمیری باوەڕداران عومەری كوڕی عبدالعزیز كێشەكەیانی پشت گوێ نەخست، بەڵكو ئاڕاستەی قەزای شەرعی كرد و ئەمەش نموونەیەكە بۆ ملكەچی بۆ ئیسلام و خۆدارنین لە ئارەزووی دەروون، دیارە ئەیتوانی وەك زۆرێك لە بەرپرسان بكات و وتاری هەڕەشە ئامێز و گەڕان بەدوای سەرانیان و سزادانیان پیا دەبكات، بەڵام ئەو خۆی یەكلاكردبوویەوە بۆ نەهێشتنی ستەم و چەسپاندنی دادگەری، ئەمەش تەنها بە حوكم كردن و پەنابردن بۆ شەرع دەكرێت.
- خەڵكی سەمەرقەند كاتێ نامەكەی ئەمیری باوەڕدارانیان بینی، خەڵكانی ژیریان پێیان وا بوو كە ئەوان لە هەردوو حاڵەكەدا دۆڕاون، بێدەنگ بوون، چونكە یان دەبێ بجەنگێن یان كێشەكە دەدۆڕێنن ئەمەش بەوان نەدەكرا بۆیە مانەوەی بارودۆخەكەیان بەو شێوەیە بەباشتر زانی كاتێ هەستیان بە دادگەری دەسەڵاتی ئیسلامی كرد [٣].

---

[١] – تأريخ الطبري،(٧ / ٤٧٢).

[٢] – ملامح الانقلاب الاسلامی في خلافة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٦٨.

[٣] – التاريخ الاسلامی(١٥، ١٦، ٦٢).

و- پەسەند کردنی کەمترین بەڵگە بۆ گێڕانەوەی ماف و نەهێشتنی ستەم: بەهۆی بەئاگابوونی عومەر لە خراپی و ستەمکاری خەلیفە و والیەکانی پێش خۆی بە جۆرێك کە ستەمکردن بوو بووە کارێکی ئاسایی، بۆیە داوای بەڵگەی زۆری لە خاوەن داوا نەدەکرد و بەبەڵگەیەکی کەم وازی دەهێنا و هەرکە جۆری ستەمەکەی بۆ ڕوون بوایەتەوە مافی خۆی بۆ دەگێڕایەوە و بەڵگەی زۆری داوا نەدەکرد، ئیبن عبدالحکم دەیگێڕێتەوە و ئەڵێ: ئەبوزەناد وتی: عومەری کوڕی عبدالعزیز بە بێ بەڵگەی یەکلاکەرەوە مافی خەڵکی دەگێڕایەوە و بە بەڵگەیەکی کەم ڕازی دەبوو و هەرکە جۆری ستەمی کابرای بزانیایە ئەوە مافی خۆی بۆ دەگێڕایەوە و داوای بەڵگەی تەواوی لێ نەدەکرد، چونکە ستەمکاری والیەکانی پێش خۆشی لائاشکرا بوو، ئەوە بوو بە هۆی گێڕانەوەی مافی خەڵکیەوە پارە لە بەیتولمالی عێراق دانەماو لە شامەوە پارەی بۆ دەنێردرا [1]، ئای چەند جوان بوو ئەو کارەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز کردی و چەند باشە کە کار ئاسانی بۆ خەڵك بکرێت بە پێی توانا، چونکە کات و ماندوو بوونیان بۆ دەگەڕێتەوە [2].

هەروەها لەم کارەیەوە بنەمایەکی گرنگمان دەست دەکەوێت بۆ جیاکردنەوە لە نێوان دادوەری ئاسایی و شێوازی لێکۆڵینەوە لە دادوەری ئیداری دا کە عومەری کوڕی عبدالعزیز داینا، چونکە بەڵگەی یەکلاکەرەوە بە ئاسانی پەیدا ناکرێت و پێکهاتەکانی بەئاسانی کۆناکرێنەوە و ئەگەر ستەم ئاشکرا بوو ئەوە دادوەر بەبەڵگەیەکی کەم واز دەهێنێت [3].

ز- لابردنی باجی شتومەك - مکس -: لەبەر ئەوەی کە مکس ستەم و زیانگەیاندنە، چونکە باجێکە بە شێوەیەکی ناڕەوا لە خەڵك وەردەگیرێت، هەروەها لەبەر ئەوەی کە زەکات لەسەر موسڵمانان و سەرانەوەدە یەك و خەراج لەسەر - ئەهلی کیتابە - گاور و جولەکە - بەسن و پێویست بە قورسکردنی باری شانی خەڵکی ناکات ئەوە عومەر نەهی کرد لە مەکس و زۆر

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ١٠٦ - ١٠٧.
[2] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢، ٥٥٨).
[3] - نظام الحكم في الشريعة و التاريخ الاسلامى(٢ / ٥٦٥).

توند بوو بەرامبەر بە وەرگرتنی، محمدی کوڕی قەیس ئەڵێ: کاتێ کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە باجی زەوی و سەرانەی لەسەر موسڵمانان هەڵگرت [1].

هەروەها نامەشی نووسی بۆ عەدی کوڕی اطارة و داوای هەڵگرتنی باجی لێکرد.. هەروەها داوای لابردنی مەکیشی کرد، چونکە ئەوە ئەو کەمکردنەوەیە کە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ هود: ٨٥). واتە: وە کەم و کوڕی مەکەن لە شت و مەکی خەڵکیدا و خراپە کاری مەکەن(یا خراپە بڵاومەکەنەوە) لە زەویدا.

جا هەرکەسێك زەکاتی سامانی دا ئەوە لێی وەرگرە و هەرکەسیش نەیدا ئەوە خوای گەورە لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکات [2].

هەروەها نامەیەکی نارد بۆ کاربەدەستی خۆی لە فەڵەستین عبدالله ی کوڕی عەوف و تیایدا هاتبوو: بڕیارم داوە بڕۆم بۆ ئەو ماڵەی کە مەکس – باجی شت و مەك – ی تیایە بیڕۆخێنم و پارەکەی ناوی بکەمە دەریاوە [3].

لە مەوە تێ دەگەین کە مەکس بڕێك پارەیە کە لە فرۆشیاری کەل و پەلەوە لە بازاڕ دا وەردەگرێت و ئەمەش ئەو گومرگە دەگرێتەوە کە دەخرێتە سەر شت و مەك لەکاتی هێنانیدا لە دەرەوە لە ئێستادا، و عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەوەی بە ستەم زانیوە و قەدەغە کردوە [4]، بەڵگەی عومەریش لەم بارەیەوە فەرمایشتی: ﴿وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ﴾ هود: ٨٥).

ح– گێڕانەوەی ماڵە زەوتکراوەکان و دەرکردنی زەکاتی: عومەری کوڕی عبدالعزیز بڕیاری گێڕانەوەی ئەو شت و مەکە زەوتکراوەی دا کەلە بەیتولمال دایە و زەکاتی ساڵێکی لێ دەرکرد [5]، لە مالیکی کوڕی ئەنەسەوە لە ئەیوب ی سختستیانەوە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەو ماڵە زەوتکراوانەی گێڕایەوە کە لە بەیتولمال دا بوو و فەرمانی دا بەگێڕانەوە و

---

[1] – الطبقات الكبرى لابن سعد (٥ / ٣٤٥).

[2] – الطبقات الكبرى لابن سعد(٥ / ٣٨٣).

[3] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ١١٣.

[4] – فقه عمر بن عبدالعزيز د. محمد شقير(٢ / ٥٦١).

[5] – هەمان سەرچاوە(٢ / ٥٦٦).

دەركردنی زەكاتی ئەو چەند ساڵەی كە لێی دەرنەركرا بوو، پاشان نامەیەكی تری نووسی: كە پێم وایە ئەوە ماڵێكە ئومێدی گەڕانەوەی ناكرێت بۆیە تەنها زەكاتی یەك ساڵی لێ دەردەكرێت [1].

هەروەها لە عەمری كوڕی مەیمونەوە ئەڵێ: والی لەسەردەمی عبدالملكدا بیست هەزار پارەی لە پیاوێكی كۆیلە بەناوی ئەبوعائشە سەند و خستیە بەیتولمالەوە، كاتێ عومەری كوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە كوڕێكی هاتەلای و سكالای خۆی بۆ بەرزكردەوە، ئەویش نامەیەكی نووسی بۆ مەیمون: كە پارەكانیان بدەنەوە و زەكاتی ئەم ساڵی لێ دەربكەن، ئەگەر پاریەكی خەوێندراو نەبوایە زەكاتی هەموو ساڵەكانمان لێ دەردەكرد [2].

ئەمە دادگەری عومەری كوڕی عبدالعزیز بوو لە دەوڵەتەكەیدا كە لەسەر بنەمای دادگەری بنیاتی نابوو و والی و كار بەدەستەكانیشی وا ڕاهێنا بوو كە ژیان بەدادگەری دەچەسپێت، كاتێ هەندێ لە كاربەدەستانیشی نامەیان بۆ ناردو وتیان: پاشان، شارەكەمان وێران بووە، جا ئەگەر ئەمیری باوەڕداران پارەمان بۆ بنێرێت نۆژەنی دەكەینەوە، عومەریش بۆی نوسیوە: لە نامەكەت گەیشتم ئەوەش كە دەڵێ ی شارەكەتان ڕووخاوە ئەوە داوات لێ دەكەم بەدادگەری بەهێزی بكەیت و ڕێگاكانی لە ستەم پاك بكەیتەوە بەم شێوەیە ئاوەدان دەبێتەوە و السلام [3].

هەروەها نامەی بۆ هەندێ لە كار بەدەستانی نووسی: ئەگەر ئەتەوێ لە دادگەری و چاكەكاری و چاكسازی دا بگەیتە ئاستی ئەوانەی پێش تۆ لە ستەم و دەستدرێژی و خراپەكاری دا ئەوە بیكە و هێز و دەسەلاتیش هەر بۆ خوایە [4]، هەروەها نامەیەكی نووسی بۆ ئەبوبەكری كوڕی حەزم، كە دیوانەكان بپشكنە و هەر ستەمێكت پێش من بەدی كرد دژی موسڵمانێك یان خاوەن كتێبێك كرابوو ئەوە قەرەبووی بۆ بكەرەوە، ئەگەر كۆچی دواییشیان كردبوو ئەوە بیگەڕێنەوە بۆ میراتگرەكانیان [5].

---

[1] - الطبقات الكبرى لابن سعد(٥ / ٣٤٢).

[2] - مصنف ابن ابي شيبة(٣ / ٢٠٢).

[3] - تأريخ الخلفاء للسيوطي، ل: ٢٣، عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار، ل: ٢٢٦.

[4] - الطبقات(٥ / ٣٨٣ – ٣٨٤ ).

[5] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٤٢ – ٣٤٣).

هەروەها عومەر(رضي الله عنه) بۆ چەسپاندنی دادگەری ڕووبەڕووی کێشە و گرفتی زۆر دەبوویەوە و ڕێگری و کۆسپی زۆری بۆ دروست دەکرا، ئەویش پارەی دەبەخشی بۆ هێمن کردنەوە و دامرکاندنی هەندێ دڵ و دەروون لە پێناو چەسپاندنی حەق و هەڵگرتنی ستەم، ئەوە بوو جارێکیان عبدالملکی کوڕی هاتە لای و وتی: بابەگیان چی ڕێگرتە لە چەسپاندنی ئەو دادگەرییەی کە مەبەستتە؟ سوێند بە خوا من ئاساییە بەلامەوە ئەگەر من و تۆ پێکەوە لە یەك مەنجەڵدا بکوڵێنن لەسەری؟ ئەویش وتی " کوڕم خۆم، مَن خەڵکی لەسەر نەرێتکی گران ڕادێنم، من ئەمەوێ دادگەری لەمەسەلەکاندا زیندوو بکەمەوە، هەتاوەکو بگەم بە دادگەری و تەماعێك دەخەمە بەردەمی خەڵك بەم شێوەیەش بێزاریان لە چەسپاندنی دادگەری بەو تەماعە دەڕەوێنمەوە [1].

هەروەها هەستا بە دانانی خەڵات بۆ هەرکەسێك کە خێرێکی نیشان بدات یان لە هەڵەیەك ئاگاداری بکاتەوە، یاخود ستەمێکیان پێ ڕابگەیەنێت کە خاوەنەکەی نەیتوانیوە باسی بکات، ئەوە بوو نامەیەکی نووسی و فەرمانی دا کەل لە وەرزی حەجدا بۆ حاجیان بخوێنرێتەوە، هەروەها لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا ڕابگەیەنرێت وتیایدا هاتبوو: پاشان، هەر کەسێك بێتەلامان بۆ گێڕانەوەی مافێك یان کارێك کە سوودی بۆ کەسێك یان هەموان هەبێت لە ڕووی ئاینەوە ئەوە لەسەد دینارەوە هەتاوەکو سێ سەد دیناری پێ دەدرێت بە پێی گرنگی ئەو کارەی کە لێی ئاگادار مان دەکاتەوە و بە پێی دووری ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتووە، ڕەحمەتی خوا لەکەسێك کە دووری ڕێگا نابێتە بەربەست بۆی، بەڵکو خوای گەورە بەهۆی ئەو کارەی ئەوە وە حەقێك زیندوو بکاتەوە و بەتاڵێك لەناو بەرێت و دەروازیەکی خێر بکاتەوە [2].

هەروەها بە هۆی چێژ بردنیەوە لە شیرینی دادگەری و میهرەبانی و خێر و خۆشی خەڵك لە سایەیدا ئەیفەرموو: سوێند بە خوا حەز دەکەم یەك ڕۆژ دادگەرانە فەرمانڕەوایی بکەم و خوای گەورە گیانم بکێشێت [3].

بێگومان سەرباری ئەوەی کە ئەو بەروبوومەی دادگەری بینی و خەڵکیش لەبەرووبوومی بەهرەمەند بوون، بەڵام هێشتا دەروونی ئارەزووی زیاتری دەکرد ئەمەشی بەم شێوەیە دردەبڕی:

---

[1] - عمر بن عبدالعزیز، عبدالستار الشیخ، ل: ٢٢٦.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢٧.

[3] - تهذیب الاسماء و اللغات(٢ / ٢٣).

ئەگەر پەنجا ساڵێ تر لە ناوتانـدابم هێشتا دادگـەری تـەواوم نەچەسـپاندووە [1]، تەنانـەت دادگـەری گیاندارانیشی گرتبوویەوە و ئەمەش چەند نمونەیەکە لەو بوارەدا:

- نەهی کردن لە تێکوتانی وڵاخ بە ئاسـن و تونـد جڵـەوکردنی: عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز جەختی لەسەر بەزەیی هاتنەوە بە گیانداران و ئازارنەدان و ستەم لێ نەکردنیان دەکردەوە، ابو یوسف ئەڵێ: عبدالله ی کوڕی عومەر بۆی باسکردین، کە عومەری کوڕی عبـدالعزیز نـەهی کردووە لەوەی کە پۆستە بەر بە ئاسنێك بکوتێتە وڵاخەکەی، هەروەها نەهی کردووە لە توند جڵەو کردنی وڵاخ [2]، هەروەها فەرمانی قەدەغە کردنی توند جڵەو کردنی ئەسپ و هێـستری دەرکرد و بەکارهێنانی نەقیزەی سەر ئاسنی قەدەغە کرد بوو [3].
- دیاری کردنی باری حوشتر بە شەش سەد ڕەتڵ: کاتێ کە ئاگادار کرایەوە کە خـەڵکی بـاری قورس لە حوشتر دەنێن و حوشترەکان لە توانایاندا نیە و ئەمەش لە میسردا ڕووی دابوو بۆیـە نامەیەکی بۆ والیەکەی نووسی و باری حوشتری بەشەش سەد ڕەتڵ دیاری کـرد و داوای لـێ کرد کە ئەم بڕیارە جێبەجێ بکات و خەڵکی لێ ئاگادار بکاتەوە [4].
- ئەمە هەندێك بوو لە ڕواڵەتە خێراکانی بەرپاکردنی دادگەری لـە دەوڵـەتی عومـەری کـوڕی عبدالعزیزدا دیارە یەکێك لە ئامانجـەکانی تـەمکین بریتیـە لـە بـەرپاکردنی کۆمەڵگەیـەك کـە بەهاکانی دادگەری و نەهێشتنی ستەم و بەرەنگاربوونەوەی بە هەموو جۆر و شێوەکانیەوە تیادا باڵادەست بێت ئەمەش ئەو کارە بوو کە عومەری کوڕی عبدالعزیز ڕەحمەتی خوای لێبێت پێی هەستا.

٤- یەکسانی: خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴾ الحجرات: ١٣). واتە: ئەی خەڵکینـە بێگومـان ئێمە دروستمان کردوون لە نێر و مێ یەك وە کردومانن بە چەند گەل و هـۆزەوە تـا یـەکتری بناسن بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خوا پارێزگار ترینتانە بێگومان خوا زانای ئاگادارە.

---

[1] - تاریخ ابن عساکر لە عومەری کوڕی عبدالعزیزی عبدالستارەوە، ل: ٢٢٧.

[2] - مصنف ابن ابي شيبة(١٢ / ٣٣٢) فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٥٧٣).

[3] - ملامح الانقلاب الاسلامي، ل: ٧١.

[4] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٥٧٥) محمد شقير.

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێت: ئەی خەڵکینە ئێوە خواتان یەکە و باوکتان یەکە و عەرەبێك لە غەیری عەرەبێك باشتر نیە بە تەقوانەبێت و فەزڵی ڕەشێك بەسەر سورێکدا و سورێك بەسەر ڕەشێکدا نیە بە تەقوا نەبێت [1].

عومەری کوڕی عبدالعزیز هەستا بە جێبەجێ کردنی ئەم بنەمایە لە دەوڵەتەکەیدا، یەکەم بەڵگەش لەسەر ئارەزووی بۆ جێبەجێ کردنی بنەمای یەکسانی ئەوە بوو کە سوێندی خوارد کە یەکسانی لە نێوان خۆی و خزمەکانی و خەڵکیدا بکات [2].

وتی: سوێند بەخوا حەز دەکەم کە لە خۆم و خزمەکانمەوە دەست پێ بکەم هەتاوەکو باری گوزەرانی من و ئێوە یەکسان ببێت سوێند بەخوا ئەگەر شتێکی ترم بویستایە، ئەوە زمانم پاراو بوو بۆی و شارەزای هۆکارەکانی بووم [3].

هەروەها لە وتارێکدا وتی:... هەرکەسێك لە ئێوە پێویستی خۆیمان پێ ڕابگەیەنێت ئەوە حەز دەکەین بۆی جێ بەجێ بکەین بە پێی توانا [4]، هەروەها عومەر(ﷺ) یەکسانی لە نێوان خەڵکدا پیادەکرد لە ماف و ئەرکدا و لە هەموو بوارەکانی ژیاندا و جیاوازی لە نێوان خەڵکدا دەکرد لەمەسەلەی دامەزراندن و سپاردنی کارو ئەرك پێیان و هەرگیز شتێکی بەکەسێك نەدەدا – هەرکەسێك بوایە – کە مافی خۆی نەبوایە و جیاوازی لە نێوان ناودارانی بەنی ئومەیە و خەڵکانی تردا نەدەکرد و لە موچەو یارمەتیە تایبەتەکان بێ بەشی کردن و کاتێکیش کەلەو بارەوە قسەیان لەگەڵدا کرد وتی: پارەی من بەشتان ناکات، ئەم پارەیەش – مەبەستی بەیتولماله – مافی ئێوە تیایدا وەك مافی خەڵکی ترەوایە، بۆیە سیاسەتی دارایی لەسەر بنەمای یەکسانی بنیاتنرا بوو، بەیتولمال بەلایەوە موڵکی هەموو موسڵمانان بوو و هەرکەسێکیان مافی هەیە وەك یەکسانی تر لێی سودمەند بن و قۆرخ نەکرێت بۆ چین و توێژێکی دیاری کراو، هەروەها لەو کارانەشی کە بەڵگەیە لەسەر چەسپاندنی بنەمای یەکسانی لە نێوان خەڵکدا ئەوەی کە لە کاتی دەستگرتنی بەنی ئومەییەدا بەسەر چەندین پارچە زەوی بەرفراواندا ڕایگەیاند و وتی: لەوەڕگە بۆ هەموو موسڵمانانە مافی پێشەواش

---

[1] – النموذج الاداری المستخلص من ادارة عمر بن عبدالعزیز، ل: ٢٩٧.

[2] – هەمان سەرچاوە.

[3] – سیرة عمر بن عبدالعزیز لابن عبدالحکم، ل: ١١٢.

[4] – تاریخ الطبري لە النموذج الاداری في ادراة عمر، ل: ٢٩٧.

تیایدا وەك یەكێك لە موسڵمانانە بارانیش خوای گەورە بۆ هەموو بەندەكانی دەبارێنێ و هەموو وەك یەك پشكدارن تیایدا [1].

یەكسانی لە نێوان ئەو كەسانەدا كرد كە موسڵمان بوو بوون لە گاور و جولەكەكان و لە نێوان موسڵماناندا و هەوڵی دا بەربەستی لێك تێ نەگەشتن لە نێوانیاندا لابەرێت، بۆیە ئەیوت:... هەر گاور و جولەكە و ئاگر پەرستێك لەوانەی كە ئەمرۆ سەرانەدەدەن موسڵمان ببێت و تێكەڵاوی موسڵمانان بكات و لە هاوئاینە پێشوەكانی جیا ببێتەوە ئەوە ماف و ئەركی وەك موسڵمانانە و پێویستە لەسەریان كە تێكەڵاوی و دڵنەوایی بكەن [2].

ئیبن سەعد ئەیگێڕێتەوە كە عومەری كوڕی عبدالعزیز عەرەب و خزمەتكارانی – موالی – وەك یەك لێكردبوو لە ڕۆزی و پۆشام و یارمەتی و موچەدا، بەڵام بیست و پێنج دیناری بۆ خزمەتكاری ئازاد كراو و دیاری كرد بوو [3].

هەر لەبواری یەكسانی و جیاوازی نەكردن لە نێوان خەڵكیشدا بەرامبەر یاسا و حوكمەكانی ئیسلامدا، بەم بەڵگەیە وازدەهێنین كە عومەر خۆی یەكێك بوو لە لایەنەكانی كێشەكە لەبەرامبەر دادوەردا: ئەوە بوو كاتێك كە پیاوێك لە میسرەوە هاتە خزمەت عومەری كوڕی عبدالعزیز و پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، عبدالعزیز – مەبەستی باوكی عومەرە – بە نارەوا پارچە زەویەكی لێ سەندووم، عومەریش وتی: زەوی تۆ لە كوێیە ئەی بەندەی خوا؟ وتی: لە حەلوان، عومەریش وتی: شارەزام لەوێ چەند شەریكێكم هەیە، و ئەمەش دادوەرە و حوكمان لە نێواندا دەكات، عومەر چوو بۆلای دادوەر و كێشەكە لە بەرژەوەندی كابرای میسری كۆتایی پێ هات، عومەریش وتی: بەڵام ئێمە پارەمان تیادا خەرج كردووە، دادوەریش وتی: ئەوە لە بەرامبەر ئەو بەروبوومەدایە كە لێیەوە دەستتان كەوتووە، عومەریش فەرمووی: ئەگەر بە جۆرێكی تر حوكمت بكردایە جگە لە مە هەرگیز نەمدەهێشت دادوەری بكەیت، پاشان فەرمانی دا بە گێڕانەوەی زەویەكە بۆ كابرای میسری [4].

---

[1] – سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٨١ لابن عبدالحكم.

[2] – هەمان سەرچاوە، ل: ٧٩.

[3] – الطبقات(٥ / ٣٧٥).

[4] – عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ٢٩٨.

هەروەها عومەر حسابی بۆ بنەمای یەکسانی دەکرد تەنانەت لە مەسەلە گشتیەکانیشدا، نموونەی ئەمەش فەرماندانی بەوەی کە کەس تایبەت نەکرێت بە نزا بۆ کردن و نامەیەکی نووسی بۆ ئەمیری جەزیرە کە تیایدا هاتبوو: پێم گەشتووە کە خەڵکانێك لە چیرۆکخوانان جۆرە نزاو درود ناردنێکیان بۆ ئەمیرەکانیان داهێناوە، کە هاوشێوە ئەوەیە کە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەینێرن، جا هەر کە ئەم نامەیەت بە دەست گەشت، ئەوە فەرمانیان پێ بکە، با نزا و درودیان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) تایبەت بێت و نزاشیان بۆ موسڵمانان بە گشتی بێت و واز لە شتی تر بێنن جگە لەوە [1].

لێرەشەوە گرنگی دانی عومەر(رضي الله عنه) بە یەکسانی دەردەکەوێت تەنانەت لە مەسەلەی دوعا کردنیشدا بە جۆرێك کە نابێ تایبەت بکرێت لە نزادا، چونکە هەموو موسڵمانان پێویستیان بە نزاو ڕەحمەتی خوایە، خوای گەورەش شیاوی وەڵامدانەوەیە [2]، هەروەها بنەمای یەکسانی لە نێوان خۆی و خەڵکیشدا ڕەچاو دەکرد، ئەوە بوو جارێکیان پیاوێك جنێوی پێدا بە هۆی شتێکیەوە ئەویش هەمان ڕێوشوێنی بەرامبەر گرتەبەر کە لە کاتی جنێودان بە هەر تاکێکی ئاسایی دادەگیرێتەبەر، ئەمە لە کاتێکدا ڕووی دا کە ابوبەکری کوڕی محەمەدی کوڕی حزم والی عومەر لە مەدینەدا لە کاتی نوێژکردنیدا حوکم بەسەر کابرایەکدا دراو ئەویش نوێژەکەی پێ بڕین و شمشێری بۆ هەڵکێشان، ئەبوبەکریش نامەیەکی نووسی بۆ عومەر(رضي الله عنه)، کاتێ وەڵامەکەی عومەریان بۆ کابرا خوێندەوە، ئەویش جنێوی بە عومەر و نامەکەو ئەو کەسەش دا کە هێناویەتی، ئەبوبەکریش ویستی بدات لە ملی، پاشان عومەری ئاگادار کردەوە کە ئەو جنێوی پێداوە و ئەمیش ویستویەتی بیکوژێت، عومەریش بۆی نووسی: ئەگەر بتکوشتایە ئەمکوشتیت، چونکە کەس بە هۆی جنێودان بە کەسێکی ترەوە ناکوژرێت مەگەر جنێو بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بدات.

جا هەرکە ئەم نامەیەت پێ گەیشت ئەوە موسڵمانان بپارێزە لە خراپەی و هەموو سەری مانگێ داوای تەوبە کردنی لێ بکە، ئەگەر تەوبەی کرد ئازادی بکە [3].

عومەر فەرمانی بەوالیەکانیشی دەکرد کە یەکسانی بچەسپێنن و نامەیەکی نووسی بۆ کار بەدەستی خۆی لە مەدینە و تیایدا ئەیوت: بڕۆرە ناو خەڵك و یەکسان مامەڵەیان لەگەڵدا بکە لە

---

[1] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٢٧٣.

[2] – النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٢٩٩.

[3] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ١٤٢.

دانیشتن و ڕووپیێ داندا و کەس پێش کەس نەخەیت و نەشڵێیت ئەوانە بنەماڵەی ئەمیری باوەڕدارانن، چونکە بنەماڵەی ئەمیری باوەڕداران و خەڵکی تر بەلامەوە یەکسانن، بەڵکو حەقی خۆمەکە وابزانم بنەماڵەی ئەمیری باوەڕداران مافی خەڵك دەخۆن [1].

ئەمە هەندێك بوو لە هەڵوێستەکانی عومەر، کە هەرچەندە جیاواز بێت، بەلام ئاماژەیەکی ڕوونی تێدایە بۆ پەیڕەو کردنی بنەمای یەکسانی لەلایەن عومەرەوە(ﷺ) [2].

٥- ئازادیەکان لە دەوڵەتی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا: بنەمای ئازادی یەکێکە لەو بنەما سەرەکیانەی کە حوکمڕانی لە دەوڵەتی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا لە سەربنیاتنرا بوو، ئەم بنەمایەش پێویستی بە دەستەبەر کردنی ئازادیە گشتیەکان هەیە لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا، عومەریش گرنگی بە هەموو جۆرە ئازادیەکی مرۆڤانە دەدا و هەموو جۆرەکانی ئازادی دەخستە ڕوو، ئەوانەی پەسەند دەکرد کە لەگەڵ ڕێنماییەکانی ئیسلامدا دەگونجان ئەمەش ڕوونکردنەوەیەکە دەربارەی ئازادیەکان لە دەوڵەتی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا:

أ- ئازادی هزر و بیرباوەڕ: عومەر(ﷺ) سوور بوو لەسەرجێ بەجێ کردنی بنەمای ئازادی بیروباوەڕ لە کۆمەڵگەدا و سیاسەتی لە بەرامبەر جولەکە و گاوردا بریتی بوو لە پابەندبوون بە پەیمانامەکان و بەرپاکردنی دادگەری لەگەڵیاندا و نەهێشتنی ستەم لەسەریان و تەنگ پێ هەڵنەچنینیان لەبیروباوەڕ و ئاینداریاندا ئەمەش لە ڕوانگەی فەرمایشتی: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴾ البقرة: ٢٥٦). واتە: بە هیچ جۆرێك زۆر لێ کردن لە دین دا نیە(بۆ هاتنە ناو ئیسلام)...

عومەریش شێوازی بانگەوازی دەگرتەبەر لەگەڵ پاشاکانی هیند و ئەو هۆزانەی کە لە ئیسلامدا دەرچوو بوون، و زۆری لە هیچ گاورێك یان کەسێکی تر نەکردوە بۆ موسڵمانان بوون، هەرچی ئازادی ڕاودەر بڕینیشە ئەوە بوارێکی بەرفراوانی پێدرا بوو لە و دەوڵەتەدا و بوار بۆ کار بەدەستان و هاولاتیان ڕەخسێنرا بوو بۆ سکالا کردن و دەربڕینی ڕاوو بۆ چوونەکانیان بەوپەڕی ئازادیەوە، قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبوبەکری صدیقیش ئەمەمان پێ ڕادەگەیەنێت کاتێ دەڵێ: ئەمڕۆ بێ دەنگەکان دێنە گۆ [3].

---

[1] - الطبقات(٥ / ٣٤٣) النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٣٠١.

[2] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٣٠١.

[3] - الطبقات لابن سعد(٥ / ٣٤٤).

ب- ئازادی سیاسی: عومەر دەستپێکردنەوەی ئازادی سیاسی ڕاگەیاند کە ئیسلام بۆ موسڵمانانی ڕەخساند بوو، چونکە گوێڕایەڵی بۆ هیچ مرۆڤێك دروست نیە لەسەرپێچی پەروەردگاردا، ئەگەر چی ئەوکەسە فەرمانڕەوا و والیش بێت، ئەوە تا عومەر(ﷺ) لە یەکەم ڕۆژی فەرمانڕەوایی دا ئازادی ڕاگەیاند لە فەرمانکردن بە چاکە و قەدەغە کردنی خراپە دا و ڕەخنەی لەو واقیعە تاڵە دەگرت کە خەڵکی تیابوو، چونکە ئیسلام لەبەرامبەر ستەمدا بێدەنگ نابێت، ئەوە بوو ڕۆژێك وتاری داو وتی: ئاگاداربن ئیسلامەتی کەسێك ڕەوانیە کە پێچەوانەی سونتە و گوێڕایەڵی بۆ دروستکراوێك ڕەوانیە لەسەر پێچی پەروەردگاردا ئێوەش بەوکەسە دەڵێن گوناهبار کەلە ستەمی فەرمانڕەواکەی هەڵاتووە، بەڵام ستەمکاری ڕاستەقینە فەرمانڕەواکەیەتی [1]، ئەوەش کە دەستە بەرکردنی ئازادی سیاسی لەلایەن عومەرەوە بۆ خەڵك دەسەلمێنێت ئەوەیە، کە یەکەم ڕێو شوێنێك کە گرتیەبەر دوای بوونی بە خەلیفە بریتی بوو لە دەسهەڵگرتنی لە خیلافەت و داواکردن و سەرپشککردنی خەڵك بوو لە هەڵبژاردنی خەلیفەدا، جا ئەگەر ئازادی سیاسی لە دوو شوێندا دەربکەوێت کە یەکەمیان: بەشداری کردن لە هەڵبژاردنی فەمانڕەوادا لە ڕێی ئەنجومەنی خەڵك و عەقدەوە و بە پێی بەیعەت و ڕەزامەندی موسڵمانان، دوومیشیان: ڕادەربڕین و ئامۆژگاری کردنی دەسەڵاتداران و ڕەخنەگرتن لە کارەکانیان بە پێی پێوەرەکانی ئیسلام [2].

عومەر(ﷺ) ئازادی سیاسی لەم دوو شوێنەدا جێبەجێ کردووە و سەرپشکی کردن لە هەڵبژاردنیدا بۆ پۆستی خەلیفایەتی پێش ئەوەی کە ئامۆژگاری بکەن [3]، ئەمەش لەکاتی خۆیدا بە پشتیوانی پەروەردگار ڕوون دەکەینەوە.

ج- ئازادی تاکە کەسی: عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) لە هەوڵداندا بوو بۆ بەدەستهێنان و پشتیوانی کردن لە ئازادی تاکەکەسی، لەم بوارەشدا چەند کۆت و بەندێکی لەسەر ئازادی هاتوچۆ هەڵگرت و دەرگای کۆچ کردنی والاکرد بۆ خوازیارانی، ئەوە بوو وتی:.... سەبارەت بە کۆچیش ئەوە ئێمە دەرگای والا دەکەن بۆ هەرکەسێك کە مەڕومالات بفرۆشێت

---

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٢٤٠ لإبن الجوزي.

[2] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٣١٢.

[3] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل ل: ٣١٢.

و بچێت بۆ بەرەی جەنگ و کوشتاری دوژمنانمان، جا هەر کەسێك ئەوەی کرد ئەوە وەك کۆچکەرانی تر پشکی پێ دەدرێت لە دەستکەوتەکاندا [1].

لە نامەیەکیدا بۆ کاربەدەستەکانی ئەیوت:... دەرگای کۆچ بۆ موسڵمانان والاّ بکەن [2]، جا ئەگەر ئەمە هەڵوێستی بێت سەبارەت بە ئازادی کۆچ و هاتوچۆ ئەوە گرنگی بە چەندین بەمەسەلەی تر داوە کە کەمتر خەڵکێك لەوشوێن و پۆستەی ئەو داگرنگی پێ دەدەن، کە ئەویش سەرپشك کردنی کەنیزەکەکانیەتی لە نێوان ئازاد کردن و مانەوە بە بێ بەرامبەر، چونکە دەیزانی کە ئەوان چەند مافێکیان هەیە کە ناتوانێ پاش بوونی بەخەلیفە دا بینی بکات، بۆیە سەرپشکی کردنی لە نێوان ئازادکردن و مانەوەی بێ بەرامبەر، ئەمەش بەخشینی ئازادی تاکەکەسی تەواوە پێیان، ئبن عبدالحکم دەگێڕێتەوەە کە عومەر کەنیزەکەکانی سەرپشك کرد و وتی کارێکم بۆ هاتۆتە پێش کە بواری بەسەرکردنەوەی ئێوەم پێ نادات، جا هەر کامێکتان دەیەوێ ئازادی دەکەم، هەر کامێکیشتان لەلام مایەوە هیچ شتێکی لەلایەن منەوە بۆ نیە، ئەوانیش زۆر گریان دوای ئەوەی نا ئومێد بوون لێی [3].

● ئازادی بازرگانی و کاسبی کردن: سەبارەت بە بازرگانی کردن و گەڕان بەدوای فەزڵی خوا لە وشکانی و دەریادا، وەك بەشێك لە ئازادی ئابووری، ئەوە لە نامەیەکدا بۆ کاربەدەستەکانی پێویستی دەستەبەرکردنی ئازادی و سوود وەرگرتن لە ماڵ و سامان و بازرگانی پێوەکردنی لە وشکانی و دەریادا دوپاتکردەوە، ئەوەبوو لەنامەیەکیدا بۆ کاربەدەستەکانی هاتبوو:

بەشێك لە گوێڕایەڵی پەروەردگار کە لە کتێبەکەیدا دایبەزاندوە ئەوەیە کە خەڵکی بانگەواز بکرێت بۆ ئیسلام بەگشتی...

هەروەها خەڵکی پارە و سامانیان لەوشکانی و دەریا دا بخەنە گەڕ بێ ئەوەی ڕێگری و بەربەستیان بۆ دروست بکرێت [4]، هەروەها نوسیویەتی:.... هەرچی دەریاشە، ئەوە ئێمە وەك وشکانی وایە بەلامانەوە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟

---

[1] - سيرة عمربن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٧٩.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٨.

[3] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٣١٠.

[4] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٢١.

مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾ الجاثية: ١٢). واته: خوا ئەو زاتەیە دەریای بۆ ڕام هێناون تا بەفەرمانی خوا کەشتی تیایدا بگەڕێ وە تا هەندێ لە بەخششی خوا بەهرەمەند ببن وە بۆ ئەوەی سوپاسی خوا بکەن.

لێرەدا مۆڵەتی داوە بە هەرکەسێك کە دەیەوێت بازرگانی تیادا بکات و منیش پێم وایە کە نابێ ڕێگری لە خەڵك بکەین، چونکە وشکانی و دەریا موڵکی خوایە و ژێرباری خستووە بۆ بەندەکانی هەتاوەکو فەزڵی خوای تیادا دەست بخەن، ئیتر چۆن دەبێ ئێمە ببینە ڕێگر لە نێوان بەندەکانی خوا و بژێویاندا [1].

عومەر(رضي الله عنه) لە شوێنێکی تردا دەڵێ:... ڕێگا و پردەکان بکەرەوە بەڕووی کاسپکاراندا و با هاتوچۆی پیادا بکەن بەبێ باج، چونکە خراپەکاران خەریکی چەندکارێکن کە داوای کاری وایان لێنەکراوە [2]، سەبارەت بە نرخ دانانیش لەسەردەمی عومەردا(رضي الله عنه)، ئەوە ئەبو یوسف دەڵێ: عەبدلڕەحمانی کوڕی شەوبان لەباوکیەوە بۆی باسکردین و وتی: وتم بە عومەری کوڕی خەتتاب: ئەی ئەمیری باوەڕداران، بۆ ئەوەندە شتومەك گرانە لەسەردەمی تۆدا لە کاتێکدا کە پێشتر زۆر هەرزان بوو؟ ئەویش وتی: ئەوانەی کە لە پێش مندا بوون باری سەرشانی ئەهلی زیممەیان قورس کرد بوو، ئەوانیش ناچار بوون بۆ پەیداکردنی پارە کەلوپەلەکانیان بە شێوەیەکی هەرزان بفرۆشن، بەڵام من بە پێی توانا ئەرك دەخەمە سەرشانیان، ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان شت دەفرۆشن. ئەڵێ، وتم: ئەگەر نرخت دابنایە باشتر بوو، وتی: ئەوە مافی ئێمە نیە و نرخ بەدەست خوایە [3].

عومەر(رضي الله عنه) زۆر توند بوو لەمەسەلەی کاڵا قەدەغەکراوەکاندا و مامەڵە پێوەکردنی قەدەغە کرد بوو، بۆ نموونە مەی – مەشروب – لەوشتە حەرامکراوانەیە کە دروست نیە مامەڵەی پێوە بکرێت لەبەر حەرامی و زیانبەخشی بۆ موسڵمانان، چونکە خواردنەوەی دەبێتە هۆی دەسخستنە خوێنی موسڵمان و خواردنی ماڵی حەرام [4].

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ٩٤.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٩٨.

[3] - الادارة الاسلامية، محمد كرد، ل: ١٠٥.

[4] - السياسة الاقتصادية، و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٧٨.

عومەر(ﷺ) دەڵێ: ئێمە هەر کەسێك ببینین بیخواتەوە دوای ئاگـار کردنـەوەی ئـەو سـزایەکی ماڵی و گیانی دەدەین و ئەیکەینە پەند بۆ خەڵکانی تر [1]، ئەم سیاسەتەی عومەریش(ﷺ) سەرکەوتوو بوو لە گێڕانەوەی ماف و پێدانی ئـازادی ئـابووری ڕێکخـراو، چـونکە پاڵنـەری لـەناو خەڵکیـدا دروست کردبۆ کاروبەرهـەمهێنان و هـەموو بەربەسـتەکانی بـەردەمی نەهێشـت، ئەمـە بـووە هـۆی گەشەکردنی بازرگانی و گەشە کردنی بازرگانیش بووە هۆی بەرزبوونەوەی داهاتی تاکەکەسی و کە پەیوەست بـوو زەکاتـەوە، ئەمـەش بـووە هـۆی زیـاد بـوونی ڕێـژەی زەکـات هۆکارێـك بـوو بـۆ بەرزکردنـەوە ئاسـتی بـژێوی چـینە هـەژارەکان و بەرزبوونـەوەی توانـای کڕینـی شـتومەك و خزمەتگوزاریەکان، هەموو ئەمانەش هۆکارێك بوون بۆ بوژانەوەی ئابووری و بەرزبوونـەوەی ئاسـتی گوزەران و بژێوی [2].

بەم پێیەش ئازادی لە دەوڵەتی عومەری کوڕێ عبدالعزیزدا پارێزراو دەسـتەبەر بـوو و سـنوور و کۆت بەندی تایبەت بەخۆی هەبوو، هەربۆیە کۆمەڵگا گەشەی کرد و گەشتەئاستێکی بـالا، چـونکە ئازادی مافێکی بنەڕەتی هەمووتاکەکان بوو، هەتاوەکو لێی بەهرەمەند ببێت بۆ دۆزینـەوەی خـۆی و پەی بردن بە بەهرەو تواناکانی، دیارە سـەندنەوەی ئـازادیش لـە کۆمەڵگـە سـەندنەوەی گـرنگترین تایبەتمەندیەتی وەك مردوی لێ دێت، لە ڕاستی ئازادی لـە ئیـسلام دا تیـشکدانەوەیەکی دەرونیـە و سەراپای دەروونی مرۆڤ دەگرێتەوە بە هۆی پەیوەندی بە پـەروەردگارەوە، ئـەم پەیوەندیـدەش مـرۆڤ دەگەیەنێتە پلە بەرز و بالاکان و دەروونی تامەزرۆی کارەچاکەکان دەکات و پاڵـێ پێـوە دەنـێ بـۆ پەلەکردن لەکاری خێردا لە پێناو ڕەزامەندی خوای زەوی و ئاسمانەکاندا، کەواتە ئـازادی پایەیـەکی سەرەکی کۆمەڵگەی ئیسلامیە و لەسـەردەمی عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز دا بـە جـوانترین شـێوە بەرجەستە بوو و ڕەنگدانەوەشی لەلاپەڕەکانی مێژوودا هەبوو [3].



---

[1] – هەمان سەرچاوە، ل: ٤٨.

[2] – سياسة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٠٨.

[3] – السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٤٨، سياستة الانفاق العام في الاسلام، عوف محمد الكفراوي، ل: ٣٧٢.

## یەکەم: گرنگترین سیفەتەکانی:

کەسایەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز دادەنرێت بە کەسایەتیەکی سەرکردەی سەرنج ڕاکێش و، سیفەتەکانی سەرکردەی خواویستی لە خۆگرتبوو، لە گرنگترین ئەو سیفەتانەش: باوەڕی بەهێز بە خوا و بە گەورەیی و ئەو چارەنووس و سەرەنجامی کە چاوەڕێی مرۆڤ دەکات و ترسی زۆری لە پەروەردگار و زانستی فراوان و متمانە ی بە خوا و پێشەنگیی و ڕاستگۆیی و لێهاتویی و ئازایەتی و پیاوەتی و دونیایەویستی و خۆشەویستی قوربانیدان و خاکیبوون و وەرگرتنی ئامۆژگاری و لێبوردەیی و ئارامگری و هیمەت بەرزی و ئیدارەی توند و بەهێز و دادگەری و توانی چارەسەرکردنی کێشەکان و پلاندانان و ئاراستە کردن وڕێکخستن و چاودێری کردن و چەندین سیفەتی تر، بەهۆی ئەم سیفەتە ڕەببانیانەشەوە کە خوای گەورە پێی بەخشیبوو توانای پرۆژەی ئیسلاحی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت و زۆرێك لە ڕوخسارەکانی خەلافەتی ڕاشدین نویێ بکاتەوە کە لەبەرامبەر شالآوی پاشایی پشتاوپشت و ستەمکاردا سڕدرابوویەوە.

هەروەها توانی سەربکەوێت بەسەر کۆسپەکانی ڕێ داو هەولەکەم وێنەکانی چەند ئاکامێکی باشیان لێکەوتەوە لەسەر ئاستی تاك و کۆمەڵگە و ڕێبازی چاکسازی و نوێگەری عومەری کوڕی عبدالعزیز بووە مەشخەڵێك بۆ ئەو کەسانەی کە کار بۆ سەروەری ئیسلام دەکەن، ئەوە بوو نورەدین زەنگیش لەسەردەمی خۆیدا شوێن پێێ هەنگاوەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیزی هەڵگرت وتوانی سەرکەوتنێکی باش بەسەر خاچپەرستاندا تۆمار بکات، چاکەش لەم بوارەدا بۆ شێخ ابی حفص عمر محمد الخضر ئەگەڕێتەوە کە لە ساڵی ٥٧٠ کۆچی دوایی کردووە و یەکێك بووە لە مامۆستاکانی نورەدین زەنکی و کتێبێکی هەمەلایەنە و گشتگیری بۆ نووسی سەبارەت بە ژیاننامەی عومەری کوڕی عبدالعزیز هەتاوەکو نورەدین لەسەری بڕوات لە جیهاد و هەنگاونانیدا لە گرنگترین ئەو سیفەتانەش کە لە کەسایەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا بەرجەستە بوو بوو.

١- ترسی زۆری لە پەروەردگار: تایبەتمەندی گەورە و سەرەکی بوو کە پێی ناسرابوو پاڵنەریشی بریتی بوو لە باوەڕێ بە هێزی بوو بە ڕۆژی دوایی و تامەزرۆیی بۆ بەهەشت، دیارە جگە لەم باوەڕە بەهێزەش هیچ شتێك ناتوانێ مرۆڤ بپارێزێت لەو تەمەنەی لاوێتیەدا و هێز و ئازادی و دەسەلآتی لەبەردەم خواستە مادی و فشارە شەیتانیەکاندا بپارێزێت و لێپرسینەوەی وردی

دەروون و بەردەوامبون لەسەر حەقڕەوی بەسەردا بسەپێنێت [1]، دیارە عومەر(ﷺ) تامەزۆری بەهەشتو فەزڵدەری قیامەت بوو بەسەر دونیادا و باوەڕی بەفەرمایشتی: ﴿يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا مَتَٰعٞ وَإِنَّ ٱلۡأٓخِرَةَ هِيَ دَارُ ٱلۡقَرَارِ﴾ غافر: ٣٩). واتە: ئەی گەلەکەم بەڕاستی ژیانی ئەم دونیایە ڕابواردنێکی کەمەوبەڕاستی هەرپاشەڕۆژ جیّ ی حەسانەوەی هەمیشەیی یە.

لێرەدا عومەر(ﷺ) بە سروشتی پاکی خۆی و بیروباوەڕیّ دروستی زانی کە ڕۆژی دوایی بۆ موسڵمان لە پێشترە لە دونیا، ئەوەتا لە نامەیەکدا بۆ یەزیدی کوڕیّ موهەللەب ئەڵێت:... ئەگەر ئارەزووی هێنانی ژنی زۆر و دەستخستنی پارە و پێکەوانی سامانم هەبێت ئەوە ئەتوانم، چونکە خوای گەورە دەسەلات و توانایەکی پێداوم باشتر و زۆرتر لەوەی بەخەڵکانی تری داوە، بەلام من لە لێپرسنەوەی توند ئەترسم – لەم کارەدا کە تووشی بووم – مەگەر لێبوردەیی و ڕەحمەتی خوا بگاتە فریام [2].

عومەر(ﷺ) زۆر لە پەروەردگار دەترسا، فاتیمەی کچی عبدالملکی هاوسەری دەڵێت: سوێند بە خوا عومەر(ﷺ) نوێژ و ڕۆژووی لە خەڵك زیاتر نەبوو، بەلام هەرگیز کەسم نەدیوە هێندەی ئەو لە خواترسا بێت، لە جێگەدا یادی خوای دەکرد و وەك باڵندە هەڵدە لەرزی لە ترسی پەروەردگار بەڕادەیەك کە دەمانوت: سبەینیّ خەڵکی بیّ خەلیفە ڕۆژ دەکەنەوە [3]، هەروەها مەکحول دەڵیّ: ئەگەر سوێند بخۆم سوێندم ناکەویّ کەسم نەبینیوە لە عومەری کوڕی عبدالعزیز لە خوا ترستر و دونیا نەویستتر بێت [4].

بە هۆی ترسی زۆریشیەوە لە پەروەردگار فرمێسکی زۆری دەڕشت و زوو دەگریا، جارێکیان کابرایەك هاتە لای و ئەویش ئاگردانێکی لەبەردەستدا بوو و وتی: ئامۆژگاریم بکە کابراش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران سودی چیە ئەگەر هەموو خەڵکی بچنە بەهەشت و تۆ بچیتە ئاگر یاخود زیانی چیە بۆ تۆ ئەگەر هەموو خەڵك بچنە ئاگر و تۆ بچیتە بەهەشت ئەڵیّ: عومەریش هێندە گریا.

---

[1] - النوذج الاداري المستخلص من الدرة عمر، ل: ١٤٠ لە رجال الفكر للندوي.

[2] - تأريخ الطبري لە النوزج الاداري يەوە، ل: ١٤٠.

[3] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٤٢.

[4] - تأريخ الخلفاء للسيوطي، ل ل: ٢٢١.

هەتاوەکو ئاگردانەکە لەبەردەمیدا کوژایەوە بەهۆی زۆری فرمێسکەکانیەوە [1]، زۆر تریش لە ڕۆژی دوایی دەترسا بۆیە هەمیشە لە پەروەردگار دەپاڕایەوە و ئەیوت: خوایە گیان ئەگەر تۆ دەزانی کە من لە شتێکی تر دەترسم جگە لە قیامەت ئەوە ترسم مەڕەوێنەرەوە [2].

ئەو ڕۆژەش گۆڕانکاریەکی ڕیشەیی لە ژیانیدا دروستکرد، ئەو ڕۆژەی کە عومەر(ﷺ) دەربارەی دەڵێت:... بەڕاستی کارێکتان پێ سپێردراوە ئەگەر بە ئەستێرەکان سپێردرایە ئەوە ڕوناکیان نەدەما و ئەگەر بە کێوەکان بسپێردرایە دەتوانەوە و ئەگەر بخرایەتە ئەستۆی زەوی شەق شەق دەبوو، ئایا نازانن کە شوێنێکی تر نیە لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ دا و ئێوە دەبێ بچنە یەکێکیانەوە [3].

بەڵێ ترس لە خوا و تێڕوانینی دروست بۆ ژیان و لەناو چوون و نەمری و هەستکردن بە ڕۆژی لێپرسینەوە و هەڵچوم و کاریگەر بوون بە دیمەنەکانی بەهەشت و دۆزەخ مرۆڤی بەرپرس دەکات و وا لێ دەکات کە لەرز بیگرێت ئەگەر بەئەندازەی تاڵەمویەك لابدات لەوەی کە پەروەردگار دەیەوێت [4].

کەواتە هۆشیاری و هەستکردن بە ڕۆژی دوایی و سیفەتە بیروباوەڕیەکانی تر والە سەرکردە ئەکات کە هەموو هەنگاو و قسە و گوفتارێکی پەیوەست بکات بە ڕەزامەندی پەروەردگارەوە، ئەم لایەن و سیفەتا نەش لە لێکۆڵینەوە نوێکانی سەرکردایەتیدا مافی خۆی پێ نەدراوە کە بناغەی سەرکەوتنە لەسەر کردایەتی دا و یەکێکە لە گرنگترین ئەو تایبەتمەندیانەی کە پێویستە لەسەر کردەدا هەبێت، دیارە لە گرنگترین تایبەتمەندیەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیزیش بریتیە لە باوەڕی پتەو بە خواو ڕۆژی دوایی و زۆرترسان لە پەروەردگار و ڕۆژی ڕەستاخێز – قیامەت – [5].

٢- دونیا نەویستی عومەر(ﷺ): عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) لە ڕوانگەی ژیانی لە خزمەت قورئان و لێکۆڵینەوەی لە سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و تێڕامان و بیر کردنەوەی لە ژیانی

---

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٩٠.

[2] - تأريخ الخلفاء، ل: ٢٢٤

[3] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٢٣٢.

[4] - ملامح الانقلاب، ل: ٤٥ عمادالدين خليل.

[5] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ١٤٢.

دونیا کە خانەی تاقیکردنەوە و کێڵگەی ڕۆژی دواییە، لەم ڕوانگەیەوە خۆی ئازاد کرد لە هەژموونی دونیا و جوانی و چێژەکانی و گوێڕایەڵی و ملکەچی خۆی بە ئاشکرا و بەنهێنی بۆ پەروەردگار سەلماند و گەشت بە چەند ڕاستیەك کە یارمەتیدەری بوون بۆ دونیا نەویستی لەو ڕاستیانەش:

أ- باوەڕێکی تەواو بەوەی کە ئێمە لەم ژیانی دونیادا وەك غەریب و بێگانە و ڕیبوار واین، وەك پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمویت: " لە دونیادا وەك غەریبێك یان ڕێبوارێك بە " [1].

ب- هەروەها ئەم دونیایە هیچ نرخ و بەهایەکی نیە لای پەروەردگار مەگەر ئەوەی کە لە تاعەت و گوێڕایەڵی پەروەردگاردا بێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمویت: " ئەگەر دونیا لای خوا هێندەی باڵە مێشولەیەك نرخی هەبوایە ئەوە هەرگیز قومێ ئاوی تیادانەدەدا بە بێ باوەڕێ " [2].

ج- عومەری کوڕێ عبدالعزیز بڕوای وا بوو کە تەمەنی دونیا ڕووە کۆتاییە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرمویت: " من نێردرام و لەگەڵ قیامەتدا وەك ئەو دوو پەنجەیەی دەست لێکەوە نزیکین " [3].

د- ڕۆژی دوایی دەمێنێتەوە و ئارامگا و شوێنی کۆتا و ڕاستەقینەی مرۆڤە، لەبەر ئەم مەسەلانە و چەندین شتی تر عومەری کوڕی عبدالعزیز دونیای نەدەویست، یەکەم جۆری دونیانەویستیش بریتی لەنەویستنی حەرام، پاشان خۆ لادان لەشتە موباح و ڕێ پێدراوەکان لە بەرژەمەندی پەروەردگار، باشترین پلەی زوهد و دونیانەویستی بلایتیە لە نەویستنی شتی زیاد لە پێویست و هەرشتێك کە ئێستا پێویستت پێی نیە و هەڵپەنەکردن بۆی [4].

ئەم زوهدو دونیانەویستیەی عومەریش(ﷺ) لەسەر بناغەی قورئان و سوننەت بنیات نرا بوو، بۆیە دەستبەرداری هەموو ئەو شتانە بوو کەسوودی بۆ ڕۆژی دوایی نەبوو و دڵی بە هیچ شتێکی دونیا خۆش نەبوو بە پۆستی خەلیفایەتیشەوە و هەرگیز خەمی بۆ هیچ لە دەست چویەك نەدەخوارد،

---

[1] - الترمذي، كتاب، الزهد ژمارە ٢٣٢٠.

[2] - مسلم، كتاب الفتن و أشراط الشاعة ژمارە ١٣٢ — ١٣٥.

[3] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ١٤٨.

[4] - الآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ١٤٦).

بەڵکو دەستی لە زۆر شت هەڵدەگرت کە دەیتوانی دەستی بخات لە پێناو دەسکەوتی گەورە تر لای پەروەردگار لە ڕۆژی دواییدا [1].

مالیکی کوڕی دینار ئەڵێت: خەڵکی ئەڵێن: مالیکی کوڕی دینار زاهید و دنیا نەویستە، لە کاتێکدا کە زاهیدی ڕاستەقینە عومەری کوڕی عبدالعزیزە، چونکە دونیا ڕووی لێنا و ئەو پشتی تێ کرد [2].

ئیبن عبدالحکم ئەڵێت: کاتێ کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە زۆر دونیانەویست بوو شت و مەکەکانی دونیای ڕەتدەکردەوە و وازی لە خواردنە جۆراوجۆرەکان هێنا بوو و کاتێ خواردنیان بۆ دەهێنا دایدە پۆشی و تا دەچووە ژوورەوە پاشان دەیخوارد [3] و گوێی بە جۆری خواردن نەدەدا و خەرجی خۆی و خێزانەکەشی تەنها دوو درهەم بوو لە ڕۆژێك دا وەك سالمی کوڕی زیاد بۆمان دەگێڕێتەوە: کە عومەر ڕۆژانە بۆ خۆی و خێزانەکەی دوو درهەمی خەرج دەکرد [4]، لە جل و بەرگ و پۆشاکیدا جلی سادە و زبری لەبەردەکرد و وازی لەو زیادەڕەوی و خۆڕازاندنەوەیە هێنا بوو کە پێش ئەوە هەبوو [5]، سەبارەت بە زوهدیشی لە مەسەلەی ژن هێناندا ئەوە ئیبن عبدالحەکەم دەگێڕێتەوە و ئەڵێ: فاتمەی خێزانی ئەڵێ: هەرگیز بۆ لەشگرانی خۆی نەشتوە هەر لەو کاتەوە کە بووە بە خەلیفە هەتاوەکو گەشت بەخزمەتی پەروەردگار جگە لە سێ جار، ئەشلێن، هەرگیز بەهۆی لە شگرانی یەوە خۆی نەشتوە [6] ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیەکە عومەر(ﭬ) پێی ناسراوە لە شوێنکەویتی سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێناچێ دەستبەرداری سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو بێت و ستەم لە خێزانەکانی بکات و مافەکانیان پێشێل بکات، هەروەها وازهێنان لە هاوسەر گیری و قەدەغەکردنی لەسەر خۆ هیچ پەیوەندیەکی بە زوهدی ئیسلامیەوە نیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاماژەی پێداوە.

---

[1] - حلية الاولياء(٥ / ٢٥٧).

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٤٣.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٣٨.

[4] - الآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ١٥٥).

[5] - هەمان سەرچاوە(١ / ١٥٥).

[6] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٥٠.

ئەمە نەریتێکی بێگانەیە و دزەی کردۆتە ناو کۆمەڵگەی ئیسلامی و هەندێ کۆمەڵی لادەر لە ئیسلام شانازی پێوە دەکەن و بە بەشێك لە زوهدی ئیسلامی دادەنێن و چەندین چیرۆکیان لەو بوارەدا هەیە کە هەرکەسێك سەرنجی بدات دەزانێ کە هیچ پەیوەندیەکی بە ئیسلامەوە نیە، هەروەها وەسیەتی سەیر و ڕێنمایی نامۆیان هەیە لەم بوارەدا، لەوانە:

- هەرکەس واز لە خواردن و ئافرەت بێنێت، ئەوە دەبێ کەرامەت لەسەر دەستی ڕووبدات.
- هەرکەس ژن بێنێت ئەوە دونیای هێناوەتە ماڵی خۆی، کەواتە وریای ژن هێنان بن.
- کەسێك ناگاتە پلەوپایەی ڕاستگۆیان هەتاوەکو ژنەکەی وەك بێوەژن واز لێ نەهێنێت و منالەکانی وەك هەتیو فەرامۆش نەکات.
- هەرکەس سەربخاتە سەر ڕانی ئافرەت سەرکەوتوو نابێت.
- هەرکەسێك هاوسەرگیری بکات سەرکەوتوو نابێت [1].

ئەمە جگە لە چەندین شتی تری سەیر و سەمەرە، ئەم تێڕوانینەش پێچەوانەی ئیسلامە کە ئاینی میانەڕەویە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرمویت:(هەر کەس واز لە سونەتی من بێنێت ئەوە لە من نیە) [2].

کورتەی قسانیشی ئەوەیە کە زوهد و دونیانەویستی عومەری کوڕی عبدالعزیزی پابەند بوو بە قورئان و سوننەتەوە و زۆرێك لەوشتانەی کە لەم بوارەدا دروانەتە پاڵی ڕاست نین لەبەر لە گونجانی لەگەڵ ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوادا(ﷺ).

نموونەی زوهدی عومەریش(رضي الله عنه) لە بواری سامان و ماڵدا جیاواز بوونی بوو لەو کەسانە کەلەسەردەمی ئێمە دا پۆستێك دەگرنە دەست، و کاتێ بوو بەخەلیفە چل هەزار دیناری هەبوو، بەڵام کاتێ کۆچی دوایی کرد تەنها چوارسەد دیناری هەبوو ئەگەر زیاتریش بمایەتەوە کەمتری دەکرد [3]، چونکە هیچی لە بەتولمال وەرنەدەگرت [4] و یەکێك بوو لە زاهیدەکانی سەردەمی خۆی ئەگەر لە هەمووان زاهیدتر نەبوبێت، ئەشیفەرموو: دونیا هێندە زیانبەخشە هێندە دڵخۆشکەرنیە، ماوەیەکی

---

[1] – الطبقات للشعراني(١ / ٣٤).

[2] – فتح الباري على صحيح البخاري(٩ / ١٠٤).

[3] – حلية الولياء(٥/ ٢٥٧).

[4] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ١٨٦١.

کەم دڵخۆشت دەکات و ماوەیەکی دور و درێژ دڵتەنگت دەکات [١]. هەواڵی زوهدیشی زۆرە لەوانە شێخ ئەبو حفص عمری کوڕی محمد الخضري ناسراوە بە ملاءكة بیست و هەشت ڕووداوی لێ ئەگێڕێتەوە [٢] لە ڕاستی دا عومەر گەشتبوە قۆناغێکی پێشکەوتووی زوهد و خۆڕازاندنەوە بە سیفەتی زاهیدان، ئەمەش لە توانای کەسانێکدا نیە کە لە بارودۆخی ماددی ئەمڕۆی دونیا دەژین کە تیایدا مادە زاڵ بوە بەسەر هەموو شتەکاندا و خەڵکی بە پێی سامان و دارایی یەکتر هەڵدەسەنگێنن، دیارە هێندە بەس بوو کە سەرکردەکانی ئەم سەردەمە تەماع و چاو برسی نەبونایە و بە ڕۆزی حەلاڵ وازیان بهێنایە و هەوڵی ڕێگریان لە حەز و ئارەزوە دنیاییەکانیان بکردایە هەتاوەکو بگەنە ئاست دەرونی عومەر(ﷺ) کە بۆ بالاتر لە دونیا هەوڵی دەدا بۆ بە هەشتی پڕ ناز و نیعمەت [٣].

قسەکانیشمان دەربارەی زوهد لای عومەر بەم ڕووداوە کۆتایی پێ دێنین کاتێ کە بە موزاحمی خزمەتکاری وت: من ئارەزوی حەجم هەیە، ئایا هیچ پارەت پێیە؟ وتی چەند و دە دینارێکم پێیە، پاشان کەمێك وەستا و ئینجا وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران خۆت ئامادە بکە، حەڤدە هەزار دینارمان لە پارەی کوڕانی مەروان بەدەست گەشتووە، وتی: بیخەرە بەیتولمالەوە، چونکە ئەگەر حەلاڵ بێت ئەوە بەشی خۆمان لێبردەوە و ئەگەر حەرامیش بێت ئەوە هێندەمان بەسە، موزاحمیش وتی: کاتێ عومەر زانی ئەوە بەلای منەوە گرانە وتی: وریابە موزاحیم شتێك بە زۆر نەزانی کە بۆ خودا دەیکەم، چونکە من دەرونێکی شەیدام هەیە و شەیدای هەر پلەیەك بو بێت و پێی گەشتبێت شەیدای پلەیەکی بالاتر بووە، هەتاوەکو گەشتمە ئەم پلەیەی ئێستا کە هیچ پلەوپایەیەك لێی بەرزتر نیە و ئەمڕۆش شەیدای بەهەشتم [٤].

٣- خاکی بوونی: خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَعِبَادُ الرَّحْمَٰنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا ﴾ الفرقان: ٦٣). واتە: بەندە تایبەتی یەکانی خوای میهرەبان کەسانێکن بە ویقار و نەرمی دەڕۆن بەسەر زەوی دا(بێ لوت بەرزی و کەشخە و فیز کردن)

---

[١] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ١٥١.

[٢] - الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(١ / ٣٦٦ بۆ ٣٧٨).

[٣] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ١٥١.

[٤] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٦٢.

وە کاتێ نەزان و نەفامەکان(بە ووتەی ناشیرین) لەگەڵیان بدوێن ووتەیەك دەڵێن پێیان گوناه نەبێت.

ئیبن قەیم دەڵێت: واتە بە ئارامی و هێمنی و ویقار و خاکیانە هەنگاو دەنێن [1]، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێت:(خوای گەورە وەحی بۆ ناردم: کە خاکی بن هەتاوەکو کەس بەسەر کەسدا شانازی نەکات و کەس دەستدرێژی نەکاتە سەر کەسی تر) [2].

ئەم سیفەتە جوانەش یەکێکە لەو سیفەتە سەرەکیانەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز پێ ی ناسرا بوو، زوهدیش هۆکارێك بوو بۆ خاکی بوونی، چونکە زوهد بریتیە لە خۆبە کەم زانین لەبەردەم پەروەردگاردا [3].

هەروەك خاکی بوونی لە هەموو کاروبارەکانی ژیان و هەڵس و کەوتەکانیدا ڕەنگی دابوویەوە، ئەمەش شتێکی ئاساییە بۆ سەرکردەیەك کە لە خوا ترسابێت و ئومێدی پێی هەبێت و گوێڕایەڵی و ملکەچی ژێر دەستەکانی بوێت [4]، هەروەها وەڵامی عومەر بۆ کابرایەك کە بانگی لێکرد: ئەی جێ نشینی خوا لە زەویدا، ئەوە بوو کە پێی وت: من کاتێك لە دایك بووم ناویان نام عومەر جا ئەگەر بە عومەر بانگم بکەیت وەڵامت دەدەمەوە، بەڵام ئەگەر بڵێی جێنشینی خوا لە زەویدا ئەوە وەڵامت نا دەمەوە، چونکە من خەلیفەی خوانیم لە زەویدا، بەڵکو داود و پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوشێوەکانی خەلیفەی خوان [5].

ئەمەش ئاماژەیە بۆ: ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةً فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ ﴾ ص: ٢٦). واتە: ئەی داود بەڕاستی ئێمە تۆمان کدۆتە جێنشین لەم وڵاتەدا، فەرمانڕەوای لەنێوان خەڵکدا لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی ئەنجام بدە، هەرگیز شوێنی ئارەزوو مەکەوە تانەبێتە هۆی گومڕاکردن و لادانت لەڕێبازی

---

[1] - مدارج الساكين(٢ / ٣٤٠).

[2] -مسلم ژمارە(٢٨٦٥).

[3] - عمر بن عبدالعزيز للذحيلي، ل: ١٠٥.

[4] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ١٥٢.

[5] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٤٦.

خوا، چونکه ئەوانەی لەڕێبازی خوا لادەدەن سزای بەئێش و پڕئازار بۆیان ئامادەیە، بەهۆی فەرامۆشکردنی ڕۆژی لێپرسینەوە.

هەروەها بەهۆی خاکیبوونیەوە نەهی ئەکرد لە خەڵکی کە لەبەری هەستن و وتی: ئەی خەڵکینە: ئەگەر هەستن هەڵدەستین و ئەگەردانیشن دادەنیشین، چونکە خەڵکی تەنها بۆ خوای جیهانیان هەڵدەستن ئەمە ئاماژەدانە بە فەرمایشتی: ﴿ يَوْمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴾ المطففين: ٦).

هەروەها بە پاسەوانەکانی ئەوت: زۆر سڵاوم لێ مەکەن، بەڵکو من سڵاو لە ئێوە دەکەم [١]، هەروەك خاکیبوون بەڕادەیەك بوو کە خۆی چراکەی خۆی چاك دەکردەوە، ئەوە بوو شەوێك چەند کەسێکی لابوو چراکەی کوژایەوە و خۆی هەستا چاکی کردەوە، پێیان وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران بابۆت چاك بکەین؟ وتی: چاککردنەوەی ئەرکی خۆمە، کە هەستام عومەر بووم و کاتێ گەڕامەوە هەر عومەرم [٢]، هەروەها ڕۆژێك داوای کرد لە کەنیزەکێك و وتی: باوەشێنم بکە، ئەویش ماوەیەك باوەشێنی کرد و پاشان خەوی پیاکەوت و عومەریش خەبەری بوویەوە، کەنیزەکەکەش سوور هەڵگەڕا بوو ئارەقێکی زۆری کرد بوو بە خەوتویی عومەریش باوەشێنەکەی هەڵگرت و دەستی کرد بە باوەشێن کردنی، کاتێ کەنیزەکە کە لە خەو هەستا دەستی خستە سەر سەری و قیژاندی، عومەریش پێی وت: تۆ مرۆڤێکی و وەك من گەرماتە و منیش ویستم باوەشێنت بکەم وەك چۆن تۆ باوەشێنی منت کرد [٣].

هەروەها عومەر کەم قسەی دەکرد لە کاتێکدا کە زانایەکی زمانپاراو و قسەزان بوو ئەمەش لە ترسی ئەوەی کە تووشی لە خۆبایی بوون ببێت، هەروەها ئەیوت: بۆیە زۆر قسە ناکەم ئەترسم تووشی لە خۆبایی بوون ببم [٤]، هەروەها کابرایەك هاتە لای و پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەوانەی پێش تۆ خیلافەت دەیڕازاندنەوە، بەڵام تۆ خیلافەتت ڕازاندۆتەوە و قسەی ئەو شاعیرە ئەتگریتەوە کە ئەڵێ:

واذا الدرّزان حسن وجوه    كان للدرّ حسن وجهك زيناً

---

[١] - هەمان سەرچاوە، ل: ٣٤ — ٣٥.

[٢] - هەمان سەرچاوە، ل: ٣٩.

[٣] - أخبار أبي حفص للاجري، ل: ٨٦.

[٤] - أخبار أبي حفص الاجري، ل: ٨٤.

واتە: ئەگەر گەوهەر و مرواری دەم و چاوەکان جوان بکەن، ئەوە دەم وچاوی تۆ مرواری ڕازاندۆتەوە، عومەریش پشتی هەڵکرد [1]، هەروەها پیاوێك پێی وت: خوای گەورە لە بری ئیسلام پاداشتت بداتەوە، ئەویش وتی: نەخێر، بەڵکو پاداشتی ئیسلام بداتەوە لەبری من [2]، هەروەها پیاوێك چووە لای و لەو کاتەشدا خەڵکێکی زۆری لەلابوو وتی: سلاوی خوات لێ بێ ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەویش فەرمووی: سلاوکەت باگشتی بێت [3]، بەم شێوەیە عومەر شانی دادەنەواند بۆ موسڵمانان و خۆی لەکەس بەگەورەتر نەدەزانی و خەلیفایەتی تەنها بەزەیی و سۆزی زیاتر کرد بوو و زیاتر ملکەچ و پابەند بوو بە حەقەوە و بە دەستی خۆی چراکەی چاك دەکرد و لەناو خەڵکی دا دادەنیشت، و نەیدە هێشت پۆلیس و پاسەوانەکانی بە بەردەمیدا بڕۆن و تورە دەبوو لەو کەسانەی کە بە گەورەیان دەزانی یاخود سلاوی تایبەتیان ئاراستە دەکرد و ڕازی نەدەبوو ولاخ و سواری جیابێت یاخود لە پۆشاك یان خواردن و خواردنەوەدا جیاواز بێت لە خەڵك [4].

٤- پارێزکاری: پارێزکاری یەکێك بوو لە سیفەتەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز، پارێزکاریش واتە: خۆ گرتنەوە لەوەی کە زیانبەخشە وەك شتە حەرام و گومان لێکراوەکان، چونکە هەرکەس خۆی لە گومان بپارێزێت ئەوە ئاین و ئابڕوی خۆی پاراستووە و هەرکەسێك بکەوێتە ناو گومانەوە ئەوە کەوتۆتە حەرامەوە وەك شوانێك کە مەڕو مالاتەکەی بە دەورەی دەغڵ و دانێکدا بسوڕێنەوە ئەگەری ئەوە هەیە کە لێی بخۆن و گوناهبار بێت [5]، پارێزکاری و وەرعیش لە بناغەدا بریتیە لە دورکەوتنەوە لە شتە حەرامکراوەکان و تەنگاو بوون پێیان، پاشان ئەمە بۆ وازهێنان لە شتە حەلاڵ و ڕەواکان بەکارهێنرا [6].

بۆ سەلماندنی ئەو پارێزکاریەش کە لە عومەردا هەبوو و ڕادەی خۆلادانی لە گومان ئەگێڕنەوە کە عومەر(ﷺ) حەزی لە هەنگوین بووە و ڕۆژێکیان لەماڵەوە داوای کردووە وە بەلام نەیانبوە و دواتر بۆ یان هێناوە، و ئەویش کەمێکی لێخواردووە سەرسام بووە پێی و بەخێزانەکەی وتوو:

---

[1] - سیر اعلام النبلاء(٥ / ٣٦) الحلية(٥ / ٣٢٩).

[2] - سیر اعلام النبلاء(٥ / ١٤٧) الحلية(٥ / ٣٣١).

[3] - الطبقات(٥ / ٣٨٤).

[4] - عمر بن عبدالعزیز، لعبدالستار الشیخ، ل: ١٢٣.

[5] - الفتاوی(١٠ / ٦١٥).

[6] - لسان العرب(٨ / ٢٨٨).

ئەمەتان لەکوێ بوو؟ خێزانەکەشی وتی: خزمەتکارەکەم بەدوو دینارەوە نارد بە هێستری پۆستەدا ئەویش بۆی کڕیم، عومەریش وتی: سوێندت دەدەم کە بۆم بێنی، ئەویش گۆزەیەکی بۆ هێنا کە هەنگوێنی تیابوو، عومەریش فرۆشتنی بەزیاتر لە دوو دینار و دوو دینارەکەی گێڕایەوە بۆ خێزانەکەی و پاشماوەکەی خستە بەیتولمالەوە و وتی: وڵاخی موسڵمانان بە کاردێنن بۆ تێر کردنی ئارەزووەکانی عومەر [١]، هەروەها غولامێکی هەبوو کتریەکی بۆ هێنانەکە ئاوی گەرمی تیادا بوو بۆ دەستنوێژ گرتن، ئەویش ڕۆژێك بە غولامەکەی وت: ئایا ئەم کتریە لە چێشتخانەی موسڵماناندا گەرم دەکەیت؟ وتی: بەڵێ، خوا باشت بۆ بکات، عومەریش وتی: لێت تێك داین، پاشان فەرمانی کرد بە موزاحم کە کتریەك ئاوی گەرم بکات و پاشان بزانێت چەند داری پێویستە و ئەو ڕۆژانە بژمێرێت کە ئاوی بۆ لێناوە و بە ئەندازەی ئەوە دار بگێڕێتەوە بۆ چێشتخانەی موسڵمانان [٢].

یەکێك لەو نموونە جوانانەش کە پارێزکاری ئەسەلمێنن ئەوە بوو کە هەرگیز دیاری لە کار بەدەستەکانی یاخود لە ئەهلی زیمە وەر نەدەگرت نەوەکو بچێتە بواری بەرتیلەوە، لە عەمری کوڕی موهاجرەوە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز ئارەزووی سێوی دەکرد وتی: خۆزگە کەمێك سێومان دەبوو، چونکە تام و بۆنی خۆشە، پاشان پیاوێك لە بنەماڵەی خۆیان هەستاو سێوێکی بۆ برد، کاتێ کە هێنایان وتی: چەند بۆنی خۆشە، هەستە خزمەتکار بیبەرەوە بۆ خاوەنەکەی و پێی بڵێ: دیاریەکەت جێی خۆی گرت، ئەڵێ منیش وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە ئامۆزاتە و لە بنەماڵەی خۆتەو ئاگاداریشیت کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەرگرتووە، عومەریش فەرمووی: ئەوە بۆ ئەوان دیاری بووە، بەڵام ئەمڕۆ بۆ ئێمە بەرتیلە [٣]، هەروەها ڕێی بە خۆی نەدەدا کە بۆنی مسکێك بکات کە موڵکی موسڵمانان بێت، بۆیە کاتێ مسکێکی گەورە خرایە بەدەرەمی لوتی گرت، وتیان: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە تەنها بۆنە، ئەویش وتی: ئایا جگە لە بۆنەکەی سوود لە شتێکی تری دەبرێت [٤]. هەروەها خۆی دەپاراست لە بەکار هێنانی سامان و پارەی موسڵمانان بۆ نموونە چرای بەیتولمالی دا دەگیرساند کاتێ کە کاروباری گشتی موسڵمانان ڕادەپەڕاند و پاشان دەیکوژاندەوە و

---

[١] - اخبار ابي حفص للاجري، ل: ٥٤.

[٢] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٤٠.

[٣] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ١٩٧.

[٤] - سيرة عرم لابن الجوزي، ل: ٢٠٠، كتاب الورع لابن أبي الدنيا، ل: ٧٤.

چرای خۆی دادەگیرساند [1]، مێژوو نووسانیش زۆر نموونەیان باسکردووە کە بەڵگەیە لەسەر پارێزگاری عومەر(ﷺ) ئەوە بوو دوورکەوتنەوە لە موڵك و ماڵی موسڵمانانی لەشتە بچوکەکاندا بە دوورکەوتنەوە لە گومان دەزانی، بۆیە هەمیشە دوور بوو لە گومان [2]، چونکە شتەکان لە سێ حاڵەت بەدەرنین وەك خۆی دەڵێ:

١- مەسەلەیەك کە چاکی یەکلا بوەتەوە و شوێنی بکەوە.

٢- مەسەلەیەك کە خراپی دەرکەوتووە لێی دووربکەوەرە وە.

٣- مەسەلەیەکیش جێی گومانە و دەستی لێ هەڵگرە [3].

هەروەها عومەر(ﷺ) لە قسەشدا پارێزگار بوو و کاتێ پێیان وت: چی دەڵێی دەربارەی ئەهلی صفین؟ وتی: ئەوە خوێنێکە خوای گەورە دەستی منی لێ دوورگرتووە و منیش نامەوێ زمانمی تێ بخەم [4]، بەم شێوەیە ڕوون دەبێتەوە کە پارێزکاری عومەر هەموو کاروبارەکانی گرتۆتەوە، ئەم پارێزگدکاریەش لە باوەڕێکی بەهێزەوە سەرچاوەی گرتبوو لەگەڵ هەست کردنی بەبەرپرسیارێتی، ئەم سیفەتەش تیایدا زۆر دیار بوو بەرادەیەك کەوای لێ هاتبوو کە شوێنێك بکرێت بۆ گۆڕی خۆی بۆ ئەوەی لەدونیا دا تەنها ئەو شوێنی گۆڕەی هەبێت [5].

٥- لێبوردەیی و میهرەبانی و سنگفراوانی: ئەمەش یەکێکە لەو سیفەتانەی کە لە کەسایەتی عومەردا بەرجەستە بوو بوو، لە شێخێکی خەناصریەکانەوە ئەڵێ: عومەر کوڕێکی هەبوو لە فاتیمە، جارێکیان ئەم کوڕە چووەدەرەوە بۆیاری کردن لەگەڵ منداڵاندا، بەڵام منداڵێك سەری شکاند و بکەری ئەو کارەیان هێنا بۆلای فاتیمە و عومەریش لە ماڵێکی ترەوە گوێی لە دەنگە دەنگە کە بوو و هاتە دەرەوە و ئافرەتێکیش هات و وتی: ئەمە کوڕی منە و هەتیوە، عومەریش وتی: موچە و یارمەتی بۆ براوەتەوە؟ وتی: نەخێر، فەرمووی: ناوی بنووسن، فاتیمەش وتی: سەلامەت نەبێت ئەگەر جارێکی تر سەری نەشکێنێتەوە، عومەریش وتی: ئێوە

---

[1] - ألآثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ١٦٤).

[2] - هتمان سترضاوة(١ / ١٦٥).

[3] - العقد الفريد(٤ / ٣٩٧) ألآثار الواردة(١ / ١٦٥).

[4] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ١٩٥.

[5] - النوذج الاداري المستخلص من ارادة عمر، ل: ١٥٦.

ترساندوتانە [1]، لە ئیبراهیمی کوڕێ ابی عبلەوە ئەڵێ: ڕۆژێکیان عومەری کوڕی عبدالعزیز زۆر تووڕە بوو لە پیاوێك و فەرمانی دابەهێنانی و هێنایان و دەست و قاچیان بەستەوە و قامچیان هێناو پاشان وتی: ئازادی بکەن، من ئەگەر تورە نەبوومایە تەمبێم دەکردی پاشان ئایەتی: ﴿وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾آل عمران: ١٣٤). واتە:... و ڕقی بەتینی خۆیان دەخۆنەوە و دەبوورن لە خەڵکی....

لە عبدالملك ەوە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز هەستا بۆ خەوی قەیلولە و تووشی کابرایەك بوو کە لاپەڕەیەکی پێچراوی بە دەستەوە بوو، خەڵکەکە وایان زانی کاری بە ئەمیری باوەڕداران هەیە، ئەویش خەمی بوو نەگاتە لای خەلیفە بۆیە کاغەزە پێچێنراوەکانی فڕێ دا و عومەریش ئاوڕی دایەوە و بەرسەری کەوت و برینداری کرد و خوێن بەدەم و چاویدا هاتە خوارەوە، ئەڵێ عومەریش نامە پێچراوەکەی خوێندەوە و پێویستیەکەی جێبەجێ کرد و پاشان ئازادی کرد [2].

هەروەها ئەگێڕنەوە کە کابرایەك قسەی و توە بە عومەر و ئەویش وەلامی نەداوەتەوە، خەڵکیش وتیان: بۆ وەلامی نادەیتەوە، وتی: پارێزکار دەمی بەستراوە [3]، هەروەها لە حاتەمی کوڕی قودامەوە کە پیاوێك لە کاتی وتاردانی عومەردا هەستایەوە و پێی وت:

شایەتی ئەدەم کە تۆ فاسقیت عومەریش وتی: چۆن دەزانیت؟ تۆش شایەتی درۆ دەدەیت و شایەتیەکەتمان قبوڵ نیە [4] هەروەها ئەگێڕنەوە کە کاتێ عومەر(ﷺ) بوو بە خەلیفە شەوێکیان لە پارشێودا چوە دەرەوە و پاسەوانێکی لەگەڵدا بوو، لە ڕێگەدا قاچی هەڵکەوت لە کەسێك کە لەسەرە ڕێگادا نوستبوو، کابراش وتی: ئەوە شێتیت؟ پاسەوانە کەش ویستی لێی بدات، عومەریش وتی: ڕاوەستە ئەوە پرسیاری کرد کە ئایا شێتم؟ منیش وتم: نەء [5].

ئەگێڕنەوە کە کابرایەك هەستایەوە بۆ عومەر لە کاتی و تارداندا و قسەی پێ وت و تورەی کرد، عومەریش وتی: کابرا ویستت شەیتان و دەسەلات هەڵم بخەڵەتێنێ و کارێکت پێ بکەم کە سبەینێ پێم دەکەیتەوە لە ڕۆژی دواییدا برۆ خوا لێت خۆش ببێت [6].

---

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٢٠٧ الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٢٣).

[2] - حلية الاولياء(٥ / ٣١١).

[3] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزى، ل: ٢٠٨.

[4] - الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٢٤).

[5] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٢٥).

[6] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٢٥).

ئەشلێن: منالێك بەگریان هاتەلای عومەری کوڕی عبدالعزیز، عومەریش وتی: چی بووە؟ وتی: فلانە بەندە لێی داوم، پاشان بەندەکیان هێنا و پێی وت: لەم منداڵەت داوە؟ وتی: بەڵێ: عومەریش وتی: بڕۆ ئەگەر سزای کەسێکم بدایە لەسەر ڕاستگۆیی ئەوە سزای تۆم دەدا پاشا وازی لێهێنا [1]. هەڵوێستەکانی عومەر لە بواری لێبوردەیی و میهرەبانیدا وە زۆرن و ئەمە تەنها مشتێك بوو لە خەروارێك.

٦- ئارامگری: هەروەها ئارامگری و سوپاسگوزاری یەکێك بوو لە سیفەتەکانی عومەر(ﷺ)، ئەگێڕنەوە کە کاتێ عبدالملك کوڕی کۆچی دوایی کرد عومەر چووە سەر گۆڕەکەی و وتی: زۆر قوڵی مەکەن، چونکە ئەوەی لەسەرەوەی زەوی دایە باشترە لەوەی کە لە خوارەوەیدایە [2].

ئەشگێڕنەوە کە کاتێ سەهلی کوڕی عبدالعزیزی برای عومەر و عبدالملکی کوڕی و موزاحیمی خزمەتکاری کۆچی دواییان کرد، پیاوێك لە ئەهلی شام وتی: سوێند بەخوا ئەمیری باوەڕداران تووشی بەلایەکی گەورە بووە، کوڕەکەی مرد کە کوڕ نەبووە هێندە بەسوود بێت بۆ باوکی، پاشان برایەکی مرد کە باشترین برا بوو، ئەڵێ: بەلام بۆ موزاحم بێدەنگ بوو، عومەریش وتی: بۆ بێدەنگ بوویت بۆ موزاحیم؟ سوێند بەخوا نزیکترینی ئەو سێ کەسە بوو لە لام، ڕەحمەتی خوات لێ بێت ئەی موزاحیم، دوو تا سێ جار - بە ڕاستی تۆ دونیای زۆرت نەدەویست و باشترین هاوکار و وەزیر بوویت بۆ کاروباری قیامەت [3].

لە حفصی کوڕی عومەرەوە ئەڵێ: عبدالملکی کوڕی عومەری کوڕی عبدالعزیز کۆچی دوایی کرد و عومەریش ستایشی دەکرد لەلای گۆڕەکەیدا مەسلەمەش وتی: ئایا ئەگەر بمایە پاش خۆت بە خەلیفە دەستنیشانت دەکرد بە خەلیفە؟ وتی: نەخێر، وتی: بەو هەموو چاکیەشەوە؟ عومەریش وتی: من ئەترسم هەستی باوکایەتی کاری تێکردبم و بە چاوی باوکایەتی مەسلەکانم بینبێت [4].

هەروەها جارێکیان وتاری داو وتی: هەرکەسێك تووشی نەهامەتیەك ببێت و بلێت ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾، ئەوە پاداشتێکی دەدرێتەوە باشتر لەوە لە دەستی چووە، هەروەها ئەیوت: ڕازیبوون کەمە و موسڵمان پشت بە ئارامگری دەبەستێ، ئەڵێت: هەرکەسێ بە بێ زانیاری کار بکات ئەوە

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٢٥).

[2] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٢٥).

[3] - الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٢٧).

[4] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٢٨).

خراپە و زیانی لە چاکەی زیاتر و هەر کەس قسەکانی لە کردەوەی زیاتر بوو گوناهی زۆر دەبێت، ڕازیبوون کەمە و موسڵمان پشت بە ئارامگری دەبەستێت [1].

گرنگترین شتێکیش کە عومەر لە ژیانیدا لەسەری ئارامگر بوو بێت مەسەلەی خەلیفایەتیە لەم بارەیەوە ئەڵێ: سوێند بەخوا تەنها بۆ ئەوە لەسەر ئەم کورسیە دانیشتووم کە خەڵکی نەشیاو لەسەری دانەنیشێت، ئەگەر بەگوێشم بکرایە ڕادەستی کەسانی شیاوم دەکردەوە، بەڵام ئارام دەگرم هەتاوەکو خوای گەورە بڕیاری خۆی دەدات و دەروم لێ دەکاتەوە [2].

٧- توندی و یەکلا کردنەوەی: عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەم سیفەتەی تیا بوو لە کاتێکدا کە ئوممەت زۆر پێویستی بە توندی و یەکلا کردنەوەی مەسەلەکان هەبوو، بەتایبەتی لەو مەسەلانەدا کە پەیوەندی بە ئەمیری والی و کاربەدەستانەوە هەبوو، بەڵگەش لەسەر بەدی هاتنی ئەم سیفەتە لە عومەردا ڕێکخستنی کارەکان وشلگیری نەنواندن لەومەسەلانەدا کە بە پێویستی دەزانین بۆ بەرژەوەندی گشتی، ئەم توندیەی عومەریش شێوازی جۆراوجۆری هەبوو، وەك توندی لەگەڵ ئەمیر و گەورەکانی بەنی ئومەیە و ئەوانەی کە دەیانوسیت ناکۆکی بخەنە ریزی موسڵمانانەوە و ئاژاوە و خوێن ڕشتن بەرپابکەن، یەکەم ئاماژەش لەسەر توندی ئەو هەڵوێستەی بوو کە لە بەرامبەر کوڕانی مەروان دا نواندی کاتێ پێی وتن: ئەوەی لەسەرتانە بیدەن و ناچارم مەکەن کارێك بکەم کە پێم خۆشە نیە، هەتاوەکو تووشی شتێك نەبن کە پێتان خۆش نیە، ئەوە بوو کەسیان وەلامیان نەدایەوە، ئەویش وتی: وەلامم بدەنەوە، یەکێکیش لەوان وتی: سوێند بەخوا دەس لەو ماڵە هەڵناگرین کە باوباپیرانمان پێیان بەخشیوین گیانمان تیادا بێت بۆ ئەوەی منداڵەکانمان هەژار نەکەون و باوباپیرانمان بە بێ باوەڕدانەنرێن، عومەریش وتی: سوێند بەخوا ئەگەر لە ترسی ئەوەنەبێت کە پشت بە کەسێك ببەستن کە من مافەکان بۆ ئەوەدەگێڕمەوە، ئەوە لێدانم دەکردن، بەڵام لە ئاژاوە ئەترسم، سوێند بەخوا ئەگەر خوا تەمەنم بداتێ ماف بۆ هەموو خاوەن مافێك دەگێڕمەوە بە پشتیوانی پەروەردگار [3]، هەروەها عومەر دەستی بدایەتە هەر کارێکیش ئەیبردە سەر، ئەوە بوو ڕۆژێك نامەیەکی لە یەکێك لە کوڕانی مەروانەوە پێگەشت و تورەی کرد و هەڵچوو، پاشان وتی: سوێند بێت خوا ڕۆژێکی دەبێت لەگەڵ کوڕانی مەروان دا کەتیایدا سەردەبڕدرێن خۆزگە ئەوەش لەسەر دەستی من دەبوو

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٢٨).

[2] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ١٤٤.

[3] - العقد الفديد(٥ / ١٧٣).

کـاتێ ئەمـەش بـەوان گەیـشتەوە وازیـان هێنـا، چـونکە دەیـانزانی چـەندە تونـدە و ئەگـەر بکەوێتەبیری کارێك دەیباتەسەر [1].

سەبارەت بەو کەسانەش کە دەیانویست ناکۆکی بخەنە ڕیزی موسڵمانانەوە و لەڕیزیان دەربـچن، ئەوە لە گەڵیاندا شێوازی گفتوکۆ و مشتومڕی دەگرتەبەر – مەبەست خەواریجەکانە – کە لـە دژی بەنی ئومەیە ڕاپەڕین بە سەرکردایەتی شوذب ی خارجی لە ساڵی ۱۰۰ ی کۆچیدا هەتاوەکو هـۆی ئەو کارەیان بزانێت و بۆ ئەوەی ئەگەر حەقیان لە لابوو لە داواکانیان بکۆڵێتەوە، بەڵام لەگـەڵ ئـەم وتوێژەش دا جۆرێك لە توندی نیشان دەدا کاتێك کە مەسەلە کـە دەگەشـتە خراپـەکاری و ڕشـتنی خوێنی موسڵمانان و، ئەوە بوو نامەیەکی نووسـی بـۆ کـار بەدەسـتی خـۆی لـە عێـراق و ئـەیوت: مەیانوروژێنە مەگەر ئەوەی کە خوێنێك بڕژن یان خراپەکاری یەك بکەن، بەڵام ئەگەر ئەوانەیان کـرد ئەوە پیاو چاکێکی توندیان بۆ بنێرە وباسەربازیسی لەگەڵدا بێت و ئەوشتانەی پێ بڵێ کە فەرمانم پێ کردیت [2].

عومەر بەم شێوەیە توند بـوو، ڕێوشـوێن و هەڵوێـستە یەکلاکـەرەوەکانی بـە گرنگیـەکی زۆر و بەوپەڕی هەستیاریەوە وەردەگرت، ئەم توندیەشی ئاکـامێکی بـاش و گـەورە و کاریگـەری باشیـشی هەبوو لەسەر بەڕێوەچوونی کارەکان و جێبەجێ کردنی ئـەوەی کـە هـەوڵی بـۆدەدا لەدادگـەری و دڵنیایی و ڕوخسارەکانی خیلافەتی ڕاشید و چاند بووی [3].

٨- دادگەری: ڕەوشتی دادگەری یەکێکـە لەبەرجەسـتەترین ڕەوشـتە سـەرکردەیەکانی عومـەری کوڕی عبدالعزیز پێشتریش ئاماژەماندا بەدادگەری لە دەوڵەت و سیاسـەتی دا بـۆ نەهێـشتنی ستەم و گێڕانەوەی مافەکان، زانایانیش کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز لە پێشەوایانی دادگەری و خەلیفەکانی ڕاشیدین و پێشەوا ڕێنمـایی کراوەکانـە [4]، لەوانەشـە یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکـانی دادگـەری عومـەر بریتـی بێـت لـە بـاوەڕی بـەوەی کـە دادگەری یەکێکە لە یاسا خواییەکان لە بوونەوەردا و یەقینی تـەواوی بـەوەی کـە دادگـەری بەرهەمێکە لەبەرهەمەکانی باوەڕ و یەکێکە لە سیفەتەکانی ئـەو باوەڕدارانـەی کـە بنـەماکانی دادگەریان خۆش دەوێت هەروەها بە هۆی هەستکردنی عومەر بـە قورسـایی سـتەم لـە سـەر خەڵك لەسەردەمی خەلیفەکانی پێش خۆیدا ئەمە جگە لە هۆکاری سـەرەکی کـە بریتیـە: لـە

---

[1] – النموذج الادري المستخلص من ادارة عرم، ل: ١٥٨.

[2] – تأريخ الطبري(٧ / ٤٥٩).

[3] – النموذج الاداري المستخلص، ل: ١٦٣.

[4] – البداية و النهاية، له النموذج الاداري يتوة، ل: ١٦٣.

فەرمانکردنی پەروەردگار بەدادگەری و چاکەکردن وەك بناغەی گشتی شەریعەتە ئاسمانیەکان و ئەو خۆشویستنی دادگەریەی کە ئیسلام لە ناخی عومەردا برەوی پێ دابوو [1].

ئەمەش هەندێکە لە نموونەکانی دادگەری کە پێشتر ئاماژەم پێ نەداوە، ئاجری ئەگێڕێتەوە کە پیاوێکی – زیمی – خاوەن پەیمان ی خەڵکی حمص هات بۆلای عومەر و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران داوای حوکم کردنت بە قورئان لێ دەکەم، وتی: بۆچی؟ وتی: عەبباسی کوڕی وەلیدی کوڕی عبدالملك زەویەکەی داگیر کردوم عەباسیش لەوێ دانیشتبوو – عومەریش وتی: چی ئەڵێی عەبباس؟ وتی: وەلیدی کوڕی عبدالملك پێی داوم ئەی ئەمیری باوەڕداران و بەڵگە نامەیەکیشی بۆ نووسیوم، عومەریش وتی: چی ئەڵێ ی کابرا؟ وتی:

من داوای حوکمی قورئانت لێ دەکەم ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەریش وتی: نامەی خوا لە پێشترە هەتاوەکو نامەی وەلیدی کوڕێ عبدالملك، ئەی عەباس زەویەکەی بۆ بگێڕەوە [2] ئەویش بۆی گێڕایەوە. هەروەها لە هەڵوێستە دادگەرانەکانی ئەوەی کە الحکم ی کوڕی عومەری ڕەعینی بۆمان دەگێڕێتەوە و ئەڵێ: لە کاتی ناکۆکی مەسلەمەی کوڕی عبدالملك لەگەڵ خەڵکی دێرئیسحاق دا لەسەر ناعورە لای عومەری کوڕی عبدالعزیز بووم [3]، ئەوە بوو عومەر بە مەسلەمەی وت: لەسەر ڕاخەر دامەنیشە لە کاتێکدا کە ڕکابەرەکانت لە بەردەستمدان ئەگەر ئەشتەوێت کەسێك لەبری خۆت دەستنیشان بکە ئەگینا دەبێ لەبەردەستمدا دابنیشیت، ئەوە بوو ئەویش کەسێکی کردەبریکاری خۆی و عومەریش ناعورەی لێ سەندەوە بۆ ڕکابەرەکەی [4]، ئەمەش مشتێکە لە خەروارێك کە لە کتێبەکانی ژیاننامەدا دەربارەی دادگەری عومەر(ﷺ) هاتووە.

٩- پاڕانەوە و نزا و وەڵامدانەوی نزاکانی لەلایەن پەروەردگار: عومەری کوڕی عبدالعزیز نزاو پاڕانەوەی زۆر بوو، ئەیوت: پەروەردگار دروستت کردووم و نەهیت لێکردوم و بەڵێنت پێداوم بە پاداشتی ئەوەی کە فەرمانت پێکردووم و ترساندومت لە سزای ئەوەی کە نەهیت لێکردووم و دوژمنێکت بەسەردا زاڵ کردوم و لە سنگمدا جێنشینت کردوەو و بەناو دەمارەکانمدا هاتووچۆ دەکات، هەرکە ویستم خراپەیەك بکەم هانم دەدات و ئەگەر ویستیشم چاکەیەك بکەم ساردم ئەکاتەوە، بێ ئاگا نابێت بە بێ ئاگا بونم و لە بیری ناچێت بە لەبیر چوونم، داوم بۆ دەنێتەوە لە ئارەزوەکاندا و گومانم بۆ دروست دەکات، جا ئەگەر تۆ فێڵ و

---

[1] - النموذج الاداري، ل: ١٦٣، ١٦٤.

[2] - أخبار أبي حفص، ل: ٥٨.

[3] -ناعورە، شوێنێکە لە نێوان حەلەب و بالس دا و هەشت میل لە حەلەبەوە دوورە.

[4] - سيرة عمر بن عبدالعزيز ن ل: ٩١ لابن الجوزي.

تەڵەكەی لە من دورو نەخەیتەوە زەلیلم ئەكات، خوایەگیان دەسەڵاتی لەناوبەرە و بەسەرمەوە بە هۆی ئەو دەسەڵاتەی کە تۆ بەسەر ئەوەوە هەتە و بە هۆی زۆریادكردنتەوە بەندی بكە و منیش بگێڕە لەو كەسانەی كە پشتیان بە تۆ بەستووە، چونكە هیچ هێز و دەسەڵاتێك نیە جگە لە تۆ [١].

هەروەها ئەویت: خوایەگیان ئەو كەسە چاك بكەیت كە چاكی ئوممەتی محمدی پێوەبەندە و ئەوكەسەش لەناو بەریت کە لەناو چوونی هۆكارێكە بۆ چاكبوونی ئوممەتی محمد(ﷺ) [٢]، هەروەها ئەم نزایەشی دەكرد: خوایەگیان تەندروستی بكە بە پۆشاكی من هەتاوەكو چێژ لە ژیان بەرم و بەلێخۆشبوون كۆتایی بە ژیان بێنە هەتاوەكو تاوان كارم تێ نەكات و هەموو كۆسپێكم لێ بەدوور بگرە هەتاوەكو دەگەمەیەنیتە بەهەشت ئەی میهرەبانترینی میهرەبانان [٣]، هەروەها ئەیفەرموو: پەروەردگار من لە خۆشەویسترین شتدا بەلای تۆوە گوێڕایەڵم کردووی كە یەكتاپەرستی یە و لە قێزەونترین شت دا سەرپێچیم نەكردوی كە شیرك و هاوەڵگەریە، دەسا تۆش لەو شتانە خۆش بە كە دەكەونە نێوانیانەوە [٤].

هەروەها ئەیوت: خوایەگیان پەنابە تۆ دەگرم لەوەی كە نیعمەتی تۆ بگۆڕم بە بێ نەزانینی، یاخود دوای نەمانی لە یادم بچێتەوە و ستایشی نەكەم [٥].

زۆرجاریش ئەم نزایەی دەكرد، خوایە گیان ڕازیم بكە بە بڕیار و قەزای خۆت و بەرەكەت بخەرە ئەوەی كە بۆت نوسیوم، هەتاوەكو حەزم لە لە پێش خستنی شتێك نەبێت كە تۆ دوات خستوە یان دواخستنی شتێك كە تۆ پێشت خستووە [٦].

هەروەها عومەر(ﷺ) نزای گیرابوو، ئیبن الحكم ئەگێڕێتەوە كە ئیبن ڕەیان شمشێر بە دەستی وەلیدی كوڕی عبدالملك بوو، كاتێ عومەر بوو بەخەلیفە وتی: من ئەزانم چەند لوت بەرز و سەرگەردانە، پاشان وتی: خوایەگیان من پلەوپایەی ئیبن ڕەیانم لەبەر تۆدا بەزاندووە و تۆش بەرزی نەكەیتەوە، ئەڵێ لەو كاتەوە هیچ ناودارێك نەبوو هێندەی ئەو لە یاد كراو و بێ ناو بوو بێت [٧]، لە

---

١ - الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(١ / ٣٤١).

٢ - هەمان سەرچاوە(١ / ٣٤٢).

٣ - هەمان سەرچاوە(١ / ٣٤٣).

٤ -سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٢٣٠.

٥ - الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(١ / ٣٤٣).

٦ - هەمان سەرچاوە(١ / ٣٤٤).

٧ - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٣٠.

کاتی حەج کردنیدا و پێش چوونە ناو مەککەوە ئاگاداریان کردەوە لە کەمبونەوەی ئاو لەمەککە دا ئەویش نزای کرد و خوای گەورە نزاکەی گیرا کرد و باران باری، ئەمەش لەکاتێکدا بوو کە عومەر ئەمیری مەدینە بوو [1]، دۆعاشی کرد لە غیلانی قەدەری لە کاتی مشتومڕی نێوانیانداو وتی: پەروەردگار ئەگەر غیلان ڕاست دەکات ئەوە باشە ئەگینا لە خاچی بدە، ئەڵێ دواتر لەسەردەمی هشامی کوڕی عبدالملك دا لە خاچ درا[2].

## دووەم: ڕوخسارەکانی نوێکردنەوە لای عومەری کوڕی عبدالعزیز:

چاودێری وتەی زانایان و مێژوونوسان و ئەو کەسانەی کە گرنگی بە لێکۆڵینەوەی بزوتنەوەی نوێگەری ئاینی دەدەن، کۆ دەنگیەکی تەواو بەدی دەکات سەبارەت بە دانانی عومەری کوڕی عبدالعزیز بە نوێگەر و موجەدیدی یەکەم لە ئیسلامدا [3].

یەکەم کەسێکیش کە ئەم نازناوەی لێنا پێشەوا محمدی کوڕی شەهابی زوهەری بوو، پاشان پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل شوێن پێی هەڵگرت و وتی: لە فەرموودەیەك داهاتووە کە خوای گەورە لەسەری هەر سەدساڵێکدا کەسێك دەنێرێت کە ئاینی ئەم ئوممەتە نوێ بکاتەوە، ئێمەش سەیری سەد ساڵی یەکەممان کرد و بینیمان ئەو کەسە عومەری کوڕی عبدالعزیزە [4]، زانایان بەردەوام بوون لە دانانی بە یەکەم نوێگەر هەندێ لە ئەهلی عیلم پێیان وایە کە عومەر یەکێکە لەو کەسانەی کە مەبەستن بەو فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ): خوای گەورە هەر سەد ساڵێك کەسێك دەنێرێ بۆ ئەم ئوممەتە کە ئاینی نوێ بکاتەوە [5]، بێگومان عومەری کوڕی عبدالعزیزیش شایانی ئەوەیە کە ئەم فەرموودەیە بیگرێتەوە، چونکە لە زانایانی کارا بوو کە هەموو خەمێکی شەو و ڕۆژی زیندوو کردنەوەی سوننەت و نەهێشتنی بیدعە و شتەداهێنراوەکان و سەرکۆ نەکردنی خاوەنەکانیان بوو [6]، ئیبن حەجەری عەسقەلانی ئەڵێ: دیارە ئەم شتانەی کە پێویستیان بەنوێ کۆببنەوە هەیە لە یەك جۆر چاکەدا کۆنابنەوە، و مەرج نیە هەموو سیفەتە باشەکان لە کەسێکدا کۆببنەوە، مەگەر لە عومەری کوڕی عبدالعزیز دا، چونکە ئەو هەستا بەوکارە لەسەری سەد ساڵی یەکەمدا و هەموو ئەو سیفەتانەشی تیادا کۆببوو بوویەوە، لێرەشەوە پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: زانایان پێیان وا بوو مەبەست لەم

---

[1] - البداية و النهاية له الاثار الواردة(١ / ١٨٣).

[2] - الشريعة للآجري(١ / ٤٣٨).

[3] - عون المعبود(١١ / ٣٩٣) العظيم آبادي، جامع الاصول(١١ / ٣٢٢).

[4] - سيرة و مناقب عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٧٤.

[5] - المجدون في الاسلام، ل: ٥٦ للصعيدي، موجز تأريخ للمودودي، ل: ٦٣.

[6] - الاثار الواردة عن عمر في العقيدة(١ / ١٧٧).

فەرموودەیە عومەرە(رضي الله عنه)، سەبارەت بە وانەش کە دوای ئەو هـاتوون وەك شـافیعی ئـەوە هەرچـەند سیفەتە جوانەکانی لە خۆدا کۆکردبوویەوە، بەلاَم ئەو جیهاد و دەسەلاَتی دادوەرانەی نەبووە [1].

لەگەلّ ئەوەشدا کە هەندێك لە زانایان پێیان وایە کە پلەوپایەی نوێگـەری کامـلّ تـەنها مەهـدی ئاخیرزەمان بەدەستی دێنێت و تا ئێستاش نوێگەر و مجـددێکی تـەواو لـە دایـك نـەبووە، هەرچـەندە عومەری کوڕی عبدالعزیز نزیك بوە لە گەشتن بەو پلەوپایەیـە ئەگـەر بیتوانیایـە شـێوازی حـوکمی پشتاوپشت هەلّبوەشێنێتەوە و هەلّبژاردنی خەلیفە لە ڕێگەی شوراوە بگەڕێتەوە [2].

جا ئەگەر عومەری کوڕی عبدالعزیز شیاوی نازناوی موجەددیدی کاملّ بێـت یـان نـا، ئـەوە ئـەو کارە نوێخوازیانەی کە پێی هەستا و ئەو هەولّە زۆرانەی کە خستیە گەڕ بۆ گێڕانەوەی ژیان ئیسلامی و گێڕانەوەی بۆ پاکێتی سەردەمی پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) و خەلیفەکانی ڕاشیدین(رضي الله عنهم) بەسە بۆ ئەوەی لە پێشەوەی نوێگەر و موجەددیدەکانی مێژووی ئیسلامیدا دابنرێت، بێگومان پێگەشی لـە سـەرەوەی خیلافەتدا یارمەتی دەری بوو بۆ ئەمە، بۆ ئەوەی قەبارەی ئـەو کـارە نوێخوازیانـەش بـزانین کـە پێـی هەستاوە و ڕادەی ئەو چاکسازیەمان بۆ دەرکەوێت کە ئەنجامی داوە پێویـستە هەلّوێـستەیەك لەسـەر ڕادەی ئەو لادانانە بکەین کە بەسەر ژیانی ئیسلامیدا هاتبوو و ئەو گۆڕانکاری و کودەتایە کەبەسـەر خەلاَفەتدا کرا بوو، لەوانەیە لە ڕاستی لامان نەدابێت ئەگەر لادان کورتکە ینەوە لەسیستمی حـوکم و ئەو ستەم و گەندەلّیەی کە لێی کەوتبوویەوە، بەلاَم ژیانی کۆمەلاَیەتی هێشتا کاریگەری ڕوناکی و ڕێنماییـەکانی پێغەمبـەری خـوا(صلى الله عليه وسلم) لەسـەر بـوو و ئـاین دەسـەلاَتی یەکـەمی هـەبوو بەسـەر دلّـی خەلّکیدا [3].

**١- لە چاکسازی و کارە نوێخوازەکانی عومەر(رضي الله عنه):**

أ- **شورا و ڕاوێژ:** پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە عومەری کوڕی عبدالعزیز لە یەکەم چاوپێکەوتنی لەگەلّ خەلّکیدا، سوپاس و ستایشی خوای کردوە و فەرموویەتی: ئەی خەلّکینە من ئەم کارەم توش کراوە بە بیّ ئـەوەی ڕای خـۆمی لەسـەر بێـت و بـە بـیّ ئـەوەی داوای بکـەم و بـەبیّ ڕاوێژکردن بە موسلّمانان، ئێستا منیش بەیعەتی ئێوە لە گەردنی خۆم دەکەوە و داوادەکەم کە بە ئارەزووی خۆتان کەسێك هەلّبژێرن، ئەوە بوو خەلّکیش بەیەك دەنگ هاواریان کرد: ئـەوە

---

[1] - فتح الباري(١٣ / ٢٩٥).

[2] - موجز تاريخ تجديد الدين للمودودي، ل: ٦٩.

[3] - عمر بن عبدالعزيز للندوي، ل: ١٠.

تۆمان هەڵبژارد ئەی ئەمیری باوەڕداران و ڕازین بە تۆ و کاروبارمان بـەخێر وبەرەکەتـەوە لـە ئەستۆ بگرە [١].

بەم پێیەش هەستا بەیەکەم کاری نوێخوازانە کاتێ خەڵکی ڕزگار کرد لە دەسـەڵاتی سـتەمکار، و زۆری لێ نەکردن بۆ ڕازی بوون بەکەسێك کە هەڵیاننە بژاردووە، بەڵکو مەسەلەکەی گێڕایەوە بـۆ خۆیان و ڕاوێژی پێ کردن لە بارەیەوە.

ب- **ئەمینداری لە حوکم و دانانی کەسانی ئەمین و دەستپاك:** دەقی زۆر بە شـێوەی پشتاوپـشت هاتووە و ئاماژە بەوە دەکات کە تا دواڕادە سوور بووە لەسـەر ئەمیـنداری و ئەمانـەتپارێزی، دیارە لە یەکەم ساتەوە هەستی بە گەورەیی مەزنی ئەو بەرپرسیارێتی یە کرد بوو کـە خرابـووە ئەستۆی، بۆیە بەو کەسەی وت کە پرسیاری لێ کرد، بۆ خەمباری؟ فەرمووی: حەقی خۆیەتی کە خەم بخۆم بۆ ئەو بارەی کە تێی کەوتوم، چونکە هیچ کەسێك نیـە لـەم ئوممەتـەدا کـە مـن نەمەوێت مافی خۆی پێ بگەیەنم بێ ئەوەی داوای بکات [٢].

هەروەها ئەڵێ: لە هیچ کام لە ئێوە باشترنیم، بەڵام لە هەمووتان بارم قورسترە [٣]، هەروەك داوای لە کاربەدەستەکانی دەکرد کە خەڵکی بە توانا و دیندار هەڵبژێرن بۆ کارەکان و نامەیـەکی نووسـی بۆ یەکێك لە کار بەدەستانی کە تیایدا هاتبوو، کاروباری موسڵمانان بە کەسێك نەسپێریت ئەگەر بـە مۆچیاری و پاشەکەوت کردن و پاراستن و گەیاندن ئەمانەت نە ناسرا بێت [٤].

سیاسەتیشی بۆ خۆپاراستن لە ماڵ و موڵکی موسڵمانان تەنها بەسەرخۆیدا نەسەپاند بـوو ،بـەڵکو کاربەدەست و والیەکانیشی پێوە پابەند کرد بوو، ئەوەتا لە نامەیەکیدا بۆ ئەبوبەکری کوڕی حزم ی کاربەدەستی هاتووە: پێنوسەکەت ورد بگرە و دێڕەکانت نزیك بکەرەوە، چونکە من نامـەوێ شـتێ لە سامانی موسڵمانان بەفیڕۆ بچێت کە سوودی نیە بۆ یان [٥]، هـەروەها عومـەر(ﷺ) بەشـێوەیەکی میهرەبانانە سیاسەتی دەکرد و ژیانێکی باشی بۆ ڕەخساندبوون و لە سواڵ و دەرۆز کـردن ڕزگـاری کردن و سامان و پارەی زیادی بەیتولماڵی ماڵی بەسەر خەڵکی نەدار دا دابەش کرد [٦]، ئەوە بـوو سـێ

---

[١] - التجديد في الفكر السلامي د. عدنان محمد، ل: ٧٩.

[٢] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٥٨٦).

[٣] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٥٨٦).

[٤] - تأريخ الطبري، لە التجيد في الفكر الاسلامي، ل: ٨١ وة.

[٥] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٥٩٥).

[٦] - تأريخ الطبري، لە التجديد في الفكر الاسلامي يتوة، ل: ٨١.

درهەمی بەسەر هەر هەژارێکی بەسرەدا دابەش کرد، پەنجا پەنجاشی دا بە زیمی یەکان [1]، هەروەها داوای کرد لە کاربەدەستەکانی کە هەرکەسێك دەیەوێ بەڕێی بخەن بۆ حەج [2]، نامەشی نووسی بۆ کاربەدەستەکانی کە دیوەخان دروست بکەن لە شارەکانتاندا و هەر موسڵمانێك سەردانی کردن سەو و ڕۆژێك میوانداری بکە و ئاگاتان لە ولاخەکانیان بێت، هەرکەسێکیش نەخۆش بوو دوو شەو و دوو ڕۆژ میوانداری بکەن، ئەگەر پارە و خەرجی لێ بڕا بوو ئەوە هاوکاری بکەن تا دەگاتە ولاتی خۆی [3]، هەروەها بەکەمی کەسێك دەست دەکەوت کە لە سەردەمی عومەر(رضي الله عنه) دا زەکاتی وەرگرتایە، عومەری کوڕی ئەسید ئەڵێت: سوێند بەخوا عومەر کۆچی دوایی نەکرد هەتاوەکو وای کرد کە کەسێك پارەیەکی زۆری دەهێنا و ئەیوت: چۆنتان پێباشە ئەم پارەیە سەرف بکەن. ئەوە بوو زۆری نەدەبرد هەموو پارەکانی پێ دەدرایەوە، چونکە عومەر هەموو خەڵکی دەوڵەمەند کرد بوو [4]، ڕێزی موسڵمانانیش لە سەرووی هەر پارەو پۆڵێکەوە بوو ئەوە بوو نامەی نووسی بۆ کاربەدەستەکان: دیلی موسڵمانان بکڕنەوە ئەگەر هەموو پارەکانیش بەرێت [5].

خیلافەتی عومەری کوڕی عبدالعزیزیش بەڵگەیەکی مێژوویە دژ بە هەموو ئەوانەی کە گومانیان هەیە لە ئەگەری پیادەکردنی سیستمی ئابووری ئیسلامی و هەروەك بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئەوەی کە پەنا بردن بۆ شەریعەتی خوا تاکە ڕێگەیە کە خۆشگوزەرانی دونیا و سەرفرازی ڕۆژی دوایی بۆ مرۆڤەکان مسۆگەر دەکات [6].

ج- **بنەمای دادگەری:** عومەر لەم بوارەدا ڕۆڵی سەرەکی هەبوو و بەڕاستی میراتگری عومەری کوڕی خەتتابی باپیری بوو ئەوە بوو لەسەر دراو دەستەواژەی، خوا فەرمانی کردووە بە دادگەری و وەفاداری نووسیبوو [7]، هەروەها داوای کرد کە حەد و سزا بەسەر کەسێکدا جێبەجێ نەکرێت هەتاوەکو ئاگادار دەکرێتەوە و [8]، نامەیەکی بۆ جەڕاحی کوڕی عبدالله حوکمی ئەمیر خوراسان نووسی کە تیایدا هاتبوو: ئەی کوڕی ام جراح، نەدەیت لە هیچ

---

[1] - تأريخ الطبري(٧ / ٤٧٤).

[2] - هەمان سەرچاوە(٧ / ٤٧٤).

[3] - هەمان سەرچاوە(٧ / ٤٧٢).

[4] - سير أعلام النبلاء(٥ / ٥٨٨).

[5] - سيرة عمر لابن الجوزى، ل: ١٢٠.

[6] - خامس الخلفاء الراشدين عمر بن عبدالعزيز، ل ٤١ — ٤٢.

[7] - سير و مناقب عمر بن عبدالعزيز الجوزي، ل: ٩٨.

[8] - تأريخ الطبري(٧ / ٤٧٤).

موسڵمانان یان خاوەن پەیمانێك و ئاگات لە تۆڵە بێت، چونکە تۆ بۆ لای کەسێك دەچیت کە چاوەنا پاك و نهێنی دڵەکان دەزانێت و نامەیەکت پێ دەدرێت کە هیچ بچوك و گەورەیەك نیە تیایدا هەژمار نەکرابێت [1].

هەروەها مافی ئەهلی زیمە و خاوەن پەیمانەکانی دا و فەرمانی کرد کە دەستدرێژی نەکرێتە سەر خۆیان یان کڵێسا و پەرستگاکانیان، لەم بارەشەوە نامەی نووسی بۆ کاربەدەستانی، کە کڵێسای گاوران و پەرستگای جولەکەکان مەڕوخێنن هەروەهاماڵێکی ئاگر کە لەسەری ڕێککەوتبن، ئەوە بوو باجی هەڵگرت و دەیەکی نەهێشت کە حکومەتەکانی پێش ئەم فەرزیان کرد بوو و ئازادی بازرگانی لەوشکانی و دەریادا بۆ خەڵك مسۆگەر کرد و خۆی پاککردەوە لەو ستەمانەی کە بەنی ئومەیە کرد بوویان و خۆی بێ بەری کرد لە حەجاج و کارەکانی و سەرزەنشتی ئەو کار بەدەستانەی کرد کە شوێن پێی حەجاجیان هەڵدەگرت [2].

د- **هەستانی بەزیندوو کردنەوەی فەرمانـدان بەچـاکە و نـەهی کـردن لـە خراپـە :** خەلافەت بەرەبەرە پاشەکشەی کرد لە و مەبەستەی کە لە پێناویدا بەرپابوو بوو، کە ئەویش بریتی بوو لە پاراستن و پاسەوانی ئاین، ئەوە بوو عومەریش ئەم بنەمایەی جێبەجێ کرد و ئاڵا و بەیداخی لەم بوارەدا بەرز کردەوە و پێش هەموو کارەکانی تری خست، ئەو دەست کەوت و کارە مەزنانەش کە عومەر بەدەستی هێنا هەموو لە ڕوانگەی ترسی زۆریەوە بوو لە خوا و مەبەستیشی تەنها ڕەزامەندی ئەو بوو، بوونی گەورە زانایان و موجتەهیدانیش لە گەڵیاندا یارمەتی دەرێکی باش بوو بۆی لەم بوارەدا [3]، تەنانەت مەڕوانی کوڕی مەیمون لەبارەیەوە ئەیوت: زانایان لای عومەری کوڕی عبدالعزیز وەك قوتابی بوون [4]، ساغ و دروستی ئاین و ڕاستی بیروباوەڕیشی کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر نوێگەری و چاکسازیەکانی و، توانی ڕوبەڕووی خەڵکانی بیدعەچی و ئارەزوباز ببێتەوە و بەتوندی سەر زەنشتیان بکات [5].

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٧ / ٤٦٤).

[2] - هەمان سەرچاوە(٧ / ٤٧٧).

[3] - سیرة و مناقب عمر، ل: ١٠٧، ١٠٨.

[4] - التجدید في الفکر الاسلامی، ل: ٨٥.

[5] - سیر اعلام النبلاء(٥ / ٥١٨).

ئەمەش دواتر بە باشی ڕوون دەکەینەوە بە پشتیوانی پەروەردگار، پێشەوا ئەوزاعیش لێیەوە دەگێڕێتەوە کە وتویەتی: ئەگەر کۆمەڵێکت بینی کە لە مەسەلەی دینداریدا چپەچپێکی تایبەتیان هەبوو و نەیاندەهێشت خەڵك بزانێت ئەوە بزانە کە خەریکی کارێکی گومڕاکەرانەن [1].

هەروەها پێ ی وابوو کە ژیانی هیچ نرخێکی نیە بە بێ زیندوو کردنەوەی سوننەتێك یان مراندنی بیدعەیەك [2].

گرنگی یەکی زۆری دەدا بە ئاین و ڕەوشتی خەڵکی و لە نامەکانیدا بۆ کاربەدەستەکانی هاتبوو: خۆتان دووربگرن لە کارکردن لە کاتی نوێژدا، چونکە هەر کەس نوێژ بفەوتێنێت ئەوە مەسەلەکانی تری ئیسلام زیاتر دەفەوتێنێت [3].

ئەگەر سەرنجی وتار و ئامۆژگاریە زۆر و زەبەندەکانی عومەر بدەین ئەوە باوەڕێکی بە هێز و ترسێکی ئاشکرا و زۆربەدی دەکەین لەو ڕۆژەی کە خەڵکی لەبەردەم پەروەردگاردا دەوەستێنرێن، هەروەها کەسایەتی عومەر و سیاسەتی دادگەرانەشی کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر ژیانی خەڵك و ئارەزوو حەزەکانیان [4]، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە طبری لە تاریخەکەیدا ئەیگێڕێتەوە لە کاتی بەراورد کردنی سەردەمی عومەر بەسەردەمی خەلیفەکانی پێش خۆیدا و ئەڵێ: وەلید خاوەنی بیناسازی و کارگە بوو و خەڵکی بەیەك دەگەشتن لەسەردەمی دا و پرسیاریان لە یەك دەکرد دەربارەی بینا و کارگە، پاشان سولەیمان بوو بە خەلیفە و خاوەنی ژن و خواردەمەنی بو خەڵکیش هەمیشە باسی کەنیزەیەك و هاوسەر گیریان دەکرد، کاتێ، عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بەخەلیفە خەڵك لە یەکیان دەپرسی ئەم شەو چی دەکەیت و چەند قورئان لەبەردەکەیت و کەی خەتمێك دەکەیت و کەی لێبویتەوە و چەند ڕۆژ لە مانگێکدا بە ڕۆژوو دەبیت [5].

عومەر تەنها بە بەرپاکردنی ئاین لە دەوڵەتەکەیدا وازی نەهێنا، بەڵکو گرنگی بە خەڵکانی غەیرە موسڵمانیش دەدا و بانگی دەکردن بۆ هاتنە ناو ئیسلام و نامەی دەنارد بۆ پاشاکانی هیند و پاشاکانی ئەو دیو دەریا و بەڵێنی پێدان کە ماف و ئەرکیان وەك موسڵمانان بێت، لە ئاکامدا خەڵکێکی زۆریان لێ موسڵمان بوو و ناوی عەرەبیان لە خۆیان نا [6].

---

١ - سيرة و مناقب عمر بن عبدالعزيز، ل: ٨٣ لابن الجوزي.

٢ - التجديد في الفكر الاسلامي، ل: ٨٦.

٣ - سيرة و مناقب عمر بن عبدالعزيز، ل: ٢٢١ لابن الجوزي.

٤ - التجديد في الفكر الاسلامي، ل: ٨٦.

٥ - تأريخ الطبري، له التجديد في الفكر الاسلامي، ل: ٨٦.

٦ - خامس الراشدين عمر بن عبدالعزيز، للندوي، ل: ٣٠.

ڕەنگە یەکێك لە پیرۆزترینی ئەو کارانەشی کە خزمەتی ئیسلامی پێ کرد فەرمانـدانی بێـت بـە نووسینەوەی زانستە ئیسلامیەکان بەتایبەت زانستی فـەرمووده ئەمـە دواتـر بەپـشتیوانی پـەروەردگار ڕوون دەکەینەوە، ئەم کارە مەزن و چاکسازیە گەورانـەش لـە مـاوەی کـورتی خەلافـەتی عومـەری کوڕی عبدالعزیزدا(ﷺ) بە دەست هات و توانی ببێتە ئەستێرەی ئوممـەت و مەشـخەڵێك هـەتاوەکو عەودالانی نوێگەری و چاکسازی شوێن پێ هەڵگرن [1].

هـ- **مەرج و سیفەتەکانی کەسی نوێگەر – مجدّد -:** ئـەتوانین لـە ڕوانگـەی ژیاننامـەی عومـەری کوڕی عبالعزیز ەوە گرنگترین ئەو مەرج و سیفەتانە دیاری بکەین کە پێویـستە بـۆ مجدّد بـەم شێوەیە:

- دەبێ نوێگەری بە پاکی بیروباوەڕ دروستی ڕێبـاز ناسـرابێت، چـونکە یـەکێك لـە گـرنگترین ئەرکەکانی نوێگەر بریتیە لە گێڕانەوە ئیسلام بۆ پاك و بێگەردی خـۆی دور لـە هـەموو ئـەو شتانەی کە دزەی کردۆتە نـاوی، ئەمـەش ڕوونـادات مەگـەر ئـەو نوێگـەرە لەسـەر ڕێـبازی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی(ﷺ) بێت و لە کۆمەڵی ڕزگار بوو و سەرخراو – طائفةی منصورە – بێت کە وەسف کراوە بەوەی کە کۆمەڵێکە لە حەفتا و سێ کۆمەڵە کـەو پابەندە بەوەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵان(ﷺ) لەسەری بـوون لـە ڕووی بیروبـاوەڕ و ڕێباز و بۆ چوونەوە [2].

ئەم مەرجەش لە عومەری کوڕی عبدالعزیزدا بەدی هاتبوو لـە شـوێنەوارە بیروباوەڕیەکانیـدا بـە پشتیوانی پەروەردگار باسی لێوە دەکەین.

- دەبێ زانایەکی موجتەهید و تێڕوانین بێت: ئەم مەرجـەش لـە عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز دا بەدی هاتبوو، چونکە ڕوبەڕووی ئەو گرفتانە وەسـتا کـە لەسـەردەمی خۆیـدا پەیـدا بـوون و هەوڵی دا بۆ دۆزینەوەی ڕێگە چارەی شەرعی بۆی، لە ڕاستیشدا پلەی ئیجتیهـاد و تێـڕوانین بۆ حوکمە شەرعیەکان بەو گرانی و قورسیەش نیە کە هەندێ کتێبی ئوسوڵی فیقە بۆی دەچـن کە هەندێکیان کۆمەڵە مەرجێکیان داناوەکە ڕەنگ مەحاڵ بێت لە کەسێکدا بەدی بێت، کاتێ بە پێویستیان زانیوە کە کەسی موجتەهید شارەزا بێت بە تەواوی لە – زانستە یارمەتیـدەرەکان – علوم الآلة – وەك نەحوو بەلاغەیان لە زانـستە شـەرعیەکاندا وەك تەفـسیر و فـەرموودە و ئوسوڵی فیقـە و زانـستەکانی قورئـان و زاراوەی فـەرموودە – مطلـع الحـدیث – و سـیرە و

---

[1] - التجديد في الفكر الاسلامي، ل: ٨٧.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٤٦.

ژیاننامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هەروەها زانستی منطق – لۆژیك – و زانستی كەلام و زانستە زۆر و زەوەندەكانی تر كە ئاسان نیە كەسێك هەمووی بیانزانێت [1].

ڕاستەكەشی ئەوەیە كە ئیجتیهاد ئاسان و سانایە بۆ كەسێك كە توانای لێكدانەوە و تێڕوانینی هەبێت گرنگیشە بزانین كە یەكێ لە مەرجەكانی موجتەهید ئاگادار بوو نەلە مەبەستەكانی شەریعەت و توانای تێگەیشتن و هەڵگۆزینی هەبێت و [2]، ئاگادار بێت لە بارودۆخی سەردەمی خۆی و بە باشی واقیعی خۆی بناسێت [3].

مەنناوی ئەڵێت: پێویستە لەسەر نوێگەر كە خاوەن بەڵگە وسەرخەری سوننەت بێت و توانای گێڕانەوەی مەسەلەوە مشتبەهەكانی هەبێت بۆ مەسەلە مُحْكَە مەكان و توانای دەرهێنانی حەقیقەت و تیۆرەكانی لە دەقەكانی قورئان و ڕێنایی و ئاماژەكانی هەبێت بە دلێكی ئامادە و هۆشێكی زیندووەوە عظیم ئابادی ئەڵێت: كەسی نوێگەر ئەبێ شارەزا بێت لە زانستە ئاینیەدیار و نادیارەكان و سەرخەری سوننەت و لەناوبەری بیدعە بێت [4].

مەدودیش ئەڵێت: لەو تایبەتمەندیانەی كە پێویستە لە كەسی نوێگەر دا هەبێت بریتیە لە: مێشكێكی ساف و تێڕوانینی وردبینانە و هزرێكی ڕاست و دوور لە نارێكی و توانای ڕاگیر كردنی كارەكان لە نێوان زیادەڕەوی و كەمتەرخەمیدا و ڕەچاوكردنی میانەڕەوی و توانای بیر كردنەوەی بابەتیانە و دور لە فشاری باردۆخ و ئەو دەمارگیریانەی كە چەندین سەدەیە كەڵكە بوون و ئازایەتی و بوێری بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی لادانەكانی سەردەم [5]، لە میانەی باسكردنی لە كارەكانی موجتەهیدیشدا ئەڵێت: ئیجتهاد لە ئایندا، مەبەست بەمەش ئەوەیە كە موجەدید و نوێگەر لە بنەما گشتیەكانی ئاین تێ بگات و شارەزای بارودۆخی شارستانی و گەشەی بیناسازی سەردەم بێت و شێوازی نوێ و پلانی باشی هەبێت بۆ ئەنجامدانی گۆڕانكاری لە شێوازی كۆنی بیناسازی دا، كە سەلامەتی شەریعەت و بەدی هێنانی مەبەستەكانی دەستەبەر بكات و پێشەنگی ئیسلام لە بواری گەشەی شارستانی دا مسۆگەر بكات.

● نوێگەری بواری هزر و هەڵسوكەوت لە كۆمەڵگەدا بگرێتەوە: چونكە ڕاستكردنەوەی لادانەكان یەكێكە لە گرنگترین ئەو ئەركانەی كە پێویستە نوێگەر پێ ی هەڵسێت، ئاشكراشە

---

[1] – عون المبعود(١١ / ٣٩٢).

[2] - التجديد في الفكر الاسلامي، ل: ٤٦.

[3] – فيض القدير للمغاوي(١ / ١٤).

[4] – عون المعبود(١١ / ٣١٩).

[5] – موجز تأريخ تجديد الدين للمودودي، ل: ٥٢.

که لادان بەسەر هەڵسوکەوتدا دێت هەروەك چۆن بەسەر هزردا دێت، بەڵکو زۆرینەی لادانە سلوکیەکان لەلادانی هزرەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئەرکی نوێگەریش ئەوەیە کە بۆ چوون و هزرەکان ڕاست بکاتەوە و لە گومان بەدووری بگرێت و زانستی بە سوود و تێگەشتنی دروست بۆ ئیسلام زیندوو بکاتەوە و لە نێوان خەڵکیدا بڵاوی بکاتەوە لە ڕێ وتنەوە و دانانی کتێب و هۆکارە بەردەستەکانی ترەوە، پاشان هەوڵ بدات بۆ چاککردنی ڕەوشت و هەڵسوکەوتی خەڵك و پاککردنەوەی دەرونیان و بەتاڵکردنەوەی ئەو داب و نەریتانەی کە پێچەوانەی شەریعەتن و ڕاگەیاندنی جەنگ لە دژی بیدعەوشی پڕوپوچ و خراپە باوەکان و ڕووبەڕووبەونەوەی خراپەکاری بە هەموو جۆر و شێوەکانیەوە بەتایبەت گەندەڵی دەسەلات و حکومەت، بەم شێوەیەش نوێگەر کارو گوفتار و زانست و کردەوە پێکەوە گری دەدات، سەلەف و پێشینانیش ئاماژەیان بەم مەرجەداوە و وتویانە کە دەبێ سەرخەری سوونەت و لەناوبەری بیدعە بێت [1].

- سوود و کەڵکی هەموو خەڵکی بگرێتەوە: بەو پێیەی نوێگەر پیاوی قۆناغێکی زەمەنیی دیاری کراوە، کە یەك سەدە دەخایەنێت، کەواتە پێویستە مەشخەڵێك بێت و ڕێگا بۆ خەڵکی ڕووناك بکاتەوە هەتاوەکو نوێگەر و موجەدیدێکی تر بێت، ئەمەش وا پێویست دەکات کە زانستی نوێگەر و سوودی خەڵکی سەردەمی خۆی بگرێتەوە و هەوڵە چاکسازیەکانی شوێنەوارێکی دیاریان هەبێت لەسەر هزر و هەڵسو کەوتی خەڵکی، ئەمەش زۆر جار لە ڕێی ئەو قوتابیانەوە بەدی دێت کە پەروەردەیان دەکات. هەروەها لە ڕێ ئەو هاوڕێ دڵسۆزانەوە کە هەڵدەستن بە درێژەدان بە کاروانی چاکسازی و کتێب و هزر و بۆ چوونەکانی بڵاو دەکەنەوە قوتابخانەی فیکری دادەمەزرێنن هەتاوەکو هەنگاوەکانی ئەو لە بواری چاکسازی و نوێگەریدا وێنابکەن [2].

٢- **فەرموودەی پێغەمبەری خوا**(ﷺ): خوای گەورە لەسەری هەر سەد ساڵێکدا کەسێك دەنێرێت بۆ ئەم ئوممەتە کە ئاینی بۆ نوێ بکاتەوە [3]. و ئەو پەند و وانە و سوودانەی کە لێیەوە وەردەگیرێت: ئەم فەرموودەیە یەکێکە لەو مژدانەی کە پاراستنی ئەم ئاینە لەلایەن پەروەردگارەوە دووپات دەکاتەوە.

---

[1] - عون المعبود(١١ / ٣٩١)، التجديد في الفكر الاسلامي، ل: ٤٨.

[2] - التجديد في الفكر الاسلامي، ل: ٤٨.

[3] - سلسلة الحاديث الصحيحة(٢ / ١٥١).

هەروەها سەرخستنی ئەم ئاینە بە ناردنی خەڵکانی موجەدید و خواویست کە لەخەو بێداری دەکەنەوە و پاش مت بوون زیندووی دەکەنەوە بەهۆی ئەو ڕووناکی و ڕێنماییەی کە پێیانە هەروەها ئەم فەرموودەیە هیوایەکی بەهێز. بە موسڵمانان دەبەخشێت بەوەی کە ئایندە بۆ ئیسلامە هەر چەندە هێزە خراپەکان زۆربن و ڕووناکیش هەر دەبێ دەربکەوێت هەر چەندە شەو تاریك بێت، ئێمەش لەم کاتەدا پێویستی زۆرمان بە دووپاتکردنەوەی ئەم مانایە و بڵاوکردنەوەی لە نێوان خەڵکیدا هەیە، هەتاوەکو بە هۆیەوە بەرەنگاری شەپۆلەکانی بێ ئومێدی ببینەوە کە دەرونەکانی داگیر کردووە و دوچاری دەستەوسانی و ملکەچی کردووە بە بەڵگەی ئەوەی کە ئێمە لە ئاخرزەماندایىن و هیچ سوود و ئومێدێك بە هەوڵەکانی چاکسازی نیە.

چونکە ئیسلام لە پاشەکشە و بێ باوەڕی لە برەودایە و ئەوەتا نیشانە. بچوکەکانی قیامەت دەرکەوتووە و چاوەڕانی دەرکەوتنی نیشانە گەورەکانین کەدوابەدوایان قیامەت هەڵدەسێت لەوانەشە خاوەنی ئەم بۆچوونە پشت بەهەندێ فەرموودە ببەستن و بە جۆرێك لێی تێ بگەن کە دوورە لە مەبەستی خۆی [1] و وەك بەڵگە هێنانەوەیان بە فەرموودەی ئەنەس(ﷺ) لەلای بوخاری:

(هەرزەمانێکتان بەسەردا بێت ئەوە زەمانی دوای ئەو لەو خراپترە هەتاوەکو دەگەن بە خوای گەورە) [2]، هەروەها فەرموودەی:(ئیسلام بە غەریبی دەستی پێ کردووە و دووبارە غەریب دەبێتەوە دەسا خۆشبەختی بۆ غەریبان) [3].

ئەمانە لەبیریان چووەکە نابێ ئەم فەرموودانە بە جیا لەو فەرموودانەی تر لێکبدەینەوە کە موژدەی تیایە بۆ ئوممەت وەك فەرموودەی نەوەوی:(ئوممەتی من وەك باران وایە نازانی سەرەتاکەی باشترە یان کۆتاییەکەی) [4]. یاخود کام هۆزی لە هۆزێکی تری یان کام سەردەمی لەسەردەمێکی تری باشترە وەك ئیبن قەیم باسی دەکات [5].

هەر بۆیە مێژووی ئیسلام چەند سەردەمێکی درەوشاوە و باشی بە خۆوە بینیوە وەك سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز [6]، و نورەدین و سەلاحەدین و یوسفی کوڕی تاشفین و محمد لفاتیح.. و هتد، شایانی باسیشە کە ئەو فەرموودەیە کە باس لە نوێکردنەوە دەکات و ئێستا ئێمە لێی دەدوێین و

---

[1] - التجديد في الفكر الاسلامي، ل: ٥٥.

[2] - البخاري ژمارە ٦٥٤، كتاب — الفتن.

[3] - مسلم، كتاب: الايمان ژمارە ٢٠٨.

[4] - سنن الترمذي رقم ٢٧٩٥، صحيح.

[5] - مدارج السالكين(٣ / ١٩٦).

[6] - التجديد في الفكر الاسلامي، ل: ٥٦.

ئەو فەرمودانە کە مزگێنی دەدەن بە هاتنەوە و گەڕانەوەی ئیسلام بۆ ڕابەرایەتی کردنی ژیان، چونکە هەواڵێکی ڕاست و دروستە و هەر دەبێ بەدی بێت بەو شێوەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی کردووە.

هەرچەندە ئەم فەرموودانە لەناوەڕۆکیاندا هانی موسڵمانان دەدەن، بەڵکو لەسەریان پێویست دەکەن کە هیمەتیان بخەنە گەڕ بۆ سەر خستنی ئەم ئاینە و هەوڵدانی بێوچان بۆی بە پێی سوننەتی خوا لە پەیوەستکردنی هۆکارەکانی بە دەرەنجامەکانەوە [1].

أ- لە فەرمایشتی " خوای گەورە ئەینێرێت بۆ ئەم ئوومەتە "وە [2]، دەرئەکەوێت کە ئەم نێردراوە تەنها خەمی خۆی نیە، بەڵکو لەوە تێپەڕ بووە و بۆ ئوممەت دەژی و خاوەنی ورە و هیمەتە و لەگەڵ خەمی ئوممەتەکەیدا دەژی و شەو دەداتە دەم ڕۆژ لە پێناو ڕزگار کردنی ئوممەت و گێڕانەوەی متمانە بۆ ئاینەکەی و هێنانەوەی بۆ سەرڕێگەی ڕاست بەو پەڕی ئارامگری و خۆڕاگریسەوە لەبەردەك کۆسپ و نەهامەیتیەکاندا، هەتاوەکو بەرزی و شکۆمەندی و سەروەری بگێڕێتەوە بۆ ئوممەتی ئیسلامی [3].

ب- فەرمایشتی، لە سەروی هەر سەد ساڵێکدا [4]: سەر لە زەمانەوانیدا سەرەتای شت و کۆتاییەکەی دەگرێتەوە [5]، زانایانش جیاوازیان هەیە سەبارەت بە وشەی سەر لەم فەرموودەیەدا و هەندێکیان دەڵێن: مەبەست یەکەم ساڵی سەد ساڵەکەیە و کۆمەڵێکی تریش دەڵێن: مەبەست کۆتا ساڵە [6]، ئیبن حەجەر [7] و الطيبي [8] و العظيم ئابادی [9] ئەم ڕایەیان هەڵبژاردووە.

العظيم ئابادیش بەڵگەی هێناوەتەوە کە پێشەوا زوهەری و ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و چەندین پێشەوای تر پێیان وایە کە یەکێك لە موجەدیدەکان لەسەری سەد ساڵ یەکەم دا عومەری کوڕی

---

[1] - الاجتهاد للتجديد، عمر عبيد حسنة، ل: ٧.

[2] - سلسلة الاحاديث الصحيحة(٢ / ١٥١).

[3] - التجديد في الاسلام، لە التجديد في الفكر الاسلامي، ل: ٥٧.

[4] - سلسلة الاحاديث الصحيحة(٢ / ١٥١).

[5] - عون المعبود(١١ / ٣٨٦).

[6] - هەمان سەرچاوە(١١ / ٣٨٦).

[7] - فتح الباري(١٣ / ٢٩٥).

[8] - عون المعبود(١١ / ٣٨٩).

[9] - هەمان سەرچاوە(١١ / ٣٨٧).

عبدالعزیزە و لەسەری سەد ساڵی دووەمیشدا پێشەوا شافیعیە، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش لە ساڵی سەد و یەکدا کۆچی دوایی کرد لە تەمەنی چل ساڵیدا و ماوەی حوکمڕانیشی دوو ساڵ و نیو بوو.

شافعیش لە ساڵی دوو سەدو چوار دا کۆچی دوایی کرد [1]، بەم پێیەش ناتوانین عومەری کوڕی عبدالعزیز بەمجددی سەد ساڵی یەکەم دابنێین، چونکە ئەو لە سەرەتای ئەو سەد ساڵەدا لە دایك نەبووە، هەتاوەکو ببێت بەموجەدیدی هەروەها پێشەوا شافیعی ش لە سەرەتای سەد ساڵی دووەمدا لە دایك نەبووە هەتاوەکو مجددی بێت [2].

ج- ئایا مەرجە بۆ دانانی کەسێك بە موجەدید کە وەفاتی لەسەرەوەی سەد ساڵدا بێت؟ هەندێ لە زانایان بە مەرجی دەزانن بۆ بە موجەدید دانانی کەسێك کە لەسەری سەدەدا لە دایك بوو بێت، بەڵام ئەم ڕایە لاوازە، چونکە وشەی ناردن لە فەرموودەکەدا بەڵگەیە لەسەر دەرکەوتن و هاتن، وەك چۆن مردن گرتنەوە و نەمانە، کەواتە مەبەست لە فەرموودەکە ئەمەیە کە: موجەدید ئەو کەسەیە کە لە کاتی هاتنی کۆتایی سەدەدا کارە نوێخوازیەکانی دەرکەوتبێت و بە چاکی و بەسوودی ناسراو بێت، مەرجیش نیە مردنیپێش کۆتایی سەدە بێت و بەزیندویی بمێنێتەوە هەتاوەکو پێ دەنێتە سەدەی دواتر [3].

د- ئایا موجەدید لەیەکدا کەسێکەیان زیاتر؟ فەرمایشتی " کەسێکی بۆ دەنێرێت کە ئاینی بۆ نوێ بکاتەوە " پرسیارێکی وروژاندوە لە ڕابردوو و ئێستادا، کە ئایا: ئایا مەبەست بە وشەی کەسێك لە فەرموودەکەدا یەك کەسەیان چەند کەسێکە یاخود مەسەلەکە فراوانترە و هەموو تاك و کۆمەڵەکان دەگرێتەوە، زۆرینەی زانایانیش پێیان وایە کە مجددیەك کەسەو سیوطیش ئەم ڕایەی داوەتە پاڵ زۆرینە و لە:(أرجوزە) کەیدا سەبارەت بە موجددیدەکان ئەڵێت:

وکو نُهُ فرداً هو المشهور    قد نطق الحديث و الجمهور [4]

واتە: ئەوەی کە بەناوبانگە ئەوەیە کە مجدد کەسێکە و فەرموودەکە و زۆرینەی زانایانیش ئاماژە بەمەدەدەن، کۆمەڵێکی تریش لە زانایان پێیان وایە کە وشەی(مَنْ) واتە: هەرکەسێك و وشەیەکی

---

1 - هەمان سەرچاوە(11 / 387).

2 - التجديد في الفكر الاسلامي، ل: 58.

3 - عون المعبود(11 / 394).

4 - التجديد في الفكر الاسلامي، ل: 61.

گشتیه له زمانەوانیدا [1] تاك و كۆ دەگرێتەوە لەو زانایانەش ئیبن حەجەر و ئیبن أثیر و ذهبي و ئیبن كثیر و مەنناوی و عظیم ئابادی [2]، بەلاّم له ڕوانگەی لێكۆڵینەوەوە ڕوون دەبێتەوە كە مەبەست لە وشەی(مَنْ) لێرەدا گشتیه، چونكه مێژوو و واقیع ئەیسەلمێنێت كە زیاتر لەیەك موجەدید هەبووە لەسەری هەر سەد ساڵەكانی ڕابردوودا، هەروەها ئەركی نوێخوازی ئەركێكی مەزن و فراوانە و تەنها یەك لایەن و بواری ئاین ناگرێتەوە، بەو پێیەی كە جیهانی ئیسلامی بەرفراوانە و ئاسان نیە كە تاكێك یان كۆمەڵێك بە تەنها هەستن بە ئەركی نوێگەری گشتگیر و هەمەلایەنە تیایدا [3].

هـ- ئەوەی كە نوێ دەكرێتەوە و ئاینی ئوممەتە نەك خودی ئاین: وەك تێبینی دەكەین لە فەرمایشتی(كەسێك كە ئاینی بۆ نوێ دەكاتەوە) لێرەدا ئاینی دا وەتە پاڵ ئوممەت و نەیفەرمووە خودی ئاین، بەڵكو ئاینی ئوممەت، چونكە دین وەك ئەو ڕێبازە نەگۆڕەی كە خوا بە پێغەمبەر(ﷺ) دا ناردوویەتی و بەو بیروباوەڕ و پەرستش و ڕەوشت و شەریعەتانەی كە پەیوەندی مرۆڤ بە پەروەردگار و مرۆڤەكانی ترەوە ڕێك دەخات ئەوە نەگۆڕە و گۆڕان هەڵناگرێت، بەڵكو ئاینی ئوممەت بەمانای پەیوەندی خەڵك بە ئاینەوە و ڕادەی پابەندبوون و پیادەكردنی لە واقیعدا، كەواتە ئەو مانایەیە كە نوێكردنەوە هەڵدەگرێت، بۆ ئەوەی خەڵكی بگێڕێتەوە بۆ ئەو ئاستەی كە پێویستە لەسەری بن لە پەیوەندیان لەگەڵ ئاین دا [4].

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ٦١.

[2] - هەمان سەرچاوە ل: ٦٢، ٦٣.

[3] - هەمان سەرچاوە ل: ٦٥.

[4] - من اجل صحوة اسلامية للقرضاوي، ل: ٢٦ — ٢٧.

عومەری کوڕی عبدالعزیز گرنگی دەدا بە بیروباوەڕی ئـەهلی سـوننەت و سـوور بـوو لەسـەر فێربوون و فێرکردنی خەڵکی و بڵاوکردنەوەی زانست لـە نێوانیانـدا، وتەشـی زۆرە سـەبارەت بـە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و عەقیدە و تەفسیر و فەرموودە و فیقه و هتد.

مامۆستا حیاه بن محمد بن جبریلیش هەستاوە بە کۆکردنەوەی زۆرینـەی وتـەکانی لـە هـەولێکی زاستیدا و بە هۆیەوە نامەی ماستەری بە دەست هێناوە، زۆرێکیش لەو کەسانەی کە لەسەر عومەری کوڕی عبدالعزیز یان نووسیوە تیشکیان نەخستۆتە سەر ئەم بوارە گرنگە لە ژیانیدا کە پەیوەسـتە بـە سووربوونی لەسەر هۆشیار کردنەوەی خەڵك و ئاشـنا کردنیـان بـە بیروبـاوەڕی دروسـت کـە لـە قورئان و سوننەتدا باس کراوە، لە گرنگترین ئەو بوارە عەقیدەییانەش کـە عومـەر قـسەی لـەبارەوە کردووە:

## یەکەم: یەکتاپەرستی:

١- **یەکتاپەرستی لە خوایەتیدا – ئولوهیەت -**: بە یەکتاپەرستنی خوا بناغـەی ئـاینی ئیـسلامە، بەڵکو بناغەی هەموو ئاینە ئاسمانیەکانە، پێغەمبەران لە پێناویدا نێردراون و کتێبـە ئاسمانیـەکانی بۆ نێردراوە و هەموو پێغەمبەران هەر لـە ئادەم علیه السلام هـەتاوەکو محمـد بانگەشـەیان بـۆ کردووە و مەبەسـت و ئامـانجی سـەرەکی دروسـتکردنی مـرۆڤ و جنۆکەیـە، خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴾ الذاريات: ٥٦). واتـە: وە مـن جنۆکـە و ئادەمیزادم تەنها بۆ ئەوە دروست کردووە کە بەندایەتی من بکەن.

پێشینانی ئەم ئوممەتـەش ڕەحمـەتی خوایـان لـێ بێـت گرنگیـان بـەم جـۆرە یەکتاپەرسـتیە دەدا و عومـەریش لـەم بـوارەدا ڕۆڵـی خـۆی هـەبوو[١]. پـێش ئـەوەی ئـەو شـتانەش بخەینـە ڕوو کـە لـە عومەرەوە(رضي الله عنه) هاتوە پێویستە مەبەست لە یەکتاپەرستی ئولوهیـەت بخەینـە ڕوو کـە پێناسـە کـراوە بەوەی کە بریتیە لە شیاو بوونی پەروەردگار بۆ ئەوەی بە بێ هاوەڵ بپەرسترێت[٢].

هەندێ لە لێکۆڵەرانیش بەم شێوەیە پێناسـەی دەکـەن: سـەلماندنی یـەکتایی خـوا بـە کـردەوەی بەندەکان کە بە یەکتاپەرستی(داخوازی و مەبەست) ناسراوە مەبەستیش پەرستنی پەروەردگارە بە تاك و تەنهایی و خۆشویستن و ترس و ئومێد پێ بوون و پشت پێ بەستن و ڕوتـێ کردنـی بـە تـەنهایی و

---

[١] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ١٩٩).

[٢] - شرح العقيدة الطحاوية(١ / ٢٩).

نزيك بوونەوە لێی بەسەرجەم پەرستشە جەستەیی و ماڵیەکان بە بێ بەشداری پێ کردنی هیچ یەکێك لە دروستکراوانی [1].

هەروەها چەندین شوێنەوار سەبارەت بە نزاو تەبەڕوك و ترس و ئومێد و پشت بەستن بەخوا و سوپاسگوزاری لە عومەری کوڕی عبدوالعزیزەوە هاتوە لە وانە:

أ- **نزا:** عومەری کوڕی عبدالعزیز بەلای پیاوێکدا تێپەڕ بوو کە چەند بەردێکی بە دەستەوە بوو یاری پێ دەکردن و ئەیوت: خوایە گیان حۆری بەهەشتی بکەیت بەهاوسەرم، عومەریش هەستایەوە بۆی وتی: تۆ خوازبێنی کەرێکی خراپی بۆ ئەو بەردانە لانابەیت و دڵسۆزانە نزا بکەیت [2].

لەم ئاسەوارەدا عومەر ڕوونی دەکاتەوە کە یەکێك لەمەرجەکانی نزا بریتیە لە دڵسۆزی و ئامادەیی دڵ، قورئان و سوننەتیش بەڵگەیە بۆ ئەمە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَٱدۡعُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾ غافر: ١٤). واتە: کەواتە لەخوا بپاڕێنەوە و بە پاکیی بۆی گەردن کەچ بن هەر چەندە بێ باوەڕانیش پێیان ناخۆش بێ. پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئەفەرموێت:(نزا بکەن و دڵنیابن لە وەڵامدانەوەی و بشزانن کە خوای گەورە نزای دڵێکی بێ ئاگاو غافڵ وەڵام ناداتەوە) [3].

ب- **عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) ئەفەرموێت:** خوایەگیان من لە خۆشەویسترین شت دا بەلای تۆوە بەگوێم کردویت کە یەکتاپەرستیە، لە خراپترین شت دا سەر پێچیم نەکردویت کە هاوەڵگەرییە، دەسا تۆش لەوشتانە خۆش بە کە دەکەونە نێوان ئەو دوانەوە [4].

لێرەدا عومەری کوڕی عبدالعزیز تاعەت و یەکتاپەرستی کردۆتە تکاکار بۆ لێخۆشبوونی پەروەردگار دیارە تکاکردن و توسّل بە کردەوە چاکەکان دروستە وەك فەرموودەی ئەو سێ کەسەی کە چوونە ناو ئەشکەوتەکە بۆ مان ڕوون دەکاتەوە [1].

---

[1] - رسالة توحيد الالوهية اساس الاسلام ى لێکۆڵەر حامد عبدالقادر الحمدي، ل: ٧، الاثار الواردة عن عمر في العقيدة(١ / ٢٠٠).

[2] - الحلية(٥ / ٢٨٧) سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٨٤.

[3] - سنن الرمذي(٥ / ٤٨٣) صحيح سنن الالباني ژمارة ٢٧٦٦.

[4] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن القيم الجوزية، ل: ٢٤٢.

ئەوە بوو کردەوە چاکەکانیان کرد بە تکاکار هەتاوەکو نزاکانیان گیرا ببێت و دەرویان لێ بکرێتەوە، باوەڕدارانیش کردەوە چاکەکانیان کردوە بە تکاکار و پێش نزایان خستووە، وەك لە فەرمایشتی: ﴿ رَبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ أَنۡ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمۡ فَـَٔامَنَّاۚ رَبَّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ﴾ آل عمران: ١٩٣). واتە: ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە گوێمان لە بانگخوازێك بوو بانگی ئەکرد بۆ بڕواهێنان(دەی ووت) بڕوا بێنن بە پەروەردگارتان دەست بە جێ بڕوامان هێنا ئەی پەروەردگارمان دەی لە گوناهەکانمان خۆش بە و بیسڕەوە لێمان خراپەکانمان و بمان مرێنە لەگەڵ چاکاندا. لێرەدا باوەڕیان پێش نزاخستووە و نمونەی تریش لەم بارەوە زۆرە [1].

ج- **بومەلەرزەیەك لە شام [2] دا ڕووی دا و عومەری کوڕی عبدالعزیزیش نووسی:** ئەم زەمین لەرزەیە شتێکە خوای گەورە بەهۆیەوە گلەیی لە بەندەکانی دەکات، هەروەها نامەیەکی نووسی بۆ خەڵکی ناوچە و شارە جیاجیاکان کە فلانە ڕۆژ لە فلانە مانگ دا بچنە دەرەوە هەرکەسێك شتێکی هەبوو بابیبەخشێت [4]. خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ ﴾ الأعلى: ١٤ - ١٥). واتە: ئەی پەروەردگارمان ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد جا ئەگەر لێمان نەبووری و میهرەبانیمان لەگەڵ نەکەیت سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لە زیانباران دەبین.

هەروەها وەك ئادەم بپاڕێتەوە و دەڵێن: ﴿ رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴾ الأعراف: ٢٣).واتە:... ئەی پەروەردگارمان ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد جا ئەگەر لێمان نەبووری و میهرەبانیمان لەگەڵ نەکەیت سوێند بەخوا بێگومان ئێمە لە زیانباران دەبین.

هەروەها یونس بپاڕێتەوە و بڵێن: ﴿ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾ الأنبیاء: ٨٧). واتە:(ئەی خوا) بەراستی هیچ پەرستراوێك نییە جگە لە تۆ پاکی و بێ گەردی بۆ تۆیە بێگومان من لە ستەمکاران بووم.

---

[1] - مسلم، الرقم ٢٧٤٣.

[2] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزیز في العقیدة(١ / ٢١٩).

[3] - سیرة عمر لابن عبدالحکم، ل: ٦٤ الحلیة(٥ / ٣٠٤، ٣٠٥).

[4] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزیز في العقیدة(١ / ٢٢٠).

هەروەها فەرمانی کرد بە ژێر دەستەکانی کە پەنا بۆ خوای پەروەردگار بەرن و خێر و داوای لێخۆشبوون بکەن و بچنە دەرەوە بۆ شوێنی نوێژ کردن لە کاتی ڕوودانی بومەلەرزەی شام دا [1].

د- **مەیمونی کوڕی مەهران ئەڵێ:** لای عومەری کوڕی عبدالعزیز بووم، ئەویش زۆر گریا و داوای مردنی لە پەروەردگار کرد، وتم: بۆ داوای مردن دەکەیت؟ لە کاتێکدا کە خوای گەورە لەسەر دەستی تۆ خێرێکی زۆری بە دی هێناوە و چەندین سوننەتی بە هۆی تۆوە زیندوو کردۆتەوە و چەندین بیدعەشی مراندووە؟(ئەویش وتی: ئەی وەك ئەو بەندە چاکە نەبم کە کاتێ خوای گەورە چاوی ڕوون کردەوە و کاروباری بۆ کۆکردەوە) وتی: ﴿رَبِّ قَدْ ءَاتَيْتَنِي مِنَ ٱلْمُلْكِ وَعَلَّمْتَنِي مِن تَأْوِيلِ ٱلْأَحَادِيثِ ۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ ۖ تَوَفَّنِي مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ﴾ يوسف: ١٠١). واتە: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی پێت بەخشیووم هەندێك لە لەدەسەڵات و پاشایەتی وە هەندێکیش لە لێکدانەوەی خەوت فێرکردووم ئەی دروستکاری ئاسمانەکان و زەوی تۆ پشتیوان و یارمەتی دەری منی لە دنیا و لە ڕۆژی دوایی دا بە موسڵمانێتی بمرێنە و بمخەرە ڕیزی پیاو چاکانەوە(لە دوا ڕۆژدا).

ئەوەتا داوای مردنی کردووە لەسەر باوەڕ و ئەمەش سوننەتی پێغەمبەران(علیهم السلام) و دروشمی پیاو چاکانە، لەوانەشە لە ترسی تووشبوونی ئاژاوە لە ئاین دا بە تایبەت لە کاتی مردنی هاوکارانیدا ئەم نزایەی کردبێت وەك: عبدالملکی کوڕی و موزاحیمی خزمەتکار و سەهلی برای وەك لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە [2]؟

٢- **سوپاسگوزاری:** لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ئەڵێ: پێم گەشتووە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز وتویەتی: باسکردنی نیعمەت سوپاسکردنیەتی، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش ئەڵێت: باسی نیعمەتەکانی پەروەردگار بکەن بە سوپاسگوزاری بۆی [3]. هەروەها بۆ هەندێ لە کاربەدەستانی نووسی:... وەسیەتت بۆ دەکەم بە لە خواترسان و هانت دەدەم بۆ سوپاسگوزاری ئەو نیعمەتانەی خوا کە لەلاتەو ئەو ڕێزەی کە پێی بەخشیویت، چونکە

---

[1] - العقد الفريد(٤ / ٣٩٦) الاثار الواردة(١ / ٢٢٤).

[2] - مضف ابن ابي شيبة(٨ / ٢٤٠).

[3] - ابن ابي الدنيا، كتاب الشكر لله تعالى، ل: ١٩.

نیعمەتەکانی بە سوپاسگوزاری بەردەوام دەبن و بە پێنەزانین کۆتاییان پـێ دێـت [1]. هـەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز هانی خەڵکی دەدا بۆ سوپاسـکردنی پـەروەردگار لـەسـەر نیعمەتـە زۆر و زەبەندەکانی و ئەمەش بەڵگەی قورئان و سوننەتی لـەسەرە، خوای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَٱشۡكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ﴾ البقرة: ١٧٢). واتە:... وە سوپاسی خوا بکەن ئەگەر ئێوە هەر ئەو دەپەرسـتن. هـەروەها ئەفـەرموێت: ﴿وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ﴾ البقرة: ١٥٢). واتە:... وە سوپاسم بکەن پێ نەزان و ناسوپاسییم مەکەن.

دیارە سوپاسکراویش نیعمەتی زیاتر دەخوازێت خوای گەورە ئەفەرموێت : ﴿ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٞ﴾ ابراهيم: ٧). واتە:(بیریـان بخـەرەوە) کـاتێ کە پەروەردگارتان ڕای گەیاند سوێندبێ بێگومان ئەگەر ئێوە سوپاسی(چاکەی) من بکەن بۆتـان زیـد دەکەم، بێگومان ئەگەر نا سوپاسی بکەن ئەوە بەڕاستی سزای من زۆربەتینە.

ئەوەش لـە عومەرەوە هاتووە لـەم ڕووەوە ڕێبازی سـەلەف و پێـشینانمان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە بـۆ مامەڵە کردن لـەگەڵ ئەو نیعمەتانەی کە پەروەردگار ئەیبەخشێت بە بەندەکانی [2]؟

٣- **پشت بەخوا بەستن:** حەکەمی کوڕی عومەر ئـەڵێ: عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز سـێ سـەد پاسەوان و سێ سەد پۆلـیسی هـەبوو، ئـەیوت بـە پاسـەوانەکان، مـن بـە بـێ ئێـوەش قـەدەر ئەمپارێزێت و ئەجەلـیش هەمیشە چاودێرمە جا هەرکەسێکتان لـەم کارەیدا بمێنێتەوە دە دینار پێ دەدەم، ئەوەش کە نایەوێ بابڕوات [3].

ئەوە بوو کاتێ کە عومەری کوڕی عبدالعزیز لە مەدینە دەرچوو موزاحیمی خزمەتکاری سـەیری مانگی کرد و بینی مانگ لـە پشت هەڵکردندایە [4]، ئەڵێ منیش پێم ناخۆش بـوو باسـی بکـەم، بۆیـە وتم: سەیری مانگ بکە ئەم شەو چۆن خەرمانەی داوە، عومەریش سـەیری کـرد و بینـی لـە پـشت

---

[1] - ابن ابي الدنيا، ذم الدنيا، ل: ٨١.

[2] - الاثار الواردة(١ / ٢٣٠).

[3] - سير اعلام النبلاء(٥ / ١٣٦).

[4] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٢٣٥).

هەڵکردندایە، وتی: ئەڵێی ویستت ئاگادارم بکەیتەوە کە مانگ لە پشت هەڵکردندایە ئەی موزاحیم، ئێمە بە هۆی مانگ و خۆرەوە لەماڵ دەرناچین، بەڵکو بە هۆی پەروەردگاری تاك و باڵا دەستەوە [1].

لێرەدا سوور بوونی عومەر لەسەر پشت بەخوا بەستن و دەستگرتن بە هۆکارە شەرعیەکانەوە دەردەکەوێت، توکل یش بریتیەلە پشت بەستن بە خوا لەگەڵ گرتنەبەری هۆکارەکان، ئەمەش ئەسڵێکە لە ئەسڵەکانی یەکتاپەرستی، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَٱعۡبُدۡهُ وَتَوَكَّلۡ عَلَيۡهِ ﴾هود: ١٢٣). واتە:... کەواتە ئەو بپەرستە و هەر پشت بەو ببەستە... هەروەها ئەفەرموێت: ﴿ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ ﴾ الفرقان: ٥٨). واتە: پشت ببەستە بە(خوای) زیندوو کە زاتێکە هەرگیز نامرێت...

پشت بەخوا بەستنیش یەکێکە لەو هۆکارانەی کە خواستەکانی بەدی دێنێت و خراپەکان لێ دوور دەخاتەوە، جار هەر کەسێك نکوڵی لە هۆکارەکان بکات ئەوە پشت بەخوا بەستنی ڕاست دەرناچێت، بەڵام پشت بەخوا بەستنی تەواویش دەکات کە دڵ نەبەستین بە هۆکارەکانەوە، بەم پێیەش دڵی بە خواوە دەبەسترێت و جەستەشی بە هۆکارەکانەوە [2].

٤- **دەربارەی ترس و ئومێد:** لە یەزیدی کوڕی جەعدیەوە ئەڵێ: عومەر کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ سولەیمانی کوڕی ابی کریمە، لە پێشترین کەس بۆ بە گەورە زانین ی پەروەردگار و ترسان لێی کەسێکە وەك من تاقی کرابێتەوە، کەسیش لای خوا هێندەی من بێ بایەخ نیە و لێپرسینەوەی توندی لە گەڵدا ناکرێت ئەگەر سەرپێچی خوا بکەم.

ئەوەتا من تەواو تەنگاو بووم و ئەترسم ئەم پلەو پایەیەم تیا چوونی تیادا بێت ئەگەر خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی ڕەحم پێنەکات، ئێستاش ئاگادار کراومەتەوە کە تۆ ئەتەوێت لە پێناو خوادا بچیت بۆ جەنگ جا حەز ئەکەم ئەی برای من کە ئەگەر چوویتە ئەو شوێنە لەخوا بپاڕێیتەوە بۆم کە شەهیدیم بە نەسیب بکات، چونکە حاڵم پەشێو مەترسیم زۆرە، جا داوا ئەکەم لەو خوایەی کە بەم شێوەیە تاقیکردومەتەوە کە ڕەحمم پێ بکات و لێم خۆش ببێت [3].

---

[1] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٣٢.

[2] - مدارج الساكين(٢ / ١٢٥).

[3] - الطبقات(٥ / ٣٩٤ – ٣٩٥) الاثار الواردة(١ / ٢٤٠).

ڕەبیعی کوڕی سبرەش بە عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەڵێت: لە کاتێکدا کە کوڕ و براو موزاحیمی خزمەتکاری کۆچی دواییان کرد بوو لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا، ئەی ئەمیری باوەڕداران کەسێکم نەبینیوە کە لە چەند ڕۆژێکی کەمدا وەك تۆ چەند نەهامەتیەکی بەسەردا هاتبێت، کوڕی وەك کوڕەکەی تۆ و برای وەك براکەی تۆ و خزمەتکاری وەك خزمەتکارەکەی تۆم نەبینیوە، ئەڵێ: عومەر ماوەیەك سەری داخست و پاشان پێی وتم: چۆنت وت ئەی ڕەبیع؟ ئەڵێ منیش بۆم دووبارە کردەوە، ئەویش وتی: نا سوێند بەو کەسەی کە گیانی کێشان حەز ناکەم هیچ شتێك لەوەی کە بووە نەبوایەت بە هۆی ئەو ئومێدەی کە پێیان هەمە لەلای پەروەردگار [1].

هەروەها لە قەتادەوە هاتووە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ – ولی عهد – (کەسی دەستنیشان کراو بۆ خەلیفایەتی دوای خۆی) تایدا هاتبوو: بەناوی خوای گەورە و میهرەبان لە بەندەی خوا عومەر ئەمیری باوەڕدارانەوە بۆیە یەزیدی کوڕی عبدالملك: سڵاوی خوات لێ بێت، سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە جگە لە ئەو خوایەکی تر نیە پاشان، ئەم نامەیت بۆ دەنووسم و بۆ باری تەندروستیم زۆر خراپە و بەدەست ئازارەوە ئەناڵێنم، ئەم ئاینەش فێری کردووم کە من بەرپرسم لەوەی کە پێم سپێردراوە و پاشای دونیا و ڕۆژی دوایی لێ پرسینەوەم لەگەڵدا دەکات منیش ناتوانم هیچ کارێکی لێ بشارمەوە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ ﴾ الأعراف: ٧). واتە: جا سوێند بەخوا بەڕاستی(ئەوەی کردوویانە) بۆیان دەگێڕینەوە لە ڕووی زانیاریەوە وە ئێمە هیچ کاتێ بێ ئاگا نەبووین(لێیان).

جا ئەگەر خوای میهرەبان لێم خۆش بێت ئەوە ڕزگارم دەبێت لە مەترسی گەورە، ئەگەر لێشم خۆش نەبێت ئەوە قوڕ بەسەر چارەنووسم، جا داوا ئەکەم لەو خوایەی کە جگە لەو خوایەکی تر نیە کە بە ڕەحمی خۆی ڕەحم پێ بکات و لە ئاگر بمپارێزێت و ڕەزامەندی خۆی و بەهەشتم بکات بەنسیب [2].

لەم قسانەی عومەرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو ترس و هیوای(خوف و رجاء) پێکەوە کۆ کردۆتەوە، ئەمەش بەشێکە لە بیروباوەڕی سەلەفی ساڵح، کە بریتیە لەوەی کە موسڵمان لە نێوان

---

[1] - المعرفة و التاريخ للفسوي(١ / ٦١٠).

[2] - الاثار الواردة(١ / ٢٤١).

بێ ئومێدی لە ڕەحمی خوا و دڵنیا بوون لە سزای خودا بێت، سەلەف و پێشینانیش بەم شێوە بوون لەگەڵ خواترساندا ئومێدیان بە ڕەحمیشی هەبووە [1].

ئەمەش پابەندبوونە بە فەرمایشتی: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ ﴾الإسراء: ٥٧). واتە: ئەوانەی کە ئەو(نەفامانە) هاواریان لێ دەکەن ئەوانە بەدوای هۆکارێکدا دەگەڕێن کە نزیکیان کاتەوە لە پەروەردگاریان کامیان نزیك ترە(لە خواوە و پلەوپایەی بەرزترە). و بە هیوا و ئومێدی ڕەحمی ئەون و لە سزایشی دەترسن...

هەروەها خوای گەورەش ستایشی ئەو کەسانەی کردووە کە ترس و ئومێدیان هەیە و فەرموویەتی: ﴿ أَمَّنۡ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ سَاجِدٗا وَقَآئِمٗا يَحۡذَرُ ٱلۡأٓخِرَةَ وَيَرۡجُواْ رَحۡمَةَ رَبِّهِۦۗ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾ الزمر: ٩). واتە:(هاوبەش دانەران چاکترن) یا کەسێ ملکەچ و پەرست کارە(بۆ خوا) لە کاتەکانی شەودا بە سوژدە بردن و ڕاوەستان(لە شەو نوێژدا) کە لە(سزای) دوا ڕۆژ دەترسێت و بە هیوای بەزەیی پەروەردگاریەتی(ئەی موحەممەد ﷺ) بڵێ ئایا ئەوانەی دەزانن یەکسانن لەگەڵ ئەوانەی کە نازانن بەڕاستی تەنها خاوەنانی ژیریی ئامۆژگاری وەردەگرن.

## دووەم: بیروباوەڕی عومەری کوڕی عبدالعزیز سەبارەت بە ناوە جوانەکانی پەروەردگار:

ناوەجوانەکانی پەروەردگار بریتیە: لەو وشانەی کە سیفەتەکانی کەماڵ و تەواویتی بۆ پەروەردگار بە بێ لێك چوون دەسەلمێنێت و لە سیفەتەکەم و کورت و هەموو ناتەواویەك بەدووری دەگرێت [2].

ناوە جوانە ناسراوەکانیش ئەوانەن کە خوای گەورەی پێ بانگ دەکرێت و لە قورئان و سوننەتدا هاتووە، خۆی لە خۆی دا ستایش و سوپاسی پەروەردگاری تێدایە [3].

---

[1] – سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٢٤٤.

[2] – الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ٢٤٥).

[3] – منهج اهل السنة و مهج الاشاعرة في توحيد الله، خالد عبداللطيف(٢ / ٣٩١).

گومانیش لەوەدا نیە کە هەر خوێنەرێکی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەبینێت کە خوای گەورە خۆی بە چەند ناوێك ناو ناوە یان پێغەمبەر(ﷺ) ناوی ناوە، چونکە کەس هێندەی خوای گەورە(خۆی پێغەمبەرەکەی) زاتی پەروەردگار ناناسن و ناوەکانی پەروەردگاریش هەموو جوان و پیرۆزن هەموو ناو و ئاوەڵناو سیفەتن هەمووشیان ناوی ڕاستەقینەن و بەڵگەن لەسەر زاتی خوا و سیفەتەکانی و هەموویان تەوقیفین – واتە بەو شێوەیەی کە لە خوا و پێغەمبەرەوە هاتووە لەسەری دەوەستین و زیاد و کەمی بۆ بڕیار نادەین و ژمارەشی دیاریکراو نیە و دروستکراویش نین و دروست نیە کەسێك بێ باوەڕ بێ بەرامبەریان [1].

هەروەها لە ڕوانگەی نامە و وتارەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هەندێ لەو وانانە کە لە وتار و نامەکانیدا باسی کردووە، ڕێبازی عومەری کوڕی عبدالعزیزیش ئەو ڕێبازە ڕاستەیە کە قورئان و سوننەت نیشانی داوین و ئەهلی سوننەتیش چەند بنەمایەکیان داناوە سەبارەت بەناوە پیرۆزەکانی پەروەردگار کە ئەتوانین هەندێکیان لە قسەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە دەربهێنین، لەو بنەمایانەش:

- ناوەکانی پەروەردگار ئەزەلین و هەربوون، عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەڵێ:... زۆر ناوانە ڕون دەکەینەوە بەرامبەر بە خوا کەسێك کە پێی وا بێت کە زانستی خوا دوای بە دیهێنانی بوونەوەر پەیدا بووە، بەڵکو خوای گەورە هەمیشە زانیاری سەبارەت بە هەموو شتەکان هەبووە و شایەت بووە بەسەر هەموو شتەکانەوە، پێش و پاش ئەوەی هەرشتێك دروست بکات [2].

هەروەها عومەر ڕوونی کردەوە کە خوا خاوەنی ناوە جوان و پیرۆزەکانە و هەر خۆی لە ئەزەلەوە زانا و بە ئاگایە ئەمەش بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە [3].

- ناوە جوانەکانی پەروەردگار تەوقیفین، ئەمەش ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە و لەسەر نجدانی قسەکانی عومەرەوە(ﷺ) دەردەکەوێت کە تەنها ئاماژەی بەو ناوانە داوە کەلە قورئان و سوننەتدا باسکراوە – بە پێی زانیاریەکانی من – هەر ئەمەش ڕاستە، چونکە دروست نیە

---

[1] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٢٧٦).

[2] - الحلية(٥ / ٣٤٨)، الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٣٠٤).

[3] - الاثار الواردة(١ / ٣٠٥).

ناوێك لە خوای گەورە بنرێت جگە لەوەی کە خۆی هێناویەتی لە قورئاندا یان لەسەر زاری پێغەمبەری خوا(ﷺ) و لە سوننەتدا باسکراوە [1].

●ناوەکانی پەروەردگار ناو و وەسفن، ناون بەو پێیەی کە بەڵگەن لەسەر زاتی خوا و وەسفیشن بە پێی ئەو مانایانەی کە دەیبەخشێت، کەواتە وەك ناو هاو واتایە و وەك وەسفیش جیاوازن، چونکە هەریەکەیان دەلالەت لە مانایەکی جیاواز دەکات و هەریەکە مانایەکی تایبەتی هەیە، بۆ نموونە الحي واتە زیندوو – الرحمن الرحیم – واتە بەخشندە و میهرەبان هەموویان ناون بۆ یەك ناونیشان بەڵام مانای الحي جیاوازە لە مانای الرحمن و بەو شێوەیە [2].

هەندێ لەو گروپانەش کە دەدرێنە پاڵ ئیسلام پێچەوانەی بیروڕای سەلەفی ساڵحن سەبارەت بە یەکخستنی ناوە پیرۆزەکان، بۆ نموونە جوهەمیە [3] نوکلی ناوە جوانەکانی خوایان کردووە، چونکە وایان زانیوە کە یەکتاپەرستی نەفی کردنێکی ڕووتە و سەلماندنی ناوەکانی پەروەردگاریش سەلماندنی چەند شتێکی بەدی هاتووە بۆیە تەنها ناوی القادر – بە توانا و الخالق – بەدیهێنەر و پەروەردگار یان سەلماندووە، چونکە جەهم هیچ کام لە دروستکراوەکان بە قادر – بەتوانا – نازانێت، بەو پێیەی کە پێی وایە مرۆڤ بێ دەسەڵاتە و کەسیش بە خالق و پەروەردگار نازانێت جگە لە خوا، چونکە پێی وایە هەر سیفەت و ناوێك کە دروست بێت بۆ مرۆڤ بەکاربێت ئەوە شایانی خوا نیە [4].

بەم پێیەش پێویستە لەسەر موسڵمان کە لەسەر ئەو ناوانە بوەستێ کە هاتیان لە قورئان و سوننەتدا ساغ بووەتەوە و واز لە بیدعە و داهێنراو بێنێت و پەنا بۆ تەئویل و شێواندنێك نەبات کە سەری لە بێ باوەڕیەوە دەردەچێت [5]، چونکە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ الأعراف: ١٨٠). واتە: هەر بۆ خوایە جوانترین و چاکترینی ناوەکان جا ئێوەش بەو ناوانە بانگ و هاواری لێ بکەن واز بهێنن و نرخ

---

[1] - هەمان سەرچاوە(١ / ٣٠٥).

[2] - القواعد المثلی، ل: ٨.

[3] - جوهەتمیە / لە باسی مشتومڕی عومەر لەگەڵ کۆمەڵەکاندا لێی دەدوێین.

[4] - منهاج السنة(٢ / ٥٢٦) الاثار الواردة(١ / ٣٠٦).

[5] - الاثار الواردة(١ / ٣٠٦).

دامەنێن بۆ ئەوانەی کەلە ناوەکانی(خوا دا گۆڕان و لادان دەکەن(دەیکەنە ناو بۆ بتەکانیان) بەزوویی تۆڵەی ئەوەی دەیانکرد لێیان دەسەنرێت.

هەروەها لەنامە و وتارەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا زۆرێك لەناوە پیرۆزەکانی پەروەردگار هاتووە وەك: " الله و الرب و الرحمن و الرحیم، الملك الخبیر و الکریم و الحي و الرقیب و الشهید، و الواحد القهار، و العلي العظیم و العفو الغفور و العزیز الحکیم و الوارث الخالق العظیم "[1]، لێرەشدا قسە لەسەر هەندێك لە و ناوە پیرۆزانە دەکەین:

١- دەربارەی ناوی(الرب) پەروەردگار، عومەر ئەفەرموێت: پەروەردگار ئەقڵم بە سوود بکە بۆم[2]. الرب یش یەکێکە لە ناوەکانی پەروەردگار، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ﴾ سبأ: ١٥). واتە:... ولاتێکی پاك و خۆش و پەروەردگارێکی لێبوردە(یان هەیە).

مانای الرّب یش واتە: " چاکەکەری شتەکان " رب الشئ یش واتە: " خاوەنی "، چونکە الله خاوەنی بەندەکان و چاککەری خۆیان و کاروبارەکانیانە[3]، چاوگی الرب یش الربوبیە و هەر کەسێك شتێکی هەبوو پێ دەوترێت رب بۆ نمونە: ئەوترێت رب الدار واتە خاوەنی ماڵ رب الصنعه، خاوەنی پیشە سازی، بەڵام الرب واتە: بە دانانی پێشگری ئەلف و لام بۆی تەنها بە پەروەردگار دەوترێت[4].

٢- سەبارەت بە ناوی " الحي ": عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) هاورێیەکی هەبوو و ئاگادر کرایەوە کە کۆچی دوایی کردووە، ئەویش چوو بۆ لای بنەماڵەکەی هەتاوەکو سەرە خۆشیان لێ بکات، بەڵام ئەوان هاواریان کرد بەرووی دا، ئەویش رتی: ئەم مردوەتان رۆزی دەری ئێوە نەبووە، بەڵکو ئەوەی کە رِۆزیتان دەدات زیندوە(حی)یە[5] و هەرگیز نامرێت، کە واتە الحی واتە: " زیندوو نەمر " یەکێکە لە ناوەکانی پەروەردگار، خوای گەورە ئەوفەرموێت: ﴿

---

[1] - الاثار الواردة(١ / ٢٧٩ هتا ٣٠٦).

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٦٨ الاثار الواردة(١ / ٢٨١).

[3] - الاثار الواردة(١ / ٢٨١).

[4] - اشتقاق اسماء الله الحسنى للزجاجي، ل: ٣٢، ٣٣ الاثار الواردة(١ / ٢٨١).

[5] - الحلية(٥ / ٣٣٠) الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٢٨٨).

﴿ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ﴾البقرة: ٢٥٥)، واته: خوا ئەو خوایەیە كە هیچ پەرەستراوێكی(ڕاست) نیە بێجگە لەو هەمیشە زیدووی تەدبیركەر و ڕاگر(ی بوونەوەر)ە...
هەروەها ژیانی پەروەردگاریش دوای نەبون بەدی نەهاتووە و نەمانی بەسەردا نایەت و ژیانێكیشە كە هەموو كەماڵ و تەواوێتیەكی تیایە وەك زانست و توانا و بیستن و بینین و هتد [1].

٣- سەبارەت بە هەردوو ناوی الواحد القهار: عومەری كوڕی عبدالعزیز بە موزاحیمی خزمەتكاری وت: ئێمە بە هۆی مانگ و خۆرەوە لە ماڵ دەرناچین، بەڵكو بە هۆی خوای تاقانە و بە دەسەڵاتەوە(واحد القهّار) [2] خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَوْمَ تُبَدَّلُ الْأَرْضُ غَيْرَ الْأَرْضِ وَالسَّمَاوَاتُ وَبَرَزُوا لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴾ إبراهيم: ٤٨). واتە: لە ڕۆژێكدا كە ئەم زەوی یە دەگۆڕێ بە زەویەكی تر و ئاسمانەكانیش(دەگۆڕێن بە ئاسمانی تر) ئەوسا هەموو(لە گۆڕەكانیان دێنە دەرەوە) دەردەكەون بۆ خوای تەنیای زاڵ بەسەر هەموو شتێكدا.

الواحد القعار واتە: ئەو زاتەی كە تاك و بێ هاوتایە لە گەورەیی و ناو و سیفەتەت و كردەوە جوان و مەزنەكان و دەسەڵاتی بەسەر جیهاندا، بە بەجۆرێك كە هەمووی لە ژێر دەسەڵات و بەڕێوەبردنی ئەو دایە و هیچ شتێكی لێ ناجولێت بە مۆڵەتی ئەو نەبێت [3].

٤- سەبارەت بە هەردوو ناوی:(العلي العظيم): عومەری كوڕی عبدالعزیز نامەیەكی نووسی بۆ ئەمیرەكانی سوپا و لە كۆتاییەكەیدا هاتبوو... دەسەڵات و توانا هەر بۆ خوای بەرز و مەزنە(العلي العظيم) [4].

ئەم دوو ناوەش لەناوە پیرۆزەكانن، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ﴾ البقرة: ٢٥٥). واتە:... وە پارێزگاری كردنی ئاسمانەكان و زەوی بۆ خوا ئاسانە(گران نیە) وە هەر ئەوە بڵند پلەی پایە گەورە.

---

[1] - اشتقاق اسماء الله الحسنى، ل: ١٠٢ للزجاجي.

[2] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٣٢.

[3] - تفسير السعدي، ل: ٤٢٨.

[4] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٨١.

العلي واتە: بەرز و بڵندە بەسەر تەخت و عەرشەکەیەوە و باڵا دەستە بە سەر هەموو دروستکراوەکاندا و خاوەنی پلەوپایەی باڵا بە هۆی تەواوی و کەماڵی سیفەتەکانیەوە [1]، العظیم واتە: ئەو زاتەی کە گەورەیی دەسەڵات و هێزی دەسەڵاتدارەکان لە بەرامبەریدا بچوك و بێ هودەیە و پاشاکان لە بەرامبەر قودرەتیدا بێ هێز و لوت شکاون دەسا پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە خاوەنی شکۆمەندی و مەزنیە [2].

ئەمانە هەندێك بون لەو ناوە پیرۆز و جوانانەی کە لە نامە و ئاسەوارەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز داهاتوون و تەنها وەك نمونە ئەگینا ناوی پیرۆزی زیاتر لەمانە لە عومەرەوە هاتووە.

## سێیەم: بیروباوەڕی سەبارەت بە ئەو سیفەتە تەواوانەی کە لە زاتی خوادا هەن:

وەك زانست و دانایی و بیستن و بینین و دەست و دەم و چاو هەموو ئەو شتانەی کە پەروەردگار هەواڵی لە بارەوە داوە لە قورئاندا یاخود لەسەر زمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، یەکتاپەرستی پەروەردگاریش لە سیفەتەکانیدا بریتیە لەوەی کە خوای گەورە بەو شێوەیە وەسف بکرێت کە خۆی وەسفی خۆی کردووە یان پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەسی کردووە بە ئەرێ و نەرێ(نفی اثبات) و ئەوەی کە بڕیاری داوە بۆ خۆی [3] بسەلمێنرێت و ئەوەش کە ڕەتی کردۆتەوە ڕەت بکرێتەوە، ئاشکراشە کە ڕێبازی سەلەف و پێشینانی ئوممەت بریتیە لە بڕیاردان و سەلماندنی ئەو سیفەتانەی کە خوای گەورە بۆ خۆی بڕیاری داوە بێ چۆنێتی و بەیەکچواندن(تکیف و تمثیل) یاخود گۆڕین و یەك خستن(تحذیف و تعطبل) هەروەها ئەوەیان ڕەتکردۆتەوە کە پەروەردگار بۆ خۆی ڕەتی کردۆتەوە، لەگەڵ بڕیاردانی ئەو سیفەتانە کە بۆ خۆی سەلماندویەتی بە بێ ئەوەی دەست وەردەنە مانای ناو و نیشانەکانی، چونکە خوای گەورە زەمی ئەوانەی کردووە کە ناوەکانی دەشێوێنن وەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ الأعراف: ١٨٠). واتە: هەر بۆ خوایە جوانترین و چاکترینی ناوەکان جا ئێوەش بەو ناوانە بانگ و هاواری لێ بکەن واز بهێنن و نرخ دامەنێنن بۆ ئەوانەی کەلە ناوەکانی(خوا)دا گۆڕان

---

[1] - تفسیر السعدي، ل: ١١٠.

[2] - تفسیر السعدي، ل: ١١٠.

[3] - اقوال البعین في مسائل التوحید و الایمان(٣ / ٨٧٤).

و لادان دەكەن(دەیكەنەوە ناو بۆ بتەكانیان) بە زوویی تۆڵەی ئـەوەی دەیـانكرد لێیـان دەسـەنرێت.

هەروەها خوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخۡفَوۡنَ عَلَيۡنَآۗ أَفَمَن يُلۡقَىٰ فِي ٱلنَّارِ خَيۡرٌ أَم مَّن يَأۡتِيٓ ءَامِنٗا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ٱعۡمَلُواْ مَا شِئۡتُمۡ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾ فصلت: ٤٠). واتـە: بێگومـان ئەوانـەی لـە ئایەتەكانی ئێمە لادەدەن لە ئێمە شاراوە نین دەی ئایا كەسێ دەخرێتە نـاو ئـاگرەوە چـاكترە یـا ئـەو كەسەی لە ڕۆژی قیامەتدا بێ ترس دێت هەرچیان ویست(حەزیان لـێ كـرد) بیكـەن بێگومـان خـوا بەوەی دەیكەن بینایە.

كەواتە ڕێبـازی ئەمانـە سـەلماندنی نـاو و سـیفەتەكانە لـەگـەڵ ڕەتكردنـەوەی لـێكـچونی لـەگـەڵ دروستكراوەكاندا و سەلماندنی سیفەتەكان بۆی بە بێ لێكچون و تشبیه و پاك ڕاگرتنی بە بێ دارِنـین و تعطیل، هەروەك خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾ الشورى: ١١). واتە:... هیچ شتێك بە وێنەی خوا نی یە وە ئەوە بیسەری بینایە.

ئەمـەش ڕەتكردنـەوەی لـێكـچوون و شـوبهاندنە، ﴿ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴾ الشورى: ١١) ئەمـەش ڕەتكردنەوەی پەككستن و شێواندن و دارِنینی سیفەتەكانە [1]، ئاسەواری زۆریش لە عومەری كـوڕی عبدالعزیزەوە لە بواری سیفەتەكانی پەروەردگار دا هاتووە و ئەو سیفەتانەی سـەلماندووە كـە خـوای گەورە بۆ خۆی بڕیاری داوە و قسەی لەسەر سیفەتی نەفس و ڕومەت و زانست و گەورەیی و توانـا و بلنّدی و لەگەڵابوون و نزیكی و ویست و ئیرادە و تورەیی و ڕازی بوون و میهرەبانی [2] كردووە، ئەمەش كورتە باسێكە دەربارەی هەندێكیان:

أ- سیفەتی نەفس(خود): عومـەری كـوڕی عبـدالعزیز نامەیـەكی نووسـی بـۆ ضـحاكی كـوڕی عبدالرحمن و تیایدا ئەڵێ: پاشان خوای گەورە ئیسلامی داناوە و پێی ڕازیە بۆ خودی خـۆی و بەندە بەرێزەكانی و جگە لەو ئاینێكی تر قبوڵ ناكات [3].

---

[1] - مجموع الفتاوى(٣ / ٨).

[2] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزیز(١ / ٣١٣ بۆ ٣٥٩).

[3] - سیرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٨٦، الاثار الواردة(١ / ٣١٣).

ئـەم ئاسـەوارەش سـەلماندنی سـیفەتی نـەفس ڕوون دەکاتـەوە و قورئـان و سـوننەتیش ئەمـەی سەلماندووە خوای گەورە ئەفەرمویت: ﴿وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ﴾ آل عمران: ٢٨). واتە: وە خوا دەتان ترسێنێت لە سزای خۆی وە هەر بۆ لای خوایە گەڕانەوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا لە ستایشی پەروەردگار دا ئەفەرمویت:(... لا أحصي ثناءً عليك انـت كما اثنيت على نفسك)[1] واتە:(من ناتوانم وەك پێویست سوپاسی تۆ بکەم تۆ بـەو شـێوەیەیت کـە ستایشی خۆتت کردووە) نەفسی پـەروەردگاریش ئـەو زاتـە پیرۆزەیـە کـە لـە قورئـان و سـوننەتدا دەردەکەوێت[2] و نەفسی خوا ئەو زاتە پیرۆزەیەتی کە هەموو سیفەتەکانی تیادا کۆبوەتەوە و زاتیـشی جیانیە لە سیفەتەکانی، مەبەستیش لەنەفس تەنها سیقەتی ذات نیە[3].

ب- سیفەتی ڕوومەت بۆ پەروەردگار: عومەر نامەیەکی نووسی بۆ خەواریج کـە تیایـدا هـاتبوو،.. سوێندتان بۆ دەخۆم بەخوا ئەگەر لەنەوەی من بوونایە ئەوە خوێنم ئەڕشـتن لـە بەرڕەزامەنـدی خوا و ڕۆژی دوایی[4]، سیفەتی ڕومەتیش یەکێکە لە سیفەتە خودیەکانی پەروەردگار و قورئان و سوننەت باسیان لێوە کردووە خوای گەورە ئەفـەرمویت: ﴿وَٱلَّذِينَ صَبَرُواْ ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِمۡ﴾ الرعـد: ٢٢). واتـە: وە ئەوانـەن کـە دانیـان بـە خۆیانـدا گـرت بەمەبەسـتی ڕەزامەنـدی پەروەردگاریان...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای شتی نەگونجاوی لە پەروەردگار دەکرد ئـەوەتا لـە داواو نزاکانیـدا هاتووە کە وتویەتی: " داوای چێژ بردن لە سەیر کردنی ڕومەتت دەکەم "[5]

ج- سیفەتی دەسەلات و قودرەت: عومەر نامەی نووسی بۆ هەندێك لە کار بەدەستانی:... پاشـان ئەگەر دەسەلاتت بەسەر خەلکیدا وای لێ کردی کـە سـتەمیان لـێ بکـەیت، ئـەوە بـیر لـە دەسەلاتی خوا بکەرەوە لە کۆتایی هێنان بەو ستەمەی سەر ئـەوان و هێـشتنەوەی کێـشەکانی

---

[1] - مسلم رقم(٤٨٦).

[2] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيد(١ / ٣١٤).

[3] - الفتاوى له الاثار الواردة(١ / ٣١٤).

[4] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٧٥.

[5] - صحيحة الالباني في صحيح سنن النسائي(١ / ٢٨٠ – ٢٨١).

تۆ[1]. هەروەها لە نامەیەکیدا لە وەڵامدانەوەی قەدەرییەکاندا ئەڵێت:... خوای گەورە لەوە بە دەسەڵات ترە کە بەندەیەك بتوانێ کارەکانی هەڵبوەشێنێتەوە[2].

لە ڕوانگەی ئەم دوو ئاسەوارەی پێشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە عومەری کوڕی عبدالعزیز سیفەتی دەسەڵاتی بۆ پەروەردگار سەلماندووە ئەم سیفەتەش یەکێکە لەو سیفەتانەی کە بیستن و ئەقڵ ئەسەلمێنێت خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ﴾ البقرة: ٢٠). واتە:... بێگومان خوا بەسەر هەموو شتێکدا دەسەڵاتدارە.

لە سوننەتیشدا فەرموودەی أبی مسعودی بدری هەیە کە کاتێك کە لە غوڵامەکەی دا پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی وت: بزانە ئەی ابو مسعود کە خوای گەورەدەسەڵاتی بەسەر تۆدا زیاترە لەوەی کە تۆ بەسەر ئەم غوڵامەتدا هەتە[3].

ئەمانە هەندێ بوون لەو ئاسەوارانەی کە بەڵگەن لەسەر سەلماندنی سیفەتەکانی پەروەردگار لەلایەن عومەری کوڕی عبدالعزیز ەوە لەسەر بنەماکانی ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت.

## چوارەم: نەهیکردنی لە بەکارهێنانی گۆڕستان وەك مزگەوت:

لە ئیسماعیلی کوڕی ابی حکیم ەوە ئەگێڕنەوە کە گوێی لە عومەری کوڕی عبدالعزیز بووە وتویەتی: دوایەمین شتێك کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتبێتی ئەوە بوو کەوتی: خوا جولەکە و گاور لە ناو بەرێت کە گوڕی پێغەمبەرەکانیان کردبوو بە پەرستگا و مزگەوت، نامێنێت – یان وتی – نابێت دوو ئاین لە زەوی عەرەبدا هەبێت[4].

هەروەها حصین بۆی باسکردین کە عومەری کوڕی عبدالعزیز نەهی کردووە لەوەی کە گۆڕ بە گەچ بنیات بنرێت وەسیەتی کرد کە ئەو کارە نەکەن[5]، ئەم فەرموودە مُرْسَلَە عمریش هۆشداری پێغەمبەرمان پێ ڕادەگەیەنێت لە بەکارهێنانی گۆڕستان وەك مزگەوت و ڕوونیشی دەکاتەوە کە ئەوە کاری جولەکەو گاورە و موسڵمانیش نەهی لێکراوە کە شوێن کرداری ئەوسەر لێشێواو و غەزەب

---

[1] – سيرة عمر، ل: ١٢٥ لابن الجوزي.

[2] – الحلية(٥ / ٣٤٧).

[3] – مسلم رقم(١٦٥٩).

[4] – البخاري رقم ١٣٣٠ مصنف عبدالرزاق(١٠/ ٣٥٩ – ٣٦٠).

[5] – سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٣٤٦.

لێگیراوانه بکەوێت بە دەقی قورئان، گومانیش لەوەدا نیە کە بە کارهێنانی گۆڕ وەك مزگەوت و هەڵبەستن و بیناکردن بەسەریەوە یەکێکە لەوشتانەی کە پێشینانی ئوممەت ڕێگریان کردووە وەك پێشتر لە عومەرەوە گێڕامانەوە کە نەهی کردووە لەوەی کە گۆڕ هەڵبەسترێت و وەسیەتیشی کردووە کە گۆڕی ئەو بەوشێوەی لێنەکرێت [1]، کاتێ وەلیدی کوڕی عبدالملك یش فەرمانی دا بە بنیاتنانی مزگەوتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەردەمی والی بوونی عمر لە مەدینەدا و پێوەلکاندنی ژوورەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ژووری عائشە کە گۆڕی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەبوبەکر و عومەری تێدایە، هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو کە گۆڕەکەی خستە گۆشەیەکەوە، هەتاوەکو گۆڕی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە پێشەوەدا نەبێت و خەڵکی لە نوێژدا ڕووی تێ نەکەن، ئەمەی کاتێك کرد کە دیواری بەیت ڕووخا و ئەویش بەو شێوەیە بنیاتی نایەوەبەیت بوو بە خاوەنی پێنج گۆشە [2]، مەبەست ئەوەیە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز دەروازەکانی هاوەڵگەری بەشێوەیەکی ژیر و دانایانە داخستووە وەك ئەوکەسانە باسی دەکەن کە بنیاتنانەوەی مزگەوت پێغەمبەریان(ﷺ) بینیوە لەسەردەمی والی بوونی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە مەدینەدا.

گومانیش لەوەدا نیە کە نەهی کردنی پێغەمبەر لە بەکارهێنانی گۆڕی خۆی و خەڵکی تر وەك مزگەوت لە ترسی ئەوە بووە کە بەگەورە بزانرێت و بە هۆیەوە خەڵکی گومڕا ببێت، تەنانەت زۆر جار خەڵکی سەری لە بێ باوەڕیەوە دەرچووە وەك لە نەتەوەکانی پێشوودا ڕووی داوە [3].

هەروەها عومەر نەهی کردووە لەوەی کە بینا لەسەر گۆڕەکەی یان گۆڕی تر دروست بکرێت و وەسیەتیشی بۆ ڕێگری لەم کارە کردووە لە کاتێکدا کە ئەو لەسەردەمێکدا بووە کە بیروباوەڕ پاك و بێگەرد بووە. بە بەراورد لەگەڵ سەردەمی دوای خۆیدا، بەڵام ئەو بەهۆی تێگەشتنی دروستیەوە لە مەبەستەکانی سوننەت و بە هۆی پەیڕەو کردنی ڕێبازی ڕاست کە ڕێبازی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵانە(ﷺ) خوای گەورە ڕێنمایی کرد بۆ وەسیەت کردن هەتاوەکو بینا لەسەر گۆڕەکەی دروست نەکرێت و نەکرێتە مزگەوت بۆیە مەسەلەکەی یەکلا کردەوە پێش ئەوەی لە دەست دەربچێت، بێگومان ئەم کارەی عومەریش داخوازی ئەو فەرموودەی صحیحە یە کە موسلیم لە

---

[1] - الاثار الواردة عن عمر في العقيدة(١ / ٢٦٤).

[2] - هەمان سەرچاوە(١ / ٢٦٥).

[3] - صحيح مسلم شرح النووي(٢ / ١٨٥).

جابری کوڕی عبدالله گێڕاویەتیەوە و ئەڵێ:(پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەهی کردووە لە گەچکاری کردنی گۆڕ و دانیشتن لەسەری و دروست کردنی بینا و هەڵواسینی گۆڕ [1].

## پێنجەم: چەمکی ئیمان لای عومەری کوڕی عبدالعزیز:

عەدی کوڕی عەدی ئەڵێت: عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی بۆ نووسیم و تیایدا هاتبوو:... پاشان باوەڕ چەند فەرز و ڕێسا و سنوور و نەریتێکی هەیە، جا هەر کەسێك بە تەواوی ئەنجامیان بدات ئەوە باوەڕی تەواوی هەیە، هەر کەسێکیش بە تەواوی جێبەجێیان نەکات ئەوە باوەڕی تەواو نیە، جا ئەگەر بمێنم ئەوە بە باشی ڕوونی دەکەمەوە هەتاوەکو کاری پێ بکەم، ئەگەر مردیشم ئەوە خەمی هاوڕێیەتی ئێوەم نامێنێت [2].

هەروەها لە جعفری کوڕی برقانەوە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەی بۆ نووسین کە بنەماکانی باوەڕ و پایەکانی ئیسلام بریتیە لە باوەڕ هێنان بە خوا و بەرپاکردنی نوێژ و زەکات دان جا نوێژەکانتان لە کاتی خۆیدا بکەن [3].

لێرەدا عومەر ڕوونی دەکاتەوە کە باوەڕ بریتیە لە چەند فەرزێك وەك نوێژ و حەج و ڕۆژوو و هەروەك چەند شەریعەت و ڕێسایە کیشە واتە: بیروباوەڕی ئاینی وەك باوەڕ بە خوا و فریشتەکانی و چەند سنورێکیشە واتە شتی نەهی لێکراوە وەك خواردنەوەی مەی و زینا، هەروەك چەند سوننەتێکیشە وەك لابردنی شتی ئازاردەر لەسەر ڕێگا و چەندین شتی باش و مەندوبی تر هەموو ئەمانە بەشێکن لە باوەڕ [4].

ئەمەش کە لە عومەرەوە هاتووە ڕاستە و قورئان و سوننەت داوای دەکەن و وتەکانی سەلەفی ساڵحیش پشتگیری دەکەن، چونکە ئیمان لای ئەهلی حەق بریتیە لە: لە وتەی زمان و باوەڕپێکردن بە دڵ و کارکردنی بە ئەندامەکانی لەش [5]، لەو بەڵگانەش کە دەیسەلمێنن کە باوەڕ وتە یە بە زمان فەرمایشتی پەروەردگارە: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ ﴾ البقرة: ١٣٦). واتە:

---

[1] - مسلم ژمارە ٩٧.

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٧٢، الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ٥٤٣).

[3] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز العقيدة(١ / ٥٤٥).

[4] - هەمان سەرچاوە(١ / ٥٤٤).

[5] - مسلم ژمارە ٣٢.

بلێن:(ئەی موسڵمانینە) بڕوامان هێنا بە خوا و بەو قورئانەی کە بۆ خۆمان نێرراوەتە خوارەوە و بەو بەرنامەی کە نێردراوە بۆ ئیبراهیم...

هەروەها فەرمایشتی:(فەرمانم پێکراوە بە جەنگ کردن لەگەڵ خەڵکیدا هەتاوەکو بڵێن " لا الە الا الله " جا رهە کەسێك وتی: " لا الە الا الله " ئەوە گیان و ماڵی پارێزراوە مەگەر پاشگەز بێتەوە و لێپرسینەوەشی لەسەر خوایە، هەروەها لەو بەڵگانەش کە دەیسەلمێنن کە کاری دڵ بەشێکە لە باوەڕ فەرمایشتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ﴾ الأنفال: ٢). واتە: بێگومان بڕواداران تەنها کەسانێکن کە کاتێك کە باسی خوا کرا و ناوی هێنرا دڵیان دەترسێت و ترسی لێ دەنیشێت...

ترسیش دیارترین کاری دڵە و لەم ئایەتەدا بە ئیمان ناوبراوە، بەڵگەش لەسەر ئەوەی کە کاری ئەندامەکانی لەش بەشێکە لە ئیمان فەرمایشتی: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ﴾البقرة: ١٤٣). واتە: وە خوای گەورە بڕوا(و نوێژەکانی جاران)تانی بەزایە نەداوە...

هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتەش ئەوە بوو کاتێ کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسیاری لێکرا، ئایا ئەوانەی کە مردون و بەرەو بەیتولمەقدس نوێژیان دەکرد حوکمیان چۆنە؟ خوای گەورەش ئایەتی: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمْ﴾البقرة: ١٤٣)، لێرەدا خوای گەورە نوێژی بە ئیمان ناو بردووە، جا ئەگەر ئەمە بۆ نوێژ وا بێت ئەوە بۆ سەرجەم پەرستشەکانی تریش هەروایە [١].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی کە تیایدا هاتبوو: داوا لە پەروەردگار دەکەم بە میهر و فەزڵی خۆی کە ڕێنماییکراو زیاتر ڕێنمایی بکات و خراپەکاریش بگێڕێتەوە بۆ تەوبە و داوای لێخۆشبوون لە کاتی لەش ساغیدا [٢]، هەروەك سەبارەت بە ئیمان دەفەرموێت:... هەر کەس هەموویان بکات ئەوە ئیمانی تەواوە و هەر کەس هەموویان جێبەجێ نەکات ئەوە ئیمانی لاوازە [٣]، کەواتە ئەم بەڵگە و ئاسەوارانە ئەیسەلمێنن کە ئیمان کەم و زیاد دەکات، قورئان و سوننەت و ئاسەوارەکانی پێشنیانی پیاو چاکیش ئەمە دەسەلمێنن، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿تِلْكَ

---

[١] - الاعتقاد للبيهقى، ل: ٩٥، ٩٦ الاثار الواردة(١ / ٥٤٥).

[٢] - الطبقات(٦ / ٣١٣) الاثار الواردة(١ / ٥٥٠).

[٣] - فتح الباري(١ / ٤٥).

﴿ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا ﴾ الأنفال: ٢). واته: كاتێكیش ئایەتەكانی خوا بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بڕوایـان زیاد دەبێت...

پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئەفەرموێت: " ئیمانی نیە ئەو كەسـەی كـە سـپاردە ناپارێزێـت " [1]، لـە وتەكانی سەلەفیش بوخاری فەموویەتی: بە خزمەتی زیاتر لـە هـەزار كـەس لـە زانایـانی ناوچـەكان گەشتووم و كەسم نەبینیوە كە گومانی هەبێت لەوەدا كـە بـاوەڕ قـسە و كردەوەیـە و كـەم و زیـاد دەكات [2].

## شەشەم: باوەڕ بە ڕۆژی دوایی:

قسە كردن لەسەر ڕۆژی دوایـی زۆر شـت دەگرێتـەوە، وەك هـەموو ئەوشـتانەی كـە خـوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسیان كردووە پاش مردن لە سزای ناوگۆڕ و پاداشـت و زینـدوو بوونـەوە و بڵاو بوونەوە و ئەو سزا و پاداشت و بەهەشت و دۆزەخەی كـە لـە ڕۆژی دوايیـدا هەیـە.. هتـد، عومەری كوڕی عبدالعزیز یش باسی ئەم مەسەلانەی كردووە وەك:

١- **سزا و پاداشتی ناو گۆڕ:** عومـەری كـوڕی عبـدالعزیز بـە پیـاوێكی وت: دوێنـی سـورەتێكم خوێندەوە كە باسی سەردانی تێدا بوو: ﴿ أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ١ حَتَّىٰ زُرۡتُمُ ٱلۡمَقَابِرَ ﴾ التكاثر: ١ - ٢) وزگـە سـەر لێـدراو چـەندێك دەمێنێتـەوە هـەتاوەكو ببرێـت بـۆ بەهەشـت یـان دۆزەخ [3].

جارێكیشیان وتاری داو وتی: خەڵكینە ئایا وانابینن كە ئێوە لە ڕیـزی تیاچـووان و لـە مـاڵی مردوان و لە زێدی ڕێبوارانداندا؟ تا دوێنی دراوسێتان بوون و ئەمڕۆ لـە دوا ئارامگایانـدا بـێ هۆش ڕاكشاون هەندێكیان ڕۆحیان ئاسوودەیە هەتاوەكو قیامەت و هەندێكیـشیان ڕۆحـی لـە سزادایە تا ڕۆژی دوایی [4].

جارێكی تر لە خناصرە وتاری داو وتی:... هەموو ڕۆژێك كەسێك بەخاك دەسپێرن كـە كۆچـی دوایی كردووە و ڕۆژی تەواو بووە پاشان ئەیخەنە درزێكی زەویەوە بە بێ ئەوەی بتوانێ پشوو بدات،

---

[1] - الایمان لابن ابي شيبة، ل: ٥ ئەلبانی بە صحیحی داناوە، الاثار الواردة عن عمر(١ / ٥٥٣).

[2] - البخاري مع الفتح(١ / ٤٧).

[3] - الحلية(٥ / ٣١٧)، الكتاب الجامع لسيرة عمر(١ / ٣٣٦).

[4] - سيرة عمر، ل: ٢٥٩. ٢٦٠ لابن الجوزي.

له ئازیزانی دورکەوتۆتەوە و هیچ هۆکارێکی بە دەستەوە نەماوە چاوەڕێی لێپرسینەوەیە و دیلی کردەوەکانیەتی وبێ پێویستە بەوەی کە جێی هێشتووە و هەژارە بەوەی کە پێشی خستووە [1].

ئەمەش کە عومەری کوڕی عبدالعزیز وتویەتی بەڵگەیە لەسەر سەلماندنی پاداشت و سزای گۆڕ و ئەمەش بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە و دەقەکانی قورئان و سوننەتیش ئەمە دەسەلمێنن، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلْقَوْلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَفِي ٱلْآخِرَةِ ﴾إبراهيم: ٢٧)، واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە خوا دامەزراویان دەکات بە ووتەی بەرێ وجێ(کە شایەتمانە) لە ژیانی دنیادا و لە ڕۆژی دوایشدا...

لە فەرموودەی صحیحیشدا هاتووە کە ئەم ئایەتە دەربارەی سزای ناو گۆڕ هاتووە [2]، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱلنَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوًّا وَعَشِيًّا ﴾غافر: ٤٦). واتە: بەیانیان و ئێواران دەبرێنە دیاری ئاگری دۆزەخ...

٢- **باوەڕبوون بە زیندبوونەوە و دابەزینی پەروەردگار بۆ دادگایی کردن:** عومەری کوڕی عبدالعزیز وتارێکی دا لە الخناصره و وتی: خەڵکینە ئێوە بۆ گاڵتە و گەپ دروست نەکروان و هەروا وازتان لێ نەهێنراوە، ئێوە وادەیەکتان هەیە کە تیایدا خوای گەورە دادەبەزێت بۆ دادوەری کردن و لێپرسینەوەتان[3].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ هەندێ لە کاربەدەستانی کە تیایدا هاتبوو:... پاشان وەك ئەوەی بەندەکان گەڕابنەوە بۆ لای خوا بۆ ئەوەی ئاگاداریان بکاتەوە لەوەی کە کردوویانە هەتاوەکو پاداشتی چاکەکاران بداتەوە بە چاکەکانیان و سزای خراپەکانیش لە بری خراپەکانیان بداتەوە [4]، لە جەریری کوڕی حازمەوە ئەڵێ: نامەی عومەری کوڕی عبدالعزیزم بۆ عەدی خوێندەوە... بزانە کە کەس ناتوانێ کێشەی نێوان خەڵکی یەکلا بکاتەوە و کۆتایی پێ بێنێت و هەر دەبێ چەند کێشەیەك بمێنێتەوە بۆ ڕۆژی دوایی [5]، هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز

---

[1] - سيرة عمر، ل: ٢٥٩. ٢٦٠ لابن الجوزي.

[2] - الروح لابن القيم، ل / ١٤٤.

[3] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٤٢.

[4] - ذم الدنيا ٧١ لابن ابي الدنيا.

[5] - في الزهد، هناد السرى(١ / ٢٩٩ – ٣٠٠)، الاثار الواردة(١ / ٤٤٨).

نامەیەکی نووسی بۆ عەدی کوڕی ارطأة:... پاشان من یادی شەوێکت دەخەمەوە کە بە قیامەت کۆتایی دێت و بەیانیەکەی ڕۆژی دواییە، ئای چ شەو و چ بەیانیەکە، بۆ بێ باوەڕان زۆر سەختە [1]، نامەیەکیشی نووسی بۆ هەندێ لە سەربازانی:... پاشان وەسیەتت بۆ دەکەم بە لە خواترسان و پابەند بوون بە فەرمانیەوە، جا هەرکەسێك حەزی لە بەهەشتە و ئەیەوێ ڕزگاری بێت لە دۆزەخ، ئەوە لەم ڕۆژانەدا تەوبە قبوڵ کراوە و لێخۆشبوونی تاوانیش مسۆگەرە پێش هاتنی ئەجەل و تەواو بوونی ڕۆژی ژیان و یەکلابوونەوەی پەروەردگار بۆ لێپرسینەوە لە بەندەکانی لە شوێنێکدا کە پارەدان و فێڵ سوودی نیە، نهێنیەکان تیایدا ئاشکرا دەکرێن و تکاکردن تیایدا نامێنێت، خەڵکی هەموو بە کردەوەکانیانەوە ئامادەن و لەوێوە بلاوەی لێ دەکەن بۆ ماڵەکانیان، جا خۆشبەختی لەو ڕۆژەدا بۆ هەر کەسێك کە ملکەچی پەروەردگاری کرد بێت و بەدبەختی بۆ کەسێك کە سەرپێچی پەروەردگاری کردبێت [2].

لە ڕاستی دا باوەڕ بوون بە زیندوو بوونەوە و ئەوەی کە خوای گەورە هەموو دروستکراوەکان کۆ دەکاتەوە و ڕوونکردنەوەی حیکمەتی ئەم مەسەلە و قورسی ئەم ڕۆژە بۆ بێ باوەڕان، هەموو ئەمانە لەو وتە و ئاسەوارانە وە دەردەکەون کە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە ن قورئانی پیرۆزیش باسی باوەڕ بوون بە ڕۆژی دوایی کردووە چ بە شێوەیەکی ڕاشکاو بێت یان بە هێما و ئاماژە، لە زۆرێك لە ئایەتەکانی قورئانیشدا پەروەردگار پێویستی باوەڕهێنان بە ڕۆژی دوایی دوپات کردۆتەوە و لە هەندێکیشیدا ڕەتی ئەو کەسانەی داوەتەوە کە نکوڵی زیندوو کردنەوەی جەستە دەکەن بە بەڵگەی ئەقڵی بە جۆرێك کە جگە لە دانپیادانان یاخود لوتبەرزی نواندن چارەیەکی تری بۆ نەهێشتونەتەوە [3].

خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴾ الروم: ١١). واتە: خوا دروست کردن(ی ئادەمی) دەست پێ دەکا و لە پاش(مردن) دروستی دەکاتەوە پاشان بۆ لای ئەو(خوا) دەگەڕێنەوە.

---

[1] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ١١٥ ابو حفص الملاء(١ / ٢٠٦).

[2] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ١١٥، ١١٦ ابو حفص الملاء(١ / ٢٦٦).

[3] - الاثار الواردة في العقيدة(١ / ٤٥١).

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ إِنَّكُم بَعْدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ۝١٥ ثُمَّ إِنَّكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ تُبْعَثُونَ ﴾ المؤمنون: ١٥ - ١٦). واتە: پاشان بەڕاستی ئێوە لە دوای ئەوە هەمووتان دەمرن. لە پاشان بێگومان ئێوە لە ڕۆژی دواییدا زیندوو دەکرێنەوە.

هەروەها دەربارەی ئەو کەسانەی کە نکولی زیندوو بوونەوە دەکەن دەڵێ: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الْإِنسَانُ أَنَّا خَلَقْنَاهُ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ۝٧٧ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُ ۖ قَالَ مَن يُحْيِي الْعِظَامَ وَهِيَ رَمِيمٌ ۝٧٨ قُلْ يُحْيِيهَا الَّذِي أَنشَأَهَا أَوَّلَ مَرَّةٍ ۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ﴾ يس: ٧٧ - ٧٩). واتە: ئایا ئادەمی نەیزانیوە کە ئەومان لە نوتفەیەك دروست کردووە کەچی یەکسەر دەبێتە دوژمنێکی دیار(دەمقاڵێ کەرێکی ئاشکرایە). و نموونەمان بۆ دێنێتەوە و بەدیهێنانی خۆی لە بیر چۆتەوە(ئەو بێ بڕوایە) دەڵێ کێ ئێسکەکان زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیون(ئەی محمد(ﷺ) بڵێ ئەو زانە زیندوویان دەکاتەوە کە لە یەکەم جارەوە بەدی هێناون و ئەو بە هەموو دروست کراوێك زاناو ئاگایە.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿ أَيَحْسَبُ الْإِنسَانُ أَن يُتْرَكَ سُدًى ۝٣٦ أَلَمْ يَكُ نُطْفَةً مِّن مَّنِيٍّ يُمْنَىٰ ۝٣٧ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةً فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ۝٣٨ فَجَعَلَ مِنْهُ الزَّوْجَيْنِ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ ۝٣٩ أَلَيْسَ ذَٰلِكَ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ﴾ القيامة: ٣٦ - ٤٠). واتە: ئایا مرۆڤ وادادەنێ کە هەروا بەرەڵا دەکرێ(و پشت گوێ دەخرێ) ئایا نوتفەیەك نەبوو لە تۆوکە دەڕژێنرا(یە منداڵدانەوە). لە پاشان بوو بە خوێنی پارەیەك ئینجا دروستی کرد و ڕێکی خست. ئینجا لەو تۆوە دوو جۆری دروست کرد نێر و مێ. ئایا ئەو زاتە توانای نی یە بەسەر ئەوەدا کە مردووان زیندوو بکاتەوە.

هەروەها لە چەند فەرموودەیەك باوەڕ بوون بە زیندوو بوونەوە باسکراوە لەوانە ئەوەی کە لە ئیبن عەباسەوە هاتووە:(خوای گەورە ئەفەرموێت: " بەندەکەم بە درۆی خستمەوە، هەرچەندە ئەمە بۆ ئەو ڕەوانیە، هەروەها قسەی پێ وتووم و ئەمەش بۆ ئەو ڕەوانیە، بە درۆ خستنەوەی بۆم ئەوە یەکە ئەڵێ ناتوانم زیندوی بکەمەوە وەك جاران، قسە وتنەکەشی ئەوەیە کە ئەڵێ من منداڵم هەیە، پاك و بێگەردی بۆ من لەوەی کە هاوسەر و منداڵم هەبێت)[1] ناوەڕۆکی ئەم دەقانەش لە عومەرەوە(رضي الله عنه) هاتووە[2].

---

[1] - البخاري ژمارە(٣٠٩٣).

[2] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٥٢).

٣- **ترازوو:** عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەڵێت: بارودۆخی مردووتـان نـەبینیوە ڕوومـەتی وونـە و خۆشی لـەبیر کراوە و ماڵی چـۆڵە و ئـەڵێی تێکـەڵاوی کەسـی نـەکردووە و هـەرگیز مـاڵی ئاوەدان نەبووە، جا خۆتان لە ڕۆژێك بپارێزن کە گەردیلەیەکی تیادا شاراوە نیـە لـە تـرازووی خوادا [١]، هەروەها ئەڵێ:... پەنا ئەگرم بە خوا لەوەی کـە فرمانتـان پـێ بکـەم بەشـتێك کـە درەوونی خۆمی لێ بەدوور دەگرم و ئەمەش ببێتە هـۆی دۆڕاندنی گرێبەسـت و دەرکـەوتنی هەژاری و لاریم لە ڕۆژێکدا کە دەوڵەمەندی و هـەژاری تیـادا دەردەکـەوێت و ترازووەکـان دادەنرێن [٢].

هەروەها لە بجلی شامیەوە لە باوکیەوە کە هاوەڵی عومەری کـوڕی عبـدالعزیز بـووە ئـەڵێ: عومەری کوڕی عبـدالعزیزم بینـی ئـەم ئایەتـەی دەخوێنـدەوە: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ الأنبياء: ٤٧). واتە: وە ئێمە دادەنێین تەرازووەکانی دادپـەروەری(کـە کـردەوەی پـێ دەکێـشرێ) لـە ڕۆژی قیامەتدا...

هەتاوەکو لار بوویەوە و خەریك بوو ئەکەوت [٣]، ئەم ئاسەوارانەش بەڵگـەن لەسـەر ئـەوەی کـە دوای هەستانەوە لە گۆڕ و چون بۆ دەشتی مەحشەر ودابـەزینی پـەروەردگار - بـەو شـێوەیەی کـە شیاوە بۆی - بۆ یەکلا کردنەوە و دادگایی کردنـی بەنـدەکانی تـرازوو دادەنرێـت، ئـەو تـرازووەش ترازوویەکی ڕاستەقینەیە و کارو کردەوەی بەندەکانی پێ دەکێشرێت، ئەمـەش بـۆ چـوونی ئـەهلی سوننەت و جەماعەتە [٤].

ئیبن حەجەر ئەڵێ: ئەبو ئیسحاقی زەجاج ئەڵێ: ئەهلی سوننەت کۆ دەنگن لەسـەر بـاوەڕ هێنـان بە ترازوو و کێشانی کردەوەی بەندەکان پێی لە ڕۆژی دواییدا، ئەو ترازووەش زمان و دوو دەسـتی هەیە سەر و خوار بە کردەوەکان دەکات، بەڵام موعتەزیلە و چەند کۆمەڵێکی تـر نکـولی ترازویـان کردووە و وتویانە: مەبەست لـە تـرازوو دادپەروەریـە بـەم پێیـەش پێـچەوانەی قورئـان و سـوننەت وەستاون، چونکە خوای گەورە هەواڵی داوەکە ترازوو دادەنێت بۆ کێشانە کردنی کاری بەنـدەکان

---

[١] - سيرة عمر، ل: ٢٥٥ لابن الجوزي.

[٢] - الحلية(٥ / ٢٩١) سيرة عمر بن عبدالعزيز الجوزي ل: ٢٣٤ - ٢٤٤.

[٣] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٢٤٨.

[٤] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٥٧).

هەتاوەکو خۆیان شایەت بن بەسەر خۆیانەوە[1]. ئەم ترازووەش زۆر وردە و کەم و زیاد ناکات خوای گەورە ئەفەرمویت: ﴿ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴾ الأنبياء: ٤٧). واتە: وە ئێمە دادەنێین ترازووەکانی دادپەروەری(کە کردەوەی پێ دەکێشرێ) لە رۆژی قیامەتدا ئینجا هیچ کەس کەمترین ستەمی لێ ناکرێ با قورسی(کردەوەکەی) بە قەدەر تۆ و خەرتەلەیەکیش بێت ئێمە دەیهێنین و بەسە کە ئێمە(خوا) ژمێریاری(کردەوەی بەندەکان) بین.

٤- **حەوز:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆ فەرمانڕەوای دیمەشق کە پرسیار بکە لە ابا سلام لەوەی کە لە ثوبانی خزمەتکاری پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بیستویەتی دەربارەی حەوز، جا ئەگەر سەلماندی ئەوە بە پۆستە دا بۆم بنێرە[2].

لە ڕێوایەتێکی تریشدا: عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ)بە پۆستەدا ناردی بە دوای ابی سەلامی حەبەشی بە هێنایان –کاتێ گەشتە لای عومەر وتی: زەحمەتی زۆرم بوو، عومەریش وتی: ئێمە مەبەستمان ئەوە نەبوو، تەنها بۆ ئەوە بوو کە بیستبومان فەرموودەی ثوبان سەبارەت بە حەوز لای تۆ هەیە و ویستم لەدەمی تۆوە بیبیستم ئەویش وتی: گوێم لە ثوبانی خزمەتکاری پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەیوت: گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ) ئەیفەرموو:(حەوزی من لە عەدەنەوە هەتاوەکو عمان البلقاءدەبێت[3]، ئاوەکەی سپی ترە لە ماست و شیرینترە لە هەنگوین پەرداخەکانیشی بە ئەندازەی ژمارەی ئەستێرەکانی ئاسمان دەبێت هەر کەس جارێك لێی بخواتەوە هەرگیز تینووی نابێت، یەکەم کەسێك کە دەچێتە سەری کۆچکەرە هەژارەکانە)[4].

گومانیش لەوەدانیە کە باوەڕ بوون بە حەوز بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە ئەمەش بە پشت بەستن بە دەقە ڕاشکاوەکان کە لەو بارەیەوە هاتوون، ئەو بەڵگانەش کە بوونی حەوز دەسەلمێنن لە سوننەتدا گەشتۆتە ڕادەی تەواتر – واتە هێندە زۆرن ناتوانین گومانی لێ بکەین: –

---

[1] - فتح الباري(١٣ / ٥٣٨).

[2] - البداية و النهاية لە الاثار الواردة(١ / ٤٦٢) وە.

[3] - الاثار الواردة(١ / ٤٦٣).

[4] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٣٧.

٥- **پردی سیرات:** عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ برایەکی خۆی:... برای من تۆ ڕووبەرێکی زۆرت بڕیوە و کەمێکت ماوە جا ئاگات لە سەرچاوە و ئەو شوێنانەبێت کە پێی دەگەیت، چونکە سروش کراوە بۆ پێغەمبەرەکەت لە قورئاندا کە تۆ لەو کەسانەی کەبەسەر پردی سیرات دا تێپەر دەبێت، بەڵام نەوتراوە ئایا دەردەچیت و ڕزگارت دەبێت یان نا، ئاگاشت لە خۆت بێت، چونکە دونیا ماڵی کەسێکە کە ماڵی نەبێت و سامانی کەسێکە کە سامانی نیە [١]، ئەم ئاسەوارەش کە لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە ڕەحمەتی خوای لێ بێت بەڵگەیە لەسەر باوەڕ هێنان بەسیرات، ئەمەش دوای بەجێ هێشتنی مەحشەر لەو ڕۆژە سەختەدا و تێپەڕ بوون بەسەر سیرات دا کە پردێکە بەسەر دۆزەخ دا درێژبوەتەوە لە موباریکتر و لە شمیشێر تیژترە، خەڵکانی پێش و پاش لە شوێنکەوتوانی یەکتاپەرستی پێغەمبەران و خاوەن گوناه و تاوانبار و دوڕووەکان بەسەریدا تێپەڕ دەبن و پێش سیرات بەردەمیان تاریك دەبێت لەم شوێنەشدا دووڕوەکان لە باوەڕداران جیادەبنەوە ئەکەونە دوایانەوە و باوەڕداران پێش دەکەون و بەر بەستێك لە نێوانیاندا دروست دەبێت هەتاوەکو نەتوانن بە باوەڕداراندا بگەنەوە، هەموو موسڵمانێکیش بە ئەندازەی کار و کردەوەی نور و ڕوناکی پێ دەدرێت و بەرپێی بۆ ڕوناك دەکاتەوە و بەسەر سیرات دا تێپەڕدەبن هەندێکیان وەك هەورە بروسکە تێپەڕدەبن و هەندێکیان وەك با هەندێکیشیان بە گاگۆڵکێ، هەتاوەکو کەسێك تێپەڕ دەبێت کە ڕوناکیەکەی لە پەنجەی پێیەوەیەتی و دەستێکی دەکەوێت و بەدەستەکەی تری خۆی دەگرێتەوە، هەروەها قاچێکی دەخلیسکێ و بە قاچەکەی تری خۆی دەگرێت و هەندێ شوێنی بەر ئاگر دەکەوێت [٢]، قورئان و سوننەتیش بەڵگەیان هێناوە لەسەر تێپەڕ بوون بەسەر سیرات دا، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴾ مريم: ٧١). واتە: کەس نییە لە ئێوە نەڕوات و تێنەپەڕێت بەسەر دۆزەخدا(ئەو تێپەڕینە) بڕیارێکی بڕاوەیە لە پەروەردگارتەوە. هەروەها ئەفەرموێت: ﴿ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا

---

[١] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٢٥٧.

[٢] - شرح الطحاوية، ل: ٤٧٠، الاثار الواردة(١ / ٤٦٨).

﴿ وَنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾ مريم: ٧٢). واته: دواتر ئەوانـە رزگـار دەكـەن خوانـاس و پارێزكـار بوون و ستەم كاران بە چۆكا هاتوویی لەناو(دۆزەخ)دا دەهێڵینەوە.

پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئەفەرموێت:(سوێند بەو كەسەی كە گیانی منی بەدەستە ناچـێتە ئـاگرەوە كەسێك كە لە ژێر درەختەكەدا بەیعەتی دابێت، حەفصە ئەڵێ: وتم ئەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئـەی خوای گەورە نافەرموێت: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾ مريم: ٧٢).واته: دواتر ئەوانە رزگـار دەكـەن خوانـاس و پارێزكـار بـوون و سـتەم كـاران بـە چـۆكا هـاتوویی لـەناو(دۆزەخ)دا دەهێڵینەوە.

ئەویش فەرمووی: ئەی نەتبیستووە خوای گەورە ئەفـەرموێت: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾ مريم: ٧١). واته: كەس نییە لە ئێوە نەڕوات و تێنەپەڕێت بەسەر دۆزەخدا(ئەو تێپەڕینـە) بڕیارێكی براوەیە لە پەروەردگارتەوە.

لێرەدا ئاماژە بەوە دەكات كە چوون بەرەو ئاگر نابێتە هۆی چوونەناویەوە، هەروەك رزگار بوون لە شەڕ مەرج نیە پاش ڕوودانی بێت و باوەڕدارانیش بەسەر سیرات دا تێ پـەڕ دەبـن، بـەڵام خـوای گەورە پارێزكاران ڕزگار دەكات و ستەمكاران فڕێ دەداتە ناویەوە، لێرەدا ڕوونـی كردۆتـەوە كـە ورود بریتیە لە تێپەڕ بوون بەسەر سیراتدا [١].

لە ڕاستیشدا دوو جۆر تێپەڕ بوون بەسەر ئاگردا هەیە، تێپـەڕ بـوون و ورودی بـێ بـاوەڕان كـە تیایدا دەكەونە دۆزەخەوە ئەم ورودەش بەمانای چوونە ناو دێت وەك خوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ يَقْدُمُ قَوْمَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَأَوْرَدَهُمُ ٱلنَّارَ وَبِئْسَ ٱلْوِرْدُ ٱلْمَوْرُودُ ﴾ هـود: ٩٨). واتـە: لـەڕۆژی قیامەتیـشدا فیرعەون پێش قەوم و شوێنكەوتوانی دەكەوێت ئینجا دەیانباتـە نێوئـاگری دۆزەخ، ئـای چـەندخراپە ئەوچونەژوورەوەیە و ئەو شوێنەی كەدەچنە ناویەوە.

خراپترین چوونە ژوورەوەیە، ورودی دووەمیش: ورودی یەكتاپەرستانە كە بریتیە لـە تێپـەڕبونیان بەسەر سیراتدا [٢]، ئەمەش مەبەستی عومەری كوڕی عبدالعزیزە لەو ئاسەوارەی پێشوو.

---

[١] - شرح الطاوية، ل: ٤٧١.

[٢] - القيامة الكبرى للاشقر، ل: ٢٧٨.

٦- **بەهەشت و دۆزەخ:** جارێکیان عومەری کوڕی عبدالعزیز گریا و فاتیمەش گریا و خەڵکی ماڵەکەش گریان، کەسیان نەیاندەزانی ئەوی تریان بۆچی دەگری، کاتێ لێبوونەوە فاتیمە وتی: باوکم بە قوربانت بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، بۆچی گریایت؟ فەرمووی: یادی تێپەڕبوونی خەڵکی و ڕۆشتنیانم کەوتەوە لەبەردەم پەروەردگارەوە کۆمەڵێك بۆ بەهەشت و کۆمەڵێ بۆ دۆزەخ، پاشان هاواری کرد و لە هۆش خۆی چوو [1].

لە سوفیانەوە ئەڵێ: ڕۆژێکیان عومەری کوڕی عبدالعزیز بێ دەنگ بوو و هاوەڵانی قسەیان دەکرد و پێیان وت: ئەوە بۆ هیچ ناڵێی ئەی ئەمیری باوەڕداران؟ ئەویش فەرمووی: بیرم لە خەڵکی بەهەشت کردەوە چۆن سەردانی یەکتر دەکەن و خەڵکی دۆزەخ چۆن هاوار دەکەن تیایدا پاشان گریا [2].

هەروەها نامەی نووسی بۆ هەندێ لە سەربازانی:... بزانە کە هەژاری و بەلا و نەهامەتی دونیا هیچ زیانێکی نیە بۆ بەندەیەك کە بگات بە ڕەزامەندی خوا و بەهەشت، خۆشگوزەرانی و ڕابواردنیش هیچ سودێکی نیە بۆ بەندەیەك کە لە ڕۆژی دواییدا خوای لێی برەنجێ و بچێتە دۆزەخەوە، هەروەها خەڵکی بەهەشت هەست بە هیچ ناخۆشیەك ناکەن کە لە دونیادا تووشیان بووبێت و خەڵکی دۆزەخیش هەست بە هیچ خۆشیەك ناکەن کە لە دونیادا هەیان بوو بێت هەموو ئەو شتانە وەك نەبوو بێت وایە [3].

لە فەزلی کوڕی ڕەبیعەوە ئەڵێ: گوێم لە فضیل ی کوڕی عیاض بوو، ئەیوت: پێم گەشتووە کە کار بەدەستێکی عومەری کوڕی عبدالعزیز لای عومەر(ﷺ) سکالای کرد وە ئەویش بۆی نووسی: براکەم بیر لە درێژی شەونخونی خەڵکی دۆزەخ بکەرەوە لەگەڵ مانەوەی هەتا هەتاییان تیایدا، جا وریابە لە خوا دوور نەکەویتەوە و لە کۆتاییدا خۆت ڕەنجەڕۆ نەکەیت. کاتێ کابرا نامەکەی پێ گەیشت ناوچەکەی بە جێ هێشت و گەشتە لای عومەر(ﷺ) ئەویش پێی وت: بۆ هاتیت؟ وتی:

---

[1] - الرقة والبكاء، ل: ٧٦.

[2] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ١٥٤.

[3] - سيرة عمر، ل: ٢٥٠ — ٢٥١، الاثار الواردة(١ / ٤٧٣).

دڵت داخورپاندم به قسەکانت، هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ پۆستەکەم هەتاوەکو بە خزمەت پەروەردگارم دەگەم.[1]

بیرو باوەڕی عومەر عومەری کوڕی عبدالعزیز یش سەبارەت بە بەهەشت و دۆزەخ هاوشێوەی ئەوە بوو کە لە قورئان و سونەتدا هاتووە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴾ الانفطار: ١٣). واتە: بەڕاستی چاکان لەناو ناز و نیعمەت دان.

هەروەها خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ (٧٥) جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴾ طـه: ٧٥ - ٧٦). واتە: وە ئەو کەسەی بەباوەڕداری بگەڕێتەوە لای(خوای گەورە) بەڕاستی کردەوەی چاکیشی کردبێ ئائەوانە پلەوپایەی بەرزو بڵندیان هەیە. کە بەهەشتانی جێگای هەتا هەتایی یە ڕوبارەکان دەڕۆن بە ژێریاندا بێ بڕوانە دەمێننەوە تیێدا ئەوە پاداشتی کەسێکە خۆی پاك و خاوێن ڕابگرێ(لە کوفر و تاوان).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێت: " کاتێ یەکێك لە ئێوە دەمرێت شوێنی خۆی بە بەیانی و ئێوارە دەخرێتە پێش چاوی، ئەگەر بەهەشتی بێت شوێنی خۆی لە بەهەشت دا و ئەگەر دۆزەخیش بێت شوێنی خۆی لە دۆزەخ دا پیشان دەدرێت و ئەوترێت ئەمە شوێنی تۆیە هەتاوەکو خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا زیندووت دەکاتەوە "[2].

٧- **بینینی پەروەردگار لەلایەن باوەڕدارانەوە لە بەهەشت دا :** عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەی نووسی بۆ هەندێ لە ئەمیری سەربازەکان:... پاشان وەسیەتت بۆ دەکەم بە لە خوا ترسان و پابەندبوون بە فەرمانیەوە و ئەنجامدانی ئەوشتانەی کە فەرمانی پێکردووی و لە قورئاندا خستویەتیە ئەستۆت، چونکە بە هۆی پارێزگاری یەوە دۆستانی خوا لە تورەیی پەروەردگار ڕزگاریان دەبێت، هەر بە هۆی ئەوەشەوە ئەبن بە دۆستی پەروەردگار و هەر بە هۆی پارێزگاریەوە دەبنە شوێنکەوتووی پێغەمبەران و لە ڕۆژی دوایشیدا ڕوو سور دەبن و بە دیداری پەروەردگار شاد دەبن[3].

---

[1] - سيرة عمر، ل: ١٢٤ – ١٢٥ لابن الجوزي، الاثار الواردة(١ / ٤٧٤).

[2] - مسلم رقم(٢٨٦٦).

[3] - في الحلية و ابن الجوزي.

ئەمە بیروباوەڕی عومەری کوڕی عبدالعزیزە سەبارەت بە بینینی پەروەردگار کە گەورەترین نیعمەت و بەخششە دوای نیعمەتی کۆمەکی و ڕێنمایی کردن، خوای گەورەش لەوەسفی باوەڕداران دا لەو ڕۆژە دا ئەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ (٢٢) إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴾ القيامة: ٢٢ - ٢٣). واتە: زۆر ڕووخسار لەو ڕۆژەدا گەشاوەن. تەماشای پەروەردگاریان دەکەن.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿۞ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾یونس: ٢٦). واتە: بۆ ئەوانەی چاکەیان کردووە پاداشتی چاکتر(بەهەشت) و زیاتریان هەیە(کە بینینی خوایە)...

هەروەها لە صوهەیبەوە ئەڵێ: سەبارەت بەم ئایەتە: ﴿۞ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌ﴾یونس: ٢٦) پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد. فەرمووی:(کاتێ کە خەڵکی بەهەشت چوونە بەهەشت و دۆزەخیەکان چوونە دۆزەخەوە بانگەوازکەرێك بانگەوازدەکات لای خوای گەورە بەڵێنێکتان هەیە ئەیەوێت بۆتان جێ بەجێ بکات، وتیان: ئایا ڕووی سپی و تای ترازووی قورس و لە ئاگر ڕزگاری نەکردووین؟ پاشان پەردە لا دەدرێت و بە دیداری پەروەردگار شاد دەبن و هەرگیز هیچ شتێکیان پێ نەدراوە هێندەی بینینی پەروەردگار بەلایانەوە خۆش بێت [1].

## حەوتەم: پابەندبوون بە قورئان و سوننەت و ڕێبازی خەلیفەکانی ڕاشیدینەوە:

١- **پابەندبوون و شوێنکەوتنی قورئان و سوننەت:** کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز بووبە خەلیفە نووسی:... پاشان وەسیەتتان بۆ دەکەم بە تەقوای خوای گەورە و پابەندبوون بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) [2]، کەسیش هیچ فرمان و چەندوچوونێکی لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا دا(ﷺ) بۆنیە جگە لە جێبەجێ کردنی فرمان و داخوازیەکانی [3]، چونکە ئەوەی لە دەرونی من دایە بریتیە لە شوێنکەوتنی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خۆ دورگرتن لەوەی کە ئارەزو و مەیلی بۆی هەیە، هەر کەسێکیش بە غەیری قورئان و سوننەت کار بکات ئەوە سەروەری و شکۆمەندی بۆ نیە لە دونیا و دوا ڕۆژدا، با ئەو کەسانە باش بزانن کە ئەمەیان بۆ باس دەکرێت، سوێند بە خوا ئەگەر لە یەکەم هەناسەدا

---

[1] - الرد على الجهمية للدارمي، ل: ١٠٣، الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ٤٧٩).

[2] - مسلم ژمارە(٢٩٧).

[3] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٦٥، الكتاب الجامع لسيرة عمر(١ / ٢٨٤).

گیانم دەربچێت پێم خۆشترە لەوەی شوێن شتێکی تر بکەوێت جگە لە قورئان و سوننەت ی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، سوکترین کەسیش بەلای منەوە ئەو کەسەیە کە پێچەوانەی سوننەت بجولێتەوە [١].

عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەڵێت: خوای گەورە چەند فەرز و سوننەتێکی داناوە هەرکەس دەستیان پێوە بگرێت دەگات بە کارواندا هەر کەسێکیش وازیان لێ بێنت تیا دەچێت [٢]، هەروەها ئەڵێ: خۆزگە بە قورئانەکەی پەروەردگار کارم بکردایە لە ناو ئێوەدا و، هەرچەندە کارم بە سوننەتێك بکردایە ئەندامێکم لێ ببوایەتەوە هەروەها هەتاوەکو دواجار گیانم دەردەچوو [٣].

نامەیەکی نووسی بۆ خەواریج:... من بانگهێشتان دەکە بۆ قورئانەکەی پەروەردگار و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) [٤] هەروەها ئەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) و کار بەدەستان دوای ئەو چەند سوننەتێکیان داناوە، دەست پێوەگرتنی دەستگرتنە بە قورئانەوە و هێزێکە بۆ دینداری، بۆ کەس نیە بیگۆڕێت یاخود لە کارێك بڕاونێت کە پێچەوانەیەتی، هەر کەس شوێنی بکەوێت ڕێنماییکراوە و هەرکەس پشتی پێ ببەستێت سەرکەوتووە و هەرکەسیش دەست بەرداری ببێت و شوێن ڕێبازێکی تر بکەوێت جگە لە ڕێبازی موسڵمانان، خوای گەورە ئەیداتە دەست خۆی و دووچاری ئاگری دۆزەخی دەکات کە خراپترین چارەنووسە [٥].

ئەو ئاسەوارانەش پابەندی عومەر(ﷺ) بە قورئان و سوننەتەوە دوو پات دەکەنەوە و ماندوو بوون و هەوڵی پیشان دەدات لە جێبەجێ کردنیدا ئەگەر چی ببێتە هۆی بڕینی ئەندامەکانی لەش و دەرچوونی گیانیشی، ئەم بۆ چوونەی عومەریش بناغە و ئەسڵی ئاینە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾ النساء: ٦٥). واتە: نەخێر(وانی یە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن) سوێند بە پەروەردگارت بڕوا دارنین تاتۆ نەکەنە دادوەر لەهەر ئاژاوە و دووبەرەکی یەکی نێوانیان دا لە پاشان

---

[١] - سيرة عمر لابن عبدالحكيم، ل: ٧١، الاثار الواردة(٢ / ٦٠١).

[٢] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٣٩.

[٣] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٣٠، الاثار الواردة(٢ / ٦٠٢).

[٤] - الاثار الواردة(٢ / ٦٠٢).

[٥] - سيرة عمر لابن عبدالجكم، ل: ٤٠.

هەست نەكەن لە دەرونیاندا بە هیچ بێزاری یەك لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل كەچ نەكەن بە ملكەچی یەكی تەواو.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) یش ئەفەرموێت: " ئەی خەڵكینە دووشتم لە نێوانتاندا جێ هێشتووە ئەگەر دەستیان پێوە بگرن هەرگیز گومرا نابن ئەوانیش " قورئان و سونەتی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)"[1].

**٢- دەستگرتن بە ڕێچكەی خەلیفەكانی ڕاشیدینەوە:** لە حاجیی كوڕی خەلیفەی برجمیەوە ئەڵێ: عومەری كوڕی عبدالعزیزم بینیَ وتاری دەدا بۆ خەڵك لەكاتی خەلیفایەتی داو ئەیوت: ئاگادار بن ئەوەی كە پێغەمبەر و دوو هاوەڵەكەی پەیڕەویان كردوە ئاینە و پابەند دەبین پێوەی، بەلاَم ئەوەی كە لە غەیری ئەوانەوە هاتبێت ئەوە وەلای دەنێین [2].

نامەیەكیشی نووسی بۆ سالمی كوڕی عبدالله ی كوڕی عومەری كوڕی خەتتاب وتیایدا هاتبوو: لە عومەری كوڕی عبدالعزیزەوە بۆ سالمی كوڕی عبدالله پاشان:... من تووشی ئەم كارە كراوم و بوم بەسەر پەرشتیاری ئوممەت بە بێ ڕاوێژو وەرگرتنی ڕای خۆم و خوای گەورەش خۆی ئاگادارە، جا ئەگەر ئەم نامەیت بەدەست گەشت، ئەوە هەڵسوكەوت و مامەڵەی عومەری كوڕی خەتتابم بۆ بنووسە سەبارەت بە ئەهلی قیبلە و خەڵكی خاوەن پەیمان(ئەهلی ذیممە)، چونكە من ئەمەوێ شوێن پێی ئەو هەڵگرم ئەگەر هاوكارم هەبێت و والسلام [3].

لە عەونی كوڕی عبدالله وە ئەڵێ: عومەری كوڕی عبدالعزیز پێی وتم: ئایا عومەر و ئیبن عومەر لای تۆ دادگەرن وتم: بەڵێ، وتی: بەلاَم ئەوان بەم شێوە الله أكبر یان نەكردووە [4]، هەروەها لە ئەزهەریەوە ئەڵێ: پیاوێك بە عومەری كوڕی عبدالعزیزی وت: ژنەكەم لە كاتی سەرخۆشیدا تەلاَقدا، زوهری ئەڵێ: ڕای عومەری كوڕی عبدالعزیز وابوو كە جەڵدی لێبدات و جیای بكاتەوە لە ژنەكەی هەتاوەكو ئەبانی كوڕی عوسمان لە باوكییەوە بۆی گێڕایەوە: كە تەلاَقی شێت و سەرخۆش ناكەوێت عومەریش وتی: فەرمانم پێ دەكەن و ئەمەش لە عوسمانی كوڕی عەففانەوە شتم

---

[1] - موطأ مالك(٣ / ٩٣) والحاكم(١ / ٩٣).

[2] - الحلية(٥ / ٢٩٨) جامع العلوم و الحكم، ل: ٢٨٨.

[3] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ١٠٨.

[4] - مصنف عبدالرزاق(٢ / ٦٦) الاثار الواردة(٢ / ٦٦).

بۆ دەگێڕێتەوە؟ پاشان جەڵدی لێداو ژنەکەی بۆ گێڕایەوە [1]. هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاربەدەستانی دوای ئەو چەند سوننەتێکیان داناوە کە دەست پێوە گرتنی دەست گرتنە بە قورئانەوە و بەهێزیە لە ئاییندا کەس بۆی نی یە بیگۆڕێت یاخود بۆ پێچەوانکەی بڕوانێت پەیڕەوکاری ڕێنمایی کراوە و پشت پێ بەستون سەر خراوە هەر کەسێکیش وازی لێ بێنێت و شوێن ڕێبازێکی تر بکەوێت جگە لە ڕێبازی موسڵمانان خوای گەورە ئەیسپێرێت بە خۆی و دەیخاتە دۆزەخەوە کە خراپترین چارەنووسە [2].

بێ گومان عومەری کوڕی عبدالعزیز پابەند بووە بە سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خەلیفەکانی ڕاشیدین و توانی ڕوخسارەکانی خەلافەتی ڕاشدین بگێڕێتەوە و بە توندی دەستی گرت بە ڕێباز و کارەکانیانەوە و لە کێشەکاندا دەگەڕایەوە بۆ وتەکانیان و حوکمی پێ دەکرد و لە بواری پەرستش و مامەڵەدا ڕەچاوی دەکرد و گرنگی تایبەتیشی بە خەلیفەی یەکەم و دووەم واتە ئەبوبەکر و عومەر دەداو دەستگرتنی بە ڕێنماییەکانیانەوە بە بەشێك لە دەستگرتن بە سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەزانی. ڕێنماییەکانی خەلیفەی سێیەمی جێبەجێ دەکرد و لەسەر پەیڕەوی خەلیفەی چوارەمیش دەڕۆشت بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ خەواریجدا، ئەوە بوو گفتوگۆ و مشتومڕی لەگەڵدا کردن و نامەی بۆ نووسین، بەڵام کاتێ سەر کێشیان کرد جەنگی لە دژ ڕاگەیاندن و ژن و منداڵ و دیلەکانیشیانی بە پێی دادوەری خەلیفەی چوارەم عەلی کوڕی ئەبو تالیب(رضي الله عنه) دادوەری کردووە [3] تەنانەت عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە هەرکەسێك و لە سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خەلیفەکانی ڕاشدین دەربچێت ئەوە لە ڕێبازی موسڵمانان لایداوە لە کۆمەڵە تیاچووەکانە، هەر سوننەتێکیش خەلیفەکانی ڕاشدین پەیڕەویان کردبێت ئەوە بەشێکە لە سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، چونکە ئەوان بە فەرمانی ئەو ئەوکارانەیان کردووە، لە ئاینیشدا هیچ شتێك نابێت بە فەرز ئەگەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرزی نەکرد بێت و حەرام و مەندوب مەکروهـ موباحیش هەروایە، شوێنکەوتنی ڕێڕەوی خەلیفەکانی ڕاشدینش لە بواری عەقیدە و حوکمەکاندا ئەوەیە کە سەلەفی صالح لەسەری بووە و قورئان و سوننەتیش داوایان کردووە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَمَن

[1] - المصدر(٤ / ٣١)، الاثار الواردة(٢ / ٦٣٣).
[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٤٠.
[3] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٦٣٧).

يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴾ النساء: ١١٥). واته: وه هەركەسێك دژايەتی پێغەمبەر(ﷺ) بكات پـاش ئـەوەی كـە ڕێـازی ڕاستی بـۆ ڕوون بوويـەوە و شـوێنی ڕێگايـەكی تـر بكـەوێ بێجگـە لـە ڕێگـای بـڕواداران ڕووی وەردەگێڕين بۆ ئەو ڕێبازەی كە هەڵی بژاردووە و دەيخەينە دۆزەخەوە ئای چ پاشەڕۆژێكی خراپە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێت:(دەسـتبگرن بـە سـوننەتی مـن و سـوننەتی خەلـيفە ڕاشـيد و ڕێنماييكراوەكانەوە لە دوای من، توند دەستی پێوە بگرن و ورياى كارە داهێنراوەكانيش بن، چونكە هەموو داهێنراو و بيدعەيەك گومراييە)[1].

هەروەها لـە حوزەيفەوە ئـەڵێ: لای پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دانيـشتبووين فـەرمووی:(مـن نـازانم چەنێك لە نێوانتاندا دەمێنمەوە جا شوێن پێی ئەو دوانەی دوای مـن هـەڵگرن) و ئامـاژەی كـرد بـۆ ئەبوبەكر و عومەر[2].

٣- **دەستگرتن بەوەی كە سروشتی مرۆڤ پەسەندی دەكات:** لە جەعفەری كوڕی ڕقانـەوە، ئـەڵێ: كابرايەك هاتە لای عومەری كـوڕی عبـدالعزيز و پرسـياری دەربـارەی ئارەزوويـەك لێكـرد، ئەويش وتی: پابەند بە بە ئاينی منداڵ و خەڵكی دەشتەكيەوە و واز لە غەيری ئەوە بێنە[3].

لێرەدا عومەری كوڕی عبدالعزيز پێی وايە كە مرۆڤەكان لەسەر ئاينی ڕاست دروست كـراون و لادان لەوە كاتی و كتوپڕە و قورئانيش بۆ ئەمە ئاراستەی كردوين، خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿ فَأَقِمۡ وَجۡهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفٗاۚ فِطۡرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِي فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيۡهَاۚ لَا تَبۡدِيلَ لِخَلۡقِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴾ الروم: ٣٠). واته: كەواتـە ڕووی خـۆت ڕێـك بكـەرە ئـاينی ئيسلام پاك و ڕاست بۆ خوا(شوێن ئـاينی) داهێنـراوی خـوا بكـەوە كـە خـەڵكی لەسـەر دروسـت كردووە داهێنراوی خوا هيچ گۆڕانی بۆ نی يە ئەو(ئاينەی باسكرا) هەر ئەو ئايينی ڕێك و ڕاست...

---

[1] - سنن الترمذي(٥ / ٤٤) فەرمودەيەكی حسن و صحيح ـە.

[2] - سُنن الترمزی(٥ / ٦١٠) صحيح سنن الترمذي للالباني(٣ / ٢٠٠).

[3] - الطبقات(٥ / ٣٧٤) شرح اعتقاد اهل السنة ژمارە ٢٥٠.

پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئەفەرموێت: هیچ لە دایك بوویەك نیە لەسەر سروشتی پاك لەدایك نەبووبێت پاشان باوك و دایكی دەیكە نە جوویان گاوریان ئاگر پەرست، وەك چۆن ولآخ بەساغی لە دایك دەبێت ئایا هەست بە برانی لایەكی دەكەیت؟

پاشان ئەبو هورەیرە ئەڵێت: ﴿فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَٰلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ﴾[1]، كەواتە سروشتی پاك دان بە بوونی پەروەردگاری دا دەنێت و خۆشی دەوێت و ملكەچی و دڵسۆزی بۆ دەنوێنێت و هێزی پێویستی بۆ ئەو بوارە هەیە هەروەها دان بە شەرعیدا دەنێت و ئەم شەرعە پێش هەر شتێكی تر دەخات و شەرع دەناسێت بەگشتی و هەندێك لەوردە كاریەكانیشی دەزانێت.

پێغەمبەرانیش هاتوون هەتاوەكو یادیان بخەنەوە و ئاگاداریان بكەنەوە و زیاتر بۆیان ڕوون بكەنەوە و ئەو هۆكارانە یان پێ بناسێنێت كە پێچەوانەی سروشتە و ڕێگرە لەبەردەم شوێنكەوتن و گرتنەبەریدا [2].

## هەشتەم: هەڵوێستی بەرامبەر بەهاوەڵان و ناكۆكی نێوانیان:

لە عبدالرحمن ی كوڕی قاسمەوە لە باوكیەوە ئەڵێ: سەرسامم بە وتەیەی عومەری كوڕی عبدالعزیز(ﷺ) كە ئەڵێت: حەز ناكەم هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جیاواز نەبونایە، چونكە ئەگەر تەنها یەك ڕابوایە ئەوە خەڵكی تووشی تەنگاوی دەبوون، چونكە ئەوان پێشەوایانێكن كە چاویان لێ دەكرێت، ئەگەر هەر كەسەو ڕای یەكێكیان وەرگرێت ئەوە فراوانیە كە بۆی [3].

ئەبو عومەر ئەڵێ: ئەمە لەو شتانەدا كە ئیجتهادی تیادا دەكرێت [4]، هەروەها پرسیاریان لە عومەری كوڕێ عبدالعزیز كرد سەبارەت بە عەلی و عوسمان(ﷺ) و صفین و ئەوەی كە لە نێوانیاندا ڕووی داوە ئەویش وتی: ئەوە خوێنێكە خوای گەورە دەستی منی لێ پاراستووە منیش نامەوێ زمانمی تێ بخەم [5].

---

[1] - البخاري رقم(١٣٥٨).

[2] - شفاء العليل، ل ك ٦٢٩ — ٦٣٠.

[3] - جامع بيان العلم(٢ / ٩٠١ — ٩٠٢) الاثار الواردة(١ / ٤١٠).

[4] - الاثار الواردة(١ / ٤١٠).

[5] - الطبقات(٥ / ٣٩٤) الاثار الواردة(١ / ٤١٢).

لە محمدی کوڕی نضرەوە ئەڵێ: باسی ناکۆکی هاوەڵانی پێغەمبەریان کرد(ﷺ) لای عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەویش وتی: ئەوە مەسەلەیەکە خوا دەستی ئێوەی لێ دوورگرتووە بۆ زمانی خۆتانی تێ دەخەن [1]، هەروەها عومەر(رضي الله عنه) وەك زانایانی تری ئوممەت سوور بوو لەسەر خستنە ڕووی چاکەکانی هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، چۆن وانەبێت لە کاتێکدا کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾ الفتح: ١٨). واتە: سوێند بەخوا بێگومان خوا ڕازی بوو لەو ئیماندارانەی کە پەیمانیان پێ دایت لە ژێر درەختەکەدا(لە حودەیبیە) جا خوا ئاگادار بوو بەوەی لە دڵیاندایە بۆیە دڵنیایی و ئارامی بۆ ناردن وە پاداشتی دانەوە بەسەرکەوتنێکی نزیك(کە ئازاد کردنی خەیبەر بوو).

بیروباوەڕ ئەهلی سوننەتیش ئەوەیە، کە هیچ کام لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە باش ترین شێوە نەبێت باس نەکرێت و بێدەنگ بین لە بەرامبەر ناکۆکیەکانیاندا، چونکە ئەوان لە پێشترین کەسن کە گومانی باشیان پێ ببرێت وقسەی باشیان لە باوەرە بکرێت [2].

ئبن حەجەر ئەڵێت: ئەهلی سوننەت کۆدەنگن لەسەر پێویستی ڕێگرتن لە تانەدان لە هەریەکێك لە هاوەڵان بە هۆی ئەو ڕووداوانەوە کە لە نێوانیاندا ڕووی داوە ئەگەر چی بشزانین کامیان لەسەر هەق بووە، چونکە بەشداری کردنی ئەوان لەو جەنگ و کوشتارانە دا لە ئیجتیهادەوە بووە، سەلماویشە کە موجتەهید ئەگەر نەشی پێکا بێت پاداشتێکی هەیە، ئەگەر پێکا بێتیشی ئەوە دوو پاداشتی هەیە [3].

ناوەڕۆکی ئەو ئاسەوارانەش کە لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە بیروباوەڕی عومەر(رضي الله عنه) مان بۆ ڕوون دەکاتەوە دەربارەی هاوەڵان ئەمەش بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەتە.

---

[1] - الطبقات(٥ / ٣٨٢) الاثار الواردة(٥ / ٣٨٢).

[2] - الثمر الداني في تقريب المعاني شرح رسالة ابي زيد، ل: ٢٣.

[3] - فتح الباري(٣ / ٣٤١).

**نۆیەم: ئیبن قەییم ئەڵێ زانایان جیاوازیان هەیە دەربارەی مانای وشەی ئال و بەیت و چەند ڕایەکیان لەو بارەیەوە:**

وتەی یەکەم: چوار ڕای جیاواز هەیە سەبارەت بە ئال و بەیت: هەندێك ئەڵێن ئەوانەن کە زەکاتیان پێ ناشێت و سێ وتە لە بارەیانەوە هەیە:

١- بەنی هاشم و بەنو عبدالمطلبن.

٢- تەنها بەنی هاشمن.

٣- بەنی هاشم بەرەو ژوور هەتاوەکو غالب.

وتەی دووەم: ئال و بەیتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بریتین لە نەوە و هاوسەرەکانی بەتایبەتی.

وتەی سێ یەم: ئال و بەیتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی قیامەت.

وتەی چوارەم: ئال و بەیتی بریتین لە پیاوچاك و پارێزگای ئوممەتەکەی [1].

پاشان وتەی یەکەم بە بەهێزتر دەزانێت کە ئالو بەیتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەوانە دادەنێت کە زەکاتیان پێناشێت [2].

ئەمە و شیعە پێیان وایە کە ئالوبەیتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بریتین لە " علی و حسن و حسین و نەوەکانیان "(ﷺ)، ئەم وتەشیان پێچەوانەی دەقە ڕاستەکانە و نەزمان و نەعورف و نە دین پشگیری ناکات، چونکە وشەی ئەهلی بەیت لە قورئانی پیرۆزدا لە کاتی گوتاری بۆ هاوسەرەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دا هاتووە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ الصَّلَاةَ وَآتِينَ الزَّكَاةَ وَأَطِعْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴾ الأحزاب: ٣٣). واتە: وە لە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە وە زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخەن(لە ناو خەڵکی نامەحرەمدا) وەکو خۆ دەرخستنی ئافرەتانی سەردەمی نەفامی یەکەم(پێش ئیسلام) نوێژ بکەن و زەکات بدەن وە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی بکەن بەڕاستی خوا دەیەوێ ئەی ئال و بەتی(پێغەمبەر(ﷺ) هەر جۆرە پیسی و گوناهێك لە ئێوە دووربخاتەوە و پاك و خاوێنتان بکاتەوە بە تەواوی.

---

[1] - جلاء الافهام في الصلاة و السلام على خير الانام، ل: ١٠٩.

[2] - جلاء الافهام في الصلاة و السلام على خير الانام، ل: ١١٠ – ١١٩ الاثار الواردة(١ / ٤٥٨).

باسی ئەم ئایەتەشم کردووە و وەڵامی تێگەشتنی شیعەی ئیمامیم داوەتەوە لە کتێبەکەمدا سەبارەت ئە ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ابوتالیب، ئەمەو عومەری کوڕی عبدالعزیز مافە دارایی و مەعنەویەیەکانی ئال و بەیتی دەزانی و بە تەواوی بۆی جێبەجێ دەکردن، لە جوەیریەی کوڕی ئەسمائەوە ئەڵێ: گوێم لە فاتیمەی کچی عەلی کوڕی ئەبوتالیب بوو باسی عومەری کوڕی عبدالعزیزی دەکرد و ڕەحمەتی زۆری بۆ نارد وتی: چوومە لای لە کاتێکدا کە ئەمیری مەدینە بوو، ئەویش هەموو کەسەکانی دەوروبەر و پاسەوانەکانی کردە دەرەوە و تەنها خۆم و خۆی داینەوە، پاشان وتی: ئەی کچی عەلی سوێند بەخوا لەسەر زەویدا خانەوادەیەك نیە هێندەی ئێوە خۆشەویست بێت بەلامەوە بگرە ئێوە لە خانەوادەی خۆشم خۆشەویسترن بەلامەوە [1].

لە عبداللە ی کوڕێ محمدی کوڕی عەقیلی کوڕی ئەبوتالیبەوە ئەڵێ: یەکەم پارەیەك کە عومەری کوڕی عبدالعزیز دابەشی کرد پارەیەك بوو کە بۆ ئێمەی نارد وەك ئال و بەیت و پشکی ژنیشی وەك پیاو و منالێشی بەهەمان شێوە دانا بوو، ئەڵێ: سێ هەزار دیناری بۆ ناردبووین و بۆی نووسین: من ئەگەر بمێنم هەموو مافەکانتان بۆ دەگێڕمەوە [2].

لە حسینی کوڕی سالحەوە ئەڵێ: باسی زاهیدەکانیان کرد لای عومەری کوڕی عبدالعزیز، کۆمەڵێك ناوی فلان و کۆمەڵێك ناوی فیساریان برد، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش وتی: زاهیدترین کەس لەدونیادا عەلی کوڕی ابوتالیب بووە [3]، بەم شێوەیە عومەری کوڕی عبدالعزیز وەك خەڵکانی تری سەلەفی سالح مافی ئالوبەیتی دەدا وەك گوێڕایەڵیەك بۆ فەرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، فەرمووی:... خواتان بیردەخەمەوە لە ئال و بەیتمدا [4].

ئیبن تەیمیە ئەفەرموێت: یەکێك لە بنەماکان بەلای ئەهلی سوننەت و جەماعەتەوە ئەوەیە کە ئەوان ئال و بەیتیان خۆش دەوێ و بە گەورەیان دەزانن و وەسیەتی پێغەمبەریان(ﷺ) لە بارەوە دەپارێزن.

ئالوبەیتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەند مافێکیان هەیە کە دەبێ ڕەچاو بکرێت، بۆ نموونە خوای گەورە مافی پێداون لە(خمس) و پێنج یەك و فەیئ دا و فرمانی کردووە بە سەلاوات دان لەسەریان

[1] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٢٩).

[2] - الطبقات(٥ / ٣٨٨).

[3] - سيرة عمر، ل: ٢٩٢ لابن الجوزي.

[4] - مسلم ژمارە ٢٤٠٨.

لەگەڵ سەلاوات دان لەسەر پێغەمبەری خواش(ﷺ)[1]، ئەو مافانەش کە ئیبن تەیمیە باسی کردووە هەمان ئەو مافانەن کە عومەری کوڕی عبدالعزیز سور بوو لەسەر گەیاندن و جێبەجێ کردنی بۆیان بە پێی شەرع، ئەوەبوو فدکی گێڕایەوە بۆ خانەوادەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێنج یەکی پێنج یەکیشی پێدان و لە فەیئیش خۆراکی بۆ دابین دەکردن، و گرنگی دەدا بە مافەکانی ئال و بیەت لە ڕووی ماددی و مەعنەویەوە، بە هۆی سووربوونی لەسەر پابەندبوون بەوەی کە خوا فەرمانی پێکردووە و خۆلادان لەوەی کە نەهی لێکردووە و وەك خۆشەویستی بۆ شوێنکەوتنی سەلەفی سالح[2]، ئەوەش کە کتێبەکانی مێژوو باسی دەکەن کە والیەکانی بەنی ئومەیە پێش عومەری کوڕی عبدالعزیز قسەیان بە علی وتووە، لە ئاسەوارێك دا " أثر " کە ابن سعد ئەیگێڕێتەوە و ڕاست نیە ،ئیبن سەعد ئەڵێ: عەلی کوڕی محمد ئاگاداری کردینەوە لە لوطی کوڕی یەحیاوە ئەڵێ: والیەکانی بەنی ئومەییە پێش عومەری کوڕی عبدالعزیز قسەیان بە عەلی(ﷺ) دەوت، کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە کۆتایی بەو کارە هێنا، هەروەها کثیر عزەی خوزاعی ئەڵێ:

و لیت فلم تشتم علياً و لم تخف — بريا ولم تتبع مقاله مجرم

تـكلمت بــالحق المبين و انما — تبين آيات الهدى بالتكلم

فطّدقت مـعروف الذي قلت — بالذي فعلت فاضحى راضيا كل مسلم[3]

واتە: بویت خەلیفە و قەست بە عەلی نەوت و لە کەسیش نەترسایت و شوێن خراپەکاران نەکەوتیت، قسەی ڕاست و ڕەوانت دەکرد و ڕاستیش بەو شێوە ڕوون دەکرێتەوە، بەکردەوەش ڕاستی قسەکانت سەلماند و توانیت هەموو موسڵمانێك ڕازی بکەیت[4].

ئەم ئاسەوارەش لاواز و بێ بنەمایە، چونکە عەلی کوڕی محمد خەڵکی مەدائینە و لاوازە و مامۆستاکەشی لوطی کوڕی یەحیا هەر زۆر لاوازە و یەحیای کوڕی موعین لە بارەیەوە ئەڵێت: متمانە پێکراو نیە، ئەبوحاتە میش ئەڵێت: قسەی وەلادەنرێت و دارقطني ش ئەڵێت: هەواڵدەرێکی

---

[1] - الفتاوي(٣ / ٤٠٧).

[2] - الاثرا الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(١ / ٤٣٣).

[3] - الاثار الواردة عرن عمر بن عبدالعزيز العقيدة(١ / ٤٣٥).

[4] - سير اعلام النبلاء(٥ / ١٤٧).

لاوازە و ناوەندی(المیزان)یش دەربارەی ئەڵێ: هەواڵنێرێکی فەوتێنەرە متمانەی پێ ناکرێ، بە گشتی هەموو گێڕدراوەکانی لە خەڵکانی لاواز و نەناسراو و فەوتاوەوەیە [1].

دیارە شیعەش موعاویەیان تۆمەتبار کردوە بەوەی کە هانی خەڵکی داوە بۆ قسەوتن و نەفرەت کردن لە عەلی لەسەر مینبەری مزگەوتەکان ئەم قسەیەش هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە، بەلاّم ئەوەی کە پشتی مرۆڤ دەشکێنێت ئەوەیە کە لێکۆڵەران هەستاون بە بلاّو کردنەوەی ئەم درۆیە وێرای لاوازی بە بێ ئەوەی بیخەنە ژێر نەشتەری ڕەخنەَ وشی کردنەوە وە، بە جۆرێك کە لای خەڵکی ئەم سەردەمانەی دوایی بووە بەشێکی بەڵگە نەویست کە بواری قسە لەسەر کردنی نیە، لە کاتێکدا کە هەرگیز لە ڕێوایەتێکی ڕاست و صحیح دا نەسەلمێنراوە، چونکە نابێ پشت بەو شتانە ببەسترێت کە لە کتێبەکانی الدمیری و الیعقوبی و ابی الفرج ی اصفهانی دا هاتووە.

ئەمە لە کاتێکدایە کە مێژووی ڕاست پێچەوانەی قسەکانی ئەوان دوو پات دەکاتەوە [2]، موعاویە ڕێز و حورمەتی زۆری هەبووە بۆ ئالوبەیت و عەلی ئەمیری باوەڕداران و، چیرۆکی نەفرەت کردن لە عەلی(ﷺ) لەسەر مینبەرەکانی بەنی ئومەییە ناگونجێ لەگەڵ ڕەوتی ڕووداوەکان و سروشتی کەسە ناکۆکەکاندا، ئەگەر بشگەڕێینەوە بۆ ئەو کتێبە مێژوویانەی کە لەسەردەمی بەنی ئومەییەدا نووسراون ئەوە هەرگیز شتی لەو شێوەی تیادا بەدی ناکەین، بەڵکو ئەمە تەنها لە کتێبەکانی سەردەمانی دواتردا هەیە کاتێ کە مێژووی عەباسیەکانیان نووسیوە و مەبەستیان بووە ناوبانگی بەنی ئومەییە بشێوێنن لەلای ڕای گشتی موسڵمانان، بۆ نموونە کەسێکی وەکو مەسعودی لە مروج الذهب دا ئەمەی نووسیوە لەگەڵ چەند نووسەرێکی تری شیعەدا و ئەم درۆیەش دزەی کردۆتە ناو کتێبە مێژوویەکانی ئەهلی سوننەت و هیچ ڕیوایەتێکی ڕاستی لەسەر نیە، کەواتە ئەم قسەیە بە ڕاستی نەگێڕدراوەتەوە و سەنەدەکەش لە ڕەخنە بەدەر نیە و مەتنەکەشی قسەی لەسەرە.

ئەمەش لای کەسانی لێکۆڵەر ئاشکرایە و موعاویە زۆر دوورە لەم تۆمەتانەو چاکی و دینداری سەلمێنراوە و کەسێکی ڕەوشت جوان بووە و کەسانێك لە هاوەڵان و باشترینی شوێنکەوتوان و

---

[1] - المیزان(٣ / ٤١٩).

[2] - الحسن و الحسین، محمد رضا، ل: ١٨ کلام المحقق د. احمد ابو الشباب.

تابیعین و ستایشیان کردووه و گەواهی زانست و دینداریان بۆ داوه و دادگەری و لێبوردەیی و چەندین ڕەوشتی باشی تریان لێوه گێڕاوەتەوه [1].

زۆر مەحاڵیشه که کەسێك ئەمه ڕەوشتی بێت و لەسەر مینبەر خەڵکی هان بدات بۆ جنێودان بە عەلی(ﷺ)، هەر کەسێکیش ژیاننامەی موعاویه بخوێنێتەوه و شارەزای فەرمانڕەوایی و ئەو لێبوردەیی و سنگفراوانی و هەڵسوکەوتی باشی بێت لەگەڵ ژێر دەستەکانیدا بۆی دەردەکەوێت که گەورەترین درۆیه که بەدەمیەوه دەکرێت، چونکه مەعاویه لە لێبوردەییدا نموونەی پێ دەهێنرێتەوه [2]، ئێمەش بەشێوەیەکی فراوانتر لەو درۆیه دواوین لە کتێبی خامس الخلفاء الراشدین الحسن بن علی بن ابی طالب، که تیایدا پەیوەندی موعاویەمان بە کوڕای عەلی یەوه ڕوونکردۆتەوه دوای ئەوەی که خەلیفایەتی بۆ موعاویه یەکلابوویەوه و ئەو خۆشەویستی و ڕێز و دۆستایەتیەی کە لە نێوانیاندا هەبووه، هەروەك کۆمەڵگەش لەوسەردەمەدا بەگشتی پابەندبووه بە شەریعەتەوه و زۆر دوور بون لە تانه و نەفرەت کردن و قسەی ناشیرین و نابەجێ، پێغەمبەری خواش(ﷺ) نەهی کردوه لە قسه وتن بە مردووی موشریکەکان، جا ئەبێ حوکمی ئەو کەسه چۆن بێت کە قسه بە دۆستان ی خوا و پیاوچاکان دەڵێت: لە عائیشەوه بە – مەرفوعی – واته بەرز کراوەتەوه بۆ پێغەمبەرەکه فەرموویەتی: " قسه بە مردوو مەڵێن، چونکه ئەوان چونەته بەر دەست پەروەردگار" [3].

---

[1] - الانتصار للصحب و الآل، ل: ٣٦٧ للزحيلي.

[2] - خامس الخلفاء الراشدين الحسن بن على بن ابي طالب، ل: ٣٠٣.

[3] - البخاري رقم ٦٥١٦.

## یەکەم: خەواریج:

ئەم کۆمەڵە لەسەردەمی خەلافەتی عەلی کوڕی ئەو تالیب دا دەرکەوتن لە ساڵی ٣٧ ك دا دوای جەنگی صفین و قبوڵکردنی تحکیم و دادوەری دوو داوەرەکە، منیش بە کەمێك وردەکاریەوە باسی ئەم کۆمەڵەم کردووە لە کتێبەکەمدا سەبارەت بە ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو تالیب، لە گرنگترین بیروباوەڕەکانی ئەم کۆمەڵەیەش:

١- بەکافر دانانی عەلی کوڕی ئەبو تالیب(﵁) و عوسمانی کوڕی عەفان(﵁) هەردوو دادوەرەکە ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عاص.

٢- بەڕەوا زانینی دەرچوون و یاخیبوون لە پێشەوای ستەمکار.

٣- بەکافردانانی ئەوکەسەی کە تاوانی گەورە ئەنجام دەدات و هێشتنەوەی بە هەتا هەتایی لە دۆزەخ دا[1].

ئەم سێ بنەمایەش ناوەڕۆکی بیروباوەرە لای خەواریج، هیچ ناکۆکیەکیان لەم بارەیەوە نیە جگە لە ناکۆکیان سەبارەت بە جێبەجێ کردنی ئەم بنەمایە[2]، ئەبوحەسەنی ئەشعەری لە باسی ئەو بنەمایانەی کە خەواریج لەسەری کۆکن ئەڵێت: خەواریج کۆدەنگن لەسەر کافر کردنی عەلی کوڕی ئەبوتالیب(﵁)، بەڵام جیاوازیان لەوەدا هەیە کە کافر بوونەکەی شیرکە یان نا؟

هەروەها کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی کە هەموو گوناهێکی گەورە کوفرە جگە لە نەجدەکان کە رایان بەو جۆرە نیە[3]، هەروەها کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە بە بەردەوامی سزای ئەوکەسانە دەدات کە گوناهی گەورە دەکەن جگە لە نەجدەکان هاوەڵانی نەجدە[4].

مەقدیسی ئەڵێت: ئەسڵی مەزهەبەکەیان بریتیە لە کافرکردنی عەلی کوڕی ئەبوتالیب(﵁) و خۆبێ بەری کردن لە خوێنی عوسمان ی کوڕی عەففان و کافر کردنی خەڵك بەهۆی تاوانەوە و یاخیبوون و دەرچوون لە پێشەوای ستەمکار[5].

---

١ - وسطية اهل السنة بين الفرق، ل: ٢٩١.

٢ – وسطية أهل النسة بين الفرق، ل: ٢٩١.

٣ - نەجدەکان: شوێنکەوتوانی نەجدەی کوڕی عامری حەنەفین کە لە ساڵی ٦٩ کۆچی دا کوژرا، دەستەیەکن لە خەواریج.

٤ - المقالات(١ / ١٦٧ – ١٦٨)

٥ - البدء و التاريخ(٥ / ١٣٥) وسطية اهل السنة بين الفرق، ل: ٢٩٢.

خەواریجەکان بەردەوامبون لە جەنگیان دا لە دژی دەوڵەتی ئەمەوی و ماوەیەك چالاك دەبوون و زۆرجاریش دەوڵەت زاڵ دەبوو بەسەریاندا و بەهێز بێدەنگی دەکردن هەتاوەکو عومەری کوڕی عبدالعزیز هات و دەستی دایە گفتوگۆ و مشتومڕ لەگەڵیاندا و لەکاتی پێویستیدا هێزی لەگەڵ دابەکار دەهێنان، دیارە عومەر(رضي الله عنه) مشتومڕ و جەدەلی بێ ئەنجامی پێ باش نەبوو و بەباشی گفتوگۆی دەکرد و ئەیوت: هەرکەسێك ئاینی بکات بەبابەتی ناکۆکی ئەوە ئەمبەر و ئەوبەری زۆر دەکات[1].

هەروەها ئەڵێ: خۆتان لە دەمە دەمێ و مشتومڕی ناڕەوا بپارێزن، چونکە نزیکە لە ئاژاوە و حیکمەتیشی تیادا نیە[2]، دەشڵێت: سەرکەوتووە کەسێك کە خۆی بپارێزێت لە دەمەدەمێ و توورە بوون و تەماع[3]، هەروەها عومەر(رضي الله عنه) نەهی ئەکرد لە مشتومڕی نەزۆرك و بێ ئەنجام و هانی خەڵکی دەدا بۆ مشتومڕکردن بە باشترین شێوە و چەند هەڵوێستێکی دیار و وتەی بەناوبانگی هەیە لە بواری مامەڵە کردن لەگەڵ خەواریج و وەڵامدانەوە و بەتاڵکردنەوەی بەڵگە و گومانەکانیان و ڕوونکردنەوەی حەق و ڕاستی بۆیان، ئەمەش لە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا و شوێنکەوتنی سەلەفی سالحەوە سەرچاوەی گرتبوو(رضي الله عنه)[4].

١- **هەڵوێستی بەرامبەر بە دەرچوون و یاخیبوونی خەواریج لێی:** لە هیشامی کوڕی یەحیای غەسسانیەوە لە باوکیەوە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی بۆ نوسیبوو سەبارەت بە خەواریج کە تیایدا هاتبوو: ئەگەر ڕایان وایە کە ئازاد بن بەبێ ئەوەی بێ ئەدەبی بکەن بەرامبەر بە پێشەوایان و دەستدرێژی نەکەنەسەر ئەهلی زیمە و خاوەن پەیمانەکان و قسەبە کەس نەڵێن و ڕێ بە موسڵمانان نەگرن، ئەوە بۆ کوێ دەیانەوێ بابڕۆن، بەڵام ئەگە ویستیان کوشتاری موسڵمانان بکەن ئەوە سوێند بەخوا ئەگەر نۆبەرەی مناڵەکانم لە ڕیزی موسڵمانان دەرچن ئەوە خوێنیان دەڕژم لە پێناو ڕەزامەندی خوا و ڕۆژی دواییدا[5]

---

١ - ابن ابي الدنيا، كتاب، الصمت و آداب اللسان، ل: ١١٦ الطبقات(٥ / ٣٧١)

٢ - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٢٩٣، الحلية(٥ / ٣٢٥).

٣ - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٢٩١، الاثار الواردة(٢ / ٦٧١).

٤ - الاثار الواردة عن عمر في العقيدة(٢ / ٦٩٣).

٥ - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٧٥، سيرة لابن الجوزي، ٩٩ — ١٠٠.

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە: سوێند بەخوا ئەگەر ئێوە نۆبەرەی منالانی من بن و پشت هەڵکەن لەو خزمەتەی کە بەخەڵکمان کردووە ئەوە خوێنتان دەڕژم لە پێناو ڕەزامەندی خوا و ڕۆژی دواییدا، چونکە پەروەردگار ئەفەرموێت: ﴿ تِلْكَ ٱلدَّارُ ٱلْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ القصص: ٨٣). واتە: ئەو مالّی دوا ڕۆژە(بەهەشت) دەیدەین بەو کەسانەی نەبەرزی و خۆ بەزل زانی یان دەوێت لە زەوی دا نەدەست درێژی و خراپەکاری وە سەرئەنجامی چاك بۆ خۆپاریزانە.

جا ئەمە ئامۆژگاری منە ئەگە رحەزتان لە ئامۆژگاریە ئەگەر ئەشتانەوێ فێڵ بکەن ئەوە هەر لە کۆنەوە فێڵ لە ئامۆژگاریکەران کراوە و السلام علیکم و رحمة الله و برکاته [1].

لەم ئاسەوارانەی پێشووە وە ڕێبازی عومەری کوڕی عبدالعزیزمان بۆ دەردەکەوێت بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خەواریج دا، کە سەرباری دەرچوونیان لە دەسەلاتی دادپەروەرانەی ئەو نەیورژاندن بەلّکو نامەی بۆ نووسین و ئاگاداری کردنەوە لە دەرچوونیان لە ڕیزی کۆمەلّی موسلّمانان، چونکە خوای گەورە فەرمانی بەکۆبوونەوە و یەکگرتن کردووە و نەهی لە دوبەرەکی و ناکۆکی کردووە هەروەك داوای پابەندبوون بە کۆمەڵ و نەهی کردوە لە جیابوونەوە لێی و کۆ دەنگی ئەم ئومەتەش ی بەبەلّگە داناوە و ئەگەر کۆبوونەوە لە دەوری ئەمیرێك ئەوە گیرایەلّی پێویستە و جیابوونەوە لێی حەرامە مەگەر فرمان بە خراپە و تاوان بکات یاخود بەڕاشکاوانە بێ باوەڕی بنوێنێت [2].

ئەو ئاسەوارانەش کە لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتوون ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت ڕوون دەکەنەوە بۆ مامەڵەك کردن لەگەڵ خەورایج دا کە یەکەمینی ئەو گروپانەن کە سەریان هەڵداوە لە ئیسلام دا، ئەوەتا لەگەڵ دەرچوونیان لە دەسەلاتی عومەر بەودادگەری و سەر ڕاستیەشەوە ئەو نەیوروژاندن و هێرشی نەکردە سەریان، بەلّکو بە جۆرێك مامەلّەی لەگەڵ کردن کە دەرفەت و بواری گەڕانەوەیان بۆ حەق هەبێت و لەمەشدا پەیڕەوی لە ڕێبازی ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو تالیب کرد بۆ مامەلّە کردن لەگەڵ خەواریج دا کاتێ کە لێی یاخیبوون [3].

---

[1] - الاثار الواردة عن عنر بن عبدالعزیز(٢ / ٦٩٥).

[2] - هەمان سەرچاوە.

[3] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٦٩٦، ٦٩٧).

٢- **مشتومڕی لەگەڵ خەوڕا یجەکاندا:** هەڵوێستی عومەر بەگشتی بەرامبەر بە خەواریج لە ڕوانگەی ئەو باسەی پێشەوە ڕوون بوویەوە، لەم باسەشدا ئاماژە بە هەڵوێستی بەرامبەر بەوانە دەدەین کە نامەیان بۆ نووسی و نامەی بۆ نووسین و داوای گفتوگۆی ڕووبەڕووی لێکردن، ئەگەر ئامادەییان تیابێت، ئەوە بوو هەندێکیان ئامادەی خۆیان دەربڕی ئیبن عبدالحکم ئەڵێت: لە بەندەی خوا عومەر ئەمیری باوەڕدارانەوە بۆ ئەو دەستەیە، پاشان، من وەسیەتتان بۆ دەکەم بە تەقوای خوا، چونکە: ﴿ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴾ الطلاق: ٢ - ٣). واتە: ئینجا کە گەیشتنە کاتی خۆیان ئەوسا یان بیانهێڵنەوە بە باشی(بیان بەنەوە بۆ لای خۆتان پیاوانە) یان لێیان جیا ببنەوە بەباشی وە دوو شاهیدی دادپەروەر بگرن لە خۆتان کە لەبەر خوا ئەو شاهیدیە بدەن ئەوانە(باسکران پەندێکن) کە مۆچیاری ئەوانەی پێ دەکرێ کە باوەڕیان هەبێ بە خوا و ڕۆژی دوایی وە هەرکەسێ خواناس بێ خوا دەروی لێ دەکاتەوە. وە ڕزق و ڕۆزی دەدات لەلایەکەوە کە بەخەیاڵیدا نەهاتووە وە هەرکەسێ پشت بەخوا ببەستێ ئەوە خوای بەسە بەڕاستی خوا کار و فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێ بێگومان خوا بە هەموو شتێك ئەندازەیەکی دیاری کراوی داناوە.

پاشان نامەکەتانم پێ گەیشت کە بۆ یەحیای کوڕی یەحیا و سولەیمانی کوڕی داوودتان نوسیوە خوای پەروەردگاریش ئەفەرموێت: ﴿ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ وَهُوَ يُدْعَىٰ إِلَى الْإِسْلَامِ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴾ الصف: ٧). واتە: جا کێ لەو کەسە ستەمکارترە کە درۆ هەڵببەستێت بەدەم خواوە لە کاتێکدا کە بۆ ئیسلام بانگ دەکرێ وە خوا ڕێنموونی گەلی ستەم کار ناکات.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿ ادْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾ النحل: ١٢٥). واتە:(خەڵکی) بانگ بکە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بە لێزانی و دانایی و ئامۆژگاری چاك و شیرین وە لەگەڵیان بدوێ(موجادەلە

بکە) بدویێ بە چاکترین شێوە بێ گومان پەروەردگارت خۆی چاك دەزانێ بەوانەی گومڕا بوون و لایانداوە لە ڕێگاکەی وە هەر خۆشی زانایە بەوانەی لەسەر ڕێگای ڕاستن.

هەروەها ئەفەرمویێت: ﴿ فَلَا تَهِنُوا وَتَدْعُوا إِلَى السَّلْمِ وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ وَاللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَالَكُمْ ﴾ محمد: ٣٥). واتە: جا(باوەڕداران) لاواز و سست مەبن و داوای ئاشتی(و شەڕ وەستان) مەکەن، چونکە هەر ئێوە زاڵ و بەهێزنارن(یارمەتی) خواش لەگەڵ ئێوەدایە وە(پاداشتی) کردەوەکانتان کەم ناکاتەوە.

منیش بانگهێشتتان دەکەم بۆ ئیسلام و بەرپاکردنی نوێژ و زەکاتدان و فەرمانکردن بە چاوکەو ڕێ گریکردن لە خراپە انشاءالله و لاحول و لاقوە الا بالله، هەروەها داواتان لێ دەکەم کەواز بێنن لەوکارانەی کە پێشتر خوێنی پێ حەلاڵ کراوە بە بێ بەکارهێنانی هێز و سەرزەنشت کردن، یادی خوای پەروەردگاریشتان دەخەمەوە کە واز لە دروستکردنی گومان لە قورئان و سوننەت دا بێنن، چونکە ئێمە بۆ ئەو دووانە بانگێهشتتان دەکەین، ئەمە ئامۆژگاریەکە لەئێمەوە بۆ ئێوە جا ئەگەر قبوڵی بکەن ئەوە ئاواتی ئێمەیە ئەگەر ڕەتیشی بکەنەوە ئەوە هەر لە کۆنەوە فێڵ لە ئامۆژگاریکەران کراوە، ئەمەش هیچ شتێکی لەمافی پەروەردگار کەم نەکردۆتەوە، بەندەی چاکی خواش بە هۆزەکەی ئەڵێت: ﴿ وَأَنِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَاعًا حَسَنًا إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ ۖ وَإِن تَوَلَّوْا فَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴾ هود: ٣). واتە: هەروەها بۆ ئەوەی داوای لێبوردن بکەن لە پەروەردگارتان پاشان تۆبە بکەن و بگەڕێنەوە بۆلای دەتان ژێنێ بە ژیانێکی چاك و خۆش تاماوەی دیاری کراو(بۆتان) وە دەبەخشێ بە هەموو خاوەن چاکە و بەهرەیەك(پاداشتی) چاکە و بەهرەی خۆی وە ئەگەر ڕوو وەرگێڕن و سەر پێچی بکەن ئەوە بەڕاستی من مەترسی دەکەم یەخەتان بگرێ سوای ڕۆژێکی گەورە(کە ڕۆژی دواییە).

هەروەها ئەفەرمویێت: ﴿ قُلْ هَٰذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ ۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي ۖ وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴾ یوسف: ١٠٨)[1]. واتە: بلێ ئەمە ڕێگای منە بانگی(خەڵکی) دەکەم بۆلای خوا لەسەر بەڵگەی ڕوون من و ئەوانیش شوێنم کەوتوون و خواش پاك و بێ گەردە وە من هیچ کات لە هاوبەش ڕەوادەران نیم.

---

[1] - سیرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٧٩ – ٨٠ و سیرة عمر لابن الجوزي، ل: ٩٩، الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزیز(٢ / ٧٠).

هەروەها لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: عومەر نامەیەکی نووسی بۆ خەواریج، کاتێ خوێندیانەوە وتیان: دوو پیاو ئەنێرین لەگەڵیدا قسە بکەن، ئەگەر وەڵامی داینەوە ئەوە باشە، ئەگەر ڕازیش نەبوو ئەوە ئەیدەینە دەست خوا، ئەوە بوو خزمەتکارێکی بەنی شەیبانیان نارد بە ناوی عاصم لەگەڵ پیاوێکدا لەبەنی یە شکور لە خۆیان کاتێ چوونە لای وتیان: السلام علیکم و دانیشتن، عومەریش پێی وتن: پێم بڵێن چی وا لە ئێمە یاخی کردون؟ لەچی توڕەن؟

عاصمیش کە حەبەشیەك بوو وتی: ئێمە نارازی نین لە هەوڵەکانی تۆ بۆ چەسپاندنی دادگەری و چاکە کردن، بەڵام ئەمانەوێ بزانین چۆن ئەم کارەت گرتە دەست بە ڕەزامەندی موسڵمانان یان بە زۆر و خۆسەپاندن؟

وتی: من داوای بوون بە خەلیفەم لێ نەکردوون و زۆریشم لێ نەکردوون، پیاوێك منی دەستنیشان کردووە کە هەرگیز بە نهێنی یان بە ئاشکرا داوای ئەو کارەم لێ نەکردووە منیش ئەك کارەم لە ئەستۆ گرت و کەسیش نارازی نەبوو پێی جگە لە ئێوە، ئێستاش ئێوە ڕەزامەندی هەموو کەسێکی بە ویژدان دەبینن، جا ئێوەش وەك ئەو پیاوە بڕیار بدەن ئەگەر لە حەق لام دابوو ئەوە گوێڕایەڵیم لەسەرتان پێویست نیە، ئەوانیش وتیان: لە نێوان ئێمە و تۆدا مەسەلەیەك هەیە ئەگەر پێمانی ببەخشیت ئەوە لە ئێمە و ئێمەش لە تۆین ئەگەر لێشمانی قەدەغە بکەیت ئەوە لە ئێمە نیت و ئێمەش لە تۆنین، عومەریش وتی: چیە؟ وتیان:

ئێمە ئەزانین کە تۆ پێچەوانەی بنەماڵەکەت ڕەفتارت کردووە و ڕێبازی ئەوانت نەگرتۆتە بەر و کارەکانی ئەوانت بەستەم ناو بردووە، جا ئەگەر ئەڵێی تۆ لەسەر حەقیت و ئەوان گومڕان ئەوە بێبەری بوونی خۆت ڕابگەینە و نەفرەتیان لێ بکە، چونکە تەنها ئەمە دەتوانێ ئێمە و تۆ پێکەوە کۆ یان جیابکاتەوە، ئەڵێ: عومەریش لەم کاتەدا هاتە هاتە گۆ و وتی:

من ئەمزانی یان وا گومانم دەبرد کە ئێوە لەبەر دنیا لە ئێمە یاخی نەبوون، بەڵکو ئێوە مەبەستتان ڕۆژی دواییە، بەڵام ڕێگەکەیتان لێ ونبووە، منیش پرسیاری شتێکتان لێ دەکەم جا سوێندتان دەدەم بە خوا کە بەڕاستی وەڵامم بدەنەوە تا ئەو ڕادەیەی کەدەیزانن، وتیان:

باشە وتی: باشە ئەبو بەکر و عومەر بە پێشینان و پێشەوایانی خۆتان نازانن و گەواهی بەهەشتیان بۆ نادەن؟ وتیان: بەڵێ، وتی: ئەی ئەزانن کە عەرەب کاتێ کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد هەڵگەڕانەوە و ئەبوبەکریش کوشتاری کردن و ماڵ و منالی بەدیل گرتن؟ وتیان: بەڵێ وا بوو،

وتی: باشه ئایا ئەبوبەکر خۆی بێ بەری، کرد لە عومەر یان بە پێچەوانەوە؟ وتیان: نەخێر، وتی: ئایا ئێوە خۆتان بێ بەری دەکەن لە ئەبوبەکر و عومەر(ﷺ) وتیان: نەء؟ وتی: باشە ئەی خەڵکی نەهرەوان لە پێشینانی ئێوەنین و شاهیدی ڕزگار بوونیان بۆ نادەن؟

وتیان: بەڵێ، وتی: ئەی ئەزانن کە کاتێ خەڵکی کوفە چوونە دەرەوە بۆیان دەستیان هەڵگرت و خوێنیان نەرشت و ماڵ و موڵکیان نەبردن؟ وتیان: بەڵێ وابوو، وتی: ئەی ئەزانن کە خەڵکی بەسرە کاتێ چوونە دەرەوە بۆیان لەگەڵ عبداللە ی کوڕی وەهبی ڕاسبی دا [1] و خۆیان نیشاند و کوشتنیان و تووشی عبداللە ی کوڕی خەبباب [2] ی هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون و کوشتیان بە خۆی و کەنیزەکەیەوە پاشان چوونەسەر تیرەیەکی عەرەب و ژن و پیاو منداڵانیان کوشتن تەنانەت منداڵیان دەخستە ناو مەنجەڵەوە و تیایدا دەکوڵێنران وتیان: بەڵێ وابوو، وتی: ئایا ئەهلی کوفە خۆیان بێبەری کرد لە ئەهلی بەسرەیان بە پێچەوانەوە؟ وتیان: نەخێر، وتی: ئەی ئێوە خۆتان بێ بەری دەکەن لە هیچ لایەکیان وتیان: نەء

وتی: باشە ئایا چەند لایان لەسەر حەق بوون؟ وتیان: یەك، وتی: ئەی باشە شتێك هەیە بۆ ئێوە دروست بێت بۆمن دروست نەبێت؟ وتیان: نەخێر، وتی: ئەی چۆن ئێوە ئەبوبەکر و عومەر بە پێشەوای خۆتان دەزانن و ئەوانیش یەکتریان قبوڵ بووە لە کاتێکدا کە هەڵسوکەوت و بۆ چوونیشیان جیاواز بووە؟ یان چۆن دروستە خەڵکی کوفە خەڵکی بەسرە بەڕاست بزانن و خەڵکی بەسرەش خەڵکی کوفە بەڕاست بزانن لە کاتێکدا کەلە گەورەترین مەسەلەدا جیاواز بون. لە خوێن و داوێن و پارەدا، بەلاّم بۆ من هیچ شتێك دروست نیە جگە لە نەفرەت کردن لە بنەماڵەکەم، چونکە ئەگەر نەفرەت کردن لە گوناهکاران فەرز بێت ئەوە پێم بڵێن ئێوە کەی نەفرەتتان لە فیرعەون هامان کردووە؟

وتیان: نازانین کەی نەفرەتمان لێ کردووە. وتی: قوڕ بەسەرینە ئێوە بۆتان هەیە واز لە نەفرەت کردن لە فیرعەوت بێنن، بەلاّم من هیچ چارێکم لەبەردەمدا نیە جگە لە نەفرەت کردن لە بنەماڵەکەم و ڕاگەیاندنی بێ بەری بوونی خۆم لێیان؟

---

[1] - الاثار الواردة(٢ / ٧٠٣)

[2] - هەمان سەرچاوە.

ئێوە بەڕاستی کۆمەڵێکی نەزانن، ڕێگەی هەڵەتان گرتۆتەبەر بۆ ئامانجەکانتان، ئێوە شتێك لە خەڵکی قبوڵ دەکەن کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕەتی کردۆتەوە و شتێکیش ڕەت دەکەنەوە کە ئەو قبوڵی کردووە، هەروەها کەسێك لای ئێوە دەترسێ کەلای ئەو نەترساوە و کەسێکیش لای ئێوە دڵنیا دەبێ کەلای ئەو ترساوە، وتیان: ئێمە وانین، وتی: ئێستا دانتان بەوەدانا، ئایا ئەزانن کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناردی بۆلای بت پەرستان و داوای وازهێنانی لە بت پەرستی لێکردن و شایەتی " لااله الا الله محمد رسول الله " بدەن.

جا هەرکەس ئەوەی کرد ئەوە خوێنی پارێزراوە و دڵنیا دەبێت لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرکەیش ڕازی نەبوایە جیهادی لە دژ ڕادەگەیاند؟ وتیان: بەڵێ وتی: ئایا ئێوەئەمڕۆ خۆتان بە بێ بەری نازانن لەو کەسانەی کە بت پەرست نین و شایەتی " لااله الا الله محمد رسول الله " دەدەن ونەفرەتیان لێدەکەن دەیانکوژن و خوێنیان بە حەڵاڵ دەزانن؟

بەڵام چاوتان بەخەڵکانی ئاینەکانی تر دەکەوێت وەك گاور و جولەکە و پەنایان دەدەن ولاتان دڵنیا لە گیان وماڵیان؟ حەبەشیش وتی: هەرگیز بەڵگەی لەمە ڕونتر و جوانترم نەبینیوە، من وەك خۆم شایەتی ئەدەم کە تۆ لەسەر حەقیت و بێبەری بوونی خۆم ڕادەگەیەنم لە هەر کەسێك کە پێچەوانەی تۆ بێت عومەریش(ﷺ) وتی: بەشەیبانی: ئەی تۆ چی ئەڵێیت؟ وتی: قسەکانت زۆر جوان و تەواو بوون، بەڵام پێم خۆش نیە بەجیا لە موسڵمانان بڕیارێك بدەم کە نازانم بەڵگەیان چیە لەسەری هەتاوەکو بگەڕێمەوە لایان، چونکە لەوانەیە بەڵگەیەکیان هەبێت و من نەیزانم.

عومەریش وتی: خۆت دەزانی، ئەڵێ: پاشان فەرمانی دا کە پشکی حەبەشی لە بەیتولمال بدەن و پاشان پازدە شەولای مایەوە و کۆچی دوایی کرد، شەیبانیش چووەوە بۆ ناو خەواریج لەگەڵیاندا کوژرا.

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە، دوو پیاو لە خەواریج هاتنە لای عومەری کوڕی عبدالعزیز و وتیان: سڵاوت لێ بێت ئەی مرۆڤ، ئەویش وتی: سڵاو لە ئێوەش ئەی دوو مرۆڤە کە، وتیان: گوێڕایەڵی پەروەردگار باشترین شتێکە کە شوێنی بکەویت.

وتی: هەرکەس ئەوە نەزانێت گومڕایە، وتیان: نابێ پارە تەنها بە دەست دەوڵەمەندەکانەوە بێت. وتی: یەڵێ حەرامکراوە، وتیان: سامانی خوادەبێ بدرێ بەوکەسانەی کە شیاوینی، وتی: خوای گەورە لە قورئاندا ئەوەی ڕوونکردۆتەوە، وتیان: دەبێ نوێژ لەکاتی خۆیدا بکرێت، وتی: ئەوە مافی

نوێژه و حەقی خۆیەتی، وتیان: دەبێ ڕیزەکان ڕێك بخرێن لە نوێژدا، وتی: ئەوە سوننەتێکی تەواوە، وتیان: ئێمە بۆلای تۆنێردراوین.

وتی: بلێن و مەترسن، وتیان: ڕاست بەلەگەڵ خەڵکیدا، وتی: خوای گەورە پێش ئێوە فەرمانی پێکردوە، وتیان: حوکم تەنها بۆ خوایە، وتی: ئەوە قسەیەکی ڕاستە ئەگەر مەبەستەکەی ئێوە ناڕاست نەبێت، وتیان: کەسانی ئەمین و پاك بەکاربێنە، وتی: ئەوانە هاوکارانی منن وتیان: ئاگات لە خیانەت بێت، وتی: دز متمانەی پێ ناکرێت، وتیان: ئەی گۆشتی بەراز و مەی؟ وتی: ئەوە شیاوی هاوەڵگەرانە وتیان: هەرکەس موسڵمان بوو ئەوە دەبێ دڵنیا بێت لە خۆی، وتی: بە هۆی ئیسلامەوە دڵنیاین لە خۆمان، وتیان: باشەی ئەی ئەوانەی کە پێغەمبەر پەیمانی پێداون؟ وتی: پەیمانەکەیان دەپارێزین، وتیان: لە توانای خۆیان زیاتر داوایان لێمەکە، وتی: ﴿ لاَ يُكَلِّفُ اللّٰهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا... ﴾ سورة البقرة، آية(٢٨٦).

واتە: خوا داوا لە هیچ کەسێك ناکات مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی...

وتیان: قورئانمان یادبخەرەوە، وتی: ﴿ وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ﴾البقرة: ٢٨١). واتە: وە بترسن لە ڕۆژێك دەگەڕێنرێتەوە بۆ لای خوا...

وتیان: بەولاخی پۆستەدا بمان نێرەوە، وتی: نەخێر ئەوە موڵکی خوایە بۆ ئێوە دروست نیە، وتیان: دەی پارەمان پێ نیە، وتی: کەواتە ئێوە ابن سبیل و ڕێبوارن و خەرجیتان لەسەر منە [1].

هەروەها لە أطأرة ی کوڕی منذرەوە ئەڵێ: گوێم لە ئەبو عەون بوو ئەیوت: خەڵکێك لە حەروریەکان – خەواریج – هاتنە خزمەت عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) و هەندێ شتیان بیرخستەوە، هەندێ لە ئامادە بوانیش پێیان باش بوو کە بیانترسێنێ و ڕوویان لەگەڵدا بگۆڕێت، بەلام عومەر هەر بەنەرمی لەگەڵیاندا ڕۆشت هەتاوەکو توانی کە کێشیان بکات و لێی ڕازی بن و ئەویش پۆشاك و پارەی پێدان، کاتێ چوونە دەرەوە عومەر کێشای بەڕانی کابرایەکدا کەلە تەنیشتیدا بوو وتی: ئەگەر توانیت دەرمانێك بۆ هاوڕێکەت پەیدا بکەیت کە بە بێ داخ کردن پێی چاك دەبوویەوە ئەوە هەرگیز داخی نەکەیت [2]؟

---

[1] - أنساب الاشراف(٨ / ٢١١ – ٢١٥) الاثار الواردة(٢ / ٧٠٤)

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٤٧، الاثار الواردة(٢ / ٦٧٧).

لە ڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە: کاتێك کە شوزب کە ناوی بستام بوو لە تیرەی بەنی یەشکور لە عبدالحمیدی کوڕی عبدالرحمن لە عێراق دا یاخی بوو لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا و چووە ناوچەی جوخی [1]، بە هەشتا سوارەوە کە زۆربەیان لە هۆزی ڕەبیعە بون، عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ عبدالحمید کە مەیانوروژێنە مەگەر خوێنێك بڕژن یان خراپەکاریەك ئەنجام بدەن، ئەگەر شتێکی وایان کرد ئەوە لێیان بدە، کەسێکی توند و بەهێزیش بە چەند سەربازێکەوە بنێرە بۆیان و ئەوەی کە پێم وتی پێی بڵێ، عبدالحمیدیش لیوای دایە دەست محمدی کوڕی جەریری کوڕی عبدالله ی بەجلی بە دوو هەزار کەسەوە لە خەڵکی کوفە و قسەکانی عومەری پێ ڕاگەیاند.

عومەر نامەیەکی نووسی بۆ بەستام و بانگهێشتی کردوو داوای هۆی دەرچوونی لێکرد، ئەوە بوو نامەکەی عومەری بە دەست گەشت لەوکاتەشدا محمدی کوڕی جریر بەرامبەری خێوەتی هەڵدا بوو، بەڵام بە هیچ جۆرێك نەیدەو ڕوژاند، لە نامەکەی عومەریشدا هاتبوو: بیستوومە کە تۆ لە بەرخاتری خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) چویتەتە دەرو تۆش لەو مەسەلەیەدا لە من لە پێشتر نیت جا وەرە با گفتوگۆ بکەین، ئەگەر ئێمە لەسەر حەق بووین ئەوە تۆش وەك خەڵکی گوێڕایەڵیمان دەکەیت و ئەگەر حەقیش لای تۆ بوو گوێت بۆ ئەگرین، ئەوە بوو بە سطام لە شوێنی خۆی نەجولا، بەڵام نامەیەکی نووسی بۆ عومەر(رضي الله عنه) و وتی: بڕیارێکی دادگەرانەت داوە، منیش دووپیاوم بۆ ناردویت گفتوگۆت لەگەڵدا بکەن، ئەبو عوبەیدە: معمری کوڕی مثنی، ئەڵێ: ئەو دووپیاوە کە شوذب ناردنی بۆلای عومەر مەخدوجی خزمەتکاری بەنی شیبان و یەکێکیشیان لە بەنی یەشکور بوو، ئەڵێ: چەند کەسێکی نارد کە ئەم دووانەشیان تیا بوو، عومەریش هەواڵی نارد، کە دوو کەس هەڵبژێرن، ئەوانیش هەڵیان بژاردن و هاتنە لای عومەر و کەوتنە گفتوگۆ و وتیان: باسی یەزیدمان بۆ بکە بۆ داتناوە بە خەلیفە دوای خۆت؟

وتی: کەسێکی تر دایناوە، وتیان: باشە ئەگەر پارەیەکت بدرێتە دەست و تۆش بیدەیت بە کەسێکی ناپاك، ئایا ئەمانەتت پاراستووە [2]؟

---

[1] - جوخي: ڕوبارێکە لەبەری ڕۆژهەڵاتی بەغدا.

[2] - تاريخ الطبري(٧ / ٧٦٠).

هەندێ ڕیوایەتیش وەك خەملاندنێك ئەڵێن: کوڕانی مەڕوان لەوە دەترسان کە عومەر ئەو شتانەیان لێ بسێنێت کە بەدەستیانەوە یە و ڕێگری لە بەخەلیفە بوونی یەزیدی کوڕی عەبدولمەلیکیش بکات لە دوای خۆی و ئەو کارە هەڵبوەشێنێتەوە، بۆیە کەسێکیان نارد کە ژەهری پێ بدات و پێش ئەوەی وەڵامی ئەوانە بداتەوە گیانی لە دەست دا [1].

لەم ئاسەوارانەی پێشەوەوە دەردەکەوێت کە عومەری کوڕی عبدالعزیز هەمان ڕێبازی سەلەفی صالحی پیڕەوکردنی لەگەڵیاندا هاوشێوەی ئیبن عەباس و ئەمیری باوەڕداران عەلی(ﷺ)، دیارە عومەر(ﷺ) ئومێدی بە گەڕانەوەی ئەو خەواریجانە هەبوو بۆیە هەموو گومانەکانی وەڵامدانەوە و نادروستی بەڵگەکانیانی سەلماند [2]، بەڵام بۆ ئەو حەقەی کە پێیان بوو ڕوبەڕوویان نەوەستا بەڵکو داوای مۆڵەتی لێکردن، بەڵام پێش ئەوەی وەڵامیان بداتەوە گیانی سپارد، کاتێ خەواریجی عێراقیش هێزیان بەرامبەر عبدالحمیدی کاربەدەستی عومەر بەکار هێنا و توانیان سوپاکەی والی تێك بشکێنن عومەر دەست بەجێ مەسلەمەی کوڕی عبدالملکی بە سوپایەکەوە لە خەڵکی شام نارد و نامەیەکیشی نارد بۆ عبدالحمید: کە ئاگادارم سوپاکەت – سوپای خراپە – چی بە سەرهاتووە، منیش مەسلەمەی کوڕی عبدالملك م ناردووە تۆش ئاسانکاری بۆ بکە.

ئەوە بوو مەسلەمە پێشڕەوی بە سوپاکەی کرد و چووە بەرامبەر لەشکری خەواریج و شەڕ لە نێوانیاندا دەستی پێ کرد و سوپای خەلیفە سەرکەوت [3].

بێگومان ناچار بوونی عومەر بۆ بەکارهێنانی هێز دژ بە کۆمەڵێك لە خەواریج وای لێ نەکرد کە توندوتیژی بەرامبەر بە هەموویان بە کاربێنێت، چونکە هەتاوەکو بەرامبەر ئامادەبێت بۆ گفتوگۆ ئەوە پێویست بە خوێن ڕشتن ناکات [4].

٣- **ئەو هۆیەی کە کوشتاری خەواریجی لێ کەوتەوە:** عومەری کوڕی عبدالعزیز فەرمانی نەکرد بە کوشتاری خەواریج کاتێ کە جیاوازی بیروڕایان لەگەڵیدا سەری هەڵدا یاخود کاتێ کە بوونە نەیاری وقسەیان پێ وت، بەڵکو دانی بە خۆدا گرت بە ئومێدی ئەوەی کە خوای

---

[1] - هتمان سترضاوة(٧ / ٤٦٠ ) ملامح الانقلاب الاسلامي، ل: ٩٤.

[2] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز العقيدة(٢ / ٧١١).

[3] - الطبقات(٥ / ٣٥٨) ملامح الانقلاب الاسلامي، ل: ٩٤.

[4] - ملامح الانقلاب الاسلامي، ل: ٩٤.

گەورە هیدایەتیان بدات، بەڵام کاتێ گەشتنە قۆناغێکی ترسناك کە ئەویش بردنی ماڵ و موڵك و هەڵکوتانەسەر موسڵمانان و چەتەگەری و خوێن ڕشتن بوو، فەرمانی کوشتار کرنی دەرکردن.

٤- **گێڕانەوەی کەلوپەلەکانی خەواریج بۆ کەسوکاریان:** عومەری کوڕی عبدالعزیز قسەی بە ژن و منداڵی خەواریج نەوت و سەر و ماڵیانی حەڵاڵ نەکرد، بەڵکو فەرمانی کرد بە گێڕانەوەی ماڵ و موڵکیان بۆیان، ئەوە بوو فەرمانی دا بە کارا بەدەستەکەی: کە ئەگەر خوای گەروە سەری خستی بەسەریاندا ئەوە کەلوپەل و ماڵیان بگێڕەرەوە بۆ کەس و کاریان، ئەمەش ڕای عەلی کوڕی ئەبو تالیبە دەربارە یان کە نابێ ژن و منداڵیان ببرێت و بەدیل بگیرێت یان ماڵیان بە حەڵاڵ بزانرێت [١].

٥- **بەندانی کردنی دیلەکانی خەواریج هەتاوەکو پاشگەز دەبنەوە:** دوای ئەوەی کوشتاری کردن و هەندێکی لێ کوشتن و کۆمەڵێکشیی بە دیل گرت فەرمانی دابە زیندانی کردنیان هەتاوەکو واز لە و بیروبۆ چوونە هەڵانەیان دەهێنن [٢]. کاتێ عومەریش کۆچی دوایی کرد هێشتا ژمارەیەکیان بەندکرا بوون [٣]، ئەمە ڕێبازی عومەری کوڕی عبدالعزیزە بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ خەواریجە نەیارەکانیدا.

## دووەم: شیعە:

لە ئیصلاح و زاراوەدا بە هەرکەسێك دەوترێت کە عەلی بەلاوە باشتر بێت لە خەلیفەکانی ڕاشیدینی پێش خۆی و پێی وا بێت کە ئالوبەیتی ئەو شیاوترن بۆ خەلیفایەتی [٤]. سەبارەت بە ئەمیری ئاوەڕداران عەلی(ﷺ) بە دوور و درێژی لەسەر شیعە دواوم، کە چەند گرویێکن: هەندێکیان توندڕەون و لە ئیسلام دەرچوون.

هەندێکیشیان هێندە توندڕەونین و لە گرنگترین کۆمەڵەکانیشیان کەیسانیەو سەبە ئیە و ئیمامیەو هتد. عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) چەند و تەیەکی هەیە دەربارەی شیعەی توندڕەو و لە

---

[١] - فقه عمر بن عبدالعزیز(٢ / ٤٧١) د. محمد شقیر.

[٢] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٧٣)

[٣] - الطبقات(٥ / ٥ / ٣٥٨ – ٣٥٩) فقه عمر بن عبدالعزیز(٢ / ٤٧٣).

[٤] - مقالات الاسلامیین، ل: ٦٥، الاثار الواردة(٢ / ٧٢٧).

بارەیانەوە ئەڵێ: من چاکی بەنی هاشم و خراپی ئەوان دەزانم کە کُثَیر یـان خـۆش دەوێـت [1]. جـا هەرکەس ئەوی خۆش بوێت ئوە خراپەکارە، هەرکەسیش رِقی لێی بێت ئەوە چاکەکارە، چونکە ئـەو باوەڕی بە گەڕانەوەی گیان بۆ جەستەی کەسـێکی تـر هەیـە لـە دونیـادا [2]، هـەروەها نامەیـەك لـە کاربەدەستی عومەرەوە لە کوفە بە دەستی عومەر(ﷺ) گەشت کە تیایدا ئاگاداری ئەکردەوە لەسەر پێچی کردنی خەڵکەکەی عومەریش لە وەڵامیدا وتی: داوای گوێڕایەڵی کەسانێك مەکە کـە پـشتی عەلیان بەردا لە کاتێکدا کە ئەو پێشەوایەکی چاك و پەسەند بوو [3].

هـەروەها لـە ئیـسحاقی کـوڕی طلحـةی کـوڕی ئەشـعەث ەوە ئـەڵێ: عومـەری کـوڕی عبدالعزیز(ﷺ) ناردمی بۆ عێراق و وتـی: قورئانیـان بـۆ بخوێنـە و داوای خوێنـدنیان لـێ مەکـە و قسەیان بۆ بکە و گوێیان بۆ مەگرە و فێریان بکە و لێانەوەشت فێرنـەبیت، دیـارە عومـەری کـوڕی عبدالعزیز شارەزایی بیروباوەڕی کُثَيري شاعیر بووە، بەڵگەش لەسـەر ئەمـە ئـەو دێـرە شـیعرانەی " کُثَيري عذة "یە کە تیایدا بیروباوەڕی زیادە ڕەوو نادروستی خۆی بەرامبەر بـە ئـال و بـەیت دەخاتـە ڕوو و دەڵێ:

ألا انّ الأئمة من قـريش     و لاة الحـق أربعـة سـواء
عـلي والثـلاثة مـن بنيه     هم الاسباط ليس بهم خفاء
فسبط سبـط ايمـان وبرّ     و سبـط غيبـته كـربلاء
و سبط لايذوق الموت حتى     يقود الخيل يقدمها اللواء [4]

واتە: ئاگاداربن کە پێشەوایان لە قورەیشن و پێشەوا ڕاستەقینەکانیش چوارن، عـەلی و سـیان لـە کوڕەکانی کە کچەزای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ن ئەمەش لەکەس شاراوە نیە، یەکێکیان نەوەی بـاوەڕو چاکە خوازیە و ئەوی تریان لە کەربەلا ون بووە، سیّ یـەمیش هـەرگیز مـردن ناچـێژێت هـەتاوەکو ئەسپەکەی تاو نەدات و نەبێتە پێشەنگ و ئالاّ هەڵگری سوپا.

---

[1] - تأريخ الاسلام، لە الاثار الواردة(٢ / ٧٢٨) وە.
[2] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٧٢٨).
[3] - تاريخ دمشق، لە الاثار الواردة(٢ / ٧٢٩) وە.
[4] - الفَرق بين الفِرَق لە الاثار الواردة(٢ / ٧٣٤) وە.

ذهبي ئەڵێت: زبیری کوڕی بەککار دەربارەی کثیر ئەڵێ: شیعەیەك بووە کە باوەڕی بەگەڕانەوەی گیان بۆ جەستەی کەسێکی تر هەبووە – تناسخ الارواح – و(فی أی چورە ماشاو رکب) الانفطار: ٨ ی ئە خوێندەوە، ئەشلێت: باوەڕی بە گەڕانەوەی گیان – ڕۆح – بۆ جەستەیەکی تر هەبووە هەروەها باوەڕیشی بە گەڕانەوەی دووبارەی عەلی بۆ دونیا هەبووە و خەشەبی بووە [1].

هەروەها عومەر گرنگی نەدەدا بە وەڵامدانەوەی بۆ چوونەکانی کثیر و شیعە توندڕەوەکانی تر بەو شێوەیەی کە گرنگی بەر ەتدانەوەی قەدەری و خەواریجەکان دەدا، هەروەها عومەر(رضي الله عنه) داوای دورکەوتنەوە و دانەنیشتنی لەگەڵ خاوەن بیدعە و ئارەزوەکاندا دەکرد [2]، لە گرنگترین ڕاکانی شیعە توندڕەوەکانیش:

- به پێویست زانینی پێشەوایەتی علی و پێش خستن و فەزڵدانی بەسەر سەرجەم هاوەڵاندا بە بەڵگەی ئەوەی کە پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) دەقی فەرموو لەسەر پێشەوایەتی.
- به مەعسوم و بێ هەڵە زانینی پێغەمبەران و پێشەوا و ئیمامەکان و بەدوور زانینیان لە گوناهی گەورە و بچوك.
- به پێشەوا زانینی عەلی(رضي الله عنه) و بێبەری بوون لەسەرجەم هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(رضي الله عنه) بەتایبەت هەرسێ خەلیفەی ڕاشیدین [3]، هەر کەسێکیش وەڵامی ئەم بۆچوونانەی دەوێت بابگەڕێتەوە بۆ کتێبەکەم سەبارەت بە ئەمیری باوەڕداران عەلی کوڕی ئەبو تالیب(رضي الله عنه).

## سێ یەم: قەدەریەکان لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا(رضي الله عنه):

١– **پێناسەی قەردەریەکان لە ئیصطلاح و زاراوەدا:** قەدەریە دوو مانای هەیە، گشتی و تایبەت:

أ– **قەدەریە بەمانای تایبەت:** ئەوانەن کە قەدەر ڕەت دەکەنەوە، واتە: ئەندازەگیری پەروەردگار بۆ کارو کردەوەی بەندەکانی هەمووی یان بە شێکی ڕەت دەکەنەوە، واتە:

---

[1] – تأريخ الاسلام له الاثار الواردة(٢ / ٧٣٤) خەشەبی: کۆمەڵێکن لە شیعە بۆیە وناونراون، چونکە وتویانە تەنها لەگەڵ ئیمامی مەعسوم دا بە شمشێر دەجەنگێین، هەر بۆیە بە تەختە جەنگاون و پێ یان وتوون: خەشەبی واتە تەختەیی(منهاج السنة)(١ / ٣٦).

[2] – وسطية أهل الشيعة بين الفرق، ل: ٢٩٣ – ٢٩٤.

[3] – القدرية و المرجئة د. ناصر العقل. ل: ١٩.

ئەوانەی کە وتویانە خوا هیچ شتێکی بڕیارنەداوە و کارەکان لە ئێستاوە دەست پێ دەکەن و خوای گەورە پێشوەخت هیچ بڕیار و ئەندازە گیریەکی نەبووە وەك دواتر ڕوونی دەکەینەوە.

ب- **قەدەریە بەمانا گشتی یەکەی:** ئەوانەن کە قسە لە بارەی زانستی پەروەردگار و ویست و بڕیار و نووسین و دروستکردنی بە بێ زانست دەدوێن، بە پێچەوانەی دەقەکان و تێگەیشتنی سەلەف و پێشینان [1].

ج- **سەرهەڵدانی قسەکردن لە بارەی قەدەرەوە لە ئیسلام دا:** لە جابری کوڕی سەمرەوە(ﷺ) ئەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی:(سێ شت هەیە کە ئەترسم ئوممەتەکەمی تێ بکەوێت،(الاستسقاء بالأنوار و ستەمی سوڵتان و بەدرۆ خستنەوەی قەدەر) [2]، هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) هۆشداری داوە لە مشتومڕو موجادەلە کردن لە ئاین دا بە شێوەیەکی گشتی و لە مەسەلەی قەدەردا بە تایبەتی، هەروەها لە کێشانی ئایەت و فەرموودە صحیحەکان بە یەکدا و وروژاندنی گومان و نەیاری بەرامبەر بە دەقەکانی قەدەر، لەوانەش ئەو فەرموودەیەی کە پێشەوا ئەحمەد لە مسندەکەیدا گێڕاویەتیەوە لە عەمری کوڕی شوعەیب لە باوکیەوە لە باپیریەوە ئەڵێ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆژێکیان هاتە دەرەوە و بینی خەڵکی باسی قەدەر دەکەن، ئەڵێ: ئەتوت هەنارت بەدەم و چاوی داپرژاندوە هێندە تووڕە بوو و فەرمووی:(ئەوە چیتانە قورئانی خوا بەیەکدا دەکێشن؟ بەم شێوەیە ئەوانەی پێش ئێوە تیاچوون) [3].

٢- **سەرهەڵدانی یەك لە دوای یەکی کۆمەڵەکان لەسەدەی یەکەمەوە هەتاوەکو سەرهەڵدانی قەدەریەکان:** دوای دەرکەوتنی یەکەمین کۆمەڵەکان لە ساڵی ٣٧ - ٤٠ کۆچی واتە: خەواریج و شیعە باردۆخەکە بەم شێوەیە مایەوە هەتاوەکو ساڵی ٦٢ کۆچی کە تیایدا قەدەریەی گاور و ئاگر پەرست سەری هەڵدا کاتێ کە مەعبەدی جوهەنی باسی لێوەکرد

---

[1] - مسند أحمد(٥ / ٩٠) ئەلبانی بە صحیحی داناوە لە سلسلة الاحادیث الصحیحة ژمارە ١١٧٢.

[2] - مسند أحمد(٢ / ١٧٨، ١٩٦) خاوەنی الزوائد ئەڵێ: ئەمە سەنەدێکە پیاوەکانی متمانە پێکراون.

[3] - الفتاوی(٨ / ٤٢٥).

پاشان مشتومڕی زیاتری لەسەر پەیدا بوو، یاخود وەك ئیبن تەیمیە ئەڵێت: بیدعەكان سەرەتا بستێكن پاشان تەشەنەدەكات و دەبێتە باڵێك و پاشان چەند میل و قۆناغێك [1].

أ- **سەرهەڵدانی قەدریەی یەكەم:** كە خۆی لە وتەكانی مەعبەدی جوهەنی و شوێنكەوتوانی دەبینێتەوە، كە لە ساڵی ٨٠ كۆچیدا دەركەوت پاش ئەویش غەیلانی دیمەشقی و شوێنكەوتوانی، كورتەكەشی ئەوەیە كە پەروەردگار – بە قسەی ئەوان – كردەوەی بەندەكانی نەنووسیوە بڕیاری نەداوە و مەسەلەكە تازە ڕوودەدات و لە زانیاری و عیلمی پەروەردگاردا نەبووە و بەندەكان تەنها خۆیان ئەو كارانە دەكەن، سەرەتا ئەم قسانەشیان لە ساڵی ٦٣ كۆچی دا بوو، كە سەرەتای سەرهەڵدانی قەدەریەی یەكەمە كەواتە قەدەریەی یەكەم ئەوانەن كە زانیاری و عیلمی پێشوەختی پەروەردگار ڕەت دەكەنەوە و پێیان وایە كە خوای گەورە پێشتر كردەوەی بەندەكانی ئەندازەگیری و تەقدیر نەكردووە و لە لەوحی مەحفوزیشدا نەینووسیوە، كارەكانیش هەر ئێستا ڕوودەدات و بڕیاری پێشوەختی لەسەر نیە و بەندەكان تەنها خۆیان ئەو كارانە ئەنجام دەدەن ئەم وتەیەش ڕۆچوونێكی زۆری پێوە دیارە، چونكە زانیاری و نووسین و دانان و بڕیاردان دەربارەی هەموو كردەوەیەكی بەندەكان بەخێر و شەڕیەوە ڕەت دەكاتەوە، ئەمە سەرەتای بۆ چوونەكانیان بوو، كاتێ پێشەوایان ئەم وتەیەیان ڕەتكردەوە زۆرینەی قەدەریەكان ناچار بوون دان بە زانیاری پێشوەختی پەروەردگار و نووسینی كردەوەكان دابنێن، بەڵام ویست و توانای پەروەردگار و دروستكردنی كردەوەی بەندەكان ڕەت دەكەنەوە و نكوڵی ئەوە دەكەن لەوەی كە خوای گەورە بەدیهێنەری هەموو كردەوەی بەندەكان یان هەندێكی بێت و وتویانە: خوای گەورە كردەوەی خراپ بەدی ناهێنێت ئەمە دوا بیروباوەڕی قەدەریەی دووەمە بەسەركردایەتی موعتەزیلەكان [2].

بیروباوەڕی قەدەریە یەكەمەكانیش لە دوو ڕادا كۆ دەبێتەوە:

---

[1] - القدرية و المرجئة، ناصر العقل، ل: ٢٥.

[2] - الفتاوى(٧ / ٣٨٥).

● کارەکان ئێستا دەست پێ دەکات، مەبەستیان ئەوەیە کە کاری بەندەکان [1] پێشتر دانـەنراوە و بە دینە هێنراوە و خوای گەورەش – وەك دەڵێن – لـە کـاتی ڕوودانـی کـارو کردەوەکانـدا پێیان دەزانێ.

● ئەڵێن: خوای گەورە پێشتر لە لەوحی مەحفوزدا کردەوەکانی نە نووسیوە [2].

**ب- سەرانی قەدەریە یەکەمەکان:**

● مەعبەدی جوهەنی کۆچکردوو لە ساڵی ٨٠ کۆچی: ئـیبن حەجـەر لـە تـذهیب التهـذیب دا وتەی هەندێك لە زانایانی جرح و تعدیلی هێناوە دەربـارەی و ئـەڵێت: ئـەبو حاتـەم ئـەڵێت: ڕاستگۆ بووە لە قسەدا و یەکەم کەسێکە لەسەر قەدەر قسەی کردووە لە بەسرەدا و یەکێکـە لەسەرانی ئەو کۆمەڵە پاشان هاتە مەدینە و چەند خەڵکێکی تیادا شێواند [3].

الدارقطنیش ئەڵێ: قسەکانی باشە و بۆچوون و مەزهەبەکەی خراپە [4]، محمدی کـوڕی شـوعەیبی کوڕی شاپوریش لە ئەوزاعیەوە ئەگێڕێتەوە کەوتویەتی: یەکەم کەسێك کە دەربـارەی قـەدەر قـسەی کرد پیاوێکی خەڵکی عێراقە بە ناوی سەوسەن، کە پیاوێکی گاور بوو پاشان موسـڵمان بـوو دواتـر بوویەوە بەگاور مەعبەدی جوهەنیش لەوە وە بیروڕاکانی وەرگرتبوو، غیلانیش لە مەعبـەدەوە وەری گرتبوو [5] موسلیمی کوڕی یەساریش ئەیوت، مەعبەد قسەی گاورەکان ئەکات.

● غیلانی دیمەشقی کوژراو لە ساڵی ١٠٥ کۆچی: غیلانی دیمەشقیش کەسی دووەم بـوو دوای مەعبەدی جوهەنی، یەکێکە لەسەرانی بیدعەی قەدەری، بیوڕاکان لە شـام دا بـڵاو بوویـەوە و خەڵکانێك بەهۆیەوە گومڕابوون [6]، هەروەك غیلان بە قسەکانی مەعبـەدوازی نـەهێنا، بـەڵکو باسـی سـیفەتەکانی پـەروەردگاری کـردووە و هەنـدێکیانی ڕەتکردۆتـەوە وەك ئیـستواء- جێگیربوون – هەروەها ئەو وتەیەی دراوەتە پاڵ کە دەڵێ: باوەڕ بریتیە لە مەعریفـە و زانـین و

---

[1] - هەمان سەرچاوە لە القدریة و المرجئتوە، ل: ٣٠.

[2] - تهذیب التهذیب(١٠ / ٢٢٥).

[3] - تهذب التهذیب(١٠ / ٢٢٥) سیرأ علام النبلاء(٤ / ١٨٦).

[4] - هەمان سەرچاوە.

[5] - القدریة و المرجئة، ناصر العقل، ل: ٣٢.

[6] - دراسات في الاهواء و الفرق و البدع، ل: ٢٥١.

کردەوە بەشێك نیە لە باوەڕ، هەروەها باسی دروستکردن و بەدیهێنانی قورئانیشی(خلق القرآن)ی کردووە [1].

ئەمانەش بنەماکانی جەعدی کوڕی درهەمن دوای ئەو، بوو بە بنەمای جوهەمیە و موعتەزیلە، و بنەما و یاساکانی خۆیانیان تیادا داڕشت و مشتومڕیان لەسەر کرد و لەم بیدعەیەدا ڕۆچوون [2]، ئەشلێن یەکەم کەسێك کە نکولی ئیستوائی پەروەردگاری کردووە لەسەر عەرشی خۆی و بەدەستبەسەراگرتنی لێکی داوەتەوە غیلانی دیمەشقی بووە کە لە ساڵی ۱۰۵ دا کوژراوە، یان جەعدی کوڕی درهەم کە لە ساڵی ۱۲٤ کۆچی دا کوژراوە ئەشلێن جەهمی کوڕی صفوان بووە کە لە ساڵی ۱۲۸ کۆچی کوژرا.

نکۆڵی کردنی ئیستوائیش لەگەڵ ئەو بنەما بۆگەنەی جەعددا دەگونجێ کە خۆی لە تعطیل و لە کارخستن دا دەبینێتەوە قسەکردنی خوای گەورەی تیادا ڕەت دەکردەوە، یەکەم کەسێکیش کە لێوەی بیستراوە کە وتبێتی خوای گەورە لەسەر عەرش نیە، جەعدبووە پاشان جەهم لێوەی وەرگرت و بڵاوی کردەوە [3].

نکولی کردنی ئیستیواء و جێگیربوونیش یان تەئویل کردن و لێکدانەوەی کاری یەکەمی خەڵکانی خاوەن ئارەزوە و بەهۆیەوە دەمیان وەردایە سیفەتەکانی خوا و بە ڕەتکردنەوە و پەکخستن و لێکدانەوە، دیارە ئیستیواء پەیوەندی بە بەرزی و بلندی و پاشان، بینینەوە هەیە پاشان سیفەتە فیعلیەکانی تری پەروەردگار، لەوێشەوە دەمیان کوتایە سیفەتە خەبەریەکان وەك دەست و چاو و ڕومەت و... هتد [4].

## چوارەم: هەڵوێستی عومەری کوڕی عبدالعزیز بەرامبەر غەیلانی دیمەشقی:

لە عەمری کوڕی موهاجیرەوە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز ئاگادار کرایەوە کە غەیلانی دیمەشقی قسە لەسەر قەدەر ئەکات، ئەویش ناردی بە شوێنی دا و چەند ڕۆژێك دایبڕی لە خەڵك پاشان هێنای و وتی: غەیلان ئەوە چیە دەربارەی تۆ دەیبیستم؟ عەمری کوڕی موهاجیریش ئەڵێ:

---

[1] – هەمان سەرچاوە، ل: ۲۵۰.

[2] – دراسات في الاهواء و الفرق و البدع، ل: ۲۵۱.

[3] – الفتاوی(٥ / ۲۰) دراسات في الاهواء و الفرق، ل: ۲۵۱.

[4] – دراسات في الأهواء و الفرق و البدع، ل: ۲۵۱.

منيش ئاماژەم بۆ کرد کە هیچ نەڵێت، ئەڵێ: وتی: بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران خوای گەورە ئەفەرمویت: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ الإنسان: ١ – ٣). واتە: بێ گومان بەسەر ئادەمی دا تێپەڕی ماوەیەکی زۆر لە ڕۆژگار کە شتێکی وانە بوو ناوببرێ. بەڕاستی ئێمە ئادەمیزادمان دروست کرد لە دڵۆپێك ئاوی تێکەڵ لەگەڵێ توخم تا تاقیی بکەینەوە ئینجا گێڕامان بە بیسەری بینەر.

عومەریش فەرمووی کۆتایی سورەتەکە بخوێنەرەوە: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾ يُدْخِلُ مَن يَشَآءُ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًۢا﴾ الإنسان: ٣٠ – ٣١). واتە: وە ئێوە حەز ناکەن(لە گرتنی ئەو ڕێ یە) مەگەر کاتێك کە خوا بیەوێ(وە بەزۆر ناچارتان بکات) بێ گومان خوا دانای دروست کردارە. ئەوی(خوا) بیەوێ دەخاتە ناو میهرەبانی خۆیەوە وە ئامادەی کردووە بۆ ستەمکاران سزای سەخت.

پاشان وتی: چی ئەڵێی ئەی غەیلان؟ وتی: ئەڵێم: من کوێر بووم تۆ چاوت کردمەوە و کەڕ بووم تۆ بیستنت بۆ گێڕامەوە و سەرلێشێواو بووم و تۆ ڕێنمایت کردم [1].

لە ڕیوایەتێکیشدا: عومەری کوڕی عبدالعزیز غەیلانی بانگ کرد و وتی: غەیلان بیستومە تۆ قسە لە مەسەلەی قەدەردا دەکەیت! وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران درۆنەکەن بەدەممەوە؟ وتی: غەیلان سەرەتای(یس) بخوێنەوە ئەویش: ﴿ يس(١) وَالْقُرْآنِ الْحَكِيمِ(٢) ﴾ی خوێندەوە هەتاوەکو گەشتە ﴿ وَجَعَلْنَا مِنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ سَدًّا وَمِنْ خَلْفِهِمْ سَدًّا فَأَغْشَيْنَٰهُمْ فَهُمْ لَا يُبْصِرُونَ ﴿٩﴾ وَسَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾ یس: ٩ – ١٠) غەیلانیش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، سوێند بەخوا ئەڵێی هەرگیز ئەم ئایەتەم نەخوێندوەتەوە، بە شایەتت دەگرم ئەی ئەمیری باوەڕداران کە من پەشیمانم لەوەی کەوتومە، عومەریش وتی: خوایەگیان ئەگەر ڕاست دەکات دامەزراوی بکەیت ئەگینا بیکەیتە پەند بۆ باوەڕداران [2].

---

[1] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٧٥٠).

[2] - الابانة(٢ / ٢٣٥) الاثار الواردة(٢ / ٧٤٩).

هەروەها ڕیوایەتی زۆر هاتووە سەبارەت بە گفتوگۆی عومەری کوڕی عبدالعزیز لەگەڵ غیلانی دیمەشقی دا و، قسەی زۆری هەیە سەبارەت بە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت سەبارەت بە باوەڕ بە قەدەر عومەری کوڕی عبدالعزیزیش موناقەشەی قەدەریەکانی کرد و پرسیاری لێکردن سەبارەت بە زانست و عیلمی خوا جا ئەگەر دانیان پیادا نا ئەوە موناقەشەیان لەگەڵدا دەکرێت و ئەگەر ڕەتیشیان کردەوە و نکۆڵیان کرد ئەوە بێ باوەڕ دەبن. ئەوە بووبە غەیلانی دەیمەشقی وت: چی دەڵێیت دەربارەی عیلمی خوا وتی: عَیلم تەواو بووە، عومەریش وتی: کەواتە دەبێ موناقەشە بکرێت برۆ چی ئەڵێی بیلێ، لەناو چیت ئەی غەیلان تۆ ئەگەر دان بە عیلمی خوادا بنێیت موناقەشە دەکرێیت ئەگەر ڕەتیشی بکەیتەوە بێ باوەڕ دەبیت، جا ئەگەر دانی پیادا ببینێت و موناقەشە بکرێیت ئەوە باشترە لەوەی کە ڕەتی بکەیتەوە و کافر ببیت [1].

لەوانەشە عومەری کوڕی عبدالعزیز یەکەم کەسێك بێت کە ئەم ڕێبازەی پەیڕەو کردووە بۆ پرسیار کردن لە قەدەریەکان دەربارەی زانست، پاشان ئەمە بوو بە ڕێبازی ئەهلی سوننەت بە شێوەیەکی گشتی، لە وەڵامی غەیلانیش دا چەند ئایەتێکی ڕاشکاوی قورئانی بەبەڵگە هێنایەوە کە وەڵامە بۆ ئەو کەسانەی کە قەدەر بە درۆدەخەنەوە – وەك لە هەندێ ڕیوایەتدا هاتووە کە ئەویش فەرمایشتی: ﴿فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَاتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ الْجَحِيمِ﴾ الصافات: ١٦١ – ١٦٣).

واتە: ئینجا بەڕاستی ئێوە ئەو(بتانە)یش کە دەیپەرستن ئێوە ناتوانن لە بەرانبەری خوادا گومڕاکەری(کەس) بن بێجگە ئەو کەسەی(خوا دەزانێ) دەچێتە دۆزەخەوە.

ئیبن حەجەر دەربارەی تەفسیری ئەم ئایەتانە ئەڵێت: خوای گەورە ئەفەرموێت: ئێوە ئەی هاوەڵگەران خۆتان و ئەو خوا و بتانەی کە دەیپەرستن ناتوانن کەسێك گومڕا بکەن جگە لەوەی کە پێشتر لە عیلمی ئێمە دا – پەروەردگار – زانراوە کە دەچێتە دۆزەخەوە [2].

عومەر لە وتار و نامەکانیدا ڕوونی کردۆتەوە کە خوای گەورە تەنها خۆی هیدایەت دەر و گومڕاکەرە و ئەمەش لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَن يَشَإِ اللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن

---

[1] - السنة لعبد الله بن أحمد بن حنبل(٢ / ٤٢٩).

[2] - تفسير الطبري(٢٣ / ١٠٩).

يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾ الأنعام: ٣٩). واته: هەركەس خوا بیەوێ گومڕای دەكات هەركەسیش خوا بیەوێ دەیخاتە سەر ڕێگای ڕاست.

ئەمە وێڕای چەندین ئایەتی تر، هەروەها قەدەرییەكان نكوڵی ئەوەیان دەكرد كە خوای گەورە ڕێنمونیكار یان گومڕاكەر بێت، بەڵكو مرۆڤ خۆی ڕێنمایی خۆی دەكات یاخود سەر لەخۆی دەشێوێنێت، ڕەنگە نامەكانی عومەر و وتارەكانی هەینی لەو وەڵامە بەهێزانە بێت بۆ ئەو بیدعەچیانە چ بە مەبەستی بوبێت یان بێ مەبەست كە دەشێت وەڵامێكی دەمكوتكەر بێت بۆ هەر كەسێك كە لەم بوارەدا تووشی لادان بووبێت، هەروەها عومەری كوڕی عبدالعزیز ڕوونی كردۆتەوە كە كاروكردەوەی بەندەكان لەلایەن پەروەردگار ەوە بە دیهێنراوە و لەسەر بەندەكانی نووسراوە، قورئان و سونەیش ئەمە دەسەلمێنن، خوای گەورە ئەفەرمویت: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ الصافات: ٩٦). واتە: لە كاتێكدا خوا بەدیهێنەری خۆتان و ئەو بتانەشە دروستتان كردوون.

پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئەفەرمویت: " هەموو شتێك دیاریكراوە بەزیرەكی و دەستە و سانیشەوە "[1]، هەروەها عومەری كوڕی عبدالعزیز ڕوونی كردۆتەوە -وەك لە وتارەكانی داهاتووە- كە مرۆڤ ئەگەر گوناهی كرد ئەوە پێویستە لەسەری كەتەو بەو داوای لێخۆشبوون بكات و قەدەر نەكات بە بەڵگە بەسەر خواوە و نەڵێ من تاوانم چیە لە كاتێكدا كە تاوانەكانم لە سەر نووسراوە.

بەڵكو دەزانێ كە خۆی تاوانبارە، چونكە خۆی كردەوەكەی ئەنجام داوە بابەقەزاو قەدەر و ویستی پەروەدگاریش بوبێت، بەو پێیەی كە هیچ شتێك بە بێ ویست و ئیرادەی پەروەردگار نابێت وەك عومەر(ﷺ) وەڵامی قەدەریەكانی دایەوە كە ئەڵێن مرۆڤ ویستی سەربەخۆی هەیە و ئەتوانێت بە هۆیەوە زانستی پەروەدگار ڕەت بكاتەوە، ئەویش ڕوونی كردەوە كە بەندە ویستی خۆی هەیە، بەلام پاشكۆی ویستی پەروەردگارە[2].

١- **ڕوونكردنەوەی پلەكانی قەدەر:** ئەو ئاسەوارانەی كە لە عومەری كوڕی عبدالعزیز ەوە هاتوون بەگشتی بەڵگەیە لە سەر باوەڕ بوون بە قەدەر، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەو چوار پلەیەش كە سەلەفی سالح لەسەری ڕێككەوتوون - ڕەحمەتی خوای لێ بێت -

---

[1] - مسلم ژمارە(٢٦٥٥).

[2] - الاثارة الواردة عن عمر بن عبدالعزیز(٢ / ٧٦٩، ٧٧٠).

شوێنکەوتوانیشیان پابەندبوون پێوە و بەمەرجیان زانیوە بۆ تەواوێتی باوەڕ بەقەدەر، ئەوانیش: عیلم و نووسین و ویست و بەدیهێنانن ئەو قەدەریانەش کە لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا هەبوون عیلم و نووسینیان ڕەتدەکردەوە، هەر ئەمانەش بوون کە عبداللە ی کوڕی عومەری کوڕی خەتتاب خۆی بێ بەری کرد لێیان و وتی: ئەگەر گەشتی بەوانە ئەوە ئاگاداریان بکەرەوە کە من بێ بەریم لێیان و ئەوانیش بێ بەرین لە من [1].

لەو قسانەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیزیش کردوویەتی بۆ ڕوونکردنەوەی پلەکانی قەدەر ئەو وەڵامەی کە ئاڕاستەی ئەو پیاوەی کرد کە نامەیەکی بۆ نووسیبوو وتیایدا هاتبوو:... نامەیەکت نووسیوە و پرسیار دەربارەی دانانی بە قەدەردا دەکەیت، ڕێت لە پسپۆڕکەوتووە بە پشتیوانی پەروەردگار، هیچ بیدعەو داهێنراوێك یش نیە کە جێگیر تر و ئاسەواری دیارتر بێت لە دانان بە قەدەر، دیارە نەفامەکان لەسەردەمی نەفامیدا لە قسە و شیعرەکانیاندا باسیان دەکرد و دڵخۆشی خۆیان پێ دەدایەوە، بەڵام ئیسلام توند تری کرد و پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە فەرموودەیەك یان دوو فەرموودەدا باسی کردوە، موسڵمانانیش لێیەوە بیستویانەو لە ژیانیدا لێی دواون و دوای مردنیشی بڕوای تەواویان پێ هێناوە و تەسلیمی پەروەردگار بوون بۆ بەهێز کردنی خۆیان هەتاوەکو شتێکیان نەبێت کە لە عیلمی ئەودا نەبێت و لە نووسینی ئەو دا تۆمار نەکرا بێت و ئەوە بڕیاری لەسەر نەدابێت لەگەڵ ئەمەشدا لە قورئانی پیرۆزدا هەیە و لێوەی وەرگیراوە و لێشیەوە فێر بوون، ئەگەر بشلێین بۆ خوای گەورە ئەو ئایەتەی دابەزاندوە و بۆ وای فەرموو، ئەوە ئەوانیش هەمان شتیان خوێندوەتەوە کە ئێوە خوێندوتانەتەوە و ئەوتە ئویلەیان زانیوە کە ئێوە نایزانن، دوای ئەوەش وتویانە هەموو شتێك بە نووسین و قەدەرە و هەرچی نووسیبێت ئەبێت و هەرچی نەنوسیبێت نابێت و ئێمە هیچ سوود و زیانێکمان بۆ خۆمان نیە [2].

لە ڕوانگەی ئەم نامە و وتارانەی عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە بیروباوەڕمان سەبارەت بە قەدەر و ڕونکردنەوەی پلەکانی قەدەرمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە یەکەم پلەی:

أ- **زانین:** مەبەست ئەوەیە کە خوای گەورە پێشوەخت زانیویەتی کە بەندەکان چی دەکەن و چیان بەسەر دێت پێش ئەوەی دروستیان بکات بە عیلمی کۆن و ئەزەلی خۆی کە سیفەتێکە

---

[1] - مسلم کتاب: الایمان، باب القدر(١ / ٣٦، ٣٧).

[2] - الابانة لابن بطة(٢ / ٢٣٢، ٢٣٣) الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزیز(١ / ٥١٠).

له سیفەتەکانی زاتی خۆی، هەروەها بەهەشتی و دۆزەخیەکان دەزانێت خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ﴾ الأنعام: ٥٩). واته: وە کلیلی هەموو نهێنی یەکان لە ووشکانی و دەریادا هەیە وە هەر گەڵایەك بکەوێتە خوارەوە خوا پیّ ی دەزانیّ و هەر دانە ویڵەیەك لە تاریکی یەکانی زەویدا بێت و هەر تەڕو ووشکێك هەبێت هەر هەموویان لە کتێبی ئاشکراادان(لوح المحفوض).

هەروەها لە سوننەتیشدا هاتووە: کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە پیاوێکی وت کە پرسیاری لێکرد بوو: ئایا ئەهلی بەهەشت و ئەهلی دۆزەخ دیاریکراون؟ فەرمووی: بەڵێ، وتیان: ئەی بۆچی دەبێ خەڵکی هەوڵ بدەن؟ فەرمووی: هەموو کەسێك ئەو کارەی بۆ ئاسان دەکرێت کە بۆی دروستکراوە [1].

ب- **پلەی نووسین:** عومەری کوڕی عبدالعزیز وتاری داو وتی: ئەی خەڵکینە هەر کەسێك لە ئێوە چاکەیەکی کرد ئەوە با سوپاسی خوای گەورە بکات هەر کەسێکیش خراپەی کرد با داوای لێخۆشبوون بکات، چونکە هەموو کەس دەبێت ئەو کارە بکات کە خوای گەورە لەسەری نووسیوە و خستویەتیە ئەستۆیەوە [2].

ڕۆژێکیان وترای داو وتی: دونیا شوێنی مانەوە نیە و شوێنێکە خوای گەورە لە ناوچوونی لەسەر نوسیوە، هەروەها ڕۆشتن و بەجێهێشتنی لەسەر خەڵکەکەی نووسیوە [3]، کەواتە نووسینی ئەندازەی و بڕی دروستکراوەکان پێش دروستکردنیان و ئامارکردنی هەموو ئەو شتانە و زانینی وردەکاریەکانی هەموو شتێك لەلایەن پەروەردگارەوە لە عومەرەوە هاتووە [4]، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ﴾ الحدید:

---

[1] - مسلم رقم ٢٦٤٩.

[2] - الاثار الواردة(١ / ٥١٩) لە الشريعة الاجري وە.

[3] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٢٤٤.

[4] - الاثار الواردة(١ / ٥١٩)

٢٢). واته: هیچ زیان و بەڵایەك ڕووی نەداوە نەلە زەوی و نە لە خودی خۆتاندا ئیللا لە(لوح المحفوض)دا نووسراوە...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێت: " خوای گەورە ئەندازەی هەموو دروستکراوەکانی نووسیوە پێش ئەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست بکات بە پەنچا هەزار ساڵ و ئەو کاتەش عەرشی لەسەر ئاو بووە [1].

ج- **ویست و مەشیئەت:** مەبەست پێی ئەوەیە کە ئەوەی خوای گەورە بیەوێت ئەبێت، هەرچیشی نەوێت ڕوونادات و هیچ جوڵەو وەستانێك لە ئاسمانەکان و زەوی دا ڕوو نادات بیَ ویستی پەروەدگار و هیچ شتێك نایەتە موڵکیەوە جگە لەوەی کە خۆی دەیەوێت، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش سوور بوو لەسەر ڕوونکردنەوەی ئەم پلەیە و وەڵامدانەوەی ئەو کەسانەی کە نکوڵی دەکەن، ئەوەتا لە نامەیەکیدا بۆ کاربەدەستێکی ئەڵێت: هەرچی بڕیار بدات ئەبێت و هەرچی بوێت ڕوو دەدات و هەر شتێکیشی نەوێت نابێت.

هەروەها ئەیوت: ئەگەر خوای گەورە بیویستایە سەرپێچی نەکرێت ئیبلیسی دروست نە دەکرد[2].

مشتومڕی لەگەڵ غەیلانی دیمەشقی دا کردوو دەمکوتی کرد و هەڵەکانی بۆ ڕوون کردەوە لە بەڵگە هێنانەوەی بە ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی الانسان و داوای لێکرد کۆتایی ئەو سوورەتەش بخوێنیتەوە وە پێی وت: لەناو بچێت ئایا نەتبیستوە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ﴾الإنسان: ٣٠). واتە: وە ئێوە حەز ناکەن(لە گرتنی ئەو ڕێ یە) مەگەر کاتێك کە خوا بیەویَ(وە بە زۆر ناچارتان بکات). هەروەها فەرمویەتی: ﴿مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضْلِلْهُ وَمَن يَشَأْ يَجْعَلْهُ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ﴾ الأنعام: ٣٩). واتە:... هەرکەس خوا بیەویَ گومڕای دەکات هەرکەسیش خوا بیەویَ دەیخاتە سەر ڕێگای ڕاست.

پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئەفەرموێت: " دڵی بەندەکان لە نێوان دوو پەنجە لە پەنجەکانی پەروەردگاردایە و وەك یەك دڵ بە ویستی خۆی وەری دەگرێت " پاشان ئەڵێ: " ئەی وەرگێڕی دڵەکان دڵمان دامەزرێنە لەسەر گوێڕایەڵی خۆت " [1]

---

[1] - مسلم رقم ٢٦٥٣.

[2] - الاثار الواردة(١ / ٥٢٤).

د- دروستکردن و بەدیهێنان: مەبەست پێی ئەوەیە کە پەروەردگار خۆی بە دیهێنەری بوونـەوەر و دروستکەری هەموو شتێکە و تەنها ئەو بەدیهێنەرە و ئەوانی تر هەموو بەدیهێنراون [2].

عومەری کوڕی عبدالعزیزیش بە جوانترین شێوە ئەم پلەیەی دەربڕیوە و سەبارەت بە فەرمایشتی: ﴿ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ (١١٨) إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ﴾هود: ١١٨ - ١١٩).

نووسی و ئەیوت: ئەوانەی کە جیاواز نین خوای گەورە بۆ ڕەحمـەت دروسـتی کـردوون [3]، ئـەم ئایەتەش بـاس لـە دروسـتکردنی بەنـدەکان و کردەوەکانیـان دەکـات [4] هـەر بۆیـە خـوای گـەورە ئەفـــــەرمویێت : ﴿ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ النَّاسَ أُمَّةً وَاحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ (١١٨) إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴾ هـود: ١١٨ - ١١٩). واتـــە: گـــەر پەروەردگارت بیویستایە گشت خەڵکی دەکرد بە(پەیڕەوی) یەك ئایین، بەڵام ئەوان بەردەوام جیـاواز دەبن. مەگەر کەسێ پەروەردگارت میهرەبانی لەگەڵ کردبێ وە هەر لەبەر ئەوەش دروستی کردوون بڕیاری پەروەردگارت دەرچوو(کۆتایی هات) کە سوێند بەخوا دۆزەخ پڕ دەکـەم لـە جنۆکـە و لـە ئادەمی هەموو پێکەوە.

هەروەها نامەیەکی نووسی بۆ عەدی کوڕی أطارة کە تیایدا هاتبوو: پاشان بـەکارهێنانی سـەعدی کوڕی مەسعود وەك کار بەدەستی عومان یەکێکە لەو تاوانانەی کە خوای گەورە لەسەرتی نوسیوە و دایناوە کە تووشی ببیت [5]. ئەمەش کـە عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز بڕیـاری لەسـەردا قورئـان و سوننەت سەلماندوویەتی، خوای گەورە ئەفـەرمویێت: ﴿ اللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴾ الزمر: ٦٢). واتە: خوا بەدی هێنەری هەموو شتێکە وە هەر ئەویش پارێزەری هەموو شـتێکە. هـەروەها ئەفەرمویێت: ﴿ وَاللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴾ الصافات: ٩٦). واتە: لەکاتێکدا خوا بەدیهێنەری ئێوەش و ئـەم

[1] - مسلم ژمارە(٢٦٥٤).

[2] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٥٢٥).

[3] - مضف عبدالرزاق(١١ / ١٢٢).

[4] - هەمان سەرچاوە(١١ / ١٢٢)

[5] - مسلم ژمارە ٢٦٥٥.

بتانەشە کەدروستتان کردوون(نەشیانتوانی بەرگری لەخۆیان بکەن!!). پێغەمبەری خواش(ﷺ) ئەفەرموێت: " هەمووشتێك بە ئەندازەیە تەنانەت زیرەکی و دەستە و سانیش " ١.

٢- **جیاوازی نێوان قەزا و قەدەر لە ڕووی ئیصگلاح و زاراوەوە:** وتراوە کە مەبەست لە قەدەر: ئەندازەگیریە و مەبەست لە قەزایش بەدی هێنانە، وەك ئەفەرموێت: ﴿فَقَضَىٰهُنَّ سَبْعَ سَمَٰوَاتٍ فِي يَوْمَيْنِ وَأَوْحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمْرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنْيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفْظًاۚ ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْعَلِيمِ﴾ فصلت: ١٢). واتە: دروستی کردوون و بەدی هێناون قەزاو قەدەردا دوو شتی پێکەوە بەستراون و لە یەك جیانابنەوە یەکێکیان وەك بناغە وایە کە ئەویش قەدەرە و ئەویتریشیان وەك بیناکە وایە ئەویش قەزایە، جا هەرکەس بیەوێ لەیەکیان جیا بکاتەوە ئەوە بینا کە ئەوروخێنێت و هەڵیئەتەکێنێ [٢].

ئەشڵێن: قەزا بریتیە لە ئەو زانینە پێشوەختەی کە خوای گەورە لە ئەزەلەوە حوکمی پێکردووە، قەدەریش بریتیە لە هەستانی دروستکراوەکان بە ئەنجامدانی ئەو کارانەی کە پێشتر بڕیاردراوە [٣]، هەروەها ئیبن حەجەر ئەڵێت: زانایان وتویانە قەزا بریتیە لەو حوکمە گشتیە ی کە لە ئەزەلدا بڕیاردراوە و قەدەریش وردەکاریەکانی ئەو حوکمەیە [٤]. ئەشڵێن ئەگەر کۆ ببنەوە جیادەبنەوە بە جۆرێك کە هەر یەکێکیان بۆ خۆی مانایەکی هەیە وەك پێشتر باسمان کرد، ئەگەر جیاش بەکاریان بێنین کۆ دەبنەوە بە جۆرێك ئەگەر یەکێکیان جیا بکەیتەوە ئەوی تریان لەگەڵیدا تێهەڵکێش دەبێت[٥].

وەك چۆن لە جیاکردنەوەی زاراوەکانی ئیمان و ئیسلام و فەقیر و مسکین و هاوشێوەکانیاندا هەیە، لەوانەیە ئەم پێناسەیەش کۆکردنەوە و تەوفیقێك بێت لە نێوان ئەوانەی کە جیا کردنەوە یان بە دروست نازانن و ئەوانەی کە بەڕاستی نازانن، بەڵام وا دەر ئەکەوێت کە جیاوازیەکی ڕوون لە نێوان قەزا و قەدەردا نیە و ئەم جیاوازیەش هیچ سوودێکی نیە، چونکە ڕێکەوتن لەسەر ئەوە هەیە کە

---

١ - النهاية لابن الاثير(٤ / ٧٨).

٢ - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٩٤).

٣ - فتح الباري(١١ / ٤٨٦).

٤ - القضاء و القدر لمحمد بن ابراهيم الحمد، ل: ٢٩، الاثار الواردة – عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٩٤).

٥ - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٩٤).

هەر یەکێکیان بەوی تریشیان دەوترێت لـە کـاتی باسکردنیـشیاندا پێکـەوە بـەکارهێنانی یـەکێکیان لەبری ئەوی تریان سروشتیە [1].

٣- **ڕازی بوون بە قەزاوقەدەر:** عومەری کـوڕی عبـدالعزیز ئەفـەرموێت: ئـەمڕۆ ئـارەزوی هـیچ شتێکم نەماوە جگە لەو شوێنانەی کە خوای گەورە بڕیاری داوە [2].

ئەم نزایەش دەکرد، پەروەدگار ڕازیم بە قـەزا و بڕیـاری خـۆت و بەرەکـەت بخـەرە قەدەرمـەوە هەتاوەکو حەز بە پێشخستنی شتێك نەکـەم کـە دوات خـستووە و دواخـستنی شـتێك کـە پێـشت خستووە، هەروەها عومەر ئەیوت: بەردەوام ئەم نزایەم دەکرد تاوام لێهات ئـارەزووی هـیچ شـتێکم نەمابوو جگە لە مەسەلەی قەزادا [3].

هەروەها کاتێ عبدالملکی کوڕی بە خاك سپارد وتی: ڕازین بە قەزای خوا و تەسلیمی فرمـانین و سوپاس بۆ خوای پەروەردگار [4].

کاتێ کە سەر خۆشیان لێکرد بۆ کوڕەکەی وتی: من پەنا بە خوا دەگـرم کـە خۆشەویـستیم بـۆ شتێك هەبێت کە پێچەوانەی خۆشەویستی خوا بێت، چونکە ئەوەشیاوی چاکە و فەزڵی پەروەردگار نیە بەسەرمەوە [5].

ئەم ئاسەوارانەش کە لە عومەری کوڕی عبدالعزیزە وە لـەم بـوارەدا هـاتووە هانمـان دەدات بـۆ ڕازی بوون بە قەزا و قەدەر، مەبەستیش ئەو قەزایە یە کە خوای گەورە بـۆ بەندەکـەی بڕیـاری داوە لەو موسیبەتانەی کە تاوان نین، چونکە ئارامگرتن لەسەر موسیبەت پێویستە، بەڵام ڕازی بـوونی پـێ دروستە، بەڵام ئایا فەرزە یان موستەحەب و باشە؟ بە پێی دوو وتەی هاوەڵانی ئەحمەد و خەڵکانی تـر بەهێز ترینیان ئەوەیە کە موستە حەب و باشە و فەرز نیە [6]

گومانیش لەوەدا نیە کە ڕازی بوون بە قەزا تەواوکەری باوەڕ بوونە بە قەزا و قـەدەر و بەڵگەیـە لەسەر متمانە بوون بەوەی کەلای خوایە و وا لە خاوەنەکەشـی دەکـات کـە پەشـیمان نـەبێت لـەو

---

[1] - القضاء و القدر عبدالرحمن المحمود، ل: ٤٤.

[2] - القضاء والقدر عبدالرحمن المحمود، ل: ٤٤.

[3] - الطبقات(٥ / ٣٧٢) الاثار الواردة(١ / ٥٣٥).

[4] - سيرة عمر لابن عبدالعحكم، ل: ٩٧.

[5] - الاثار الواردة(١ / ٥٣٦).

[6] - الحلية(٥ / ٣٥٨، ٣٥٧) الاثار الواردة(١ / ٥٣٧).

شتانەی کە لە دەست چوون و دڵخۆش نەبێت بەوەی کە دێت و لە قەدەری خوا دا بڕیار دراوە، واتە ئەو لەبەر ئەوە پێی ڕازیە کە خوای گەورە بڕیاری داوە [١].

## پێنجەم: مورجیئە:

لە ئیرجا ئەوە یە واتە دواخستنی کردەوە بۆ دوای باوەڕهێنان، ئیرجائیش دوو مانایی هەیە، یەکەمیان: بە مانای دواخستن دێت وەك فەرمایشتی: ﴿قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ﴾ الأعراف: ١١١). واتە: ئەوانیش وتیان: کاری(مووسا) و براکەری دوابخە... مۆڵەتی بدەرێ و دوای بخە. دووەمیش بەمانای ئومێد پێ بەخشینە [٢].

مورجیئەش لە ئیصطلاح وزاراوە دا پێشەوا ئەحمەد ئەڵێ: ئەوانەن کە ئەڵێن باوەڕ تەنها وتن و دەر برینە بە زمان و خەڵکی لە باوەڕ دا یەکسانن و کەس باوەڕی بە هێزتر نیە و باوەڕی ئەوان و پێغەمبەران و فریشتەکان جیاوازی نیە و باوەڕیش زیاد و کەم ناکات و هەرکەسێکیش بەزمان باوەڕ بێنێت و دەری ببڕێت ئەوە باوەڕداره با کردەوش ئەنجام نەدات [٣]. مورجئیەی تەواویش ئەوانەن کە ئەڵێن " لەگەڵ باوەڕدا ئەنجامدانی تاوان زیانی نیە و لەگەڵ بێ باوەڕیشدا تاعەت سوودی نیە ئەمەش وتەی جەهم و هاوەڵەکانیەتی [٤].

یەکەم کەسێکیش کە باسی ئیرجائی کرد غەیلانی دیمەشقی بوو وەك شەهرستانی دەڵێ [٥]. سەبارەت بەو ئیرجائەیش کە دراوەتە پاڵ أبی محمد حەسەنی کوڕی محمدی ناسراو بە ئیبن الحنفیە ئەوە ئیرجائی بواری باوەڕ نیە، بەڵکو ئیرجاعو دواخستنی مەسەلەی ئەو هاوەڵانەیە کە لەگەڵدایە کرا بەشەڕ هاتوون و سپاردنیەتی بە پەروەردگار [٦].

ئیبن سەعدیش لە ژیاننامەیدا ئەڵێ: ئەو یەکەم کەسێکە کەباسی لە ئیرجائی کردووە، هەروەها باسی ئەوە دەکات کە زاذان و مەیسەرە چوونە لای و لۆمەیان کرد لەسەر ئەو نامەیەی دەربارەی

---

[١] - مجموع الفتاوى(٨ / ١٩١).

[٢] - الاثار الواردة(١ / ٥٣٨).

[٣] - الفرق بين الفرق للبغدادي، ل: ٢٠٢ وسطية اهل السنة، ل: ٢٩٤.

[٤] - الملل و النحل للشهرستانى(١ / ١٣٩).

[٥] - موقف اهل السنة من اهل الاهواء و البدع(١ / ١٥٢).

[٦] - وسطية اهل السنة، ل: ٢٩٤.

ئیرجاء نووسیبوی ئەویش بە زاذان ی وت: ئەی باوکی عومەر بە ئاواتم بەمردمایە و ئەوەم نەنووسیایە [1].

ئەم کتێبەش ئیرجائی مەسەلەی ئەو کەسانە دەکات کە بەشدار بوون لەو ئاژاوەیەی کە لەسەردەمی پێشەوا عوسمان دا ڕووی دا واتە سپاردنیان بە خوا [2] هەروا ئیبن حەجەر باسی ئەوە دەکات کە ئەو کتێبەی خوێندۆتەوە کە حەسەنی کوڕی محمد دایناوە و ئەڵێ: مەبەست بەو ئیرجائەی کە حەسەنی کوڕی محمد قسەی لێکردووە ئەو ئیرجائە نیە کە ئەهلی سوننەت باسیان لێوەکردووە و پەیوەندی بە باوەڕەوە هەیە [3]. گرنگترین ئەو قسانەش کە مورجیئە تیایدا جیاواز بوون لە ئەهلی سوننەت:

- دواخستنی کردەوە لە باوەڕ و دانەنانی بە بەشێك لێی.
- ئەوەی کە قەدەریە توندڕەوەکانیان وتویانە: کە لەگەڵ باوەڕدا گوناه زیانی نیە هەروەك تاعەت لەگەڵ بێ باوەڕیدا سوودی نیە [4].

هەروەها چەند ئاسەوارێك لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە کە بەڵگەیە لەسەر زیاد بوونی باوەڕ و دانانی کردەوە بە بەشێك لێی ئەم ئاسەوارانەش وەڵامێکە بۆ مورجیئە بە تایبەت کە زانایان ئەم ئاسەوارانەیان لەکاتی وەڵامدانەوەی مورجیئە داهێناوە.

هەروەها ئاگادارکردنەوە و هۆشداری دان لە بیدعە بە هەموو جۆرەکانیەوە لە عومەرەوە(ﷺ) هاتووە هیچ بیدعەیەکیش هێندەی بیدعەی ئیرجا ئاشکرانیە [5]، پێشتریش ئەم وتەیەمان هێنا کە دەڵێ: ئیسلام چەند سنور و شەریعەت و سوننەتێکی هەیە و هەرکەس کاری پێ بکات ئەوە باوەڕی تەواوە هەرکەسیش کاری پێ نەکات ئەوەباوەڕی لاوازە، جا ئەگەر من بمێنم ئەوە فێرتانی دەکەم و پابەندتان

[1] - العلل و النحل للشهرستانی(١ / ١٣٩).
[2] - قضية الثواب و العقاب للسميري، ل: ٣٠
[3] - تهذيب التهذيب(٢ / ٣٢٠) قضية الثواب و العقاب، ل: ٣٠.
[4] - وسطية اهل السنة بين الفرق، ل: ٢٩٥.
[5] - الاثار الواردة(٢ / ٨١٣).

دەکەم پێوە، ئەگەر مردیشم ئەوە من خەمی هاورێیەتی ئێوەم نامێنێت [1]. هەروەها ئەڵێ: هیچ کەسێك پاساوی نیە کە پاش سوننەت دوای گومراییەك بکەوێت و بەباشی بزانێت [2]. وتوشیەتی: ئەگەر نەمانی هەر بیدعەیەك و زیندوو کردنەوەی هەر سونەتێك لەسەر دەستی من بە برینی بەشێك لە جەستەم بەدی بێت ئەوە لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار پێم ئاسانە [3].

لەمەی پێشەوە دەردەکەوێت کە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) سوو بووە لەسەر ڕەتکردنەوەی هەر جۆرە بیدعەیەك ئەگەرچی ئەوە ببێتە هۆی لە دەستدانی چەند ئەندامێکی لەشی، هەروەك لەم ئاسەوارانەدا قسەی ڕاست سەبارەت بە باوەڕدەخاتە ڕوو کە هەموو جۆرە پەرستشێك دەگرێتەوە، تێگەیشتنی عومەری کوڕی عبدالعزیزیشم بۆ باوەڕ لە باسی گرنگیدانی بە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت دا ڕوونکردۆتەوە، کە چۆن بڕیاری داوە خەڵکی فێر بکات و پابەندیان بکات پێوەی بە هەموو بەشەکانیەوە، ئەمەش وەڵامێکە بۆ بیدعەی ئیرجاء چونکە چەسپاندنی حەق و پوچەڵکردنەوەی بە تاڵە، ئەمەش کە لەوەوە هاتووە حەقێکی سەلمێنراوە لە بواری باوەڕدا [4].

ئەوەش کە ئیبن سەعد لە طبقات دا گێڕاویەتیەوە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز کاتێ بوو بە خەلیفە عون ی کوڕی عبداللە و موسای کوڕی ابی کثیر و عومەری کوڕی حمزە هاتنە لای و لە هەندێ سەرچاوەشدا عومەری کوڕی زەریش هاتووە و دەربارەی ئیرجا لەگەڵیدا داوان و مشتومڕیان لەگەڵدا کردووە و وتویانە کە ئەو هاوڕابووە لەگەڵیاندا و بە هیچ جۆرێك جیاواز نەبووە لە گەڵیاندا [5]. ئەم ڕیوایەتە ڕاست نیە لەبەر ئەم هۆیانە:

- چونکە ئیبن سەعد بەبێ سەنەد گێڕاویەتیەوە کە واتە بچڕاوە - منقطع یە -.
- تیایدا دەستەواژە - زعموا - و وتیان بەکار هاتووە ئەمەش لاوازە.

---

[1] - سيرة عمر لابن الحكم، ل: ٤٠، الاثار الواردة(٢ / ٨١٣).

[2] - الاثار الواردة(٢ / ٨١٤).

[3] - الطبقات(٥ / ٣٤٣).

[4] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٨١٤).

[5] - الطبقات(٦ / ٣٣٩) سير اعلا النبلاء(٥ / ١٠٤).

●ئەم لافلێدان و وتیانەش پشتی پێ نابەسترێت، چونکە ئەوانەی گێڕاویانەتەوە تۆمەتبار کراون بە ئیرجاء[1].

هەر چەندە ئەگەر ئەو ڕیوایەتەش بە ڕاست بزانین ئەوە عەونی کوڕی عبداللە ی کوڕی مەسعود پەشیمان بوویەوە لە ئیرجاء وەك لالکائی بەسەنەدی خۆیەوە لە نەوفەلی هذلي لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و ئەڵێ: عونی کوڕی عبداللە ی کوڕی مەسعود کە زانا ترین و پەروەرشیار ترین خەڵکی مەدینە بوو و مورجیئە بوو، بەڵام پاشگەز بوویەوە و بە شیعر وتی:

لأول ما نفارق غير شك    نفارق ما يقول المرجئونا

و قالوا مؤمن من اهل جور    و ليس المؤمنون بجائرينا

وقالوا مؤمن دمة حلال    وقد حرمت دماء المؤمنينا [2]

واتە: یەکەم شتێك کە بێ گومان لێی جیادەبینەوە ئەوەیە کە مورجیئە ئەیلێن، ئەڵێن موسڵمانە و ستەمکارە و موسڵمانیش نابێ ستەمکار بێت، یان ئەڵێن موسڵمانە و خوێنی حەڵاڵە لە کاتێکدا کە خوێنی موسڵمانان حەرام کراوە.

بەم شێوەیەش دەرئەکەوێت کە عەونی کوڕی عبداللە(ﷺ) وازی لە ئیرجاء هێناوە و لێی پاشگەز بووەتەوە پێش ئەوەی پەیوەندی بکات بە عومەرەوە و ببێتە یەکێك لە کەسە نزیکەکانی [3].

## شەشەم: جوهەمیە:

ئەدرێتە پاڵ جەهمی کوڕی صفوان کە خەڵکی خوراسان بووە و خزمەتکاری بنی ڕاسب بووە، لەسەر دەستی جەعدی کوڕی درهەم فێر بووە و نووسەری حارسی کوڕی سریح بووە [4]. کە ئاژاوەی لە دژی دەوڵەتی ئەمەوی لە خوراساندا بەرپا کرد، جەهمیش ژیاننامەی ئەخوێندەوە و داوای دەکرد کە بیکەن بە والی [5] و خەڵکیشی هان دەدا بۆ چوونەدەر لەگەڵیدا و لە ساڵی ١٢٨ کۆچی ڕووبەڕوو بونەوەیەك لە نێوان سوپای ئەمیری خوراسان – نصری کوڕی سیار – و سوپای

---

[1] - الاثار الواردة(٢ / ٨١٥).

[2] - شرح اصول اعتقاد اهل السنتة(٥ / ١٠٧٧).

[3] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(٢ / ٨١٦).

[4] - حقيقية البدعة و احكامها(١ / ١١٥).

[5] - الكامل في التاريخ، له الحقيقة و البداية(١ / ١١٥).

حارسی کوڕی سریح دا ڕووی دا و جههمی کوڕی صفوانیش له سوپای حارس دا بوو، کهسێك دهمی بریندار کرد و کوشتی ئهشلێن به دیل گیراوه و براوهته بهر دهست سلم ی کوڕی أحوز [1] و ئهویش فهرمانی کوشتنی داوه[2]. گرنگترین بنهماکانی جوههمیهش ئهمانهن:

١- جههم بیروڕاکانی جهعدی کوڕی درههمی ڕاگهیاند که بریتیه له ڕهتکردنهوهی سیفهتهکانی پهروهردگار و به دروستکراو زانینی قورئان پاشان چهند بیدعهیهکی تری بۆ زیاد کرد.

٢- بڕیاردانی جهبر واته ئهوهی که مرۆڤ هیچ توانا و دهسهلاتێکی نیه و به زۆر کردهوهکانی پێ دهکرێت.

٣- باوهڕ بهلایانهوه تهنها زانیاریه، واته باوهڕ بریتیه له ناسینی پهروهردگار بێ باوهڕیش نهناسینیهتی.

٤- پێیان وایه که به ههشت و دۆزهخ نامێنێت و وتویانه پاش ئهوهی که بهههشتی و دۆزهخیهکان دهچنه ناویهوه به ههشت و دۆزهخ نامێنێت، چونکه بهڕای ئهوان ئهم ههموو جموجولّه ناگونجێت.

٥- وتویانه: وانستی پهروهردگار پهیدا بوو – حادثه – چونکه پێیان وایه که ناکرێت شتێك پێش دروستبوونی بزانرێت [3].

ڕهتکردنهوهی ئهم سیفهتانهشی له جهعد و له فهیلهسوف و سمنیهکانهوه وهرگرتووه [4]. دیاره جههم زمان پاراو بووه و خۆشی هیچ زانیاریهکی نهبووه و تێکهڵی زانایانیش نهبووه، سمنیهکانیش لهگهڵیدادوان و پێیان وت: وهسفی ئهو خوایهمان بۆ بکه که دهیپهرستی، ئهویش چووهماڵهوه و نههاته دهرهوه تا چهند ڕۆژێك پاشان هات و وتی: خوا ئهو ههوایهیه له گهڵ ههموو شتێك و لهناو ههموو شتێك دایه و هیچ شتێك خاڵی نیه لێی، پێشهوا ئهحمهدیش(رضي الله عنه) مشتومڕێکمان بۆ

---

[1] - البداية و النهاية، له حقيقة البدعة و احكامها(١ / ١١٥).

[2] - ههمان سهرچاوه(١ / ١١٦).

[3] - تناقض اهل الاهواء والبدع في العقيدة(١ / ١٣١).

[4] - سمنية: کۆمهڵێکی بێ باوهڕن له هیندیهکان فهلسهفهیهکی تایبهت و خوێندنگهیهکی هزری گومڕایه. ظاهرة الارجاء في الفكر الاسلامي(٢ / ٣٩٢).

دەگێڕێتەوە کە لە نێوان جەهم و سمنیە دا ڕووی داوە سەبارەت بە بوونی خوا لە کۆتاییدا جەهم خوای گەورەی بە ڕۆح چواند کە نابنرێت و نابیسترێت و هەستی پێ ناکرێت [1].

ئیبن تەیمیە ئەلێ: ئەڵێن جەعدی کوڕی درهەم خەڵکی حەڕرانە کە صابئە و فەیلەسوفێکی زۆریان تیابووە، بۆچوونی ئەوانەش سەبارەت بە پەروەردگار ڕەتکردنەوە و نکوڵی کردنی سیفەتەکانیەتی: پێیان وایە تەنها سیفەتی سلبی و زیاد و ئاوێتەی هەیە... بەم پێیەش جەعدی ئەمەی لە صابئەو فەیلەسوفەکانەوە وەرگرتووە [2].

جەهمیش هەموو بیروڕاکانی لە جەعدەوە وەرگرتبوو [3]، سەبارەت بە بیروڕای جەبرو سەپاندنیش ئەوە پێش ئەو هاوەڵگەرە عەرەبەکان وتبویان، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ﴾ النحل: ٣٥).

لێرەدا خوای گەورە باسی ئەوەمان بۆ دەکات کە هاوەڵگەران خۆیان فریودا بوو بەمەسەلەی قەدەر، ناوەڕۆکی قسەکانیشیان ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر خوای دژ بەوکارانە بێت کە ئێمە دەیکەین ئەوە بەسزادان پێی دەنواندین و یان نەیدەهێشت ئەنجامی بدەین [4].

ئەوەش کە دەڵێن باوەڕ تەنها زانیاریە ئەوە مورجیئەش پێش ئەوان وتویانە، سەبارەت بە لەناوچوونی بەهەشت و دۆزەخیش ئەوە لە ئیسماعیلی [5] و باطني و ئەهلی کەلام و جولەکەوە هاتووە ابن ابی العز ڕەحمەتی خوای لێ بێت سەبارەت بە جەهمی کوڕی صفوان ئەڵێت: باسی لە تیاچوونی بەهەشت و دۆزەخ کردووە و پێش ئەو کەس لەناو هاوەڵان و شوێنکەوتوان و پێشەوایانی موسڵمانی ئەهلی سوننەتدا ئەم قسەیەی نەکردووە، ئەمەش بە هۆی ئەوئەسڵە خراپەوە یە کە باوەڕی

---

[1] - الرد علی الجهمیة و الزنادقة للامام احمد، ل: ٤٤، ٤٥.

[2] - الفتاوی(٥ / ٢١، ٢٢) تناقض اهل الاهواء و البدع(١ / ١٣١)

[3] - تناقض اهل الاهواء و البدع(١ / ١٣١).

[4] - تفسیر القرآن العظیم(٢ / ٦٢٦).

[5] - ئیسماعیلیەکان: شوێنکەوتوانی محمدی کوڕی ئیسماعیلن کە کوڕی جەعفەری صادقە، باوەڕیان بە تەفسیری باطني هەیە، گوایە خوای گەورە ئەم زانستەی تایبەتکردووە بە عەلی کوڕی ابی طالب و هەر کەس پێچەوانەی عەلی بێت بەکافری دەزانن، الفرق بین الفرق، ل: ٤٢، تناقض اهل الاهواء و البدع في العقیدة(١ / ١٣٢).

بیّ هەبووە کە ئەویش نەگونجانی بوونی ئەو هەمووە شتە بەدی هاتووەیە ئەمەش مەسەلەی سەرەکیە لای ئەهلی کەلام [1].

ئەهلی کەلامیش بەگشتی هیچ شتێکی قورئان وسوننەت لەلایان دەلالەتێکی یەکلاکەرەوە و(قطعي) نیە، بەڵکو دەلالەتی هەمووی بەلایانەوە(ظني) و گوماناویە و زانست و زانیاری و زاراوەکانیان لە فەیلەسوف و خاوەن لۆژیکەکانەوە(مناطقة) وە وەرگرتووە [2]. کە لە بنەڕەتدا ئەگەڕێتەوە بۆ ئاگر پەرست و گاور و جولەکە، ئەوەش کە دەڵێن زانست و عیلمی خوا نویّ و بەدی هێنراوە ئەوە جەهم لە مەعبەدەوە وەریگرتووە و مەعبەدیش لە سوسن ی گاورەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر کاریگەری بوونی سەرانی ئەم کۆمەڵانە و وەرگرتنی بیروڕاکانیان لە کۆمەڵە گومڕاکانەوە [3].

ئەو ئاسەوارانەش کە لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە چەند وەڵامێکی گشتیە بۆ جوهەمیە و زانایانی سەلەفیش لەناو وەڵامەکانیاندا هێناویانە لەو زانایانەش پێشەوا ئەحمەد و دارمی و چەند زانایەکی تری سەلەف، لە جەعفەری کوڕی برقانەوە ئەڵێ: پیاوێك هاتە خزمەت عومەری کوڕی عبدالعزیز و پرسیاری لێکرد سەبارەت بە ئارەزووەکان ئەویش وتی: سەیری ئاینی کابرای عەرەبی دەشتەکی و غوڵامەکە بکە لە کتێبدا و شوێنی بکەوە و واز لە غەیری ئەوە بێنە [4].

ئەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) و کاربەدەستانی دوای خۆی چەند سوننەتێکیان بڕیارداوە کە دەست پێوە گرتنی دەستگرتنە بە قورئانەوە و بەهێزیە لە ئایندا، کەس بۆی نیە بیگۆڕێت یان چاو ببڕێتە شتێك کە پێچەوانەیەتی، هەر کەس شوێنی بکەوێت ڕێنمونیکراوە و هەر کەس پشتی پیّ ببەستێت سەرکەوتووە و هەرکەسیش پێچەوانەی بجولێتەوە و شوێن ڕێبازێکی تر بکەوێت جگە لە ڕێبازی موسڵمانان ئەوە خوای گەورە ئەیداتە دەست خۆی و دەیخاتە دۆزەخەوە کە خراپترین

---

[1] - شرح العقيدة الطماوية، ل: ٤٢٠.

[2] - تناقض اهل الاهواء و البدع(١ / ١٣٣).

[3] - هەمان سەرچاوە(١ / ١٣٣).

[4] - الاثار الواردة عن عمر بن عبدالعزيز في العقيدة(٢ / ٨١٩).

چارەنووسە [1]، عبداللە ی کوڕی عبدالحکم ئەڵێت: گوێم لە مالیك بوو ئەیوت: سەرسام بووم بە سوور بوونی عومەر لەسەر ئەو مەسەلەیە [2].

عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەڵێت: هەر کەسێك ئاینی بکاتە جێی مشتومڕ ئەوە ئەم بەرو ئەو بەری زۆر دەکات [3]. ئەم ئاسەوارانەی عومەریش لەلایەن زانایانی سەلەفەوە لە بواری وەلاّمدانەوەی جوهەمیەدا هێنراوە، دیارە ئەمە وەلاّمە بۆ هەموو بیدعەچیەك و فەرماندانە بە دەستگرتن بەوەی کە سروشتی پاك ئەیخوازێ وەك سەلماندنی سیفەتە تێرو تەواوەکانی پەروەردگار و بڕیاردانی بەرز و بلّندی خوا و ئەو سیفەتە جوانانەی تر کە سروشتی پاك ئەیسەلمێنێ، هەروەها فەرمانداني بە نەهی کردن لە مشتومڕ کردن لە ئاین دا بە بێ زانیاری، دیارە جەهمیش بە هۆی نەبوونی زانیاریەوە کاتێ کەوتە مشتومڕ و جەدەلەوە و خۆی گومڕا بوو و خەلّکیشی گومڕا کرد، سەلەفی ساڵحیش بەلّگەیان بەوە دەهێنایەوە کەلە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتبوو دەربارەی دەستگرتن بە سوننەتەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خەلیفەکانی ڕاشدین دوای ئەو وەلاّمدانەوەی بۆ جوهمیە وەك ئەوەی کە ئیبن تەیمیە کردی لە الفتوی الحمویە دا باسی ئەوە دەکات کە ابو القاسمی ئەزجی بەسەنەدی خۆی لە طرفي کوڕی عبداللە وە، ئەلّێ گوێم لە مالیکی کوڕی ئەنەس بوو ئەگەر باسی کەسێکی لابکرایە کە فەرموودەکانی بواری سیفەتەکان ڕەتدەکاتەوە ئەیوت: عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەلّێ و ئاسەوارەکەی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاربەدەستانی دوای ئەوەوە باس دەکرد..

شاطبیش باسی ئەم ئاسەوارە " اثر " دەکات و ئەلّێت: وتەیەکی کورتە چەندین بنەمای باشی سوننەتی لە خۆگرتووە لەوانە نەهێشتنی مەسەلەی بیدعەو داهێنان و ستایشکردنی شوێنکەوتوانی سوننەت و زەمکردنی ئەو کەسەی کە لێی لادەدا هەروەها ئەوەی کە ڕێبازی کار بەدەست و وەلی ئەمرەکان و کردەوەکانیان ڕاڤەی قورئان و سوننەتە، دیارە وتەکانی عومەریش(ﷺ) چەندین بنەمای باش و بە سوودی لە خۆگرتووە [4].

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٨٢٠).

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٤٠.

[3] - شرح اصوال اعتقاد اهل السنة و الجماعة(٢ / ٤٢٥).

[4] - الاعتصام، لە الاثار الواردة وة(٢ / ٨٢٢).

پێشەوا ئەحمەدیش(ﷺ) لە کتێبی الرد علی الجهمیە دا ئاسەوارێکی(اثرێکی) لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هێناوە و ئەڵێ: هەرکەس ئاینی بکاتە جێی مشتومڕ ئەوە ئەمبەر و ئەو بەرکردنی زۆر دەبێت [1].

موعتەزیلەش لە جوهەمیەوە نکوڵی کردنی سیفەتەکانی پەروەردگار و مەسەلەی دروستکردنی قورئانیان گواستۆتەوە، ئەم ڕێکەوتنەش لە نێوان موعتەزیلە و جوهەمیە دا لەسەر نەفی کردن و نکوڵی کردنی سیفەتەکانی پەروەردگار وَ مەسەلەی دروستکرانی قورئان وای لە زۆرێك لە زانایانی ئیسلام کردووە کە موعتەزیلە بەجوهەمیە ناوبەرن، بۆیە دەبێ وریابین لە کاتێکدا کە ناوی ئەو کۆمەڵانە لە بری یەکتر بە کار دێنین، چونکە هەر کۆمەڵە و کۆمەڵێکی تر هەیە کە هاوبەش بێت لە گەڵێدا لە بەشێك لەبەشەکانی بیروباوەڕدا جا ئەگەر ناوی ئەم کۆمەڵە بنێین لە کۆمەڵێکی تر کە هاوبەشە لەگەڵێدا ئەوە تێکەڵاوی ڕوودەدات و قسەکان دروست دەرناچن، چونکە دەبێ ناوی هەر کۆمەڵێك لە خۆی بنێین و بۆ کۆمەڵێکی تر بەکاری دەنەهێنین، چونکە ئەمە لە ڕووی زانستیەوە وردتر و تەواو ترە [2].

### حەوتەم: موعتەزیلە:

ناوێکە بۆ ئەو کۆمەڵەی کەلەسەرەتایی سەدەی دووەمی کۆچیدا لەسەر دەستی واصلی کوڕی عطاء [3] دەرکەوت و ڕێبازێکی ئەقڵی ڕوتیان لە لێکۆڵینەوەی بیروباوەڕدا گرتەبەر و بڕیاریاندا کە هەموو زانستەکان ئەقلین لە ڕووی ڕوودان و پێویستیەوە پێش و پاش هاتنی شەرع، ئەمانەش ئەهلی کەلام و مشتومڕکار موجادە لە چین [4].

١- **سەرهەڵدانی موعتەزیلە و هۆی ناونانیان بەوناوەوە:** کابرایەك چووەلای حەسەنی بەسری و وتی: ئەی پێشەوای ئاین، لەسەردەمی ئێمەدا کۆمەڵێك دەرکەوتون کە ئەوکەسانە کافر

---

[1] - الرد علی الجهمیة الامام احمد، ل: ٦٩.

[2] - قضیة الثواب و العقاب بین مدارس الاسلامیین، ل: ٣٤.

[3] - ابو حذیفة واصلی کوڕی عطاء، خاوەنی شیعری غەزەل و موتەکەلیم، یەکێك بووە لە سەر سەختتر موعتەزیلە و قوتابی حەسەنی بەسری بووە، چەند نووسراوێکی هەیە وەك: اصناف المرجئة، معاني القرآن، لە چینی چوارەمی موعتەزیلە یە لە ١٣١ ك کۆچی دوایی کردووە.

[4] - التنبیة والرد للملطي، ل: ٥٠، تأثیر المعتزلة في الخوارج و الشیعة، عبداللطیف الحفطي، ل: ١.

دەکەن کە خاوەنی گوناهی گەورەن کە ئەوانیش خەواریج و کۆمەڵێکی تر کـە چارەنووسـی خاوەن گوناهە گەورەکان دەسپێرن بە پـەروەردگار، و گونـاهی گـەورەش بەلایانـەوە لەگـەڵ بوونی باوەڕدا زیانێکی ئەوتۆی نیە، ئەمانەش مورجیئەی ئەم ئوممەتەن، جا ئایا حوکمی تـۆ چیـە دەربارەی بیروباوەڕی ئەوانە؟

ئەوە بوو حەسەنیش بیری لـەمە کردەوە و پـێش ئـەوەی وەڵام بداتـەوە واصـل وتـی: مـن نـاڵێم خاوەنی گوناهی گەورە بە تەواوی باوەڕدار یان بێ باوەڕە، بەڵکو ئەوە پلەوپایەیەکی هەیە لـە نێـوان ئەو دوو پلـەیەدا و نەباوەڕدار و نەبێ باوەڕە. پاشان ڕاستەوخۆ لە ئەڵقەی شێخ حەسـەنی مامۆسـتای جیا بوویەوە و چووە گۆشەیەکی مزگەوتەکەوە و ئەوەی بڕیاردا کـە بـەهاوەڵانی حەسـەنی بەسـری وت، حەسەنیش وتی: واصل جیابوویەوە لێمان، بۆیـە خـۆی و هـاوەڵانی نـاونران موعتەزیلـە واتـە جیابوو و گۆشەگیرەکان [1]، ئەم وتەیەش زۆرینەی مێژوو نووسانی کۆمەڵەکانی لـەسەرە [2].

ناوی موعتەزیلەش هیچ پەیوەندیەکی بە هاوەڵانی بەڕێزەوە نیە لە دوور و نزیکەوە، چـونکە ئـەو هاوەڵانەی کە دوورکەوتنەوە لە ئاژاوەی نێوان عەلی و موعاویە لە جەنگی الجمل دا پێیـان نـەدەوترا موعتەزیلە و جیابووەوە لە ڕووی ئیصطلاحـەوە، بـەڵکو ئـەوە تـەنها لـە ڕووی زمانەوانیـەوە بـوو، بەڵگەش لـەسەر ئەمە ئەوەیە کە ئەو موعتەزیلەیەی کە ئێمە باسیان لێوە دەکەین بۆیە پێیان دەوترێـت موعتەزیلە، چونکە لە مەزهەبی ئەهلی سوننەت جیابوونەتەوە، ئاشکراشە کـە هـاوەڵانی پێغەمبـەری خوا(ﷺ) پێشەوایانی ئەهلی سوننە و جەماعەتن ئیتر چۆن بە پێشینانی ئەو کۆمەڵە دادەنرێن کـە لـە بری شەرع کاریان بە عەقڵ دەکرد؟

لێرشەوە بە هەڵەدا چوونی ئەو کەسانە دەردەکەوێت کـە هاوەڵانیـان بـە پێـشەنگ و پێـشنیانی موعتەزیلە زانیوە، دیارە موعتەزیلە جیابوونەوەیان بە دینداری دەزانی و بیروبۆچـوونەکانیان لـەسـەر بنەمای جیابوونەوە دادەڕشت، بەڵام هاوەڵان خۆیان لە ئاژاوە جیادەکردەوە بۆ خۆ پاراستن لـەتاوان و خوێن ڕشتن [3].

---

[1] - الفرق بين الفرق، ل: ١١٨.

[2] - آراء المعتزلة الاصولية، د. على الضو يحي، ل: ٧١.

[3] - آراء المعتزلة الاصولية، ل: ٧٦.

موعتەزیلە بەبوونی خوێندنگەو ڕێبازێکی فیکری تایبەت خۆیان لە ئەهلی سوننەت جیادەکردەوە کە تیایدا بالاْ دەستی تەنها بۆ ئەقڵە و دەست بەرداری دەقە شەرعیەکان بوون کە تاقە ڕێنمایی پارێزەرە لە لادان [1].

٢- **کۆمەڵەکانی موعتەزیلە :** دیارە بنەمای سەرەکی کە موعتەزیلە پشتیان پێ دەبەست بریتی بوو لە ئەقڵ و لۆژیك و بە هۆیەوە شتەکانیان دەسەلماند یان ڕەتیان دەکردەوە، بە هۆی ڕۆچوونی موعتەزیلەش لە فەلسەفەی یۆنانیدا کە پشتی بەجەدەل و مشتومڕ دەبەست ناکۆکی کەوتە نێوان ئەو کۆمەڵەیەوە و ڕاکانیان جیاوازی تێکەوت و بوون بە بیست و دوو کۆمەڵە و گروپەوە.

وەك واصیلە و عەمرویە و هەذەلیە و نظامیة و... هتد. هەر کۆمەڵێکیش لەمانە چەند بیدعەیەکی تایبەت بە خۆیان هەیە و، بەلاْم و هەموویان یەکدەنگن لەسەر پێنج بنەماکە و تەنها جیاوازیان لە وردەکاریەکانی ئەم بنەمایانەدایە و ئەمەش سەیر نیە، بەو پێیەی کە ئەقڵ پێوەرە لایان و هەریەکە گرنگی بە بوارێکی جیاواز لەوی تردەدات [2].

٣- **ڕۆڵی موعتەزیلە لە زیندوو کردنەوەی بیروباوەڕی ئەو کۆمەلاْنەی کە پێش خۆیان هەبوون:** موعتەزیلە لە سێ کۆمەڵی پێش خۆیەوە شتی وەرگرتووە و بیرو بۆ چوونەکانی زیندوو کردونەتەوە بە جۆرێك لە جۆرەکان بۆ نموونە لە خەواریج و قەدەریە توندڕەو و جوهەمیەکانەوە شتی وەرگرتووە.

**ئەوەی کە لە خەواریجەوە وەریان گرتووە:**

أ- حوکمی خاوەنی گوناهی گەورە لە ڕۆژی دواییدا: بەغدادی ئەڵێ: واصل و عمر هاوڕابوون لەگەڵ خەواریج دا لە پشتگیری کردن لە سزادارانی خاوەنی گوناهی گەورە لە ئاگردا لە گەڵ ئەوەدا کە بە یەکتا پەرستی دەزانن نەك هاوەڵگەریان بێ باوەڕ [3]. لەم دەقەشەوە بۆمان

---

[1] - تأثير المعتزلة في الخوارج و الشيعة، ل: ١٨.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٩.

[3] - الفرق بين الفرق، ل:١١٩. تأثير المعتزلة، ل: ٢٠.

دەرئەکەوێت کە موعتەزیلە بیروباوەڕی خەواریجیان هەبوو سەبارەت بە خاوەنی گوناهی گەورە لە ڕۆژ دواییدا، بەڵام لە دونیادا بە بێ باوەڕیان دانەناوە [1].

ب- یاخبوون لە کاربەدەست و پێشەوای ستەمکار: خەواریج کۆ دەنگن لەسەر پێویستی یاخیبوون و دەرچوون لە دەسەلاتی پێشەوای ستەمکار و ڕووبەڕوو بوونەوەی بە چەك و هێز بۆ نەهێشتنی ستەم و چەسپاندنی دادگەری – وەك دەلێن – [2].

دەقەکانی فەرمانکردن بەچاکە و ڕێگری کردن لە خراپەشیان بۆ دەرچوون لە دەسەلاتی کار بەدەستان ویاخیبوون لێیان و کوشتار کردنی کەسانی جیاواز لەگەلێاندا بەکار هێناوە [3].

موعتەزیلەش ئەم بنەمایەیان لە خەواریجەوە وەرگرتووە و لە ڕووی تیۆریەوە زیندوویان کردۆتەوە لە چوارچێوەی بنەمای فرماندان بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە دا، ئەبولحەسەنی ئەشعەری ئەلێ: موعتەزیلە کۆ دەنگن – جگە لە أصم – لەسەر پێویستی فرماندان بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە لەگەڵ بوونی توانا و دەسەلات بە زمان و دەست و شمشێر – هێز – بەهەر شێوەیەك بتوانن [4]، لە شوێنێکی تریشدا ئەلێت: یاخیبوون لە سوڵتانیان بە پێویست زانیوە لەکاتی تواناو دەسەلاتدا [5].

ج- مەسەلەی تەئویل [6]: خەواریج یەکەمین کەسانێکن کە دەرگای تەئویلی نارەوایان خستە سەرپشت لە مێژووی ئوممەتدا، ئەوە بوو دەستیان دایە تە ئویلکردنی ئەو دەقانەی کە باس لە حوکم کردن دەکات شتێکی تر جگە لە قورئان، هەروەها ئەو دەقانەی کە هەرەشەی تیایە یاخود باس لە فرمان کردن بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە دەکات، پاشان کۆمەڵەکانی تر هاتن و ئەم ڕێبازەبان لەوانەوە وەرگرت و بەکاریان هێنا بۆ بەڵگە هێنانەوە بۆ ئەو بیدعانەی کە دایان هێنا بوو، لەو کۆمەلانەش: موعتەزیلە کە کە دەقەکانی سیفاتی پەروەردگاریان

---

[1] - تأثير المعتزلة في الخوارج و الشيعة، ل: ٢٠.

[2] - مقالات الاسلاميين(١ / ٢٠٤) الملل و النحل(١ / ١١٥).

[3] - الخوارج اول الفرق في تاريخ الاسلام، ناصر العقل، ل: ٣٧.

[4] - مقالات الاسلاميين(١ / ٣٣٧) تاثير المعتزلة، ل: ٢١.

[5] - مقالات الاسلاميين(٢ / ١٥٧) تاثير المعتزلة، ل: ٢١.

[6] - تەئویلی نارەوا: ئەوە یەکە و شەیەك لەماناکەی خۆی لابدرێت و مانایەکی تری پێ بدرێت کە پێچەوانەی خۆی بێت بەبێ بەڵگە.

تەئویل کرد و بڕیاری تەعطیل و لە کارخستنی سیفەتەکانی پەروەردگار یان دا هەرچەندە خەواریج دەقەکانی سیفاتی پەروەردگار یان تەئویل نەکرد بوو [1].

ئیبن تەئیمیە ئەڵێ: عیلمی کەلام و تەئویلی صیفات لەناو خەواریج دا نەبوو هەتاوەکو سەرهەڵدانی موعتەزیلە [2]، پاشان موعتەزیلە دەقەکانی قەدەریان تەئویل کرد، کە ئەمەش لای خەواریج ڕووی نەدا بوو، بە کورتی: موعتەزیلە ڕێبازی تەئویلیان لە خەواریجەوە بۆ ماوەتەوە و بەباشی دەستیان پێوەگرتووە و بووە بە بەناماو ڕێسایەك بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ دەقەکانی قورئان و سوننەت بەلایانەوە.

❖ **قەدەریەکان:** هەرچی قەدەریەشە ئەوە مەسەلەی ڕەتکردنەوەی قەدەریان لە موعتەزیلەوە وەرگرت و زیندوویان کردەوە، بەلاّم نەك بەو شێوە ڕۆچوەی کە ڕەتکردەنەوەی زانستی پەروەردگار لەخۆ دەگرێت کە قەدەریەیەکەمەکان لەسەری بوون، دیارە ئەم وتەیە نەما و لەناو چوو لەبەر دوو هۆ:

- کەمی ژمارەی ئەو کەسانەی کە بەم شێوە بیریان لە قەدەردە کردەوە.
- وەستانی هاوەڵان و زانایانی شوێنکەوتوان – تابعین – بە توندی دژ بە ئەم ڕایە، بە خۆ بێ بەری کردن لێی وەك ئیبن عومەر کردی(ﷺ) ئەوە بوو بەو کەسانەی وت کە باسیان کردن: پێیان بلێین کە من بێبەریم لەوانە و ئەوانیش بێ بەرین لەمن [3]، یان سوکایەتی پێکردت و ڕق لێ بوونیان وەك ئەمەی کە طاوسی کوڕی کیسان لەگەڵ معبد الجهنی دا کردی کاتێ لە طواف دا بینی و وتی: ئەمە معبدە سوکایەتی پێ بکەن [4]. یاخود بە کوشتنیان و کۆتایی هێنان بە ئاژاوەیان دوای دەرکردنی بڕیاری بێ باوەڕیان وەك بەغەیلانی دیمەشقی کرا کاتێ کە سور بوو لەسەر ئەم بیروڕانا ڕەوایە [5]، بەلاّم موعتەزیلە ئەم بیروباوەڕەیان بە شێوەیەکی میانە ڕەوانەتر زیندوو کردەوە و سیفەتی زانین و نووسینیان بۆ پەروەردگار چەسپاندوو ویست و

---

[1] - تاثیر المعتزلة في الخوارج و الشیعة، ل: ٢٢.

[2] - هەمان سەرضاوە، ل: ٢٢.

[3] - مسلم، شرح النووي، ك الایمان(١ / ١٥٦)

[4] - شرح اصول اعتقاد اهل السنة(٤ / ٦٣٧).

[5] - القضاء و القدر في ضوء الکتاب و السنة و مذاهب الناس، ل: ١١٧.

بەدیهێنانیان – خَلَقْ – ڕەتکردەوە و مرۆڤیان بە بەدیهێنەری کردەوەکانی خۆی دەزانی وپێیان وا بوو کە مرۆڤ بە ئارەزووی خۆی ئەو کارانە دەکات نەك بەویستی پەروەردگار [1].

هەربۆیە زانایان ئەمانەیان وەك قەدەریە توندڕەوەکانی پێشتر بە بێ باوەڕ لە قەڵەم نەداوە، ئیبن تەیمیە ئەڵێ: ئەوە قەدەریانەی کە نووسین و زانینی پەروەردگار ڕەت دەکەنەوە لەلایەن زانایانەوە بە بێ باوەڕدانراون، بەڵام یان بەبێ باوەڕ نەزانیوە کە سیفەتی زانینیان بۆ پەروەردگار بڕیارداوە، بەڵام بە دیهێنانی کردەوەکانیان ڕەتکردۆتەوە [2].

❖ **جوهەمیە :** ئەو هاوچەرخی و هاوسەردەمیەی نێوان ئەم دوو کۆمەڵە و ئەو پەیوەندیە تاکە کەسیانەی کە لە نێوان جەهەم و هەندێ لە هاوەڵانی واصل دا هەبوو ڕێخۆشکەر بوو بۆ ئەوەی کە موعتەزیلە بیروباوەڕی خۆیان لە جوهەمیەوە وەربگرن لەمەسەلەی یەکتاپەرستی دا کە پێکهاتبوو لە:

أ– ڕەتکردنەوەی سیفەتەکان: ئیبن تەیمیە ئەڵێ: پاشان ئەسڵی ئەم وتەیە – یەکخستنی سیفەتەکانی –کە بە تعطیل ناسراوە، ئەوە لە قوتابیانی جولەکە و هاوەڵگەرانەوە وەرگیراوە.. یەکەم کەسێکیش کە لێوەی بیستڕا بێت ئەم وتەیەی کردبێت لە ئیسلامدا جەعدی کوڕی درهەمە، وجەهمی کوڕێ صفوانیش لەوەوە وەری گرت و ڕایگەیاند بۆیە ئەم وتەیەی جوهەمیەی درایە پاڵ [3]، پاشان موعتەزیلە ئەم بیدعەیەیان لە جوهەمیەوە وەرگرت و زیندوویان کردەوە، بەڵام بە جۆرێك کە ڕۆچونی جوهەمیەی تیادا کەم کرابوویە، چونکە جوهەمیەکان ناوە پیرۆزەکانیان لە سیفەتەکان زیاتر ڕەت دەکردەوە [4]، وەك ئیبن تیمیە باسی دەکات: کە حەهم ناوە پیرۆزەکانی لە سیفەتەکان زیاتر ڕەت دەکردەوە [5]، بەڵام موعتەزیلە ناوەکان دەسەلمێنن، بەڵام سیفەتەکان ڕە ت دەکەنەوە [6].

---

[1] - الفتاوی لە تاثیر المعتزلتوة، ل: ٢٤.

[2] - الفتاوی لة تاثیر المعتزلة، ل: ٢٤ وە.

[3] - الفتوی الحموية الکبری تحقیق شریف هزاع، ل: ٤٧، ٤٨.

[4] - تاثیر المعتزلة في الخوارج و الشیعة، ل: ٢٥.

[5] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٥ لة الفتاوی وە.

[6] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٥.

ب- وتەی دروستکراوی قورئان – خلق القران – و ڕەتکردنەوەی بینینی پەروەردگار بە شێوەیەکی ڕەها: ئیبن تەیمیە دەربارەی موعتەزیلە ئەلێ: یەکتا پەرستیان هاوشێوەی یەکتاپەرستی جوهەمیە یە کە ناوەڕۆکەکەی ڕەتکردنەوەی سیفەتەکانە، ئەلێن: خوا گەورە نابینرێ و قورئانیش بەدیهێنراوە [1].

ئەمە هەموو ئەو وتانەیە کە موعتەزیلە لە کۆمەڵەکانی تری پێش خۆیانەوە وەریان گرتوە کە ئەوانیش خەواریج و قەدەریە و موهەمیەن، هەروەها موعتەزیلە ڕۆڵی خۆیان هەبوو و لە زیندوکردنەوەیدا و دەستکاری زۆریان کرد هەتاوەکو فشاری سەریان کەم ببێتەوە، هەروەك لە پاڵ ئەو بیروباوەڕانەش دا بەڵگە ئەقڵی و فەلسەفیەکانیان کۆ کردەوە، پاشان کۆمەڵەکانی تر هاتن و ئەو بیروباوەڕانەیان بەو شێوەیە لە موعتەزیلە وەرگرت و بەڵگەیان بە ڕاکانی موعتەزیلە دەهێنایەوە [2].

٤- **پێنج بنەماکەی موعتەزیلە:** هەموو موعتەزیلەکان لە نێوان خۆیاندا لەسەر پێنج بنەمای بیروباوەڕ ڕێکەوتون و بەبناغەی مەزهەبی موعتەزیلە یان داناوە، ئەم بنەمایانەش بریتین لە: یەکتا پەرستی ودادگەری و بەڵێن و هەڕەشە(وعد و وعید) و شوێنی نێوان دوو شوێنە کە(المنزلە بين المنزلتين) و فرمان بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە [3].

دەستەواژەی پێنج بنەماکەش لەلای و اصلی کوڕی عطاء دەرنەکەوت، بەڵکو لە قوتابیەکانیەوە وەرگیراو لای ابي هذيلي علاف بە تەواوی گەلاڵە بوو، کە ئەم کۆمەڵە بە هۆیەوە گەشتە چڵەپۆپەی ئیعیتزال و بابەتەکانی لەسەر دەستی بە تەواوی گەلاڵە بوون و هەندێ لەبەشەکانی کتێبەکەش لەبارەی پێنج بنەماکەوە یە، پاشان کتێبەکان یەك لە دوای یەك باسی ئەم زاراوەیان دەکرد لەسەر دەستی جەعفەری کوڕی حەرب و قاضی عبدالجبار و پیاوانی تری موعقتەزیلە [4].

لەسەرەتای دەوڵەتی عەباسیشدا جموجوڵی موعتەزیلە پەرەی سەند و دەستیان دایە ناردنی پیاوەکانیان بۆ هەموو ناوچەکان بۆ بانگەواز کردن بۆ مەزهەب و بیروباوەڕیان، هەروەها مەزهەبە کەشیان چانسی پشتگیری کردنی لەلایەن هەندێ خەلیفەی عەباسیەوە هەبوو بەتایبەت لەسەردەمی

---

[1] - تاثير المعتزلة في الخواج و الشيعة، ل: ٢٦ لة الفتاوى وە.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٦.

[3] - تاثير المعتزلة في الخوارج و الشيعة، ل: ٢٦، آراء المعتزلة الاصولية، ل: ٧٩.

[4] - نشأة الفكر الفسلفي د. النشار(١ / ٧١ / ٤) تاثير المعتزلة في الخوارج و الشيعة، ل: ٢٧.

مأمون دا، لێرەدا واز لە تاوتوێ کردنی بنەماکانی موعتەزیلە و هەڵوێستی ئەهلی سونەتە بەرامبەری دێنین تاوەکو باس لە دەوڵەتی عەباسی دەکەین بە پشتیوانی پەروەردگار.

## یەکەم: ژیانی کۆمەلایەتی: گرنگیدان بە منداڵ و خێزانەکەی:

عومەری کوڕی عبدالعزیز خودی خۆی سەرپەرشتی پەروەردە و فێرکردنی منداڵەکانی دەکرد و بەرپرسیارێتی سەرقاڵی نەدەکرد لەوەی کە بە چاکی پێیان بگەیەنێت و پەروەردەیان بکات بە سوود وەرگرتن لە ڕێنماییەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەم ڕاستیەش لەو نامانە وە کە ناردوویەتی بۆ منالەکانی وەردەگرین هەر وەها ئەو مامۆستایانەی کە دایناون بۆ پەروەردە و فێرکردنیان.

١- **پەیوەست کردنیان بە قورئان پیرۆزەوە:** عومەری کوڕی عبدالعزیز منداڵەکانی پەیوەست کردبوو بە قورئانی پیرۆزە وە بەرۆژانی هەینیدا ڕێگەی داون بچنە ژوورەوە بۆلای بەرلەوەی کە خەڵکی مۆڵەت بدات بچنە لای بۆ خوێندنەوەی قورئان لەگەڵیانسدا، کاتێك وتویەتی(إيها)[1]، ئیتر گەورەکەیان دەستی کردووە بە خوێندنەوە پاشان ئەیوت(إيها) ئەوەی لە دوای ئەو دێ دەستی دەکرد بە خوێندنەوە و بەو شێوەیە کۆمەڵێکیان قورئانەکەیان دەیخوێندەوە[2].

٢- **ئامۆژگاری کردنیان:** ئەو ساڵەی بووبە خەلیفەنامەیەکی نارد بۆ عبدالملکی کوڕی کە ئەو کاتە ئەو لەشاردا ژیاوە، عبدالملك دەڵێت: لەنامەکەدا هاتبوو و ئەیوت:.... هەر کەسێك خواستی بەهەشت دەکات و دەیەوێت لە ئاگر قوتار ببێت – مەبەستی عبدالملك و براکانی بوو – ئێستا کاتی تەوبە و پەشیمانیە و گوناهەکان چاوپۆشیان لێدەکرێت بەر لێخۆش بوون دەکەون بەر لەوەی تەمەن کۆتایی بێت و مردن یەخەی بگرێت و کار و کردەوە تەواو بێت و بگەڕێنەوە بۆلای خوا و بە هۆکار و کردەوە خراپەکانیانە و لە جێ و شوێنێك دایانبنێ کە هیچ فیدیە و شتێك فریایان نەکەوێت ولێیان وەرنەگیرێت و هیچ پاساوێك سوودی نەبێت لە ڕۆژێکدا شتە پەنهان و شاراوەکان تێیدا دەردەکەوێت و تکای تکارانی تێدا نامێنێت، تەنها خەڵکی بەهۆی کار و کردەوەکانیانەوە پێیدەگەن ئەوسا خەڵکی دەچنە شوێن و ماوای خۆیان... جا خۆزگە بەوکەسەی لەو ڕۆژەدا گوێڕایەڵی و ملکەچی خوای کردووە، وەیل و ماڵوێرانی بۆ کەسێکیش سەر پێچی فرمانەکانی کردبێت[3]، لە بەشێکی تری ئەم

---

[1] - گوتەی(إيها) ئاماژە بوە بۆ دەستکردن بە قورئان خوێندنەوە و پاشان ئەوی تریشکە لە دوای ئەو دەخوێنێت.

[2] - سياسة عمر بن عبدالعزيز في رد المظالم ص: ٥٢.

[3] - سيرة و مناقب عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي ص: ٢٩٨.

وەسیەتنامەیەدا هانی کوڕەکەی دەدات لەسەر یاد و زیکری خوا و سوپاسگوزاری کردنی پەروەردگار و هەست کردن بە چاو دێری خوایی لە کرداو گوفتارداو دەڵێت:... یادو ناوی خوا بهێنەرەوە بەرچاو بۆ ئەو هەموو فەزل و نازنیعمەتانەی ڕژاندوویەتی بەسەر خۆت و باوکتدا، چەندێك دەتوانیت بازمانت بە زۆری لە جوڵەی دابێت بۆ زیکرویادی خوا کردن بە سوپاسگوزاری کردن و تەسبیحات و(لااله الا الله) کردن، چونکە باشترین وتە و قسەیەك پێی بگەیت و بیلێییت حەمد و سوپاسگوزاری کردنی خوایە.. باشترین وەستاندنێك بۆ قسەی خراپ و وتنی سوپاسگوزاری خوا و یاد کردنەوەیەتی [1].

٣- **هاندانیان لەسەر گیانی لێبوردەیی و گومانی باش بردن:** عومەر(رضي الله عنه) هانی دەدان لەسەر برەودان بەگیانی لێبوردن و گومانپاکی بەرامبەر بەخەڵکی، چونکە هەندێك لە گومانەکان گوناهو تاوانەن(إن بعض الظن اثم) دەگێڕنەوە جارێکیان بە عبدالعزیزی کوڕی وتوە: ئەگەر قسەیەکت لە موسڵمانێکەوە بیست بە هیچ جۆرێك لێکدانەوەی خراپی بۆ مەکە.

٤- **هەڵسوکەوتی نەرم و نیان و گفتوگۆی هۆشمەندانە:** عومەر(رضي الله عنه) بە نەرم و نیانی هەڵسوکەوت و مامەڵەی لەگەڵدا دەکردن، بەبێ ئەوەی نازی زۆریان بداتێ و ببێتە هۆی خراپ کردنی ڕەوشتی منداڵان، گفتوگۆی ژیرانەی لەگەڵدا دەکردن و شێوازی قایل کردنی لۆژیکیانەی بەکار دەهێنا بۆ لێکگەیشتن لەگەڵیاندا و داخوازیەکانی جێبەجێ دەکردن [2]، دەگێڕنەوە جارێکیان عبدالله ی کوڕی داوای جل و بەرگ و پۆشاکی لێدەکات لەکاتێکدا کە خەلیفە بوو، ئەویش ناڕدوویەتی بۆ لای ئەلخیار کوڕی ڕەباحی بەسری و وتویەتی: بڕۆ بۆ لای جل و بەرگێکی منی لەلایە لێ ی وەرگرە ئەویش هیچ جۆرە پۆشاکێکی بە دڵ نابێت و دەگەڕێتەوە بۆلای باوکی و دەڵێت:

بابەگیان من داوای پۆشاکم لێ کردویت کەچی تۆمنت بۆلای ئەلخیاری کوڕی ڕەباح نارد ئەویش جۆرە جل و بەرگێکی پیشان دام کە جلوبەرگی من و خزمانم نەبوو ئەویش دەڵێت: ڕۆڵەگیان ئێمە تەنها ئەو جۆرە جل و بەرگانەمان لای ئەو پیاوە هەیە، پاشان عبدالله کوڕی پشتی هەڵکرد و ڕۆشت، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش(رضي الله عنه) وەك باوکێکی میهرەبان و پەروەرشیار

---

[1] - هەمان سەرچاوە ص: ٢٩٨.

[2] - النموذج الاداری المستخلص من ادارة عمر عبدالعزیز ص: ١٠١.

هەڵوێستێکی مامناوەندی قایلکەری نواند لە نێوان داواکاری کوڕەکەی و ئەوەی مەرج نیە هەموو داواکاریەك جێ بەجێ بکرێت و لەبەر دەستدابێت... بەر لەوەی بڕوات بانگی کردەوە و سەرپشکی کرد لەوەی ئایا دەتەوێت لە داهاتی خۆت سەر درهەمت بەسولفە بدەمێ؟

ئەویش وتی بەڵێ دەمەوێت ئەویش سەد درهەمی بە سولفە پێدا بۆ کڕینی پۆشاك بە ئارەزووی خۆی دواى ئەوەی داهات و پارەی پەیدا کرد سەد درهەمەکەی لێوەرگرتە وە [1].

لەو نموونانەش کە گێڕاویانەتەوە بۆ جوان بەڕێکردن و وەڵامدانەوەی داخوازی منداڵەکانی و قایل کردنیان کچێکی تاکێك گوارەی ئەڵماسی دەبێت و بۆ باوکی دەنێرێت و دەڵێن ئەگەر تاکەکەی تریشم بۆ پەدا بکەیت تاکو بیانکەمە گوێم ئەویش بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت، عومەریش نە وەڵامی دایەوە و نە ڕەتیشکی کردەوە و ئەو کارەی پەیوەست کرد بەوەی ئایا تا چەند ئارام دەگرێت لەسەر پشکۆی ئاگر هەستا دوو پشکۆی ئاگری بۆ نارد و پێمانوت: ئەگەر لە تواناتدا هەبێت ئەم دوو پشکۆیە لە گوێ بکەیت منیش تاکەکەیت بۆ دەنێرم [2] ئەمەش بۆ خۆی وەڵامێکی قایل کەر بوو بۆ کچەکەی [3].

٥- **سوور بوونی لەسەر دادگەوری لە نێوان منداڵەکانیدا:** ئەوەی کە پێویستە سەبارەت بە جوان مامەڵە کردنی لەگەڵ منداڵەکانی دا(ﷺ) باس بکرێت جەخت کردنەوەی بوو لەسەر مامەڵەی دادگەرانە لە نێوانیاندا سەرباری زۆری ژمارەیان، نوێژی کەسیان ڕق و کینە و بەرامبەر ئەویتریان هەڵنەگرێت، هەروەك عومەر(ﷺ) سوربووە لەسەر ڕەچاوکرجنی دادپەروەری لە نێوانیاندا تەنانەت بە باشی زانیوە کە کوڕی حاریسەش لە ژوورەکەیدا نەخەوێت، نەوەکو شتەمی تیادا بێت بەرامبەر منداڵەکانی تری [4]، لەمبارەیەوە دەگێڕنەوە کە عبدالعزیز کوڕی عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) گوتویەتی: عومەری کوڕی عبدالعزیز کوڕێکی لە کچی الحارثی کوڕی کەعب هەبووە زۆری خۆشویستووە و لەگەڵ خۆیدا خەواندوویەتی عبدالعزیزی کوڕی دەڵێت: شەوێکیان چوومە لای وتی: عبدالعزیزیت؟ وتم

---

[1] - سيرة ومناقب عمر لابن الجوزي ص: ٣١٢.

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم ص: ١٣٤.

[3] - النموذج الاداري المستخلص من ادراة عرم ص: ١٠١.

[4] - هەمان سەرچاوە ص: ١٠٢.

بەڵێ وتی خۆ شتێکی خراپ تۆی نەهێناوە بۆ ئێرە؟ وەرەژوورەوە منیش لەلای شاد کۆنەکەی[1] دانیشتم ئەویش نوێژی دەخوێند... پاش کەمێك هاتەلام و وتی: چیت دەوێت؟ وتم کەس هێندەی پیاو ڕێك منالەکەی خۆی ناناسێت، تۆ کارێك دەکەین کەگەڵ کوڕی حاریشدا لەگەڵ ئێمە دا وا ناکەیت من دڵنیانیم لەوەی بگوترێ تۆ شتێك لای ئەوە بەدی دەکەیت و لای ئێمە بەدی ناکەت عومەریش وتی: ئایا کەسێك ئەمەی فێر کردویت؟

وتم نەخێر وتی دوبارەی بکەرەوە منیش دووبارەم کردەوە وتی: بگەڕێرەوە مالچی خۆت منیش گەڕامەوە بۆ ماڵەوە کە خۆم و ئیبراهیم و عاصم و عبدالله – ئەمانە برای بون – هەموومان پێکەوە لە ژوورێکدا دەنووستین کاتێك چووینە شوێنەکانی خۆمان بۆ ئەوەی بخەوین ئەوەندەمان زانی کوڕی حاریسە – برایان بووە – هاتە ژوورەوە وتمان چیە بۆچی هاتووە وتی: ئەوەیە کە تۆ دەزانیت چیت پێ کردووم عبدالعزیزی کوڕی دەڵێت: باوکم ترسا ئەوە ستەم بێت [2] بۆیە ناردی هەتاوەکو لە ژوورەکەی ئێمەدا بخەوێت.

٦- **گەشەدان بە ڕەوشتە جوانەکان لای منداڵەکانی:** عومەر(ﷺ) سوور بوو لەسەر گەشەپێدانی ڕەوشتە جوان و ئاکارە پەسەندەکان لەلای منالەکانی و بەو پەڕی تواناوە بۆ هەل گەڕاوە هەتاوەکو بۆ ئەو مەبەستە بیقۆزێتەوە و، ئەوەتا لە میانەی نامەیەکیدا کە بۆ عبدالملکی کوڕی نارد لەکاتێکدا کە لە مەدینە بوو، تیایدا نەهی کردوە لە خۆهەڵکێشان و شانازی کردن بە کردار و گوفتار و خۆبەگەورە زانین و لە خۆبایی بوون و پۆزلێدان بەسەر خەڵکیدا و تێیدا هاتووە وتویەتی: نەکەی لە قسەکانتدا شانازی بکەیت و خۆت بە گەورە بزانیت و وابزانیت ئەوەی کە پێت بەخشراوە بە هۆی چاکی خۆتەوەیە یا وابزانیت ئەو زیادە چاکە و فەزیلەتەی هەتە کەسی تر وەکو تۆ پێی نەدرا بێت [3].

٧- **پەروەردەکردنی منالەکانی لەسەر دنیانەویستی دەست پێوەگرتن لە گوزەراندا:** شکۆمەندی کەسێتی عومەر(ﷺ) لە بواری پەروەردەکردندا لەوەدا دەردەکەوێت کە توانای ئەوەی بووە منداڵەکانی قایل بکات بۆ گۆڕانکاری لە ژیانی خۆشگوزەرانی یەوە بۆ ژیانی دونیایەویستی

---

[1] = الشاذ کونة: سترێستی ئوشاکێکی زبرة کتلة یەمتن دروستکراوة.

[2] - عمر بن عبدالعزیز و سیاستتی قي رد المظالم ص: ٥٢، ٥٣.

[3] - سیرة و مناقب عمر بن عبدالعزیز ص: ٣١٤.

خۆگرتنەوە لە زیادە ڕۆیی لە خەرج و سەرفکردندا قبوڵ بکەن و قایلی کردوون کە ژیانیان وەك ژیانی خەڵکی بێت بە گشتی لەبری ژیانی زیادەڕۆیی و خۆشگوزەرانی، یەکەمین ڕێوشوێنێکش کە لەم ڕووەوە گرتیەبەر لەمیانەی نامە پەروەردەییەکەیدا دێت کە بۆ عبدالملکی کوڕی ناردووە کە لە شاردا دەژیا و تیێدا هاتووە: ئەگەر خوا تاقیت بکاتەوە بە دەوڵەمەندیەك ئەوە دەستی پێوە بگرە و سادە و خاکە ڕابە لەبەر خوا، ئەوەی خوا فەرزی کردووە لە پارەسامانەکەت دا دەری بکە – مەبەستی – زەکات و صەدەقە و زیادە ڕۆیی لەخەرجیدا – یە هەروەها ئەو بەندە ڕاساڵ و چاکە بلێ: ﴿هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ﴾ النمل: ٤٠). واتە:... ئەمە لە فەزڵی پەروەردگارمەوەیە بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە ئایا شوکری(ئەم نیعمەتە) دەکەم یان پێ نەزان و سپڵە دەبم وە هەر کەسێ سوپاسی خوا بکات ئەوە بێگومان سوپاس بۆ خۆی دەکات وە هەر کەسیش ناسوپاسی بکات(زیانی بۆ خۆیەتی)، چونکە بێگومان پەروەردگارم دەوڵەمەند و بێ نیازە.

ئەم نامەیەش ڕاستەوخۆ دوابەدوای بوون بە خەلیفەی نووسیویەتی، لە کاتێکدا ماوەی ڕەفاهیەتی و خۆشگوزەرانی بەسەر نەچوو بوو، شێوازێکی زۆر جوانی پەروەردەی گرتۆتبەر و پلە بەپلە لەسەر خۆ چارەسەری کردووە لە نامەکەیدا ئەوەی گەیاندوە بە عبدالملیکی کوڕی کە هەست بکات بەوەی کە دەوڵەمەندی و زۆری پارە و دەوڵەمەندی تاقیکردنەوەی خوایەو پاشان فرمانی پێدەکات کە لە کاتی دەوڵەمەندی و بێ نیازیشدا زیادەڕۆیی و ئیسراف نەکات، هەروەها خاکی بوون لەبەر خوا و دەرکردنی فەرز و ئەرکە خواییەکانی پەیوەست کردووە بە زەکات و پارە و سامان و صدقە و هەرشتێك کە گەوێڕایەڵی خوای تێدا بێت [1].

هەروەها لە هەڵوێستێکی تردا پێیان ڕاگەیاند کە کوڕێکی ئەنگوستیلەیەکی کڕیوە و ناوکێکی عەقیقی بە هەزار درهم بۆ کڕیوە عومەریش(ﷺ) بۆی نووسی، پاشان.. پێیان ڕاگەیاندووم کە ناوکی ئەنگوستیلەیەکت بە هەزار درهەم کڕیوە، بیفرۆشەو بە پارەکەی هەزار برسی تێربکە لە بری

---

[1] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر بن عبدالعزيز ص: ١٠٦.

ئەوەش ئەنگوستیلەیەکی ئاسنی چینی بکڕە و لەسەری بنووسە ڕەحمەتی خوا لەسەر کەسێك کە خۆی دە ناسێت[1].

لێرەدا تێ بینی ئەوە دەکەین کە حەزرەتی عومەر فرمانی بە فرۆشتنی عەقیقەکەی پەیوەست کردووە بە هەبوونی کەسانی برسی یەوە و پێویست بونیان بە تێرکردن هەتاوەکو بەباشترین شێوە لە ناوەڕۆکی ئەم کارە تێ بگات بزانێت کە چۆن لە داهاتوودا پارە و سامان خەرج دەکات و هەژاران و نەداران هەمیشە لە پێش چاوی منالەکانی بن.

هەروەها ڕۆژێك یەکێك لە کوڕەکانی عومەری داوا لە باوکی دەکات کە ژنی بۆ بهێنێ و لە(بیت المال) مارەیی بۆ دابین بکات – ئەو کوڕەشی ژنێکی هەبوو – عومەریش(ﷺ) زۆر تورە دەبێت لەسەر ئەوە و نامەیەکی بۆ دەنووسێت و دەڵێت: نامەکەتم بە دەست گەشت داوای ئەوەم لێ دەکەیت لەسەر(بیت المال) فرەژنیت بۆ بکەم لە کاتێکدا کوڕی موسڵمانان هەیە نیەتی ژنێك بهێنێت بۆ ئەوەی داوێنی خۆی پێ بپارێزێت من نازانم چۆن شتێکی وات نووسیوە.. پاشان بۆی دەنووسێت: چاوبگێڕە بە دەوروبەری خۆتا ئەگەر مس یان شتێکی ترمان هەبوو بیفرۆشە و بە نرخەکەی ئەوەی دەتەوێت ئەنجامی بدە[2].

ئەم ڕێوشوێنەشی تەنها بۆ کوڕەکانی نەدەگرتەبەر، بەڵکو مامەڵەی لەگەڵ کچەکانیشی بەهەمان شێوە بوو دەگێڕنەوە کچێکی عومەری کوڕی عبدالعزیز کە(أمینه)ی ناو بوو ڕۆژێکیان سەری لێ دەدات و عومەریش بانگی دەکات ئەویش وەڵامی نەدایەوە پاشان داوای هێنانی کرد و پێ وت: بۆچی وەڵامم نادەیتەوە؟

وتی: ڕوتم مەبەستی ئەوە بوو پۆشاکەکەی باش نیە – ئەمیش بانگی موزاحیم دەکات – دەڵێن سەیر کە لەو ڕاخەرانەی هەمانە بەشی کراسێك پارچەیەکی بۆ ببڕە[3].

ئەمە لە بارەی پۆشاکی کچانی عومەر(ﷺ) لە بارەی خۆ ڕاکیشیانەوە وە ئیبن عبدالحکم دەگێڕێتەوە کە عومەر(ﷺ): لە سێ یەکی شەودا یان لە کاتێ نوێژی عیشا دا دەڕۆشتە لای کچەکانی و سڵاوی لێ دەکردن شەوێکیان دەچێتە ژوورەوە بۆ لایان کاتێك ئەوان هەست دەکەن

---

[1] - سيرة و مناقب عمر بن عبدالعزيز الجوزي ص: ٢٩٨.

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم ص: ١٠٦.

[3] - حلية الاولياء(٥ / ٢٦١) النموذج الاداري ص: ١٠٨.

کە باوکیانە لە پەنای دەرگاکەدا دەوەستن دەستیان دەگرن بە دەمیانەوە عومەریش بە خزمەتکارەکەیان دەڵێت ئەو چیانە؟ ئەویش دەڵێت: ئەم ئێوارەیە شتێك نەبووە بیخۆن جگە لە نیسك و پیاز نەبێت جا بۆ ئەوەی بۆنی دەمیان نەیەت دەستیان بەدەمیانەوە گرتووە، عومەریش(ﷺ) دەست دەکات بە گریان و پاشان پێیان دەڵێت: کچە شیرینەکانم خۆشگوزەرانیتان لە دنیادا چ سوودێکی دەبێت بۆتان کاتێك لە قیامەتدا بدەن بەلای باوکتاندا و لەناو ئاگردا بێت.

ئەوانیش دەستیان دایە گریان و دەنگیان بەرزبوویەوە و باوکیان بە جێ هێشت و چوونە دەرەوە[1]. هەروەها حەزرەتی عومەر(ﷺ) دەستی کرد بە گواستنەوەی خاو خێزانەکەی لە ژیانی خۆشگوزەرانیە وە بۆ ژیانی دنیا نەویستی و خۆ گرتنەوە، هەرچی زێڕ و زیوی(فاتیمەی کچی عبدالملك)ی خێزانیشی هەبوو خستە ناو بیت و ماڵەوە و پێ ی گوت هەڵبژێرە لە نێوان ئەوەی کە هەرچی زێڕ و زیوت هەیە بیخەیتە ناو(بیت المال) یان ڕێگەم بدە لێت جیا ببمەوە، چونکە من پێم ناخۆشە من و تۆ و ئەو زێڕ و زیوانە لە یەك ماڵدا بین ئەویش وتی: نەخێر بەڵکو هەر تۆ هەڵدە بژێرم ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوەی هەمەو چەندینی تریش کە هەمە بێت لە(بیت المال) دا دایدەنێم[2].

١- گرنگیدان بە فێرکردنی منداڵەکانی: عومەر(ﷺ) فێر کردن و پەروەردەی منالەکانی لە پێش چاوگرتبوو و گرنگیەکی تایبەتی پێدا بوو و چەند ڕێوشوێنێکی بۆ چۆنێتی فێرکردنی گرتبویە بەر وەك پەیڕەو و پرۆگرامێك بە شێوازێك بەدەم زۆرێك لەدا خوازیەکانی لاوان و تازە پێگەشتووانی موسڵمانانەوە دەچوو، هەتاوەکو خود و ئامانجەکانی یەکبخات و دابەش نەبێت بەسەر خۆیدا و جیاوازی بکەوێتە نێوان گوفتار و کرداری یاخود لە نێوان و اقیع و خەیاڵ و ئەندێشەیدا[3].

ڕەهەندەکانی ئەو ڕێبازەشی لەنامەکەیدا دەردەکەوێت کاتێك بۆ مامۆستا و مۆچیاری کەری منداڵەکانی ناردووە کە خزمەتکارێکی خۆی بووە بەناوی سەهل کوڕی صدقە، بڕیاریدا ئەو دەستنیشان بکات و ئەرکی پەروەردە و فێرکردنی منالەکانی پێ بسپێرێت پاشان ڕێبازێکی بێ وێنەی

---

[1] - سيرة عمر لابن الحكم ص: ٤٨، ٤٩.

[2] - الطبقات(٥ / ٣٣٠) النموذج الاداري ص: ١٠٩.

[3] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر ص: ١١٠.

دیاری کرد [1] بۆی لە ئامۆژگاری کردن و فێرکردنی منالەکانیدا، و لە نامەکەدا ئەڵێ: لە عبداللە واتە بەندەی خوا عومەرەوە بۆ سەهلی خزمەتگوزار و شاگردی دوای ڕێز و سلاو... لە نێوان ئەو خزمەتکار و دەست و پێوەندە تایبەتەدا کە هەمە، تۆم هەڵبژاردوە بۆ ئەوەی ئامۆژگاری کردنی کۆڕپەکەم لە ئەستۆ بگریت سەرەتا بە وشکی و زبریە وە قسەیان لەگەڵ بکە ئەمە وا دەکات باشتر بەرەو ڕووت بێن، هاوڕێەتیان واز لێ بهێنە، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی بێ ئاگایی، کەم بەدەمیانەوە پێبکەنە، چونکە زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێت، هەروەها بایەکەمین شتێك کە لە تۆوە فێری دەبن ڕق بوونەوەیان بێت لەو شتانەی کە غافڵ و بێ ئاگایان دەکات(هۆکارەکانی لە هو) کە سەرەتا لە شەیتانەوە دەست پێ دەکات دواتر توڕەیی خوای بە شوێندا دێت، چونکە لە زانایانی متمانە پێکراوە وە پێم گەشتووە کە هەبوونی و ئامادەیی مۆسیقا و گوێگرتن لە گۆرانی و هۆگری پێیانەوە دەبێتە هۆی سەوز بوونی نیفاق و دو ڕوویی لە دڵدا، هەروەك چۆن ئاو گژوگیا سەوز دەكات.

سوێند بێت بە خوا خۆ پاراستن لە وازهێنان لە ئامادەیی لەو جۆرە شوێنانەدا ئاسانترە بەلای خاوەن بیر و هۆشەوە لەوەی بە هۆی گۆرانی و مۆسیقاوە دڵی تووشی نیفاق و دوو ڕوویی بێت و تیایدا ڕۆبچێت، چونکە ئەوەی ڕاهاتبێت لەسەر گوێگرتن لێیان کاتێك لەو گۆرانی و مۆسیقایە جیا دەبێتەوە ئیتر هەرچی ببیستێ ئەوەندەی لە بیردا نامێنێت کە سوودی پێ بگەیەنێت.

هەروەها با سەرەتا هەر یەکەیان بە خوێندنی جزمێك لە قورئانی دەست پێبکەن و با خوێندنەوەکەشی بە باشی بێت کاتێك لێبوردەییەوە تیرو کەوانەکەی بدەرەوە دەست وبا بە پێی پەتی بچێت بەرە و نیشانەکە با حەوت گێم تیر بووەشێنێت و پاشان بابچێت قاوەڵتی بکات، چونکە ئبن مەسعود دەیوت قاوەڵتی بکەن(قیلولە)، چونکە شەیتانەکان قاوەڵتی ناکەن [2].

## لێرەدا تێبینی ئەم چەند ڕێنماییەی خوارەوە دەکەین:

### ١- دەستنیشان کردنی مامۆستا و ئامۆژگاری باش و ڕاساڵ:

مامۆستا و پەروەرشیار بە بەردی بناغەدا دەنرێت لە پرۆسەی فێرکردندا، عومەریش(﵁) مامۆستایەکی بۆ کوڕەکانی هەڵبژارد کە لە کەسە تایبەتمەند و بەردەستەکانی خۆی بوە و بە چاکی ناسیویەتی و متمانەی پێ هەبووە، عومەری(﵁) هەربە سەهلی خزمەتکاریەوە نەوستاوە

---

[1] - هەمان سەرچاوە ص: ١١٠.

[2] - سیرة و مناقف عمر بن عبدالعزیز لابن الجوزي ص: ٢٩٦، ٢٩٧.

بۆ فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکانی، بەڵکو بۆ ئامۆژگاری کردنیان پەنای بردۆتە بەر یەکەم مامۆستا و ئامۆژگاریکاری خۆی کە ئەویش صالحی کوڕی کیسان بووە [1].

سووربوونی حەزرەتی عومەر(ﷺ) بەمەشەوە نەوەستاوە مەیموونی کوڕی مەهرانی ڕاسپارد کە بێت بۆلای عبدالملك ی کوری بۆ ئەوەی ڕاوێژی پێکات و عەقڵ و بیرو ژیری هەڵبسەنگێنێ، میمون دەڵێت: هاتمە لای – مەبەستی عبدالملکی کوڕی عومەرە – بۆ کاتژمێرێك لەلای دانیشتم زۆر لام پەسەند بوو و سەرسام بووم پێی [2].

أ- **دیاری کردنی پرۆگرامی فێرکاری:** عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەو پرۆگرامە پەروەردەیی و فێرکاریەی دیاری کرد کە دەیویست منداڵەکانی لەسەری پەروەردەبن، کە پێکهاتبوو لە قورئانی پیرۆز و زانستەکانی و لەگەڵ زانستەکانی تردا، هەروەها مەشق و ڕاهێنان لەسەر جەنگ و جیهاد و تێکۆشان و خۆڕاگری لەسەری، ڕاهێنان لەسەر تیر ئەندازی و نیشانە گرتن و ئەنجامدانی ئەو وەرزشانەی سوودیان بۆ جەستە هەیە وەك ئەوەی بە پێی پەتی بچن بۆ نیشانەنانەوە بۆ ئەوەی ڕابێن ئەمە جگە لەوەی کە پرۆگرامەکەی بەشی پشوودانیشی تێدا بوو.

ئەو بەشە دیاری کراوەی کە ڕۆژانە بڕیار بوو بیخوێنن یەك جزم بوو لە قورئانی پیرۆز بە تێگەشتن و جوان خوێندنەوە وە هاوڕێ لەگەڵ ئەو زانستە ئاینیانەی ترکە پەیوەندیان بەو جزمەوە هەبوو.

هەروەها تیرهاویشتن بە حەوت بەش و ئەوەی کە پێویستی بوو لە ڕۆشتن بۆ نیشانەکان و هاتوچۆکردنیان لە نێوانیاندا ئەمە بۆ خۆی ئامانجێکی باڵای لە پشتەوەیە، کە ئاین و دنیای پێکەوە گرێداوە و بەیەکەوە لە هەمان کاتدا جوڵەیەك لە نێوان جەستە و ڕۆح و گوفتار و کردار دا دروست دەکات [3]. ئەم ئامانجانەش زۆربەی پرۆگرامەکانی پەروەردە و فێرکردنی هاوچەرخ لێی پاشگەزبوونەتەوە و بێ بەشن لێی [4].

---

[1] - تذكرة الحفاظ(١ / ١٤٦).

[2] - سينة و مناقب عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي ص: ٣٠٢.

[3] - النموذج الاداري ص: ١١٣.

[4] – النموذج الاداري ص: ١١٤.

ب- **دیاری کردنی ڕێبازی ئامۆژگاری و فێرکردن:** عومەری کوڕی عبدالعزیز بە دەستنیشان کردنی مامۆستا بۆ منداڵەکانی دیاریکردنی و ماددەکانی پرۆگرامی فێرکردنەوە نەوەستا، بەڵکو سەری کێشا بۆ ئەوەی وێنای ئەو ڕێباز و شێوازەش بکات کە پێویستە منداڵەکانی لەسەری ئامۆژگاری و فێربکرێن و پێوەی پابەندبن.

هەروەها جێ بەجێکردن و وردەکاری لە باش ئەنجامدانی کارەکەدا، هەروەها لە میانەی نامەکەیدا(ﷺ) داوای لە سەهل کردوە کە جیددیانە قسەیان لەگەڵدا بکات و ئەم شێوازەش دەبێتە هۆی ئەوەی باشتر بەرەوڕووی بچن و بەوریاییەوە گوێی بۆ ڕابگرن.

داواش لێکرد کە واز لە هاوڕێیەتیان بهێنێت، چونکە هۆگر بوونی دەبێتە هۆی بێ ئاگایی و هەتاوەکو پلەوپایەی مامۆستاکەیان لەلایان وەك خۆی بمێنێتەوە، چونکە ناکرێت مامۆستا قوتابیەکانی بکاتە هاوڕێ و هاودەمی خۆی و نهێنیەکانی لای ئەوان دابنێت و بەشداریان بکات لە کات و ژیانیدا، لەوانەیە هەڵوێست و ڕەفتارەکانی باش نەبێت بەلایانەوە کە ئەمەش دەبێتە هۆی سوکایەتی پێکردن و بەدەمەوە نەچوونی داخوازیەکانی لەوانەشە ببێتە هۆی ئەوەی ڕێزی لێنەگرن و گوێ بۆ قسەکانی نەگرن.

حەزرەتی عومەر(ﷺ) داوای لە ئامۆژگاری کاری منداڵەکانی کردووە دوریان بخاتەوە لە هۆکارەکانی(لەهو) و ئامادە بوونیان لە ئاهەنگیگۆرانی و مۆسیقا لەبەر ئەو کاریگەریە نێگەتیڤەی هەیەتی لەسەر ژیانی موسڵمان، تێبینی ئەوەش دەکرێت حەزرەتی(عمر ﷺ) هیچ فرمان و ئەرك و ڕێباز و شێوازێکی دیاری نەکردووە هەتا هۆکارەکەشی ڕوون نەکاتەوە لە سوود و ئاکامەکانی ڕوون نەکاتەوە [1].

ج- **دیاریکردنی کات و شتە لە پێشترەکان بۆ فێر کردن:** ئەو پرۆگرامەی عومەری کوڕی عبدالعزیز دیاری کردووە لە نامەکەیدا بۆ مامۆستای کوڕەکانی ئەوەیە کە بە(بەڕێوەبردنی کات) ناو دەبرێت ئەوە بوو بەرنامەیەکی ڕۆژانەی دیاریکرد کە مامۆستا و کوڕەکانی هەر لەسەر لەبەیانیەکی زووەوە دەبێت هەستن بەجێبەجێ کردنی ئەویش، خوێندنی جزمێك قورئانی پیرۆزە، کات و ماوەی بەیانیان بە قورئان دەستی پێ دەکرد، چونکە لەو کاتەدا بیرو هۆش سافە پاش وەرگرتنی پشوویەکی باش لەشەڕدا لێرەشەوە دانانی قورئان خوێندن لەکاتی پاك و

---

[1] - النموذج الاداري المستخلص في ادارة عمر ص: ١١٧.

بێگەردی بیروهۆشدا ئامادەگیەکی باش دەبێت بۆ فێرخواز هەروەك چۆن خوێنـدنی مادەکـانی تری زانستی پەیوەست کردووە بە باش ئەنجامدان و لەبەرکردن و چەسپاندنی لەبیر و هۆشدا، هەروەها کاتی دەرچوون بۆ نیشانە شکێنی و تیرەندازی لە دوای خوێنـدن و زانـست، وایـان لێدەکات بەتاسەوە بەرەورِووی بچن بەمەش لەوپەڕی کارامەیی و لێهاتوویدا ئـەنجامی دەدەن، لە کۆتایی بەرنامە ڕۆژانەکەدا مـاوەی قـاوەڵتی(قیلولـە) ی دانـاوە کـە ئـەوە ماوەیـەش زۆر پێویستە بۆ پشووی جەستە و دەروون و بیروهۆش [1].

د- **ڕەچاو کردنی هۆکارەکانی فێرکاری:** عومەری کوڕی عبدالعزیز ڕەچاوی هەرشتێکی کـردووە کە پەیوەنـدی بـە زانـستەوە هـەبێت، و کاریگـەری لەسـەر تێگەیـشتن و جـوان وەرگرتنـی زانیاریەکان هـەبێت، و سوودیـشی لـە هەرشـتێك وەرگرتـووە کـە لـە دوور یـان نزیکـەوە کاریگەری لەسەر زیاتر تێگەیشتن و بەهێزکردنی ئاوەزو بیروهۆش هەبووبێت.

یەکەم: یەکەم شتێکیش کە بەهەنـدی وەرگرتـووە و کاریگـەری لەسـەر زانـست و ڕەوشـت و ئاکاری منداڵەکانی لەبەرچاوگرتووە مامۆستاکەیان و بەسوودی زانیاری و زانستەکانی و چاو تێبڕین و تێڕوانینی وەك پێشەنگ و نموونەیەك لەلایەن کوڕەکانیەوە.

دووەم: لەوانەیە نەرمونیانی ببێتە هۆکاری پابەندنەبوون و جددی نەبوون لە قـسە کردنـدا و زۆر پێکەنین و هەندێك جاریش گاڵتەجاڕی، کە دەبنە هۆی بەدەمەوە نەچوونی داخوازیـەکانی فێربـون و زانستخوازی لەبری ئەوەی بە چوست چالاکیەوە و بەرە ورِووی هەنگاو هەڵگرن.

سێیەم: ئەوەی لە شوێنەکانی کات بەسەر بردن و(لە هـو) گـۆرانی دەکەوێتـەوە لـە بـەفیڕۆدانی کات کە پێویستە بۆ زانـست تـەرخان بکرێـت و هـەروەك دەبـەنگی هەسـتی زانـستی یەکێکـە لـە دەرەنجامەکانی.

چوارەم:ڕەچاوکردنی لایەنی دەروونی تازەپێگەشتوان کە لەوانەیـە ببێتـە هـۆی بێـزاری و وەڕس بوونیان و دابەزاندنی ئاستی تێگەشـتنیان، هـەروەها گرنگـی و پێویـستی پـشوودان بـە دەروون بـە شێوەیەکی ناوبەناو و لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی ترو وەرگرتنـی پـشوو، لـە کۆتاییـدا گرنگیـدان بـەو دەرەنجامە باشانەی بە هۆی وەرزشەوە دەست دەکەوێت وەك تیرەندازی و ڕۆشـتن بـۆ نیـشانەکان و

---

[1] - هەمان سەرچاوە ص: ١١٨.

ئەو لایەنە پۆزەتیڤانەی هەیەتی لەسەر جەستە و تەندروستی بیروهۆش و پاك و بێگەردی ئاوەز و مێشکی مرۆڤ[1].

**٢- لەبەرهەمەکانی پرۆگرامی پەروەردەیی عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ پەروەردە کردنی منداڵەکانی:**

عبدالملك ی کوڕی وەك نموونە: لە دەرەنجامەکانی پرۆگرامی عومەر(ﷺ) بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانی ئەو نموونە خواناسانەیە کە لە عبدالملکی کوڕیدا ڕەنگی دابوویەوە، عبدالملك بە یەکێك لەو گەنجانە دادەنرێت کە لەوپەڕی خۆشگوزەرانیدا ژیاوە و لە ڕزق و ڕۆزی فراوان و ڕەفاهیەتی ژیان بەهرەمەند بووە ژیانی ئەو نموونەیەکی گەورەیە بۆ زۆرێك لە ڕۆڵەکانی موسڵمانان و ئەوانەی هاوشێوەی ئەون فەرموو ئێوە و چەند نموونەیەك کە ژیانی:

أ- پەرستش و گریانی: لە عاصم کوڕی ئەبی بەکر بن عبدالعزیز کوڕی مەروانەوە کە برازای عومەری کوڕی عبدالعزیزە وتویەتی: بە سەردانێك چووینە لای سولەیمانی کوڕی عبدالملك، عومەری کوڕی عبدالعزیزیشمان لەگەڵدا بوو من چووم لای عبدالملك بمێنمەوە، ئەو هێشتا کوڕ بوو ژنی نەهێنا بوو لەماڵەوە لەگەڵیدا مامەوە نوێژی عیشامان کرد و هەریەکە ڕۆشتە سەر جێگەی خۆی بۆ خەوتن، عبدالملك هەستا چراکەی کوژاندەوە و هەستا بۆ نوێژکردن من خەوم لێ کەوت کاتێك بێدار بوومەوە لە خوێندنەوەی ئەم ئایەتانەدا بوو کە دەفەرموێت: ﴿ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُوا۟ يُوعَدُونَ ﴾ الشعراء: ٢٠٥ - ٢٠٦). واتە: تۆ پێم بڵێ ئەگەر چەند ساڵێ بەخۆشی بیان ژێنین. لە پاشان ئەو سزایەی کە لێی ترسێنرا بوون بێت بۆیان.

ئنجا دەستی کردەگریان پاشان گەڕایەوە سەروتنەوەی هەمان ئایەتەکانی پێشوو هەرکەلێدەبووە جارێکی تر دووبارەی دەکردەوە، لەبەر خۆم وتم: گریان دەیکوژێت کە ئەوەم لێ بینی وتم: " لاالە الا الله و الحمد لله " وەکو کەسێك کە لەخەو هەستێت بۆ ئەوەی وازبهێنێ و بیبڕێتەوە کاتێك گوێی لێم بوو بێ دەنگ بوو ئیتر هیچم لێ نەبیست [2]، ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

---

[1] - النوذج الاداری المستخلص من ادارة عمر ص: ١١٩.

[2] - مجموعة رسائل الحافظ ابن رحب الحنبلي(٢ / ٩ / ٤٧).

ب- زانست و فیقه و تێگەیشتنی: عومەری کوڕی عبدالعزیز خەڵکی کۆ کردەوە بۆ ئەوەی ڕاوێژیان پێبکات سەبارەت بە گێڕانەوەی ئەو مافانەی کە حەجاج لە خەڵکی زەوت کردبوو و قەرە بوو کردنەوەیان، ڕاوێژی بەهەر پیاوێکیان دەکرد دەیوت ئەمیری باوەڕداران ئەوە شتێك بووە لە سەردەمی دەسەلاتداریتی تۆدا نەبووە هەر یەکێکیان وای بوتایە هەڵی دەساندەوە هەتاوەکو سەرەی عبدالملیکی کوڕی هات و گوتی: بابە هەر پیاوێك چەندی لە توانا دا بێت ستەم و زۆرداریەکانی حەجاج بگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانی بابیگێڕێتەوە ئەگەر وانەکات بەشدار دەبێت لە ستەم و زۆرداری دا.

عومەر وتی: ئەگەر کوڕی خۆم نەبویتایە دەمگوت تۆ زانا و فەقیهترین ناوخەڵکیت، عبدالملك ئەو ڕایەی دەربڕی و باوکی ستایشی کرد لەسەری کە ڕای ئەویش ڕاست و پەسەند بوو، چونکە پێشەوا و دەسەلاتدار ئەگەر توانای قەرە بووی ستەم و زۆرداریەکانی پێش خۆی هەبێت ئەوە دەبێتە(واجب) و ئەرك بەسەریەوە بێگومان ئەمەش بە گوێرەی توانای ئەو کەسەیە [1].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز و عبدالملکی کوڕی لەو زانایانە بوون کە زانستی خواناسی -کەوا دەکات لە مرۆڤ خوای خۆش بوێت و لێی بترسێت- و زانستی شەرعی و زانینی حەلاڵ و حەرام و ئەحکامیان پێکەوە گرێ دابوو [2].

ج- مردن خستنەوە یادی باوکی: کوڕێکی عومەری کوڕی عبدالعزیز مرد حەزرەتی عومەریش هات و لای سەری دانیشت و جلەکانی لەسەر دەموچاوی لاداو سەیری کردو و فرمێسك بە چاوی دا هاتە خوارەوە کاتێ عبدالملکی کوڕی هات و ئەمە بینی وتی: ئایا شتێك سەر قاڵی کردویت ئەی ئەمیری باوەڕداران لەوەی مردن هاتووە بۆ لات؟ ئەو سەرقاڵی ئەوەیە لەبەر دەستدایە وا دابنێ خۆت پێی گەشتبی و خۆتت لە ژێر خاك دابێت.

حەزرەتی عومەر دەستی کردە گریان وتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت کوڕی خۆم سوێند بە گەورەیی خوا تۆ زۆر بە فەڕو پیرۆزیت وانازانم کەسێکی تر هێندەی تۆ سوود بگەیەنێت بە هۆی ئەو ئامۆژگاریەتەوە ئەوەی ببینیت لێم کە نارەحەت و نیگەران بووم بۆ براکەت، بەلام ئەوەی کە

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٨١).

[2] - مجوعة رسائل الحافظ اب رجب العنلي(٢ / ٤٨٧).

ترساندمی ئەوە بوو زانیم فریشتەی گیان کێشان هاتۆتە ناو ماڵەکەم ئەمەش ترساندمی و بینیت کە چیم لێ هات پاشان فرمانیدا کوڕەکەی بە خاك بسپێرن [1].

د- توند و تۆڵی لە ئاین و بەهێزی لە جێ بەجێکردنی هەق و ڕاستیدا: مەیمونی کوڕی مەهران وتی: عومەری کوڕی عبدالعزیز ناردی بە شوێن من و مەکحول و ئەبی قولابە و وتی: ئێوە چی دەڵێن بۆ ئەم ماڵ و سامانە کە بە زۆر و ستەم وەرگیراوە؟ مەکحول لەو ڕۆژەدا ڕایەکی لاوازی دەربڕی عومەر پێی ناخۆشبوو وتی: واباشە جارێکی تر لێی وردبیتەوە، وەکو بڵێی هانا بۆ من بەرێت سەیرێکی کردم منیش وتم ئەی ئەمیری باوەڕداران بنێرە بەشوێن عبدالملك با ئامادەبێت ئەو وەکو کەسی تر نیە کە تۆ دیوتە، کاتێك عبدالملك هاتە ژوورەوە بۆلای وتی: عبدالملك تۆ ڕات چۆنە بەرامبەر بە ئەم پارە و سامانە کە بەزۆر وەرگیراوە؟ وتی: وای بە باش دەزانم بیگێڕیتەوە بۆ خاوەنەکانی ئەگەر نا دەبیتە بەشدار و شەریکی ئەوانەی بە زۆرداری وەریانگرتووە [2].

ه- نەخۆش کەوتن و مردنی(ڕەحمەتی خوای لێ بێت): عومەری کوڕی عبدالعزیز چووە ژوورەوە بۆلای کوڕەکەی لە کاتی ئێش و ئازاری نەخۆشی – تاعون – دا وتی: ڕۆڵەگیان حاڵت چۆنە.. خۆت چۆن دەبینیت؟ وتی: لەسەر هەق و ڕاستی خۆم دەبینم عومەریش وتی: ڕۆڵەگیان ئەگەر کارو کردەوەی تۆ لە ناو کێشانەی مندا بێت لام خۆشترە لەوەی من لەناو کێشانەو تەرازووی تۆدابم(مەبەستی ئەوە بوو کارو کردەوەی کوڕەکەی بەباشتر زانیوە لە کاری خۆی) ئەویش وتی: بابەگیان ئەگەر بەو شێوەبێت کە تۆ پێت خۆشە لام خۆشترە لەوەی کە من پێم خۆشە [3].

کاتێکیش ئەسپەردەکرا لەسەر گۆڕەکەی وتارێکی داو وتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت، ڕۆڵەگیان تۆ چاکە کاربویت بەرامبەر باوکت هیچ هەڵەیەکت نەنواندوە لەو ڕۆژەوە خوا بە خۆشی تۆی پێ بەخشیم، سوێند بەخوا ئەوەندەی بە تۆ خۆشحاڵ و ئاسوودە بووم بە هیچ شتێکی تر ئاسوودە نەبووم

---

[1] – هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٨١).

[2] – هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٨٨).

[3] – هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٩٢).

لەو ڕۆژەوەی خوای گەورە تۆی دروست کردووە خوا ڕەحمت پێ بکات و لە گوناهت خۆش ببێت و بە باشترین شێوە پاداشتت بداتەوە وچاو پۆشی لە خراپەکانت بکات.

ڕەحمەتی خوداش لە هەرکەسێك بە باشی باست دەکات ئەوەی ئێستە ئامادەی ئەم مەراسیمەیە و ئەوەش لێرەنیە، ڕازین بە قەزای خوا و خۆمان تەسلیمی فرمان کردوە سوپاس بۆ خوای جیهانیان، پاشان کۆتایی بە وتارەکەی هێنا و ڕۆشت [1].

ئینجا نووسراوێکی فەرمی بۆ جێنشینی خۆی لە کوفە نووسی و تێیدا نەهی کرد لەوەی کە بگرین بۆ کوڕەکەی، کە لەو کاتەدا وەك نەریتێك خەڵکی دەگریان بۆ پاشاو و کوڕەکانیان لەکاتی مردنیاندا ئەو نووسراوەش تێیدا هاتبوو: عبدالملك کوڕی ئەمیری باوەڕداران بەندەیەك بوو لە بەندەکانی خوا خوای گەورە باشی بۆ ئەو و بۆ باوکیشی کرد، خوای گەورە بەو ئەندازەیەی کە پێ خۆ شبوو بیژیەنێت ژیاندی پاشان گیان کێشاو مراندی کاتێك پێی خۆش بیمرێنێت، ئەو ئەوەندەی ئاگاداریم بە مردنەوە پەیوەست بوو، داواکارین لە خوا چاکەی بۆ بهێنێتە پێش، پەنا ئەگرم بە خوا کە خۆشەویستەکەم هەبێت پێچەوانەی خۆشەویستی خوا بێت، چونکە ئەوە ڕاست نیە بەلامەوە بەرامبەر بە هەموو ئەو نازو نیعمەت و چاکانەی کە ڕژاندوویەتەی بەسەرمدا.

پاشان وتی: پێم خۆش بوو بۆت بنووسم و پێتی ڕابگەیەنم ئەمە قەزاوقەدەری خوایە نامەوێ ببیستم کە لای ئێوە کەس شیوەن و گریانی بۆ کرد بێت و یان کەسێك بۆ ئەو مەبەستە کۆ بووبێتەوە ڕێگە بە کەس نادەم ئەو کارە بکات نە لە دوور و نە لە نزیك لێرەدا ئەوەندە بەسەکە خوای گەورە لێی ڕازی بێت ئەگەر وابکەیت هیچ لۆمە و سەرزەنشتت ناکەم(انشاء الله) و السلام علیك [2].

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە، کاتێك عبدالملك کوڕی عومەر مرد باوکی وتویەتی: کوڕە خۆشەویستەکەم تۆ هەر بەو شێوە بوویت کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾الكهف: ٤٦). واتە: ماڵ و کوڕ و کاڵ جوانی و زینەتی ژیانی دنیان...

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٩٥).

[2] - مجموع رسائل الحافظ بن رجب(٢ / ٤٩٦).

من ئەمڕۆ ئومێدوارم خوای گەورە تۆ لە ﴿وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ﴾، واتە: ئەو كارە چاكە بەردەوامانەی لە ڕۆژی دواییدا بە كەڵك دێت دابنێت و باشترین پاداشت و چاكترین هیوا و ئومێد بێت سوێند بە خوا ئەوەی كەمایەی ئاسودەییمە و دڵخۆشم دەكات ئەوەیە هەر كات بانگتم كردبێت یەكسەر وەڵامت داوەتەوە و گوێڕایەڵیت كردوم [1].

كاتێك عبدالملك كوڕی عومەر كۆچی دوایی دەكات لە تەمەنی نۆزدەساڵیدا دەبێت، عومەری كوڕی عبدالعزیز زۆر ستایشی كوڕەكەی كردووە ڕۆژێكیان پێی دەڵێت:

ئەی عبدالملك من شتێكت پێ دەڵێم: نەخێر سوێند بەخوا هیچ لاوێكی تری وەك تۆم نەدیوە هێندە خوا پەرست و تێگەشتوو(فقیه) و شارەزا بێت لە قورئاندا. هەروەك كەسم نەدیوە لە كاتی منداڵیدا هێندە دوورە پەرێز و پارێزگار بێت چ بچوك یان گەورە [2]، هەروەها عومەری كوڕی عبدالعزیز وتویەتی: سوێند بەخوا ئەگەر لە ترسی ئەوە نەبوایە كە باوكایەتی عبدالملك ی لا جوان و پەسەند كردبم ئەوە بە شیاوترین كەسم دەزانی بۆ خەلیفایەتی [3].

لە ڕیوایەتێكیشدا هاتووە: كاتێكە عبدالملك مرد باوكی لای گۆڕەكەیدا ستایشی كرد پیاوێك پێی وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر بمایە كاری خەلیفایەتیت پێ دەسپارد؟ وتی: نەخێر، وتی: دەی باشە بۆ ئەوەندە ستایشی دەكەیت؟ وتی: دەترسم ئەم خۆشەویستی و جوانی و پەسەندیەی من هەمە هی باوكایەتی بێت... كە بە سروشت باوك ئەو هەستانەی هەیە بەرامبەر بە كوڕەكەی.

مەیمونی كوڕی مەهران دەڵێ: هیچ سێ كەسێكم نەدیوە لە چوارچێوەی ماڵێكدا بژین باشتر لە عومەری كوڕی عبدالعزیز و عبدالملك ی كوڕی و موزاحیم ی خزمەتگوزاریان، ئەمانە هەمووی بەرهەمی ئەو پرۆگرامە پەروەردەییە و زانستیە بوو كە عومەری لەسەر دەڕۆشت لە پەروەردەكردنی منداڵەكانیدا.

**٣- ژیانی لەگەڵ خەڵكیدا:**

**أ- گرنگیدانی بە چاكسازی كۆمەڵگە:** عومەر بەباشی گرنگی دەدا بە چاككردنی كۆمەڵگە و كاری دەكرد بۆ نەهێشتنی ئەو شتە خراپانەی كە تیایدا بوو، لەم بارەشەوە نامەیەكی درێژ و

[1] – هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٩٦)

[2] – هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٩٩).

[3] – هەمان سەرچاوە(٢ / ٤٩٩).

پاراوی نووسی کە چەند بڕگەیەکی لێ دەخەینەڕوو لەبەر گرنگی و بەسوودی، و تیایدائەڵێ:
پاشان خراپە لە هەر گەلێکدا دەرکەوتبێت و خەڵکانی پیاوچاك نەهیان لێ نەرکردبێت ئەوە خوای گەورە تووشی سزایان دەکات لەلایەن خۆیەوە یان لەسەر دەستی کەسانێك لە بەندەکانی، خەڵکیش بەردەوام پارێزراون لە سزاو خەشم و تووڕەیی خوا هەتاوەکو خەڵکی خراپەکار لە ناویاندا سەرکز بن و خراپەلە ناویاندا شاراوە بێت و خراپە لەهەر یەکێکیان دەرکەوێت تۆڵەی لێ بکەنەوە.

جا هەر کە خراپەیان تێدا دەرکەوت و خەڵکانی پیاو چاك نەهیان لێ نەکردن ئەوە سزا لە ئاسمانەوە بۆ خەڵکانی خراپەکار و ئەوانەی کە ڕووپامایيان بۆ دەکەن دادەبەزێت. لەوانەشە ئەو جۆرە کەسانە لەگەڵیاندا لەناو بچن با جیاوازیش بن لەگەڵیاندا، چونکە من لەوەی کە خوا دایبەزاندوە نەمبیستوو کە کەسێك لەوانە ڕزگاری بووبێت مەگەر لەو کەسانە بووبن کە نەهیان کردووە لە خراپە هەروەها خوای گەورە ئەگەر خۆی سزای ئەوانە نەدات یان بە دەستی هەندێك لە بەندەکانی بە ترس و سەر شۆڕی و تۆڵە سەندنەوە، ئەوە لەوانەیە بە کەسی خراپەکار تۆڵە لە خراپەکار و بەستەمکار تۆڵە لەستەمکار بکاتەوە.

پاشان هەردوو لا ئەنێرێتە ناو ئاگر، بۆیە پەنا دەگرین بە خوا لەوەی کە بەستەمکارمان دابنێت یاخود ڕووپامایيکەربین بۆ ستەمکاران. پاشان من پێم گەشتووە کە خراپەکاری لە ناو ئێوەدا پەرەی سەندووە و خراپەکاران ترسیان نەماوە لە شارەکانتاندا و بە ئاشکرا خراپەدەکەن بە جۆرێك کە خوا پێی ڕازی نیە و ڕوپامايیشی پێ باش نیە، پێشتریش نەیان دەوێرا کاری وا ئاشکرا کەن لەبەر خەڵکانێك کە لە خواترسن و ئەیانەوێ ڕێز و پیرۆزی خواپارێزن، بەڵام ئێستا خراپەکاران زۆرینەن و پێشینانیش بەو شێوە نەبوون و بەوشێوەش نیعمەتی خوایان بەسەردا نەباریوە، بەڵکو ئەوان بەو شێوە بوون کە ئەفەرموێت: ﴿أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلْكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيْنَهُمْ﴾الفتح: ٢٩). واتە:... بەرامبەر بێ باوەڕان توندو تیژن و لە نێوان خۆیاندا بە بەزەیین... ﴿أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ﴾المائدة: ٥٤). واتە:... بەهێز و توند بەرامبەر بێ بڕوایان تێ کۆشان دەکەن لە ڕێ ی خوادا و ناترسن لە سەرزەنشتی سەرزەنشتکاران...

سوێند بەخوا توندی بەرامبەر بە تاوانباران بە دەست و زمان بەشێکە لە جیهاد لە پێناو خوادا ئەگەر چی باوکیش بن، چونکە ڕێبازی پەروەردگار بریتیە لە گوێڕایەڵی، ئاگاداریشم کە کۆمەڵی

کەس کەم تەرخەمی دەکەن لە فرماندان بە چاکە و ڕێگری کردن لە خراپە لەبەر لۆمەی خەڵکی و هەتاوەکو بڵێن: فلانەکەس ڕەوشتی جوانە و زۆر سەرو دڵی خەڵکی ناگرێت و هەر خەریکی کەم و کورتی خۆیەتی، بەڵام هەرگیز خوای گەورە ئەوانە ناکات بە ڕەوشت جوانەکانتان، بەڵکو ئەوان بەد ڕەوشت ترینتانن، کەسێکیش بەو شێوە بێت خەمی خۆی نەخواردووە.

بەڵکو ئەوە پشتی لە خەمخواردنی خۆی هەڵکردووە، چونکە حاڵەتێکی پێ باشە کە جیاوازە لەوەی کە خوای گەورە بە باشی زانیوە بۆی کە ئەویش فەرماندان بە چاکە و نەهی کردن لە خراپەیە [1].

لەم نامە پڕ بایەخەدا عومەر(ﷺ) تیشك دەخاتە سەر سوونەتێکی پەروەردگار کە هەرگیز دواناکەوێت کە ئەویش ئەوەیە کە هەر کۆمەڵگەیەك تیایدا خراپەکاران بە ئاشکرا تاوان ئەنجام بدەن و خەڵکی پیاو چاکیش نەهیان لێ نەکەن و سەر و دڵیان نەگرن ئەوە خوای گەورە دووچاری یەکێك لەم سێ سزایە یان دەکات – یان خۆی سزایان دەدات، یان بە دەستی هەندێك لە بەندەکانی سزایان دەدات، لەوانەیە ئەوانش لە ستەمکار و دەسەڵاتدارەکان بن و خوای گەورە لەسەر دەستی ئەوان تۆڵە لە گوناهکاران دەکاتەوە، یاخود خوای گەرە دووچاری ترس و برسێتی و سەر شۆڕی و جۆرەها بەڵا و موسیبەتیان ئەکات.

عومەر لەم نامەیەدا ڕوونی دەکاتەوە کە بێدەنگ بوون لەبەرامبەر گوناهکاراندا – ئەوانەی کە بە ئاشکرا گوناه دەکەن – ڕەوشتی هاوەڵان نەبووە(ﷺ)، بەڵکو بەوە وەسفیان دەکات کە توند بوون بەرامبەر بەو کەسانەی کە ئاشکرا تاوانیان ئەنجام دەدا، هەروەها ئاماژە بەوە دەکات کە توند بوون بەرامبەر ئەو کەسانەی کە بە ئاشکرا تاوان ئەنجام دەدەن باخزمی نزیکیش بن جۆرێکە لە جیهاد، ئەم فراوانکردنەی بازنەی جیهادیش بەڵگەی شەرعی خۆی هەیە وەك فەرمایشتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ التحريم: ٩). واتە: ئەی پێغەمبەر(ﷺ) بجەنگە لەگەڵ بێ باوەڕان و دووڕوواندا وە توند و تیژ بە لەگەڵیاندا وە جێ یان دۆزەخە کە سەرئەنجامێکی زۆر خراپە.

---

[1] – سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٦٠.

جیهادی خەڵکانی دوو ڕوش بەنکوڵی کردنی کارەکانیان و توندبوون لە مامەڵە کردن لەگەڵیاندا دەبێت ١، لێرەشدا عومەر(ﷺ) چەمکێکی هەڵەلای خەڵك ڕاست دەکاتەوە کە ئەویش وەسفکردنی ئەو کەسەیە کە نکولی کاری خراپە ناکات و بێدەنگ دەبێت و خۆی بەڕەوشت جوان و تێگەیشتوو و خەمخۆری نەفسی خۆی دەزانێت، ڕوونی دەکاتەوە کە ئەمە ڕەوشت جوانی نیە، چونکە بە شێوەیەکی سلبی مامەڵە لەگەڵ خەڵکانی ناحەز و نەیاردا دەکات و پشت گوێیان دەخات لە کاتێکدا کە ئەوان پێویستان بە سۆزو بەزەیی یەو ئەوەش بە هەوڵدان بۆ چاککردنیان دەکرێت، وەلامی ئەوەش دەداتەوە کە ئەڵێن تێگەشتووە و خەریکی کەم کورتی خۆیەتی و خەمی خۆی دەخوات و ئەڵێت ئەوە خەمی خۆی نەخواردووە بۆ ڕزگا کردنی خۆی لە ئاگر و بەرزکردنەوەی پلەو پایەی لە بەهەشتدا بەڵکو خۆی بەرەو لەناوچوون بردووە.

چونکە بێدەنگ بوون لە بەرامبەر تاوان دا لێپرسینەوەی لەسەرە و لەوانەشە دووچاری دۆزەخی بکات، جا ئەگەر لای خەڵکی ئەم کەسە بەتێگەشتوو بزانرێت ئەوە لای خوا تاوانێکی گەورەی ئەنجام داوە، چونکە فەرمانی خوا و پێغەمبەری خوا(ﷺ) شکاندووە لەبەر دڵی خەڵکی [٢].

هەروەها سەرجەم نامەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز سەربارەت بە چاکسازی کۆمەڵگە بوون وەك لەو هەواڵەی ئیبراهیمی کوڕی جەعفەرەوە لە باوکیەوە هاتووە ئەڵێ: هەر نامەیەك لە عومەرەوە بۆ ئەبوبەکری کوڕی محمدی کوڕی عمری کوڕی حزم بهاتایە ئەوە ڕەتکردنەوەی ستەمێك یان زیندوو کردنەوەی سوننەتێك یان نەهێشتنی بیدەعەیەك یان بەشکردنێك یان دیاریکردنی بڕی بەخشینێك یان خێرێکی تیادا بوو [٣].

**ب- بیرخستنەوەی قیامەت بۆ خەڵکی:** ڕۆژێکیان عومەری کوڕی عبدالعزیز وتاری دا بۆ خەڵك و وتی: من لەبەر کارێك ئێوەم کۆ نەکردۆتەوە کە کردبێتم، بەڵام بیرم لە ڕۆژیی دوایی و ئەو حاڵەتە کردەوە کە ئێوەی تێ دەکەون و بۆم دەرکەوت کە باوەڕدار پێی گێلە و بێ باوەڕیش تیاچووە پاشان دابەزی [٤].

---

[١] - التريخ الاسلامی(١٥، ١٦ / ١٣٠).

[٢] - هەمان سەرچاوە(١٥، ١٦ / ١٣٠).

[٣] - طبقات ابن سعد(٥ / ٣٤٢).

[٤] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ٤٢.

ئەم وتەیەش پاراو و پڕمانایە هەر چەند کـورت و کەمـە، چـونکە یـاد خـستنەوەیەکی زینـدووی مرۆڤە بە چارەنووسی پاش مردن، چونکە ئەو کەسەی کە باوەڕی بە زیندوو بوونەوەی دوای مـردن و ئەو سزا و پاداشتە هەیە کە لـە دوایەوە دێت و خۆی بە باشـی بـۆ ئامـادە ناکـات ئـەوە بـە گێـل دادەنرێت، چونکە ئەقڵی خۆی نەخـستۆتە گـەڕ بـۆ خۆئامـادە کـردن بـۆ دواڕۆژی خـۆی لەگـەڵ ئەوەشدا کە باوەڕی پێی هەیە [1].

لەو وتارانەشدا کە دەربارەی بیرخستنەوەی ڕۆژی دوایی و مردن داویەتی، ڕوونی کرۆدتەوە کە مرۆڤ بۆ هەتا هەتایە دروست کراوە و مردن تەنها گواستنەوەیە لـە شوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکی تـر لـەم بارەیەوە ئەڵێن: ئێوەبۆهەتاهەتایەدروست کراون، بەڵام لـە شوێنێکەوە ئەگوێزرێنەوە بۆشوێنێکی تر [2].

لە یەکێك لـە وتارەکانیدا ئەڵێ: خەڵکینە، دونیا و ئەو مۆڵەتەی کە تیادایە هەڵتان نەخەڵـەتێنێ و لـە خەشتەتان نەبات، چونکە ماوەیەکی کەم دەمێننەوە و پاشان دەگوڕێرێنەوە بۆ جێیەکی تر و کـۆچ دەکەن، جا لـە خوا بترسن لـە دەروونتاندا پێش ئەوەی وادەی مەرگتان نزیك ببێتـەوە، مـەهێڵن کـاتی زۆر تان لـە کیس بچێت و دڵتان ڕق ببێت و وەك کەسانێکتان لێ بێت کە بانگ کـران بـۆ چـاکە، بەڵام کەمتەرخەمیان تیـادا کـردوو و مۆڵـەتیان لـە دەسـت چـوو، پاشـان لـە ڕۆژی دواییـدا لـەو کەمتەرخەمیان پەشیمان دەبنەوە [3].

عومەری کوڕی عبدالعزیز زۆر باسـی مـردن و ڕۆژی دوایـی و خۆئامـادە کـردن بـۆ دیـداری پەروەردگاری دەکرد لـە وتار و ئامۆژگاریەکانیدا.

ج- **ڕاستکردنەوەی چەمکە هەڵەکان:** عومەر لـە یەکێك لـە وتارەکانیدا ئـەڵێت: پاشـان خەڵکینـە، زۆر هیواتان درێژ نەبێتو تەوبـەکردن فـەرامۆش نەکـەن و قیامـەت بـە دوور نـەزانن، چـونکە هەرکەسێك مرد ئەوە قیامەتی هەسـتاوە، هـیچ گلەییـەکی وەرناگرێـت و چـاکەی زیـاتر بـۆ ناکرێت، ئاگاداربن کەسێك سەلامەت و پارێزراو نیە کە پێچەوانەی سوننەت ڕەفتـار دەکـات و گوێڕایەڵی بۆ هیچ کەسێك نیە لـەسەر پێـچی پـەروەردگاردا، ئاگـاداربن ئێـوە ئـەو کەسـە بەستەمکار دەزانن کە لـە ستەمی پێشەواو کاربەدەستەکەی هـەڵاتووە، بـەڵام سـتەمکارترینیان

---

[1] - التاريخ الاسلامي(١٥، ١٦ / ١١٨).

[2] - الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٤٨).

[3] - الكتاب الجامع لسيرة عرم بن عبدالعزيز(٢ / ٤٤٩).

ئەو پێشەوا ستەمکارەیە. ئاگادار بن من چارەسەری مەسەلەیەك دەکەم و خەریکی کارێکم کە تەنها خوا ئەتوانێ کۆمەکم بکات بۆی، گەورەکان تەمەنیان تیایدا بەسەر بردووە بچکۆلەکان تیایدا گەورە بوون و بیانی تیایدا فێری عەرەبی بووە و عەرەبی دەشتەکی لەسەری کۆچی کردوە، بەڕادەیەك کە وایان دەزانی ئاینە و غەیری ئەویان بە حەق نەدەزانی پاشان وتی: من قورسە بەلامەوە کە ماڵ و ئابڕووتان لێ زەوت بکەم مەگەر بەحەقی ئیسلام و دەسەلات و تواناش هەر بۆ خوایە [1].

لەم وتارەیدا عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) موسڵمانان ئاگادار دەکاتەوە لە نزیکی ڕۆژی دوایی، چونکە هەر کەس مرد ئەوە قیامەتی هەستاوە جابا ئاگای لە مەرگ بێت کە لەوانەیە کتوپڕ یەخەی بگرێت و ئەوسا ناتوانێ پۆزش بێنێتەوە بۆ کارە خراپەکانی کە لاپەڕەی کردەوەکانی پێ ڕەش کردۆتەوە.

هەروەها ناتوانێ کاری چاکەی زیاتر بکات و نامەی کردەوەکانی پێ سپی بکاتەوە و لە کاتێکدا پەشیمان دەبێتەوە کە پەشیمانی سوودی نیە لەوەی کە ڕۆژگارێك هەبوو ئەیتوانی تیایدا تەوبەی نصوح بکات و کاری چاکەی زۆر ئەنجام بدات.

پاشان ڕوونی دەکاتەوە کە سەلامەتی ڕاستەقینە لە شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خوادایە(ﷺ)، ئەمەش ئاماژە دانە بەیەکێك لە دوو ڕەگەزەکەی کردەوەی چاك کە ئەوانیش دڵسۆزی و شوێنکەوتنی سوننەتە، بەم پێیەش ئەو چارەسەری واقعێك دەکات کە دڵسۆزی تیایدا لەبەهای کردەوە کەم ناکاتەوە، بەڵکو شوێنکەوتنی سوننەت لەبەهای کەم دەکاتەوە، چونکە دوای نەمانی هاوەڵان بیدعە بڵاوبوویەوە و هەندێ والی دەرکەوتن کە دژایەتی هەندێ سوننەتیان دەکرد کە لەگەڵ ئارەزووەکانیاندا نە دەگونجا، پاشان یەکێك لەو شتانەی باسکرد کە ڕێگرە لە بڵاوبوونەوەی بیدعە و خراپبوونی کاروباری ئوممەت و وتی:

" گوێڕایەڵی بۆ هیچ دروستکراوێك نیە لەسەرپێچی پەروەردگاردا، جا ئەگەر هەندێ لە ئەمیرەکان نەفسی خراپەکاریان یاخود ڕوپامایی خەڵك هانیدان بۆ فەرمانکردن بە سەرپێچی کردنی پەروەردگار یان ڕێی بۆ خۆش کردنی. ئەوە نابێ گوێڕایەڵیان بکرێت، بەم شێوەیەش هۆکارێکی گرنگ لە هۆکارەکانی ئەو سەرپێچیانە نامێنێت کە ئەویش ئەو گوێڕایەڵیەیە کە وەلی ئەمر و

---

[1] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٤٣.

کاربەدەست بەسەر خەڵکیەوە هەیەتی، جار ئەگەر ئەم گوێڕاڵیە سنوودار کرا بەوەی کە دەبێ لە گوێڕایەڵی خوادا بێت ئەوە دەرونەکان کاریگەریان نامێنێت لە بلاو بوونەوەی خراپە لە کۆمەڵگەدا و کاروبارەکان بە دەست خەڵکانی چاکە کارەوە دەبێت، پاشان ڕوونی کردەوە کە ئەوەی لە عورفی و نەریتی خەڵکی داهاتووە سەبارەت بە بەیاخیبوو زانینی ئەو کەسەی کە لە ستەمی کاربەدەستەکەی هەلاتووە هیچ حسابێکی بۆ ناکرێت لە ڕووی شەرعیەوە، چونکە ئەو کارەی کە پێ ی هەستاوە یەکێکە لەو هۆکارانەی کە بۆی هەیە بیگرێتەبەر بۆ ڕزگار بوون لە ستەم،

یەکەمین کەسێکیش کەشیاوی ئەوە بێت بە ستەمکار وەسف بکرێت ئەو کەسەیە کە ستەمی کردووە، بێگومان ڕایگەیاندنی ئەم مەسەلەیە لەلایەن عومەرەوە(ﷺ) لە کاتێکدا کە لەتکەی دەسەلاتدایە – خەلیفەیە – بەڵگەیە لەسەر خۆدا ڕنینی لە ئارەزووی دەرون و دەمارگیری بۆ خزمەکانی و دڵسۆزی بۆ پەروەردگار، پاشان وەسفی ئەو واقیعە کۆمەلایەتیە دەکات کە تیایدا داب و نەریتی خەڵکی تێکەلاو بە ئاین و بیدعە بە سوننەت بوو و تاکەکانی کۆمەڵگەش خویان پێوە گرتوو و خەڵکانی عەجەمیش – غەیرە عەرەب – و عەرەبە دەشتەکیە کۆچکردوەکانیش لەسەری پەروەدە بوون و بە ئاینی دەزانن.

دیارە کاتێ نەریتی کۆمەلایەتی تێکەڵ بە نەریتی ئاینی دەبێت هەندێ نەریتی نەفامی دزەدەکاتە ناو نەریتی ئیسلامیەوە ئەمەش کاریگەری خۆی دەبێت. لەسەر پەروەردەی تاکەکانی کۆمەڵگە و ئەچێتە دڵیانەوە بەو پێیەی کە نەریتە نەفامیەکان بە هەمان ئاراستەی تێر کردنی حەزە دەرونیەکانن ئەگەر چی دەرونەکان لا دەروستەمکاریش بن، لەم کاتەشدا لایەنگر و هەواداری خۆی هەیە و هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەش بەشێوەیەکی دروست لە مەسەلەکان ناگەن و کاتێ خەڵکانی چاکەخوایش هەڵدەستن بە هەوڵی پاکسازی ئەوە خراپەکاران ئەو هەولانەیان ئەشێوێنن و داوا لە خەڵکی ئەکەن کە بەرگری لە داب و نەریتە بۆ ماوەکانیان بکەن، چونکە بۆ ماوە بوونی لە ڕوانگە ئەوانەوە جۆرێك لە پیرۆزی پێ دەبەخشێت، بەلام کاتێك چاکسازی لە لوتکەی دەسەلاتەوە سەرچاوە دەگرێت وەك لەسەر دەمی عومەری کوڕی، عبدالعزیزدا ڕووی دا ئەوە چاکسازی ئاکامی مەزن و خێرای دەبێت، چونکە بەهرەمەند دەبێت لەو گوێڕایەڵیەی کە خوا پێی بەخشیوە هەتاوەکو لە سنووری گوێڕایەڵی پەروەردگار تێپەڕ نەبێت ئەمە وێڕای ئەو هێز و دەسەلاتەی کە وەك سەرۆك هەیەتی [1].

---

[1] - التاريخ الاسلامي(١٥، ١٦ / ١٢١).

د- ڕەتکردنەوەی دەمارگیری خێڵەکەی: عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ ضحاکي کوڕی عبدالرحمن، لەو شتانەش کە لەو نامەیەدا هاتبوو: ئەوەی کە هانیدام بۆ نووسینی ئەم نامەیە ئەوە بوو کە سەبارەت بە چەند کەسێکی خەڵکی بیابان بۆیان باسکردم، پیاوانێك کە کراونەتە کاربەدەست نەزانیان ئاشکرا و زانستیان کەمە و سەرکەشی ڕووی تێکردوون. فەزڵی خوایان لەبیرکردووە نیعمەتەکانی خوایان بە جۆرێك گۆڕیوە کە بۆ ئەوان ڕەوانیە، ئەوەتا بیستومە کە کەسانێکیان جیابوونەتەوە و بەناو مضر و یەمەنەوە دەجەنگێن و پێیان وایە کە ئەوان دەبێ گەورەی خەڵك بن.

پاك و بێگەردی وستایش بۆ خوا چەندە دوورن لە سوپاسکردنی بەخششەکانی خواوە و چەندە نزیکن لە فەوتان وتیان چوون و خۆ بچوككردنەوەوە، خوا لە ناویان بەرێت چ کارێکیان هەڵبژاردووە و چە گرنتیەکیان وەرگرتووە، تۆش باش دەزانی کە خراپەکار و لاسار بە هۆی نیەتەوە بەدەبەخت دەبێت و ئاگریش بە گاڵتە دروست نەکراوە، ئایا ئەوانە گوێیان لە فەرمایشتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ﴾ الحجرات: ١٥). واتە: بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە ئەوانەن کە باوەڕیان هێناو بە خوا و پێغەمبەرەکەی پاشان دوو دڵ نەبوون(لە ئیمانەکەیاندا) وە بە ماڵ و گیانیان تێکۆشانیان کردووە لە پێناو ڕێبازی خوادا هەر ئەوانەن ڕاسگۆیان. ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحْمُ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ ۚ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ۗ ٱلْيَوْمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن دِينِكُمْ فَلَا تَخْشَوْهُمْ وَٱخْشَوْنِ ۚ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِى مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ ۙ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ المائدة: ٣). واتە: ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە ئەمڕۆ نائومێد بوون لە ئاینەکەتان کەواتە لێیان مەترسن تەنها لە من بترسن ئەمڕۆ ئایینەکەتانم تەواو(کامل) کردوە بۆتان و چاکە و بەهرەی خۆم بە تەواوی ڕشتووە بەسەرتاندا و ڕازی بووم کە ئیسلام ئایینتان بێت جا هەرکەس ناچار بوو لە برسیەتیدا بێ ئەوەی نیەتی گوناە کردنی هەبێ(لەو گۆشتانە بخوات گوناهی ناگات) ئەوەی بەڕاستی خوا لێخۆش بووی بەبەزەیی یە.

لەگەڵ ئەمەشدا بۆیان باسکردم کە کەسانێك هاوپەیمانێتی دروست دەکەن لە کاتێکدا کاری وا لە ئیسلام دا دروست نیە، هەریەکێکیش لەم دوو هاوپەیمانە بە ئومێدی ئەوەیە کە لە کاتی بوونی کێشەدا لەلایەن هاوپەیمانەکەیەوە بەرگری لێ بکرێت ئەمە سەرپێچی و لادانە لە فرمانی خوا و پێغەمبەر(ﷺ) خۆدا ڕنینە لە ئیسلام بۆیە من هەموو ئەو کەسانە ئاگادار ئەکەمەوە کە ئەم نامەیەی منیان پێ دەگات کە ئیسلام بکەن قەلاّ و پەناگەی خۆیان و جگە لە خواو پێغەمبەر و(ﷺ) باوەڕداران کەس بە دۆست و پشتیوانی خۆیان نەزانن دووبارە ئەم کەسانە ئاگادار ئەمەکەوە و خوا بە شاهید دەگرم کە لە ڕەگی بنا گوێ لە مرۆڤەکان نزیك ترە و لەمەشدا کەمتەرخەمیم نەکردووە لە ئامۆژگاری کردنتاندا.

هەرچەندە ئەگەر بزانم کە کەسێك یان هۆزێك سەرقاڵی کارێکی وایە و ئەیەوێ لەسەری بەردەوام ئەوە سەرشۆڕی دەکەم، تۆش ئەم ئامۆژگاریەمان بلاّو بکەرەوە، چونکە ئەمە ڕاست و دروستە و لەکەس شاراوە نیە.

هەروەها باخەڵکی چاکەکاریش هاوکارت بن بە زمان، چونکە خەڵکێکی زۆر هەن کە نازانن، داوا لە خوای گەورە ئەکەین کە یارمەتیمان بدات کە بە باشترین شێوە خەڵکی بەڕێوەببەین و نێوانمان باش بکات و السلام.

لەم نامەیەشدا ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) چارەسەری جۆرێکی ترسناك لە لادان ئەکات، کە ئەویش ئەوەیە کە کۆمەڵێك لە موسڵمانان کە باوەڕ لە دڵیاندا جێگیر نەبوو بوو و دڵیان ئاوەدان نەبوو بوو بە زانستی شەرعی. ئەمانە هەستان بە دانانی پەیوەندی نەفامی بۆ خۆیان لەسەر بنەمای خێڵەکی و هۆزچێتی و هەریەکەیان وەلای بۆ هۆزەکەی بوو لەسەر حەق بێت یان ناحەق بۆ دادگەری بێت یان ستەم و هۆزەکەی کرد بوەدۆزی سەرەکی خۆی و بانگەوازی بۆدەکرد و بەرگری لێ دەکرد بە جۆرێك کە بەهۆیەوە بوو بوون بەبرا و لەسەر بنەمای خێڵ و هۆز و نەژادیەکیان خۆش دەویست و هەندێك لە موجاهیدەکان لە نێوان خۆیاندا لەسەری بەشەڕ دەهاتن، ئەمەش بووە هۆکارێك بۆ دواکەوتنی جیهاد و خەڵکی وڵاتە ئازاد کراوەکانی بوێر کرد بەرامبەر بە موسڵمانان و چەندین ڕاپەڕینی یەك لە دوای یەکیان ئەنجام دا.

تەنانەت کار گەیشتە ئەوەی کە هەر کەسێك لە هۆزێك دەبووە ئەمیر ئەوە ئەنـدامانی هۆزەکـەی خۆی لە خۆی نزیك دەکردەوە و پشتی پێ دەبەستن ئەمەش ئەبووە مایەی نارەزایی تیرە و هۆزەکانی تر و راپەڕین رووی دەدا.

ئەمەش بە هۆی وەلاتانی پەیوەندی ئیسلامیەوە بـوو کـە نیعمـەتێکی گەورەیـە بـۆ موسـڵمانان و زیندوو کردنەوەی پەیوەندی نەفامی لە جیاتی دا [1].

**٥- ڕازی نەبونی بە وەستان لەبەر دەستی دا:** کـاتێ عومـەر(رضي الله عنه) بـوو بـە والی خـەڵکی لەبـەر دەستیدا دەوەستان و لـەبەریشی هەڵدەسانەوە، ئەویش وتی: ئەی کۆمەڵی موسـڵمانان ئەگـەر هەستن هەڵدەستم و ئەگەردانیشن دادەنیشم، چونکە خەڵکی تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانیـان هەڵدەستن.

خوای گەورەش چەند فەرز و سونەتێکی بڕیار داوە، هەر کەس پەیڕەویان بکات فریادەکەوێت و هەرکەسیش پشتگوێیان بخات لـەناو دەچێت [2].

لێرەدا عومەر دەیویست ئەو داب و نەرتە نارەوایانە لە ناو بەرێت کە والـیەکان تیایدا چاویان لـە قەیسـەر و کیسراکان دەکرد و سـور بـوو لەسـەر گەڕاندنـەوەی ئوممـەت بـۆ ڕێبـازی خەلیفـەکانی ڕاشیدین، لێرەشدا عومەر دوو پاڵنـەر لـە قاڵبـدەدات کـە پاڵیـان پێـوە دەنـا بـۆ بـەگوێ کردنـی بنەماڵەکەی لە بەکار هێنانی ڕواڵەتە دونیاییەکاندا کە یەکەمیان: حەزی دەروون بوو بۆ دەرکەوتن و سەپاندنی دەسەلات و شکۆ و سام خستنە دڵی خەڵکیەوە، دووەمیـشیان ئـارەزووی هۆزەکـەی بـۆ هێشتنەوەی ئەو ڕواڵەتانە و لۆمە کردنی بە هۆی جولانەوەی بە پێچەوانەی خەلیفەکانی پێش خۆی، بەلام توانی بەسەر ئەم دوو پاڵنەرەدا سەربکەوێت بە لێبڕان و باوەڕێکی بەهێزەوە، ئـەو پاڵنـەرە کـە پاڵی پێوە دەنا بۆ خاکی بـوون و ڕەتکردنـەوەی ڕواڵەتـە دونیاییـەکان بریتـی بـوو لـە ترسـانی لـە پەروەردگار و ئومێدی بەوەی کە لای پەروەردگارە و چاو تێ بڕینی بۆ ڕۆژی دوایی. ئەم پاڵنـەرەش زۆر بەلایەوە لە کێشکە زەمینیەکان بە هێزتر بوو.

---

[1] - التاريخ الاسلامی(١٥، ١٦ / ١٢٤).

[2] - تاريخ دمشق له التريخ الاسلامي يتوة(١٥ / ١١٤).

ئەوە بوو توانی سەرکەوتوو بێت لە جڵەو کردنی دەروونی خۆیدا و بێدەنگ کردنی خەڵکی خاوەن ڕواڵەتی درۆینە و ڕاستکردنەوەی چەمکە هەڵەکانی کۆمەڵگا دەربارەی ئەو بارودۆخەی کە پێویستە والی و کاربەدەستانی تیابێت و پەیوەندی نێوان کاربەدەست و هاولاتیان.

کاتێکیش ئەڵێ: خوای گەورە چەند فەرزێکی پێویست کردووە، ئەوە ئاماژە بە هۆکارەکانی خۆشبەختی و بەدبەختی دونیا و دوا ڕۆژ دەکات.

جا هەر کەسێك پابەند بێت پێوەی ئەوە ئەگاتەوە بە کاروانی پارێزکاراندا و هاوەڵانێکی باش و بەرێزی بۆ خۆی دەستخستووە و لە ڕۆژی دواییشدا بەرەو بەهەشت بە ڕێ دەخرێت و ئەوەش چارەنووسێکی باش و نەبڕاوەیە [1].

و- **ڕێزگرتنی ئەهلی فەزڵ و خەڵکانی خاوەن پلەوپایە:** حافظ ئیبن کثیر باس دەکات کە کوڕی قەتادەی کوڕی نوعمان هاتۆتە خزمەت عومەری کوڕی عبدالعزیز و ئەویش پێی وت: تۆ کێ ی؟ ئەویش دەست بەجێ وتی:

أنا ابن الذي سالت على الخدّعينةُ     فرُدَّت بكفّ المصطفى احسن الرّدّ

فعادت كما كانــت لأول أمرها     فيا حسنها عيناً ويا حسن ماردّ

واتە: من کوڕی ئەو کەسەم کە چاوی بەسەر کوڵمیدا هاتە خوارەوە، بەڵام بەدەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە باشترین شێوە گێڕدرایەوە بۆ شوێنی خۆی و وەك خۆی لێ هاتەوە، ئەی چەند چاوێکی جوان بوو چەند بەباشی گێڕدرایەوە شوێنی خۆی.

عومەری کوڕی عبدالعزیزیش وتی:

تلك المكارم لاقعبان من لبن     شيباً بماء فعادا بعد ابوالا

واتە: ئەوەیە ڕەوشت بەرزی و جوامێری نەك سەتڵەماستی تێکەڵکراو بە ئاوو و زەرد هەڵگەراو پاشان لای خۆی هێشتیەوە و خەلاتی باشی پێ بەخشی [2].

لەم هەواڵەشدا هەڵوێستی عومەری کوڕی عبدالعزیز مان بۆ دەرکەوێت ڕەحمەتی خوای لێ بێت، لە ڕێزنان لە کوڕی قەتادەی کوڕی نوعمان کاتێ سەردانی کرد و بە هۆی ئەو ڕووداوە وە کە تووشی باوکی بو بوو لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی پێ ناساند، ئەمەش بەڵگەیە

---

[1] - التريخ الاسلامي(١٥، ١٦ / ١١٥).

[2] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٩٦، التريخ الاسلامي(١٥، ١٦ / ٢٢).

لەسەر بەهێزی عومەر لەلایەن ڕەوشتیەوە بە هۆی ڕێزنانی لە خەڵکی خاوەن چاکە و فەزڵ و دەستپێشخەر بۆ خزمەتی ئیسلام و موسڵمانان، دیارە ئەوەی کە دووچاری قەتادەبووە بەڵگەیە لەسەر ڕۆچوونی لە کوشتاردا و قوربانیدانی بەگیانی لە پێناو موسڵماناندا، هەروەك ڕوودانی موعجیزەیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەودا سەروەریەکە بۆی [1].

هەروەها نموونەیەکی تری ڕێزگرتنی لە خەڵکانی خاوەن فەزڵ ئەوە بوو لە پێناو زیاد خزمەتگوزاری ئیبن عەیاش دا پێی هەستا ئەوە بوو زیادی خزمەتکاری ئیبن عەباش لەگەڵ چەند هاوەڵێکی هاتە لای، کاتێ گەشتە دەرگاکەی کۆمەڵە خەڵکێکی لێ بوو، بەلام بە تەنها مۆڵەتی چوونە ژوورەوەیان بەودا، کاتێ چوو ژوورەوە و لە بیری چوو کە سلاوی خەلیفەی لێ بکات پاشان بیری کەوتەوە و وتی: سلاوت لی بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران، عومەریش وتی: سلاوی یەکەمیشت هیچ زیانێکی بۆ من نەبوو، پاشان عومەر(ﷺ) لەو شوێنەی کە تیایدا بوو دابەزیە سەر زەوی و وتی: من بەلامەوە زۆرە لە شوێنێکدابم کە لە شوێنی زیاد بەرزتر بێت، کاتێ کارەکەی زیاد تەواو بوو ڕۆشت و عومەریش فەرمانی دا بە سەرپەرشتیاری بەیتولمال کە بەیتولمال بۆ زیاد و هاوەڵەکانی بکاتەوە هەتاوەکو پێویستی خۆیانی لێ هەڵگرن کاتێ سەرپەرشتیاری بەیتولمال زیادی بینی پێ ی قورس بوو کە بۆ کەسێکی وا بەیتولمال بکاتەوە – دیارە نەیدەناسی – پاشان بۆی کردەو و زیادیش چووە ژوورەوە و هەشتا و ئەوەندە یان نەوە د ئەوەندە درهەمی بۆ خۆی و هاوەڵەکانی برد، کاتێ سەرپەرشتیارە کە ئەمەی بینی وتی: ئەمیری باوەڕداران باش دەیزانی کێ دەنێرێت بۆ بەیتولمال [2].

لەم هەواڵەشدا نموونەی خاکی بوونی عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) و ڕێزگرتنی لە زانایانی خواویستمان بۆ دەردەکەوێت، ئەوە بوو گوێی بە نازناوی خەلیفایەتی نەدا کە بەرزترین نازناوە لای موسڵمانان، پلەوپایەش کەسانێك دەکەونە داویەوە کە بە پۆست و پلەوپایە دنیاییەکان هەڵبخەڵەتێن، بەلام ئەوانەی خاوەنی باوەڕی بەهێز و دامەزاون ئەوە کە سایەتیان ناگۆڕێ ئەگەرچی گەورەترین پۆستیشیان پێ بسپێردرێت، بەڵکو بە خاکێتی خۆیان دەمێننەوە لەوانەیە خاکی بوون و ڕێزنانی لە خەڵك زیاتر ببێت، پاشان عومەر لە شوێنی خۆی دابەزی هەتاوەکو لەو زانا خواویستە

---

[1] - التريخ الاسلامی(١٥، ١٦ / ٢٣).

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٥٣، التاريخ الاسلامي(١٥ / ٢٤).

بەرزتر نەبێت، هەرچەندە ئەو زانایەش خزمەتگوزار بوو، بەڵام ئەوە ڕێز و پلەوپایەی لای عومەر کەمتر نەکردەوە، چونکە لە ئیسلامدا زانست و خواناسی پێوەرە نەك ڕەچەڵەك، ئەم زانا خوا ویستەش هەڵوێستێکی جوامێرانەی هەبوو تەنها پارەیەکی کەمی لە بەیتولمال هەڵگرت لە کاتێکدا کە سەر پشك کرا بوو لە هەڵگرتنی ئەو بڕەی کە پێویستیەتی، ئەمەش نموونەیەکی بەرزی زوهد و پارێزکاریە، کاتێ کە دەرونەکانیش مەزن و ئەقڵەکان دەخرێنە گەڕ ئەوە خۆیان دەپرێزن لە کەل و پەلی دونیا کە مرۆڤە بچوکەکان کێ برکێی لەسەر دەکەن، و چاودەبڕانە خۆشی نەبڕاوەی ڕۆژی دوایی کە مرۆڤە گەورەکان کێ برکێی لەسەر دەکەن[1].

**ز- مرۆڤ بە دوو شتە بچوکەکەیەتی دڵ و زمان:** لە نێوان ئەو وەفدەدا کە هاتبووە لای عومەر بۆ پیرۆزبایی لێ کردنی مێرد منداڵێك هەبوو، وە فدەکەش ئەم مێرد منداڵەیان هەڵبژارد بوو بۆ قسەکردن کە لە هەموویان بچوکتر بوو، کاتێ دەستی کرد بە قسە کردن، عومەر پێی وت: پەلەمە کە کوڕم با لە تۆ گەورە تر قسە بکات، مێرد منالەکەش وتی: ڕاوەستە ئەی ئەمیری باوەڕداران، مرۆڤ بە دوو شتە بچوکەکەیەتی: دڵ و زمانی، جا ئەگەر خوای گەورە زمانێکی پاراو و دڵێکی هۆشیاری دا بە مرۆڤ ئیتر شیاوی قسە کردنە[2].

ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر پێشخستن بە تەمەن بوایە ئەوە لەناو ئوممەتدا خەڵکی بەتەمەنتر لە تۆ هەیە و دەبوایە ئەوان لە جێی تۆدا بوونایە[3]، عومەریش وتی: قسە بکە کوڕم، ئەویش وتی: بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئێمە وەفدی پیرۆزبایین نەك سەرە خۆشی، لە وڵاتی خۆمانەوە هاتوین بۆلای تۆ سوپاسی خوا ئەکەین کە تۆی پێ بەخشین، هاتنیشمان بۆ لات بۆ داخوازی و پێویستی یان لە ترسانیە، چونکە پێویستیەکانمان لەلایەن تۆوە بۆ نێردراوە و خوای گەورەش بە داد گەریت ترسی ڕەواندوینەتەوە[4].

عومەریش سەرسام بوو بە ڕەوانێژی و زانست و ژیری ئەم مێرد منداڵە بۆیە زیاتر هانی دا و متمانەی بە خۆ بوونی و بوێری تیادا بە هێزتر کرد و ئەم ڕووداوەی کردە هەڵوێستەیەکی

---

[1] - التاريخ الاسلامي(١٥ / ٢٤).

[2] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٧٩.

[3] - مروج الذهب(٣ / ١٩٧).

[4] - النموذج الاداري المستخلص ل: ٩٨.

پەروەردەیی بۆ مێرد منداڵەکە لە خزمەت خەلیفەی موسڵمانانندا، ئەوە بوو داوای ئامۆژگاری لێ کردوو پێی وت ئامۆژگاریەکی کورتمان بکەن ئەی مێرد منداڵە ئەویش وتی: بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران، خەڵکانێك هەن کە لێبوردەیی پەروەردگار و هیوا درێژی و ستایشی خەڵکی بۆیان لە خشتەی بردوون و تۆش میهرەبانی خوا بەرامبەرت لە خشتەی نەبات، پاشان عومەر پرسیاری تەمەنی مێرد منداڵەکەی کرد کە لە نێوان ١٣ – ١٩ساڵ دا بوو، بۆیە بەشیعر وتی:

تعلم فليس المرء يولد عالماً    وليس اخو علم كمن بات جاهل

و ان كبير القدم لاعلم عنده    صغير اذا التفت عليه المحافل [١]

ح- **ئافرەتێکی میسری هەژار سکاڵا لای عومەر دەکات:** عومەر چاودێری کاروباری موسڵمانانی دەکرد و دەرگای هەمیشە لەسەر پشت بوو بۆ بیستنی هەواڵ و کێشەکانیان، پۆستە چی عومەری کوڕی عبدالعزیزیش هەرچی پێ بداریە هەڵی دەگرت و دەیگەیاند، ئەوە بوو فرتو نەڕەشی خزمەتگوزاری ذی أصبح نامەیەکی پێ دا و تیایدا باسی ئەوەی دەکرد کە دیوارێکی نزمی هەیە و خەڵکی ئەچنە ماڵیەوە و مریشکەکانی دەدزن، عومەریش بۆ نووسینی: بە ناوی خوای بەخشندە لە بەندەی خوا عومەری کوڕێ عبدالعزیزەوە بۆ فەرتونە ڕوەشتی خزمەتگوزاری ذی أصبح، نامەکەتم پێ گەیشت کە تیایدا باسی نزمی دیوارەکەت و هاتنە ناوەوەی خەڵکی بۆ دزینی مریشکەکانت دەکەیت، منیش نامەیەکم نووسیوە بۆ ئەیوبی کوڕی شورەحبیلی و ئەیوب بەرپرسی نوێژ و جەنگی میسر بوو – و فەرمانم پێ کردووە کە دیوارەکەت بۆ بەرزبکاتەوە هەتاوەکو لەوە بتپارێزێت ئیشەڵلا، نامەیەکیشی نووسی بۆ ئەیوبی کوڕی شورە حبیل:

لەندەی خوا ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە بۆ کوڕی شورەحیل: پاشان فرتونەی خزمەتگوزاری ذی أصبح نامەیەکی نووسیوە و باسی نزمی دیوارەکەی دەکات و بەهۆی ئەوەشەوە مریشکیان براوە و داوای تۆکمە کردنی دەکات.

جا هەر کە ئەم نامەیەت پێگەشت ئەوە خۆت بڕۆ و دیوارەکەی بۆ بەرز بکەرەوە، ئەوە بوو هەرکە نامەکە بە ئەیوب گەشت سواری وڵاخەکەی بوو هەتاوەکو گەشتە جیزە و هەواڵی فرتونەی

---

[١] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ١٦٣ – ١٦٤، التاريخ الاسلامي(١٥ / ٧٧).

پرسی و دۆزیەوە، بینی ئافرەتێکی ڕەشی هەژارە، پاش ئاگادار کردنەوەی لەنامەی ئەمیری باوەڕداران دیوارەکەی بۆ بەرز کردەوە [1].

**ط- گرنگیدانی بە ئازاد کردنی دیلەکان:** نامەیەکی نووسی بۆ دیلەکانی قوستەنتینیە و تیایدا هاتبوو: پاشان ئێوە خۆتان بە دیل دەزانن، پەنا بەخوا، بەڵکو ئێوە لە پێناو خوادا بەند کراون، بشزانن کە من هەرچی بەسەر خەڵکیدا بەش بکەم ئەوە باشترین بەش بۆ خێزانەکانی ئێوە دادەنێم، ئەوە پێنج دیناریشم بۆ ناردوون و ئەگەر ترسی ئەوەم نەبوایە کە ملهوڕی ڕۆم لێتان بسێنێت ئەوە زیاترم بۆ دەناردن فلانی کوڕی فلانیشم بۆ ناردون هەتاوەکو گەورە و بچوك و پیاو ئافرەت و بەندە و ئازادتان بە پارە ئازاد بکات و مزگێنی بێت لێتان و و السلام عليكم[2].

لەم نامەیەشدا ڕەوشتبەرزی عومەر و هەستکردنی بەهێزی بەبەرپرسیاریتی دەردەکەوێت وەك نموونەیەکی بالاً بۆ فەرمانڕەوایەکی موسڵمانی لە خوا ترس و پارێزکار، کە مافی ژێر دەستەکانی بە ئەو پەڕی لە خوا ترسان و دلێری و ئەمانەتەوە ڕەچاو دەکات و دڵنەوایی دیلی موسڵمانان دەکات لای ڕۆمەکان بەوەی کە ئەیانچوێنێ بەو کەسانەی کە لە پێناو خوادا لە سەنگەردان و ئەمانیش وەك ئەوانە پاداشتیان هەیە، لە پاڵ ئەم دڵنەواییە مەعنەویەشدا دڵنەوایی ماددیشیان دەکات بەو بڕە پارەی کە بۆی ناردن و خەم و خەفەتیان لەکۆڵ دەکاتەوە بەو مژدەیەی کە پێی دان و ڕایگەیاند کە بژێوی خێزانەکانیانی مسۆگەر کردووە و بەڵێی ئازاد کردنی خۆشیانی پێدان، ئەمەش مامەڵەیەکی بەڕێزە و شیاوی ئەو دیلانەیە کە چوون بۆ پاراستن و سەرخستنی ئیسلام [3].

**ي- دانەوەی قەرزی قەرزاران:** نامەیەکی نووسی بۆ هەندێك لە کار بەدەستانی وتیایدا هاتبوو: قەرزی قەرزاران بدەنەوە، ئەوانیش بۆیان نووسی: کەسانێك هەن خانوو و خزمەتگوزار و وڵاخیان هەیە و کەلوپەلی ماڵەوەشیان هەیە، عومەریش نووسی: پێویستە هەموو موسڵمانێك خانوویەکیهەبێت تیایدا نیشتەجێ ببێت و خزمەتگوزارێکی هەبێت شاگردی بکات لە کارەکانیدا و ئەسپێکی هەبێت کە بەسەریەوە دژ بە دوژمنان بجەنگێت و کەلوپەلێك

---

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ١٦٣ – ١٦٤، التاريخ الاسلامي(١٥ / ٧٧).

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٦٣، ١٦٤.

[3] - التاريخ الاسلامي(١٥ / ٧٧).

کەماڵەکەی بێ برازێنێتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا هەر بە قەرزار دا دەنرێت و قەرزەکەی بۆ بدەنەوە[1].

لەم بەسەر هاتەشدا ئەمیری باوەڕداران فەرمان دەکات بەدانەوە قەرزی قەرزاران ئەگەرچی خانوو کەلوپەل و خزمەتگوزار و وڵاخیشیان هەبێت، ئەمەش ڕواڵەتێکی مەزنە لە ڕواڵەتەکانی بەزەیی و دڵنەوایی و گرنگیدان بە کاروباری ژێردەستەکان و، نموونەی هەڵسوکەوتی پێشەوا دادگەرەکانە و ئاوا مامەڵە لەگەڵ سامانی ئوممەتدا دەکەن و هەژارانی پێ دەوڵەمەند دەکەن و دڵی دڵشکاوی پێ دێننەوە و دیلەکانی پێ ڕزگار دەکەن و بەدەم تەنگاو و قەرزارەوە دەچن و پێویستی کەسانی هەژار جێ بەجێ دەکەن[2].

ك- **هەواڵی دیلەنابینا کە لەلای ڕۆمەکان:** عومەری کوڕی عبدالعزیز نێردراوێکی نارد بۆ فەرمانڕەوای ڕۆم، ئەویش گەشتە لای و پاشان لای پاشا هاتە دەرەوە و بەناو شاردا دەگەڕا و بەلای شوێنێکدا تێپەڕی گوێی لێ بوو پیاوێك قورئانی دەخوێندەوە و هاری ئەویش لێ نزیك بووەوە و دوو تا سێ جار سڵاوی لێ کرد، بەڵام وەڵامی سڵاوەکەی نەدایەوە، پاشان سڵاوی لێ کردەوە، کابراش وتی: کەی لەم وڵاتەدا سڵاو هەیە، ئەویش تێی گەیاند کە ئەم نێردراوی عومەرە بۆ فرمانڕەوای ڕۆم، پاشان پێی وت: دەنگ و باسی تۆ چیە؟ وتی: لە فلانە شوێندا بە دیل گیرام و هێنامیان بۆ فەرمانڕەوای ڕۆم، ئەویش داوای لێ کردم، کە ببم بە گاور، منیش ڕازی نەبووم، پاشان وتی: ئەگەر نەبیت بە گاور چاوت کوێر دەکەم، منیش ئاینەکەم بەسەرچاوم دا هەڵبژارد، ئەویش چاوی کوێر کردم و هێنامی بۆ ئەم شوێنە و هەموو ڕۆژێك گەنم بۆ دەنێرێت و ئەیهاڕم و کولێرەشم بۆ دەنێرێت ئەیخۆم، پاشان نێردراوەکە گەڕایەوە بۆی عومەر و ئەم باسەی بۆ گێڕایەوە، ئەڵێ: باسەکەم تەواو نەکردبوو بینیم فرمێسك بە چاوی عومەردا دێتە خوارەوە، پاشان فەرمانی کرد و نامەیەکیان نوسی بۆ فەرمانڕەوای ڕۆم و تیایدا هاتبوو: پاشان، هەواڵی فلانی کوڕی فلانم پێ گەشتووە پاشان وەسفی بۆ کرد و وتی: سوێند بێت بەخوا ئەگەر خێرا بۆم نەنێریت سوپایەکت بۆ دەخەمە ڕێ کە سەرەتای لای تۆو کۆتایی لای خۆم بێت.

---

[1] - سیرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٦٣ و ١٦٤.

[2] - التاريخ الاسلامي(١٥ / ٧٧)

ئـەوە بـوو خێـرا نێرداوەكـە گەڕایـەوە بـۆ لای فـەرمانڕەوای ڕۆم، ئـەویش وتـی: چـەند خێـرا گەڕایتەوە! ئینجا نامەكەی عومەری پێدا، كاتێ خوێندیەوە وتی: ئەو پیاوە چاكە ناچار بـە ئـەم كـارە ناكەین و ئەو پیاوەی بۆ دەنێرینەوە، ئەڵێ مامەوە و چاوەڕێم ئەكرد كەی بێتە دەرەوە، پاشن ڕۆژێكی تر سەردانی فەمانڕەوای ڕۆمم كردەوە و بینیم دابەزیبوو لە تەختی پاشایەتی و خەم دایگرتبوو، وتـی: ئەزانی بۆ وام كرد؟

وتم: نەء وتی: هەواڵم پێ گەشتوە كە ئەو پیاوە چاكە مردووە، بۆیە ئەم كارەم كرد، پاشان وتـی: كەسی پیاو چاك ئەگەر لەناو خەڵكێكی خراپدا بێت زۆر نامێنێتەوە لە نێوانیاندا، منیش وتم: مۆڵـەتم ئەدەیت بڕۆم – بێ ئومێد بوو بووم لەوەی كە كابرام لەگەڵـدا بنێرێتـەوە – وتـی: ئێمـە لـە كـاتی ژیانیدا وەڵامی نادەینەوە بۆ شتێك و لـە مردنیـدا لێـی پاشـگەز ببینـەوە، پاشـان كـابرای لەگەڵـدا ناردمەوە [1].

**ل- ئەو ئافەرەتە عێراقیەی كە عومەر موچەی بۆ كچەكانی لە بەیتولمال بڕیـەوە:** ئافرەتێك لـە عێراقەوە هات بۆ خزمەت عومـەری كـوڕی عبـدالعزیز كـاتێ كەشـتە بەردەرگاكـەی وتـی: ئەمیری باوەڕداران دەرگاوانی هەیە؟ وتیان: ئەتوانی بڕۆیتە ژوورەوە، ئەویش چووە ژوورەوە و بۆلای فاتیمە كە لۆكەی بە دەستەوە بوو شی ئەكردەوە، ئافرەتەكەش سڵاوی كـرد و ئـەویش وەڵامی دایەوە، پاشان فەرمووی لێكرد كاتێ ئافرەتەكـە دانیـشت سـەری بـەرزكردەوە هـیچ شتێكی بە نرخی نەبینی، بۆیە وتی: من هاتووم ماڵەكەم بە هـۆی ئـەم ماڵـە وێرانـەوە ئـاوەدان بكەمەوە، فاتیمەش پێی وت: ئەم ماڵە بە هۆی ئاوەدانكردنـەوەی چـەند مـاڵێكی وەك ئـەوەی تۆوە وێران بووە، ئەڵێ: پاشان عومەر هاتەوە و چووە لای بیرەكەیان و سەتڵێ ئاوی دەرهێنـا و كردی بە قوڕێكدا كە لە ماڵەكەدا بوو – زوو زوو سەیری فاتیمەی دەكرد – ژنەكـەش بـە فاتیمەی وت: خۆت دا پۆشە لەم قـوڕگرەوە زۆرسـەیرت ئـەكات، ئـەویش وتـی: ئـەوەقوڕە گرەوە نیە ئەوە ئەمیری باوەڕدارانە، ئەڵێ پاشان عومـەر(رضي الله عنه) هـات و سـڵاوی كـردو هاتـە ماڵەوە و چووە نوێژگەكەیەوە – مصلّی – كەیەوە كە لە ماڵەكەیدا بوو و پرسیاری لە فاتیمە كرد دەربارەی ئافرەتەكەی پاشان سوزگیەكی برد كە هەندێ ترێـی تیـا بـوو و هەنـدێكی بـۆ هەڵبژارد و پێشكەشی كرد و پاشان پرسیاری لێ كرد و وتی: پێویستیت چی یـە؟ وتـی: مـن

---

[1] – سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٦٨.

ژنێکی خەڵکی عێراقم. پێنج کچی تەمبەڵ و پەك کەوتەم هەیە هاتووم داوای چاودێری تۆ ئەکەم ئەویش ئەیوت: تەمبەڵ و پەك کەوتوو و گریا پاشان پێنوس و کاغەزی هەڵگرت و نامەیەکی نووسی بۆ والی عێراق وتی: ناوی گەورەکەیان بڵێ: ئەویش وتی و یارمەتی بۆ بڕیەوە، ئافرەتەکەش وتی: سوپاس بۆ خوا پاشان ناوی دوەم و سێیەم و چوارەمی لێ پرسی و دەینووسی و ژنەکەش سوپاسی خوای دەکرد پاشان زۆر دڵخۆش بوو و دوعای خێری بۆ کرد عومەریش دەستی بەرز کردەوە و وتی: ئێمە یارمەتیمان بۆ چواریان بڕیوەتەوە و با ئەوانیش یارمەتی پێنجەم بدەن.

ئافرەتەکەیش بەنامەکەوە گەڕایەوە بۆ عێراق و نامەکەی دایە دەست والی عێراق، کاتێ نامەکەی بۆ برد والی عێراق زۆرگریا و وتی: ڕەحمەتی خوا لە خاوەنی ئەم نامەیە، ئافرەتەکەش وتی: بۆ مردووە؟ وتی: بەڵێ: ژنەکەش هاواری کرد و گریا، والی عێراقیش وتی: خەم مەخۆ، هەرگیز نامەی ئەو پیاوە ڕەت ناکەمەوە پاشان یارمەتی بۆ کچەکانی بڕیەوە [1].

**م- زیندووەکردنەوە سوننەتی بەخشین – یارمەتی -**: عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەڵێ: دروست نیە یارمەتی بۆ مردووەکانتان وەرگرن، ئاگادارمان بکەنەوە لێیان و ناوی هەموو منداڵێکی تازە لە دایك بوومان بۆ بنووسن با یارمەتی بۆ ببڕینەوە[2].

لە ڕیوایەتێکیشدا کە ئیبن سەعد تەخریجی کردووە لە ابی بکری کوڕی حزمەوە ئەڵێ: ئێمە دیوانی خەڵکی زیندانمان دەهێنا و ئەوانیش ئەهێنرانە دەرەوە بۆ وەرگرتنی یارمەتیەکانیان بە نامەی عومەری کوڕی عبدالعزیز، ئەوە بوو نامەیەکی بۆ نووسیم و تیایدا هاتبوو: هەر کەسێك ئامادە نەبوو، بەلام لە شوێنێکی نزیك بوو ئەوە یارمەتیەکەی بدە بە خەڵکی دیوانەکەی، هەرکەسێکیش دیار نەبوو، یارمەتیەکەی هەڵگرە هەتاوەکو دێتەوە یان هەواڵی نەمانی دەبیستی، یان بە کەسێکی بدەکە بێتە بریکاری و بەبەڵگە بیسەلمێنێت کە لە ژیانداماوە [3]، بەم شێوەیەش عومەری کوڕی عبدالعزیز سوننەتی بەخشین و عەتای ئیسلامی زیندوو کردەوە کە لە سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین و موعاویە دا هەبوو، پاشان لەناو چوو و، یارمەتی و بەخشین تایبەت کرابوو بە چەند پیاو ماقوڵ و

---

[1] – سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ١٦٩.

[2] – طبقات ابن سعد(٥ / ٣٤٦)

[3] – هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٤٨).

ڕیش سپیەکی ئوممەت بەنی ئوممەیەش لەوە پشکێکی زۆریان دەبرد بە پێی پلەوپایەیان، کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەوەی بەسەر ئوممەتدا دابەش کرد هەمووانی گرتەوە ئەمەش یەکێکە لە دیارترین چاکسازیە نوێکانی [1].

ن- **ڕزگارکردنی هەژاران لە دەستپانکردنەوە و سواڵ کردن:** کەسانێکی خەڵکی مەدینە هاتنە خزمەت عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەویش هەواڵی خەڵکی مەدینەی لێ پرسین وتی: ئەو هەژارانە چیان لێ هات کە لە ئەو شوێنەدا دا دەنیشتن؟ وتیان لەوێ نەماون ئەی ئەمیری باوەڕداران خوا دەوڵەمەندی کردن، ئەڵێ: کەسانێك لەناو ئەو هەژارانەدا هەبوون کە جۆرە گەڵایەکیان ئەفرۆشت بە ڕێبواران کە حوشتر دەیخوارد [2].

پاشان خەڵکی چوون بۆ کڕینی ئەو گەڵایەلێیان ن بەڵام ئەوان وتیان: ئەو کارە ناکەین خوای گەورە بێ پێویستی کردوین بە هۆی ئەو یارمەتیەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز دەدات [3].

ئەمەش لەبەرهەمەکانی ئەو ڕێبازە دادگەریە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز گرتیەبەر لە دابەشکردنی سامانی موسڵمانان‌دا، ئەوە بوو ڕێ ی لە زیادەڕەوی ئەو کەمینە دەوڵەمەندە گرت و ئەوەی کە یەکێك لەوانە پێشتر خەرجی دەکرد دابەشی دەکرد بەسەر دەیان موسڵماندا، بەم شێوەیەش سامانی گشتی گەشتە هەموو چین و توێژەکان و دەستیان لەو کارە قورسانە هەڵگرت کە لەبەرامبەر پارەیەکی کەمدا ئەنجامیان دەدا [4].

س- **مارەیی دان لە بەیتولمال:** عومەری کوڕی عبدالعزیز گرنگی دەدا بە پێدانی مارەیی لە بەیتولمال بۆ ئەو کەسانەی کە توانایی دانی مارەییان نەبوو، ئەبو لعەلائ ئەڵێ: نامەی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە مزگەوتی کوفە دا خوێندرایەوە و منیش گوێم لێی بوو: هەرکەس سپاردەیەکی لایە و ناتوانێ بیداتەوە ئەوە لە سامانی خوا بەشی بدەن، هەرکەسێکیش هاوسەرگیری لەگەڵ ئافرەتێکی دا کرد و نەیتوانی مارەیی بۆ دابین بکات ئەوە لە سامانی خوا بۆی بدەن.

---

[1] - التاريخ الاسلامي(١٥، ١٦ / ١٣٨).

[2] - الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(١ / ١٥١).

[3] - التاريخ الاسلامي(١٥ / ١٣٨)

[4] - طبقات ابن سعد(٥ / ٣٧٤).

ئەمەش بڕیارێکی گرنگە بۆ چاکسازی کردن لە کۆمەڵگەدا، چونکە چاکی کۆمەڵگە بەندە بە چاکی ڕۆڵەکانی و پاراستنیان بە هۆی هاوسەرگیریەوە هەتاوەکو لە ئاسوودەیی هاوسەرگیری بەهرەمەندبن لەوانەشە مارەیی کۆسپ بێت لەبەردەم هاوسەرگیری کردنی هەندێ خەڵکی هەژاردا بە تایبەت لە کاتێکدا کە مارەیی زۆر داوا دەکرێت. جا ئەگەر دەوڵەت هاوکار بوو لە دابین کردنی مارەیی دا بۆ کەسانێك کە توانایان نیە ئەوە بەشدار دەبێت لە پێکهێنانی کۆمەڵگەیەکی چاك و پاراستنی لە هۆکارەکانی خراپە و تێکچوون [1].

ع- **هەوڵەکانی بۆ لێك نزیککردنەوەی چین و توێژەکانی کۆمەڵگە:** یونسی کوڕی ابی شبیب ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیزم بینی لە جەژندا پیاو ماقولان چواردەوری مینبەرەکەیان دابوو و لە نێوان ئەوان و خەڵکیدا بۆشاییەك هەبوو، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش هات و چووەسەر مینبەر و سڵاوی لێ کردن، کاتێ بۆشاییەکەی نێوانی بینی، ئاماژەی بۆ خەڵکی کرد کە بۆشاییەکە پڕ بکەنەوە ئەوانیش پڕیان کردەوە و تێکەڵ بوون [2].

دیارە والیەکان دوای سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان ڕاهاتبوون لەسەر بەرزکردنەوەی چین و توێژێك و جیاکردنەوەیان لە خەڵك لە دانیشتن و یارمەتی دان و هتد.

ئەمەش لەناو کۆمەڵگەدا بڵاو بوویەوە و هەندێ کەس لە کۆمەڵگەدا تووشی هەست بە خۆبەکەمزانین بوو بوون و پێیان وابوو کە ئەوان شیاوی ئەوەنین لەگەڵ خەڵکانی دەوڵەمەند و پیاوماقولان دا دابنیشن کە بەرە بەرە ناوی(ئەشراف) و پیاو ماقولانیان لێنرا، بەڵکو لاوازی هێندە زۆری بۆ کۆمەڵگە هێنا کە نەیان دەوێرا لەو خەڵکە تایبەتە نزیك ببنەوە ئەگەر چی لە مزگەوتەکانیشدا بوایە کە پێویستە نوێژخوێنان تیایدا کێ بەرکێ بکەن لەسەر نزیك کەوتنەوە لە ئیمام، چونکە پاداشتی زیاتری تێدایە بۆیە کاتێ ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بەخەلیفە یەکێك لە کارە سەرەکیەکانی بریتی بوو لە نزیککردنەوەی توێژەکانی کۆمەڵگا لەیەکەوە، ئەمەش دابەزاندنی ناوبانگی چینە باڵاکان و نەهێشتنی لوتبەرزیان و بەرزکردنەوەی پلەوپایەی توێژە لاواز و چەوساوەکان و بەرزکردنەوەی ورەیان و نەهێشتنی هەستکردن بەلاوازی تیایاندا.

---

[1] - طبقات ابن سعد(٥ / ٣٨٧).

[2] -التريخ الاسلامي(١٥ / ١٤٠).

یەکەم هەڵوێستی لەوبوارەدا یەکسانکردنی یارمەتی و بەحشینی نێوانیان بوو، بێگومان پارەوسامانیش بایەخی خۆی هەیە بۆ بەرزکردنەوە و دابەزاندنی پلەوپایەی خەڵکی، لەم بەسەرهاتەشدا گرنگی دانیمان بۆ دەردەکەوێت کاتێ کە ئاماژە بۆ نزیکبوونەوەی خەڵکەکە دەکات لە توێژەتایبەتە کە – پیاو ماقوڵ و ئەشرافەکان – هەتاوەکو تێکەڵ بن و ئەو بۆشاییەی نێوانیان نەمێنێت کە لە ئاکامی ستەمی والیەکان و بەڕێوەبردنی نارەوایان دابەدی هاتبوو [1].

**ف- هەستکردنی کەسی برپرس بە بەرپرسیارێتی لە بەرامبەر تاکەکانی کۆمەڵگەدا:** فاتیمەی کچی عبدالملك خێزانی عومەر(ﷺ) ئەڵێ:... عومەر خۆی یەکلا کردبوویەوە بۆ موسڵمانان و هەمیشە سەرقاڵی کێشەکانیان بوو، ئەگەر ئێوارەشی بەسەردا بهاتایە و لە کێشەکانی خەڵك نەبوایەتەوە ئەوە شەوی دەدایەدەم ڕۆژوو تائێوارە خەریك دەبوو هەتاوەکو دەستی خاڵی دەبوو، ئەوەبوو داوای ئەو چرایەی دەکرد کە بە پارەی خۆی کڕی بووی، پاشان دوو ڕکات نوێژی دەکرد و دواتر سەری دەخستە سەر دەستی و سەری دادەخست و فرمێسك بە کوڵمی دا دەهاتە خوارەوە و هەناسەیەکی قوڵی هەڵدەکێشا کە خەریك بوو دڵی لەت دەبوو و گیانی دەردەچوو بەم حاڵەتەوە دەمایەوە هەتاوەکو بەرەبەیان و بەیانیش بە ڕۆژوو دەبوو، منیش لێی نزیك بوومەوە و وتم: ئەمشەو ئاوات نەکرد؟

وتی: بەڵێ، بەڵام تۆ خەریکی کاری خۆت بەو کارت بەسەر منەوە نەبێت، وتم: من ئەمەوێت پەندت لێوەر بگرم، وتی: باشە باست بۆ دەکەم.

من بیرم کردەوە و بینیم من کار و باری ئەم ئوممەتەم پێ سپێردراوە بە سور و ڕەشیەوە، پاشان بیرم لە هەژاری برسی و غەریبی فەوتاو و دیلی ستەملێکراو و کەسی نەدار و خاوەن منداڵ و هاوشێوەی ئەوانە کردەوە لە وڵات و ناوچە دوورەکاندا و بۆم دەرکەوت کە خوای دەربارەیان پرسیارم لێ دەکات و، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەبێتە ڕکابەرم لەسەریان، بۆیە ترسام کە خوای گەورە پاساوم لێ وەرنەگرێت و لە بەردەم پێغەمبەری خوا شدا(ﷺ) بەڵگەکانم نەخوات، بۆیە بەزەیم بە جۆرێك بە خۆمدا هاتەوە کە فرمێسکی هێنا بە چاومدا و ئازاری بە دڵم گەیاندو من هەرچەندە بیری لێ دەکەمەوە زیاتر دەترسم، تۆش پەند لەمە وەرگرەیان وازبێنە [2].

---

[1] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٧٠، التاريخ الاسلامي(١٥ / ١٠٧).

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٧٠، التاريخ الاسلامي(١٥ / ١٠٧).

ئەمەش بایەخدانێکی زۆرە بەو بەرپرسارێتیەی کە عومەر لە ئەستۆی گرتووە، ئەوەتا لە بیری خەڵکانی لاواز و خاوەن پێویستیدایە وێڕای ئەو هەوڵە زۆرەی کە خستویەتیە گەڕ بۆ ئاگادار بوون لەباروودۆخی ئوممەت.

بەلام بەو پێیەی کە ئەم کارە سنووردار نیە، دەترسێت لەوەی کە خەڵکانێك هەبن لە ناو موسڵمانانندا کە پێویستیەکانیان بۆ ئەو بەرز نەکرا بێتەوە لە کاتێکدا کە ئەو بەرپرسە لێیان، بیر کردنەوەشی لە لێپرسینەوە و بەهەشت و ئاگر بەڵگەیە لەسەر قوڵی باوەڕی بەغەیب بە جۆرێك کە بەلایەوە وەك بینراو وابوو و ئەمەش بووە پاڵنەرێك بۆی بۆ دادگەری و بەزەیی هاتنەوە و زیادەڕەوی کردن لە بەسەرکردنەوەی کاروبارەکانی ئوممەت و گریانی بەکوڵیشی بەڵگەیە لەسەر ترسی زۆری لە پەروەردگار، خوای گەورەش بەهۆی ئەم ترسەوە پاراستی و بە هزر و هەڵسوکەوتی بەرزبوویەوە بەسەر شتە هەڵخەڵەتێنەرەکاندا و دامەزراو و بەهێز بوو لەبەردەم کۆسپەکاندا، ئەگەر شتێکیش بەلایەوە گەورە بوایە ئەوە یادی دۆزەخ و لێپرسینەوەی دەکردەوە، ئەمەش هەموو کێشە و گرفتێکی بۆ ئاسان دەکرد و هەموو مەسەلەیەکی گەورەی لەبەر چاو بچوك دەکردەوە [1].

**ص- دەربارەی بەخشینی پارە بە " ئەهلی کیتاب " ئەگەر گەورە بوو و هیچ سامانێکی نەبوو:**

ئیسلام ئاینی دادگەری و لێبوردەیی و گرنگیدانە بە هەژاران، هەروەها ئیسلام گرنگی دەدات بەهەر کەسێك کە لە سەر خاکی ئیسلام بژی با موسڵمانیش نەبێت، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش ئەم بەهابالایە بەرجەستە دەکات بەجێبەجێ کردنی حوکمەکانی ئەم ئاینە و بڕیاردەدات کە هەر زیمەیەك – ئەهلی کیتاب – چوو بەساڵدا و هیچ پارە و پولێکی نەبوو ئەوە دەبێت لە بەیتومال خەرجی بکێشرێت [2].

ئیبن سەعد بۆمان ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: عومەری کوڕی بەهرامی صَراف ئەڵێ: نامەی عومەری کوڕی عبدالعزیزمان بۆ خوێنرایەوە وتیایدا هاتبوو بەناوی خوای گەورە و میهرەبان، لەبەندەی خوا عومەری ئەمیری باوەڕدارانەوە بۆ عەدی کوڕی أرطأة و ئەو موسڵمانانەی کە لەلای ئەون سڵاوی خواتان لێ بێت. من سوپاس و ستایشی ئەو پەروەردگارە ئەکەم کە جگە لە ئەو خوایەکی تر نیە، پاشان: ئاگات لە ئەهلی ذیمە بێت و نەرم و نیان بە لەگەڵیاندا و ئەگەر کەسێکیان بەساڵاچوو و

---

[1] - التاريخ الاسلامي(١٥ / ١٠٨).

[2] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٣٥٣).

پارە و پولی نەبوو ئەوە یارمەتی بۆ ببڕەوە، ئەگەر خزمێکیشی هەبوو ئەوە فرمانی پێ بکە با خەرجی بکێشێت [1].

**ق- نان خواردنی لەگەڵ ئەهلی کیتابدا:** عومەری کوڕی عبدالعزیز هەموو ڕۆژێك درهەمێکی دەخستە سەر پارەی موسڵمانان و لەگەڵیاندا نانی دەخوارد، هەروەك سەردانی ئەهلی زیمەی دەکرد و ئەوانیش پاقلەمەنیان پێشکەش دەکرد ئەویش پارەی زیاتر لە نرخی ئەو خواردنەی بۆ دادەنان و لەگەڵیاندا نانی دەخوارد، بەلاَم ئەگەر ئەو پارەیان لێ وەرنەگرتایە ئەویش نانی لەگەڵیاندا نەدەخوارد [2].

**ر- عومەر و شاعیران:** کاتێ کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بووە خەلیفەی و جێنشین و شاعیران سەردانیان کرد و چەند ڕۆژێك لەبەردەرگایدا مانەوە و ئەویش مۆڵەتی نەدان، لە کاتێکیشدا کە ئەوان لەوحاڵەدا بوون و بڕیاری ڕۆشتنیان دا ڕەجائی کوڕی حیوە بەلایاندا تێپەڕی کە یەکێك بوو لە وتاربێژەکانی شام، کاتێ جەریر بینی ئەچێتە ژوورەوە بۆ لای عومەر ئەم هۆنراوەی هۆنیەوە:

یا ایها الرجل المرخي عما مته     هذا زمانك فاستأذن لنا عمدا

واتە: ئەی ئەو کەسەی کە مێزەرەکەت بەرداوەتەوە ئەمە ڕۆژی تۆیە داوای مۆڵەتمان بۆ بکە لای عمرا.

ئەڵێ: ئەویش چوو ژوورەوە و هیچ باسی نەکردن، پاشان عەدی کوڕی اطأة بەلایانداتی پەڕی و، جەریریش پێ ی وت:

ایها الرجل المرخي مطیته     هذا زمانك اني قد مظى زماني

ابلغ خلیفتنا إن کنت لاقیة     اني لدی الباب کالمصفود في قرنِ

لاتنسَ حاجتنا لقیت مغفرة     قد طال مکثي عن اهلي و عن وطني

واتە: ئەی ئەو کەسەی کە ئەسپەکەت بەرداوە ئەمە سەردەمی تۆیە وسەردەمی من بەسەرچوو خەلیفەمان ئاگادار بکەرەوە ئەگەر بینیت کە من لە بەردەرگادا وەك کەسێکم کە بە شاخی

[1] - الطبقات الکبری(٥ / ٣٠٠).

[2] - حلیة الاولیاء(٥ / ٣١٥ – ٣١٦) فقه عمر بن عبدالعزیز(٢ / ٣٥٦).

ولاَخێکەوە بەسترابێتەوە کارەکەمان لە بیرنەکەیت خوا لێت خۆش بێت ماوەیەکی دوور و درێژە لە ماڵ و زێدم دابڕاوم.

پاشان عەدی چووە لای عومەر وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، شاعیران لەبەردەرگاکەتدان و تیرەکانیان ژەهراویە و قسەکانیان تیژە عومەریش وتی: بێدەنگ بە ئەی عەددی من چیمە بە شاعیرانەوە؟ وتی: خوا ئەمیری باوەڕداران پایەدار بکات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێشەنگە، وتی: چۆن؟ وتی: عباسی کوڕی مرداسی سەلەمی ستایشی کردوو ئەویش بازنەیەکی پێ بەخشی و بێدەنگی کرد، وتی: هیچت لە شیعرەکەی لەبەر، وتی: بەڵێ، پاشان ئەم دێڕە شیعرانەی وت:

رايتك ياخير البرية كلها　　نشرت كتاباً جاء بالحق معلماً

شرعت لنادين الهدى بعد جورنا　　عن الحق لما اصبح الحق مظلماً

ونورت بالتبيان امراً مدلساً　　و أطفات بالقرآن ناراً تضرماً

عومەریش وتی: کێ لەم شاعیرانە لەبەر دەرگادایە؟ ئەویش ناوی هەندێ لە شاعیرەکانی بۆ هەڵدا وەك عومەری کوڕی عبدالله ی کوڕی ربیعە و فەرەزەدەق و جەریر و اخطل، عومەریش هەموویانی ڕەت کردەوە جگە لە جەریر کە مۆڵەتی هاتنە ژوورەوەی پێدا، جەریریش هاتە ژوورەوە وتی:

انّ الذي النبي محمدا　　جعل الخلاقة للامام العادل

و سع الخلائق عدله و وفائه　　حتى ارعوى فأقام حيل المائل

اني لأرج منك خيرا عاجلا　　و النفس مولعة يجب العاجل

کاتێ چووە بەردەم عومەری پێی وت: جەریر لە خوا بترسە و جگە لە حەق هیچ شتێکی تر نەڵێت [1]. جەریریش ئەم شیعرەی هۆنیەوە وتی:

أأذكر الجهد و البلوى التي نزلت　　أم قد كفاني بما يُلَغْتَ من خيري

كم باليمامة من شعثاءَ أرملة　　و من يتيم ضعيف الصوت و النَّظَرِ

ممن يعدُكَ تكفي فقد و الِدِه　　كالفَرخَ في العش لم ينهض ولم يطر

يدرعوك دعوة ملهوف كأنَّ به　　خبلاً مِن الجِنّ أو مساً من البشر

خليفة الله ماذا تأمرون بنا　　لسنا اليكم ولا في حار منتظر

---

[1] - المنتظم(٧ / ٣٧).

ما زلت بعدك في هم يُؤرقني    قد طال في الحيّ إصعادي و منحدري

لا ينفع الحاضر المجهود بادينا    و لا يعود لنا بادٍ على حضر

إنا لنرجو إذا ما الغيث أخلفنا    من الخليفة ما نرجو من المطر

نال الخلافة إذا ثقضيّت حاجتها    فمن لحاجة هذا الأرمل الذكر

الخير ما دمن حياً لا يفارقنا    بوركت يا عمر الخيرات من عمر

عومەریش وتی: ئەی جەریر وانازانم لێرە هیچ مافێکت هەبێت، وتی: بەڵێ مافم هەیە، ئەی ئەمیری باوەڕداران من پیاوێکی پارە لێبڕاوم، عومەریش سەد درهەمی لە پارەی خۆی پێدا – پاشان بە جێ ی هێشت، شاعیرەکانیش پێیان وت: چی بوو؟ وتی: ئەوەی کە ئێوە پێتان ناخۆشە، ئەمیری باوەڕدارانم بە جێ هێشت پارەی دەدا بە هەژاران و دەیگرتەوە لە شاعیران و منیش لێی ڕازیم، پاشان وتی:

رِايت رقي الشيطان لا تستقزه    و قدكان شيطانى من الجن راقياً [1]

واتە: بینیم نوشتەی شەیتان کاری تێ نەدەکرد شەیتانە جنۆکەکەی منیش نوشتەکەر بوو.

ئەمەش ڕێبازێکی نوێ بوو بۆ مامەڵە کردن لەگەڵ شاعیران لەسەردەمی دەوڵەتی ئەمەویدا، ئەوە بوو شاعیرەکان ستایشی والی و ئەمیرەکانیان دەکرد و شیعریان پیادا هەڵدەدان لە بەهیوای وەرگرتنی برێك پارە و پوڵ و لەم پێناوەشدا ڕۆدەچوون لە پیا هەڵدان و درۆکردندا، هەتاوەکو عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە و شاعیرەکانیش ڕوویان لێنا، ئەویش هەڵوێستی بەرامبەریان بەوشێوە بوو کە باسمان کرد و کۆتایی بەو نەریتە خراپە هێنا کە بونیادی کۆمەڵگە دەشێوێنێت و دەبێتە هاندەرێك بۆ بالا دەست کردنی ڕەوشتی خراپ وەك درۆ و هەڵخەڵەتاندن و دوڕوویی، عومەریش ئەم نەریتەی نەهێشت و چیتر و هەتاوەکو عومەری کۆچی دوایی نەکرد ڕووی نەدا [2].

لێرەشدا جەریردانی بەوەداناکە شەیتانەکان لەپشت شاعیرەکانەوە بوون بۆ وروژاندنی ئەمیرەستایشکراوەکان و بەلأم عومەری کوڕی عبدالعزیز توانیویەتی خۆی لەو شەیتانە بپارێزێت [3].

---

[1] - المنتظم(٧ / ٩٩).

[2] - التاريخ الاسلامي(١٥ / ١٧٤).

[3] - هەمان سەرچاوە(١٥ / ١٧٤).

**ش- کاریگەر بوونی بە شیعری زوهد و دنیا نەویستی و پەیوەندی بە سابقی بەربەریەوە:**

عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەو شاعیرانەی لە خۆی نزیك کردەوە کە پابەندبوون بە شیعری زوهد و باسی مەرگ و ترس لە ڕۆژی دوایی وادیارە نزیکترین شاعیریش لە دڵی عومەرەوە سابقی بەربەری بووە [1]، ئەم شاعیرە ئامۆژگاری عومەری دەکرد بە شیعر و عومەریش کاریگەر دەبوو و دەگریا، ئەوە بوو ڕۆژێکیان هاتە خزمەت عومەر و شیعری وت: هەتاوەکو گەشتە ئەم دێڕانە:

فكم من صحيح بات للموت آمناً    أتته المنايا بغتة بعدما هَجَع

فلم يستطع إذ جاءه الموت بغتة    فراراً ولا منه بقوَّتِهِ امتنع

فأصبح تبكيه النساء مُقَنَّعاً    و لا يسمع الداعي وإن صوته رفع

و قُرّبَ من لحدٍ فصارَ مقليه    و فارق ما قد كان بالأمس قد جمع

گێڕەرەوەی ئەم بەسەرهاتە مەیمونی کوڕی مەهران ئەڵێ: عومەر بەردەوام بوو لە گریاندا هەتاوەکو لە هۆش خۆی چوو و ئێمەش هەستاین و بە جێمان هێشت [2].

هەروەها سابق ی بەربەری هۆنراوەیەکی درێژی هۆنیەوە کە ئامۆژگاری و پەندی بە پێزی تیادا بوو و کاریگەری بە هێزی لەسەر عومەری کوڕی عبدالعزیز بە جێ هێشت و ئەمەش هۆنراوەکەیە:

بسم الذي أنزلت من عنده السور    والحمدلله اما بعد يا عمر

ان كنت تعلم ما تاتي و ما تذر    فكن على حذر قد ينفع الحذر

و اصبر على القدر المجلوب و ارض به    و ان اتاك بما لا تشتهي القدر

فما صفا لامرئ عيش يسر به    الا سيتبع يوما صفوه كدر

و استخبر الناس عما انت جاهله    اذا عميت فقد يجلو العمى و الخبر

قدير عوي المرء يوما بعد هفوته    و تحكم الجاهل الايام و العبر

من يطلب الجور لا يظفر بحاجته    و طالب الحق قد يهدى لخ الظفر

و في الهدى عبر تشفى القلوب بها    كالغيث بنضر و سميه [1] الشجر

---

[1] - شاعیرێکی زاهید بووە، وتەی دانایانە و دڵنەرم کەری هەبووە، لە خزمەتکارەکانی بەنی ئومەییە یە، بەربەریش نازناویەتی و خۆی بەربەرنەبووە، لە الرقەدا نیشتەجێ بووە و سەردانی عومەری کوڕی عبدالعزیز دەکرد، الاعلام(٣ / ٦٩).

[2] - الكتاب الجامع لسيرة عمر(٢ / ٦١٢) سيرة عمر بن عبدالعزيز، عفت و صال حمزة، ل: ١٨٤.

و ليس ذو العلم بالتقوى كجاهلها   و لا البصير كأعمى ماله بصر

و الشرد نافلة تهدى لصاحبها   و الغي يكره منه الورد و الصدر [٢]

وقد يوبق [٣] المرء امر وهو يحقره   والشيء يا نفس ينمى وهود يحتصر

لا يسبع النفس شي حين تحرزه   ولا يزال لها في غيره وطر

ولا تزال، و ان كانت لها سعة   كما تعير لون اللمة الغير [٤]

و كل شيء له حال تغيرخ   لها الى الشيء لم تظفر به نظر

والذكر فيه حياة للقلوب كما   يحيي البلاد اذا ما ماتت المطر

و العلم يجلو العمى عن قلب صاحبه   كما يجلي سواد الظلمة القمر

لاينفع الذكر قلبا قاسيا ابد   وهل يلين لقول الواعظ الحجر؟

والموت جسر لمن يمشي على قدم   الى الامور التي تخشى و تنتظر

فهم يمرون افواجا و تجمعهم   دار اليها يصير البدو و الحضر

من كان في معقل للحرز [٥] اسلمه   او كان في خمر لم ينجه خَمَرُ

حتى متى انا في الدنيا اخو كلف   في الخير مني لذاتها صعر [٦]

ولا ارى اثر للذكر في جسدي   والماء في الحجر القاسي له اثر

لو كان يسهر عيني ذكر آخرتي   كما يؤرقني للعاجل الشهر

اذا لداويت قلبا قد اضر به   طول القسام و وهن العظم ينجبر

ما يلبث الشيء ان يبلى اذا اختلفت   يوما على نقضه الروحات و البكر [٧]

والمرء سصعد ريعان الشباب به   وكل مصعدة يوما ستنحدر[٨]

---

[١] - الوسمي: یەکەم بارانی وەرزی بەهار.

[٢] - الورد: الماء الذي يورد و القوم يردون الماء الصدر: الرجوع عن الماء.

[٣] - يوبق: يُهلك من وبق.

[٤] - الغِير: كما تغير الاحداث.

[٥] - الحِرز: المكان المنيع يلجا اليه.

[٦] - صَعَر: صعر خده، اماله كبرا.

[٧] - الروحات والبكر: روحة من الرواح و يقابله الصباح البكر: اول النهار.

[٨] - اي بعد كل صعود نزول: ما طار طير وارتفع الا كما طار وقع.

وكل بيت خراب بعد جدته و من وراء الشباب الموت و الكبر

بينا يرى الغصن لدنا [1] في ارومته ريان اضحى خطاما جوفه نخر

وكم من جميع اشت الدهر شملهم وكل شمل جميع سوف ينتشر

وربَّ اصيد سامي الطرف معتب بالتاج نيرانه للحرب تستعر

يظل مفترش الديباج محتجبا عليه تبني ثياب الملك و الحجر

قد غادرته المنايا وهو مستلب مجدل ترب الخدين منعفر [2]

ابعد آدم ترجون البقاء و هل تبقى فروع لأصل حين ينعقر

لهم بيوت بمستن السيول وهل يبقى على الماء بيت اسه مدر

الى الفناء – و ان طالت سلامتهم مصير كل بني انثى وان كثروا

ان المور اذا استقلتها اشتبهت [3] و في تدبرها التبيان و العبر

والمرء ما علاش في الدنيا له امل اذا انقضى سفر منها اتى سفر

لها حلاوة عيش عير دائمة وفي العواقب منها المر و الصبر

اذا انقضت زمر آجالها نزلت على منازلها من بعدها زمر [4]

و ليس يزجركم ما تو عطون به و البهم يزجرها الراعي فتنزجر [5]

اصبحتم جزرا للموت يقبضكم كما البائم في الدنيا لها جزر

لا تبطروا و اهجروا الدنيا فإن لها غبا و خيما، و كفر النعمة البطر

ثم اقتدوا بالالى كانوا لكم غررا و ليس من امة الا لها غرر [6]

حتى تكونوا على منهاج اولكم وتصبروا عن هوى الدنيا كما صبروا

مالي ارى الناس و الدنيا مولية وكل حبل عليها سوف ينبتر [7]

---

[1] - لدنا: طريا لينا.

[2] - مجدل: جدل: صرع، و في حدث على ﷺ: يعز علي ابا محمد ان اراك مجدلا تحت النجوم.

[3] - اشتبهت: اشتبه اختلط الامر عليه.

[4] - الزمر: مفردها زمرة وهي الفوج و الجماعة.

[5] - انزجر: انقاد – اي ان الحيوانات تنقاد لراعيها اذا وعاها.

[6] - الغُرر: غرة: و غرة القوم: شريفهم و سيدهم.

[7] - ينبتر: انبتر: انقطع.

لا يشعرون بما في دينهم نقصوا    جهلا و ان نقصا دنياهم شعروا [1]

عومەری کوڕی عبدالعزیزش زۆر شیعری دەوتەوە، لەو شیعرانە کە بەردەوام دەیوتەوە:

لاخير في عيش امرئ لم يكن له    من الله في دار القرار نصيب

هەروەها ڕۆژێکیان عومەری لە کاتێکدا کە لەگەڵ تەرمێکدا دەڕۆشت کەسانێکی بینی لەبەر تۆز و گەرما دەم و چاویان داپۆشیبوو و پەنایان برد بوو بۆ سێبەرێك، ئەویش گریا و ئەم شیعرانەی هۆنیەوە:

بسم الذي أنزلت من عنده السور    والحمدلله اما بعد يا عمر

ان كنت تعلم ما تاتي و ما تذر    فكن على حذر قد ينفع الحذر

و اصبر على القدر المجلوب و ارض به    و ان اتاك بما لا تشتهي القدر

فما صفا لامرئ عيش يسر به    الا سيتبع يوما صفوه كدر

و استخبر الناس عما انت جاهله    اذا عميت فقد يجلو العمى و الخبر

قدير عوي المرء يوما بعد هفوته    و تحكم الجاهل الايام و العبر

من يطلب الجور لا يظفر بحاجته    و طالب الحق قد يهدى لح الظفر

**ت- لە نێوان شاعیری دوکینی کوڕی ڕەجاءو عومەری کوڕی عبدالعزیزدا:** دوکین ئەڵێ: ستایشی عومەری کوڕی عبدالعزیزی کرد لە کاتێکدا والی مەدینە بوم، ئەویش فرمانی دا بە پێدانی پازدە حوشتری سەرکەش، منیش پێم خۆش نەبوو بیانکەمە دەشت.و حەزیشم لە فرۆشتنی نەبوو.

ئەوە بوو کۆمەڵە هاوەڵێکمان لە مُضَر ەوە هاتن، منیش داوای هاوڕێیەتیم لێکرد، ئەوانیش وتیان: ئەو کەس بەشەودا نانێرێتەوە، منیش ڕۆشتم و داوای مۆڵەتم لێ کرد، ئەویش مۆڵەتی دام و چوومە ژوورەوە و بینیم دوپیاوی بەساڵا چووی ناسراوی لایە، منیش خواحافیزیم لێ کرد، ئەویش وتی: ئەی دوکین، من دەرونێکی تامەزۆرم هەیە، جا ئەگەر من کەوتمە بارودۆخێکی باشتر لەمە ئەوە بە چاوێکی تایبەت سەیرت دەکەم، وتم: شایەتم بۆ بگرە بەسەر خۆتەوە، وتی: خوا دەگرم بە شاهید، وتم: ئەی لە ناو مرۆڤەکاندا وتی: ئەم دوو کەسە شایەتن، منیش ڕووم کردە یەکێکیان وتم: تۆ کێیت ئەتناسم؟

---

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، عفت و صال، ص: ١٨٧، الكتاب الجامع لسيرة عمر(١ / ٨١).

وتی: سالمی کوڕی عبدالله وتم: شایەتێکی باشت گرتووە بە دووەمیشیانم وت: تۆ کێی؟ وتی: ئەبو یەحیا خزمەتگوزاری ئەمیر[1]. پاشان وشترەکانم بردەوە بۆ ولاَی خۆمان و خوای گەورەش بەرەکەتی تێ خستن و حوشترێکی زۆریان لێ کەوتەوە، ئەوەبوو لە کاتێکدا کە لە دەشتی فەلەج دا بووم، کەسێك باسی کۆچی دوایی سولەیمانی کوڕی عبدالملك ی دەکرد، منیش وتم ئەی کێ شوێنی گرتۆتەوە؟

وتیان: عومەری کوڕی عبدالعزیز، منیش کەوتمە ڕێ بۆلای عومەر(ﷺ) لە ڕێگادا تووشی جەریر بووم کە لەلای ئەووە هاتبوو، وتم: لە کوێوە ئەی ئەبو حرزە؟ وتی: لەلای کەسێکەوە کە پارەدەدات بە هەژاران و قەدەغەی دەکات لە شاعیران، بەلاَم بۆ یارمەتی دانی ڕێبوار پشتی پێ بەستە، منیش ڕۆشتم بۆ لای و بینیم لە ماڵەکەیدایە و خەڵکی دەوریان داوە، بەلاَم بوارنەبوو لێ ی نزیك ببمەوە بۆیە هاوارم کرد:

یا عمر الخیرات و المکارم و عمر الّدسائع العظائم

انّي امرء من قطن بن دارم اطلب دَین من اخ مکارم

اذ ننتجي و الله غیر نائم في ظلمة اللیل و لیل عاتم

لای ابی یحیی و لای سالم – دوو شایەتەکەی پێشتر – ئەوە بوو ئەبو یەحیا هەستا و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەم دەشتەکیە شایەتیەکی بەسەرمنەوە یە لەسەر تۆ، وتی: ئەزانم، وەرە پێشەوە ئەی دوکین، من لەسەر ئەو پەیمانەم کە پێم داویت و بەو شێوەم کەوتم: دەروونم بەهەر پلەیەك گەشتبێت ئەوە ئارەزووی لەوە باشتری کردووە، ئێستاش بەرزترین شتی دونیام دەست کەوتوو و دروونم تامەزرۆی ڕۆژی دواییە، سوێند بەخوا هیچ شتێکم لە سامانی خەڵك لانەخستوە هەتاوەکو بیدەم بە تۆ و تەنها دوو هەزار دەرهەمم لایە هەزار یانت پێ دەدەم، پاشان فەرمانی کرد بەوەی کە هەزاری پێ بدەن، سوێند بەخوا هەرگیز هەزاری هێندەی بە پیت و بەرەکەتم نەبینیوە[2].

هەروەها دوکین ئەڵێت:

اذا المرء لم یدنس من اللؤم عرضه فکل رداء یرتدیه جمیل

---

[1] - الشعر و الشعراء لابن قتیبة(٢ / ٦١١).

[2] - الشعر الشعراء لابن قیتیة(٢ / ٢ / ٦).

وان هو لم يضرع عن اللؤم نفسه   فليس الى حسن الثناء سبيل [1]

واته: ئەگەر مرۆڤ خۆی بەکاری خراپ ناشیرین نەکات ئەو هەر پۆشاکێك بپۆشێت جوانە، بەڵام ئەگەر خۆی لە خراپەکاری نەپاراست ئەوە بواری بۆ باسکردنی بە باشە نەهێشتۆتەوە.

**٤- ئەماژەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لای عومەری کوڕی عبدالعزیز:**

ئەتوانین لە ڕوانگەی ژیانی کۆمەڵایەتی عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە ئاشنا بین بە ڕێبازی سەبارەت بە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی کە گرنگترین ڕوخسارەکانی بریتی بوو لە:

أ- **پێشەنگ بوون:** نموونەیەکی نایاب بوو بۆ زوهد و پارێزکاری و لێپرسینەوە لە دەروون و خزم و کەس و پیادەکردنی شەرع لە خۆی و دەورروبەریدا.

ب- **تەدەروج و قۆناغ بەندی:** ئەوە بوو سوننەتی چاکسازی کۆمەڵایەتی پەیڕەو دەکرد لەگەڵ نەهێشتنی بیدعیە و زیندوو کردنەوەی سوننەت وەك باسمان کرد.

ج- **تێگەیشتن لە دەورونە جیاوازەکان:** هەر بۆیە لەگەڵ خەڵکیدا شێوازی حیکمەت و ئامۆژگاری جوانی دەگرتەبەر، مژدەدەر و ترسێنەر بوو، شتێك لە ماڵی دونیای دەبەخشی بۆ هێور کردنەوەی دەرونەکان پاشان ڕامکردنیان بۆ حەق و پیادەکردنی دادگەری و نەهێشتنی ستەم.

د- **ڕیزبەندکردنی کارە لە پێشەکان:** بۆ نموونە نەهێشتنی ستەمی پێش کارەکانی ترخستبوو، بۆیە سیاسەتێکی ڕوون و ئاشکرای هەبوو بۆ گێڕانەوەی ستەم و لە خۆیەوە پاشان خێزان و هۆزەکەیەوە دەستی پێکرد، و والیە ستەمکارە کانی لابرد و خەڵکانی پیاوچاك و بەتوانا و دەست پاك و زانای دامەزراند بۆ پیادەکردنی دادگەری و جێبەجێ کردنی شەریعەت و... هتد.

٥- **بەرچاوڕوونی لە هەنگاوە چاکسازیخوازیەکانیدا:** چەمکی شوراو بەیعەتدان بەفەرمانڕەوا و مافی ئوممەت لە هەڵبژاردنی دا نوێ کردەوە و کاری دەکرد بۆ ناردنی کەسانی ئەمین و پاك بۆ ویلایەتەکان و بڵاوکردنەوەی دادگەری لە هەموو جێیەکی دەوڵەتدا و زیندووکردنەوەی فەرماندان بە چاکە و نەهیکردن لە خراپە و سوربوو لەسەر ڕاست و دروست بوونی بیروباوەڕی ئوممەت و بەرەنگار بوونەوەی بۆ چوونە نادروستەکان و گرنگیدانی بە زانایان و بەگەڕخستنیان بۆ خزمەتی ئیسلام لە ڕێی بانگەواز و فێر کردن و پەروەردە کردنەوە..هتد.

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٢ / ٦).

جگە لە گرنگیدانی بە بوارەکانی ئابووری و سیاسەت و کۆمەلآیەتی، چونکە خاوەنی تێڕوانینێکی ئیسلامی نوێگەر و گشتگیر بوو، وەك لەم کتێبەدا دەردەکەوێت.

و- **پابەندبوونی بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا**(ﷺ) ڕێنماییەکانی خەلیفەکانی ڕاشدینەوە لە تێڕوانینی چاکسازیخوازانەیدا، بۆیە ئەتوانین بڵێین کە ڕوونی تێڕوانینی لەو نەگۆڕە چەسپاوانە وە سەرچاوەی گرتبوو کە خۆی لە مەرجەعیەتی شەرعی تێڕوانینە ئیسلاحیە گشتگیرەکەیدا دەبینیەوە، کە ژیانی کۆمەلآیەتی یەکێك بوو لە بوارەکانی.

**دووەم: عومەری کوڕی عبدالعزیز و زانایان:**

سەردەمی سولەیمانی کوڕی عبدالملك سەرەتایەك بوو بۆ بەشداری کردنی زانایان لە ئەرکەکانی دەوڵەتدا و نزیك بوونەوەیان لەسەرچاوەی بڕیاری سیاسی و کاریگەریان لەسەری، کاتێ سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزیش هات بەشداری زانایان بەهێز کاریگەر و گشتگیر و هەمە جۆر بوو، عومەر(ﷺ) کە سەرۆکی دەوڵەت بو یەکێك بوو لە زانا دیار و گەورەکان و وەك زانایەکیش دەوڵەتی بەڕێوە دەبردنەك وەك پاشا، هەروەها بازنەی بەشداری زانایان لەسەردەمی عومەر دا فراوانتر بوو و عومەر کۆمەڵە زانایەکی لە دەوری خۆی کۆ کردبوویەوە بۆ هاوکاری کردن و ڕوناککردنەوەی ڕێگا بۆی و خەڵکانی تریشی لە خۆی دوور خستەوە، بەم پێیەش زانایان تاکە سوار چاکی مەیدان بوون و ڕۆڵیان هەبوو لە دارشتنی سیاسیەتی دەوڵەتدا بەشێوەیەکی شەرعی تەواو ئەم بەشداریەشیان هەموو دەزگاکانی دەوڵەتی گرتەوە و هەموو جۆرە پۆست و کاریکیان پێ دەسپێدرا، ڕەنگە زیادە ڕەویشمان نەکردبێت ئەگەر بڵێین: دەوڵەت لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا دەوڵەتی زانایان بووە، و نموونەیەك بوو بۆ یەکگرتنی دەسەلآتی دادوەری و جێ بەجێ کردن بە باشترین شێوە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا [1].

هەروەك بەشداری زانایان لەسەردەمی عومەردا(ﷺ) بە جۆرێك فراوان بوو کەلەسەردەمی ئەمەویدا هاوشێوەی نەبوو، ئەمەش ئەگەڕێتەوە بۆ چەند مەسەلەیەك لەوانە: سوور بوونی عومەر لەسەر نزیککردنەوەی زانایان لە خۆی و کردنیان بە وەزیر و دەست و پێوەندی خۆی، هۆی دووەمیش پەیوەندی بە دەسەلآتی عومەر و بەشداری کردن لە کارەکانیدا هەیە، چونکە ئەوانەیان کە پێیان وا بوو دەبێ زانایان زانستە کەیان بپارێزن و دەستپێشخەر نەبن لە چوون بۆلای کاربەدەستان،

---

[1] - اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١١٤.

بەڵکو دەبێ کار بەدەستان سەردانی ئەوان بکەن و زانستیان بنرخێنن، ئەوانەی کە بەم جۆرە بیریان دەکردەوە مەرجەکەیان هاتەدی، چونکە عومەر سەردانی زانایانی دەکرد و خەڵکی ئەنارد بۆلایان، ئەو زانایانەش کە خۆ دوور گرتنیان پێ باش بوو لە پێناو پاراستنی ئاینیان ئەوە ئەوەی کە لێی دەترسان بوونی نەبوو، چونکە مەجلیس و کۆڕەکانی عومەر باوەڕی مرۆڤی بەهێزتر دەکرد. بۆیە زانایان ڕوویان کردە عومەر و پێیان وا بوو کە پێویستە لەسەریان بەشدار بن لە ئەستۆگرتنی ئەو بەرپرسارێتیەی کە خراوەتە ئەستۆی عومەر و هیچ پاساوێکیان بۆ خۆ دوورکرتن نەبوو [1].

وەك ئیبن عەساکیر باسی دەکات وتویانە: ناتوانین دوور بگرین لەم پیاوە هەتاوەکو قسەی پێچەوانەی کردەوەی نەبێت [2].

ئەوەتا مەیمونی کوڕی مەهران کە ئەیوت: مەڕۆ بۆلای سوڵتان ئەگەرچی بۆ فەرمانکردن بەچاکەش بڕۆیت، هەروەها ئەشی وت: ئەمیر مەناسە و ئەو کەسەش مەناسە کە ئەیناسێت. لەگەڵ ئەمەشدا ئاساییە بەلایەوە کە هاوکاری عومەر بێت و کاری لەگەڵدا بکات [3].

بەشداری زانایانیش لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا لە چەند ڕواڵەتێکدا خۆی دەبینێتەوە کە گرنگترینیان:

١- نزیکیان لە خەلیفە وە و هاندانی بۆ بەردەوام بوون لەسەر ڕێبازی چاکسازی: زانایان ڕۆڵیان هەبوو لە یارمەتیدانی عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ بەردەوام بوون لەسەر ڕێبازی چاکسازی و پشتیوانی بوون لەو بڕیارنەدا کە لەم بارەوەدەیدا، هەندێکیشیان ڕۆڵیان هەبوو لە دەرکردنی هەندێ لەو بڕیارانە، نموونەی ئەمەش وەك ئەوەی کە لە زانای کارا عراك ی کوڕی مالیکە وە هاتوو [4].

ئەوەتا ئامۆزاکەی باسی ئەوە کات کە یەکێك بووە لە هاوەڵە هەرە نزیکەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز و یەکەمین پشتیوانی بوو بۆ سەندنەوەی ئەو فەیءِ و مافانەی کەلای کوڕانی مەڕوان بوو، بەهۆی ئەم هەڵوێستەشەوە بەنی ئومەیە دواتر ڕقیان لێ هەڵگرت و یەزیدی کوڕی عبدالملك دووری

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٩٦.

[2] - مختصر تاريخ ابن عساكر، لە اثر العلماء في الحياة السياسيتوة، ل: ١٩٧.

[3] - البداية و النهاية لە هەمان سەر چاوە، ل: ١٩٧.

[4] - عراکی کوڕی مالیکی غەفاری مەدەنی، یەکێکە لە زاناکاراکان.

خستەوە بۆ دهلك [1]. ئەم عراكی كوڕی مالیكی غەفاریەش شێخێكی گەورە و گێڕەرەوەی فەرموودە و شوێنكەوتوو(تابیعەكی) متمانە پێكراو بوو و یەكێك بوو لە باشترین شوێنكەوتوان و خواناسێكی دونیا نەویست بوو و خەڵكی ئەو دوورگەیەش كە بۆی دوور خرایەوە سوودی باشیان لێ وەرگرت [2] و زۆربەی كات بە ڕۆژوو بوو، عومەری كوڕی عبدالعزیز لە بارەیەوە ئەڵێ: كەسێك ناناسم كە نوێژی لە عراكی كوڕی مالك زیاتر بێت، ئەم زانایەیە(ﷺ) لەو شوێنەدا كۆچی دوایی كرد كە بۆی دوورخرابوویەوە لەسەردەمی یەزیدی كوڕی عبدالملك لە ساڵی ١٠٤ كۆچی [3].

هەروەها مەیمونی كوڕی مەهران یەكێك بوو لە كەسە نزیكەكان لە عومەری كوڕی عبدالعزیزەوە، ئەوەتا عومەری كوڕی مەیمونی كوڕی مەهرانی كوڕێ لەباوكیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە و ئەڵێ: بەشدار بووم لەگەڵ عومەری كوڕی عبدالعزیزدا لە بەڕێوەبردنی ئوممەتدا، تەنانەت ڕۆژێكیان پێم وت: ئەم تۆمارانە چیە كە بە قەڵەمی بە نرخ لەسەری دەنووسی كە موڵكی بەیتولماڵە، ئەویش نامەی نوسی بۆ هەموو شوێنێك بۆ وازهێنان لێی و نامەكانی بچوك كردەوە بۆ بستێك [4].

مەیمونی كوڕی مهرانیش ئەو زانایەیە كە زەهەبی دەربارەی ئەڵێت: پێشەوای باوەڕپێكراو موفتی جزیرە [5]، عومەری كوڕی عبدالعزیزیش دەربارەی ئەڵێت: ئەگەر ئەمە و هاوشێوەكانی نەمان ئەوە خەڵكی نەزانی ڕوویان تێ دەكات [6]، لە تەمەنیشدا بیست ساڵ لە عومەر گەورەتر بوو [7].

مەیمونی كوڕی مەهران لە زانایانی سەلەف و پێشین بوو، چەندین هەڵوێست وتەی هەیە لەبارەی سەرخستنی قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) لەوانە: لەگەڵ قەدەریەكاندا دامەنیشن و جنێو بە هاوەڵانی(ﷺ) مەدەن و فێری ئەستێرە ناسی مەبن [8].

---

[1] - دورگەیەكی تەسكە لە دەریای یەمەن دا بنی ئومەیە ڕكابەرەكانیان بۆ دووردەخستەوە، سیر اعلام النبلاء(٥ / ٦٤).

[2] - انتشار الاسلام في القرن الافريقي خلال القرون الثلاثة الاولى للهجرة، ل: ٣٨، ٣٩.

[3] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٦٤).

[4] - سير اعلام النبلاء(٥ / ١٣٣)

[5] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٧١).

[6] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٧٢).

[7] - سير اعلام النبلاء

[8] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٧٣).

ئەوە بوو ڕۆژێکیان نامەیەکی نووسی بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز و تیایدا هاتبوو: من پیاوێکی بەساڵاچوو لاوازم، تۆش دادوەری خەڵکت پێ سپاردووم، لە جزیرەشدا خەراج و دادوەریم لە ئەستۆدا بوو، عومەریش بۆی نووسی: من کارێکی گرانم نەخستۆتە ئەستۆت، خەراجێك کە پاکەو دڵنیایت لێی کۆی بکەرەوە و دادوەریش بکە بەو شێوەی کە بۆت ڕوون دەبێتەوە، ئەگەر شتێك بەلاتەوە ڕوون نەبوو، بەرزی بکەرەوە بۆم، چونکە ئەگەر هەرکەسێك کارێکی بەلاوە گران بێت و وازی لێ بێنێت ئەوە هیچ کاروبارێکی دنیا و دین جێبەجێ نابێت [1].

هەروەها لەوتەکانی مەیمونی کوڕی مهران: مرۆڤ نابێتە پارێزکار هەتاوەکو لە کەسێکی خاوەن شەریك بۆ شەریکەکەی زیاتر لێپرسینەوە لەگەڵ دەروونی خۆیدا نەکات و هەتاوەکو بزانێت جل و بەرگ و خواردن و خواردنەوەی لە کوێوە دێت [2]. هەروەها ئەڵێ سێ شت هەیە کە پێویستە بۆ خراپەکار و چاکەکاریش ببرێتەسەر سپاردە و پەیمان و خزمایەتی[3]. هەروەها پیاوێك وتی: بەمەیمونی کوڕی مهران: ئەی باوکی ئەیوب، خەڵکی سەلامەتن هەتاوەکو خوای گەورە تۆیان بۆ بهێڵێت، مەیمونیش وتی: خەریکی کاری خۆت بە، خەڵکی باش دەبن هەتاوەکو لە خوا بترسن [4].

هەروەها ئەڵێ: هەرکەس بە نهێنی گوناهی کرد با بەنهێنی تەوبەبکات، هەرکەسیش بە ئاشکرا گوناهی کردوە بابە ئاشکرا تەوبە بکات، چونکە خەڵکی عەیبداری ئەکەن و لێخۆش نابن، بەلام خوای گەورە خۆش دەبێ و عەیبداری ناکات [5].

لە جەعفەری کوڕی برقانەوە ئەڵێ: مەیمونی کوڕی مهران پێی وتم: ئەی جەعفەر شتانێکم ڕووبەڕوو پێ بڵێ کە پێم ناخۆش بێت، چونکە کەسێك ئامۆژگاری براکەی نەکردووە هەتاوەکو ڕوبەڕوو شتێکی پێ نەڵێت کە پێی ناخۆشە [6].

لە ابی الملیحە وە ئەڵێ: مەیمونی وتی: ئەگەر کەسێك هاتە بەردەرگای سوڵتان و ئەویش ڕێی پێنەدا بچێتە ژوورەوە، ئەوە بابچێت بۆ مزگەوت و دوو ڕکات نوێژ بکات و داوای پێویستیەکانی لە

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٧٤).

[2] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٧٤).

[3] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٧٤).

[4] - سیرة اعلام النبلاء(٥ / ٧٥).

[5] -هەمان سەرچاوە(٥ / ٧٥).

[6] - سیر اعلام النبلاء(٥ / ٧٥).

خوای گەورە بکات[١]. هەروەها لە مەیمونی کوڕی مهرانەوە ئەڵێ: سێ شت هەیە خۆتی پێ تاقی مەکەرەوە: سەردانی سوڵتان مەکە، هەر چەندە بۆ فەرماندان بە چاکەش بێت. گوێش مەگرە بۆ شتێك کە ئارەزوتە، چونکە تۆ نازانێت دڵت بە هۆیەوە تووشی چی دەبێت، نەچیتە لای ئافرەتیش ئەگەر چی بۆ فێرکردنی قورئانیش بێت[٢].

هەروەها ئەڵێ: کەس سوودی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پیاو چاکان نەبردووە بە ئارامگرتن نەبێت[٣]. ئەمە و مەیمون(ﷺ) لە ساڵی سەد و حەڤدەدا[٤] کۆچی دوایی کرد و ئەشڵێن لە ساڵی سەد و شازدە دا بووە.

٢- بە سەرکردنەوەی عومەر بە ئامۆژگاری و بیرخستنەوەی ئەرکەکانی: عومەری کوڕی عبدالعزیز یەکێکە لەو خەلیفانەی کە زۆرترین ئامۆژگاری و ڕێنموونی کراوە لەسەردەمی ئەمەویەکاندا، ئەوە بوو چەندین نامە لە نێوان خەلیفە و زانایاندا ئاڵو گۆڕ کرا، ئەگەر ناوی ئەو زانایانە و ئەو نامانەش کە ئاراستەی عومەری کوڕی عبدالعزیز یان کردووە بنووسین ئەوە زۆری دەوێ، بەڵام وەك: نموونە ناوی هەندێکیان دێنین وەك سالمی کوڕی عبدالله ی کوڕی عومەری کوڕی خەتاب و محمد کوڕی کەعبی قرظی و ابا حازم سەلەمەی کوری دینار و قاسمی کوڕی مخیمرە و حەسەنی بەسری(ﷺ)... هتد.

ئامۆژگاری زانایانیش کۆمەڵە ڕێنماییەکی لە خۆ دەگرت کە پەیوەندی بەرێبازی سیاسی عومەرەوە هەبوو، ئەمەش دووپاتی ئەکاتەوە کە عومەر ڕێبازەکەی لە هەمان سەرچاوە وە وەرگرتووە کە ئەم ڕێنماییانەی لێوە هەڵقوڵاوە[٥]، لەو شتانەش کە لە ئامۆژگاری محمدی کوڕی کعبی قرظی داهاتووە:... ئەی ئەمیری باوەڕداران، دەرگاکان بکەرەوە و دەرگا وانەکەت با ڕوخۆش و ئاسانکار بێت و پشتی ستەملێکراو بگرە و ستەمکاربگێڕەرەوە[٦].

---

[١] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٧٥).
[٢] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٧٧).
[٣] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٧٨).
[٤] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٧٨).
[٥] - اثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الاموية، ل: ١٩٩.
[٦] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٩٩.

ئامۆژگاری قاسمی کوڕی مخیمرەش هەمان مانای دووپات ئەکردەوە کاتێ وتی بەعومەر، پێمان گەشتووە کە هەرکەسێك ببێتە کار بەدەستی خەڵك و خۆی لە پێویستی و کاری خەڵکی بشارێتەوە ئەوە خوای گەورە لە ڕۆژی دواییدا وەڵامی داواکاریەکانی ناداتەوە، عومەریش وتی: ئەی تۆچی ئەڵێی؟ ئەویش ماوەیەکی زۆر بێ دەنگ بوو پاشان هاتە دەرەوە بۆ ناو خەڵك [1]. هەروەها لە یەکێك لە نامەکانی حەسەنی بەسریدا بۆ عومەر هاتووە: پاشان ئەی ئەمیری باوەڕداران بۆ هاو تەمەنی خۆت وەك برای گەورەبە بۆ لە خۆت گەورەتر وەك کوڕ و بۆ بچوکیش وەك باوك بەو هەرکەسەو بە پێی جەستەی خۆی سزای بدە و بۆ تورە بوونی خۆت یەك قامچی نەوەشێنیت هەتاوەکو نەچێتە دۆزەخ.

هەروەها عومەر سوور بوو لەسەر جێ بەجێ کردنی ئەم ڕێنماییانە و فرمانیشی بە کار بەدەستەکانی دەکرد هەتاوەکو جێبەجێ ی بکەن [2]. هەروەها لەوشتانەی کە لەنامەکەی سالمی کوڕی عبدالله ی کوڕی عومەری کوڕی خەتتابدا هاتبوو کە پڕ بوو لە ڕێنمونی:... پێش تۆ پیاوانێك هەبوون کە کاریان دەکرد و شتانێکیان زیندوو کردەوە و کەسانێك لەسەری پەروەردە بوون وایان دەزانی کە ئەم شتانە سوننەتن و دەرگا و دەرویان لەخەڵك داخست و هەرچەندە ئەوانیش دەرگایەکیان دابخستایە خوای گەورە دەرگایەکی تری بۆ خەڵکەی دەکردەوە تۆش ئەگەر توانیت – تواناش هەر بۆ خوایە – دەروی خێر لە خەڵك بکەیتەوە، بیکەرەوە، چونکە تۆ هەر دەروازیەکیان لێ بکەیتەوە ئەوە خوای گەورە دەرگای بەڵایەکت لەسەر دادەخات وکێشەی کار بە دەستێکت لە کۆڵ دەکاتەوە کە دەتەوێت جێنشینی بۆ دیاری بکەیت و کەست دەست ناکەوێت، چونکە ئەگەر تۆ لەبەر ڕەزامەندی خوا ئەو کار بەدەستە لا ببەیت ئەوە خوای گەورە خەڵکانێکت بۆ دەنێرێت کە جێی بگرنەوە.. هەروەها تیایدا هاتبوو:... هەر کەسێك لە کار بەدەستەکانت نارد بۆ عێراق ئەوە بە توندی نەهی لێ بکە لە بردنی سامانی خەڵکی و ڕشتنی خوێنیان تەنها لەسەر حەق نەبێت، ئاگاداری پارە و خوێن بە ئەی عومەر، چونکە ڕزگار بونت نیە لە ئاگر دۆزەخ ئەگەر ئاگادار بکرێتەوە لەستەمی کار بەدەستێك و نەیگۆرێت [3].

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٣ / ١، لابن الجوزي.

[2] - اثار العلماء في الحياة السياسية في الدولة الاموية، ل: ١٩٩.

[3] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ١٠٣.

ئەم ڕێنماییانەش کرۆکی سیاسەتی عومەرە لە هەوڵدانیدا بۆ دەوڵەمەند کردنی ژێردەستەکانی و هەڵبژاردنی کار بەدەستەکان و لێپرسینەویان [١].

٣- بەشداری زانایان و هاوکاریان بۆ عومەر کوڕی عبدالعزیز لە مۆچیاری کردنیدا کورت نەبوو بویەوە، بەڵکو لەوە تێپەڕی کرد بوو بۆ گرتنە دەستی چەندین پۆست لە هەرێمە جیاوازەکاندا گرنگترینی ئەو پۆستانە و کاریگەر ترینیان لەسەر سیاسەتی دەوڵەت: ئەمیری هەرێمەکان و سەرپەرشتی بەیتولمال بوو [٢]، کاتێ سەرنجی والیەکانی لە هەرێمەکاندا دەدەین ئەبینین کە زۆربەیان لە زانایان بوون لە نموونەی پێشەوای باوەڕپێکراو و ئەمیری دادگەر عبدالحمیدی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی کوڕی خەتتاب والی کوفە [٣] و زانای پایەبەرز ئەبوبەکری کوڕی عومەر ی کوڕی حەزم والی مەدینە [٤] و پێشەوای مەزن ئیسماعیلی کوڕی ابی لە هاج والی ئیفرەیقیە و زانا و گێڕەرەوەی فەرموودە عەدی کوڕی عەدی کیندی والی جزیرە و ئەرمینا و ئەزربایجان [٥] و پێشەوای دادوەر عبادەی کوڕی نسي والی ئودوون [٦] و دادوەری پیاو چاك سالمی کوڕی وابصە ی عبدی والی ڕقە و پیاو چاکی متمانە پێکراو عروەی کوڕی عطیەی سەعدی والی یەمەن [٧]، هەرچی بە یتولمالیشە ئەوە کۆمەڵێك زانا کاریان تیادا کردووە لەوانە: زانای پایەبەرز مەیمونی کوڕی مهران بەرپرسی خەراجی جەزیرە [٨] و زانا وەهەبی کوڕی منبە بەرپرسی بەیتولمالی عومەری کوڕی عبدالعزیز [٩] لە یەمەن دا و، هەروەها عومەری کوڕی مەیمون بەرپرسی پۆستەی عومەری کوڕی عبدالعزیز [١٠].

---

[١] - اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٩٩.

[٢] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٠٠.

[٣] - سير اعلام النبلاء(٥ / ١٤٩).

[٤] - المعرفة و التاريخ(١ / ٦٤٥).

[٥] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٢١٣).

[٦] - مختصر تاريخ دمشق(١٦ / ٣٢).

[٧] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٣٢٣).

[٨] - تهذيب التهذيب(٦ / ١٨٦).

[٩] - تاريخ دمشق لە اثر العلماء ف يالحياة السياسية وە، ل: ٢٠١.

[١٠] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٧٨.

گومانیش لەوەدا نیە کە ئەم بەشداریە فراوانەی زانایـان و وەرگرتنـی پۆسـتی ئـەمیر و بەرپرسـی بەیتولمال لە سەرجەم هەرێمەکاندا کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر کۆنترۆلکردنی کاروبارە ئیداری و مادیەکانی دەولەت و ئەو ئاسەوارە باشانەی کە لە ژیانی سیاسی دا لـە سـەردەمی عومـەری کـوڕی عبدالعزیز لێی کەوتەوە [1].

## سێ یەم: خوێندنگە زانستیەکان لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز و دەولەتی ئەمەویدا:

لە کتێبەکەمدا دەربارەی ژیانی عومەری کوڕی خەتتاب باسی خوێندنگـە زانسـتیەکان و کردنـی پایتەختی دەولەت بـە خوێندنگەیـەك کـە زانایـان و بـانگخوازان و والی و دادوەرەکـان تیایـدا پـێ دەگەشتن ئەوە بوو خوێندنگە زانستیەکان لە مەککە و مەدینە و بەسـرە و کوفـە و شـام و میسـر و شوێنەکانی تردا چالاك بوون و هاوەلانی بەرێز سەرپەرشتی پەروەردە و فێر کردنـی خـەلکیان تیـادا دەکرد و توانیان کادیری زانـستی و فیقهـی و پـەروەردەیی پێـشکەوتووی تیـادا پـێ بگەیـەنن کـە هاوکاری دەزگای سەربازیان کـرد لـە ئـازاد کردنـی عێـراق و ئێـران و شـام و میـسر و ولاتـانی مەغریبدا.

زانایانی هاوەلان کە خۆیان یەکلا کردبوویەوە بۆ بانگەواز کردنی خەلکی و پـەروەردە کردیـان توانیان نەوەیەك لە عاریفان بە ئاینی ئیسلام لەناوچەتازە ئازاد کراوەکاندا پێ بگەیـەنن و توانیـان زالّ بن بەسەر کێشەی زمان دا تەنانەت زۆرینەی خەلکانی عەجەم – غـەیرە عـەرەب – فێـری عـەرەبی بوون و زۆرینەی ڕێبەرانی بزافی زانستی دوای سەردەمی هاوەلان لە خەلکانی غەیرە عەرەب بوون، بێگومان خوێندنگە زانستی و فیقهیەکان کاریگـەریان هـەبوو لەناوچـە ئـازاد کراوەکانـدا و تـوانی نەوەیەك لـە شوێنکەوتوان – تابعین – پێ بگەیەنێت کە زانستی هاوەلانیان گواسـتەوە بـۆ ئومـەت و بوون بە بەشێك لە زنجیرەی ئەو سەنەدەی کە قورئان وسونەتی گەیاند بە ئومەت، فـەزلّیش – پـاش خوای گەورە – لە گواستنەوەیئەو زانستەی کە هاوەلان لە پێغەمبەرەوە وەریانگرتوە ئەگەڕێتەوە بۆ دامەزرێنەرانی خوێندنگە زانستیەکان لە مەککە و مەدینە و کوفە و بەسرە و شـ[illegible]کانی تردا [2].

---

[1] - اثر العلماء في الحياة السياسية، ل:٢٠٢.

[2] - الدور السياسي للصفوة ل: ٤٦٢، ٤٦٣.

هەروەها خوێندنەگانی(تابعین) بەردەوام بوون لەسەر چالاکی لەسەردەمی ئەمەویدا و زۆرێك لەو زانایانەی کە لەو خوێندنگانە دەرچوون هاوکاری عومەری کوڕی عبدالعزیزیان کرد لە پرۆژەی چاکسازی و نوێگەری ڕاشدی پابەندبە ڕێبازی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گرنگترینی ئەو خوێندنگانەش:

١- خوێندنگەی شام: لەسەردەمی ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی خەتاب دا دامەزرا، بەناوبانگترین دامەزرێنەرانیشی لە هاوەڵان، موعازی کوڕی جەبەل و ئەبو دەرداءو عبادەی کوڕی صامت بوون(ﷺ) پاشان شوێنکەوتوان بەیداخی زانستی و پەروەردەیی و بانگخوازایان پاش هاوەڵان لە ئەستۆ گرت کە بەناوبانگترینیان ئەمانە بوون:

أ- پێشەوای زانا ئەبو ئیدریسی خەولانی: عائزیی کوڕی عبداللە، دادوەر و زانای گەورەی دیمەشق لە ئەبو هورەیرە و ئیبن عەباس و خەڵکانێکی زۆرەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە ئەبو ئیدریس زانای شام بوو لە پاش ئەبو دەرداء ئەڵێ: ئەبو دەرداءم بینیوە و لێیەوەشت فێربووم، هەروەها عبادەی کوڕی صامت و شەدادی کوڕی ئەوسم بینیوە لێیانەوەشت فێر بووم [1].

ئەبو ئیدریس باوەڕپێکراوی ئەهلی فیقە و زانای حەڵاڵ و حەرام بووە و یەکێکە لەباشترین قورئان خوێنەکان لەو سەردەمەدا، لە یەزیدی کوڕی ئەبی عوبەیدەوە کە ئەو ئەبو ئیدریسی بینیوە لەسەردەمی عبدالملکی کوڕی مەروان دا و ئەڵقەکانی قورئان لە مزگەوتەکانی دیمەشق دا قورئانیان خوێندوە ئەبو ئیدریسیش دانیشتوە و پاڵی داوە بە ستونێکەوە، هەر ئەڵقەیەك بگەشتنایە تە ئایەتی سوجدە ئەیاننارد بە شوێنیدا، ئەویش بۆی دەخوێندنەوە و سوجدەی پێ دەبردن...

هەرکە لە خوێندنەوەی قورئانیش ئەبوونەوە ئەبو ئیدریس باسی بۆ دەگێڕانەوە [2]، هەروەها لە یەزیدی کوڕی مالیکەوە ئەڵێ: ئێمە لای ئەبو ئیدریسی خۆلانی دادەنیشتین ئەیوش باسی چەند غەزایەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ دەکردین و بەباشی هەموو ئەو کەسانەی باس دەکرد کە تیایدا بەشدار بوو بوون.

جارێکیان پیاوێك وتی: تۆ لەو غەزایەدا ئامادە بوویت؟وتی: نەخێر.. کابراش وتی: من تیایدا بەشدار بووم، بەڵام تۆ باشتر لەمن ڕووداوەکانی دەزانیت [3].

---

[1] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٢٧٥).

[2] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٧٤).

[3] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٢٧٥).

لەسەردەمی عبدالملكی كوڕی مەروانیشدا عبدالملك هەستا بە لەسەر كار لابردنی بلالی كوڕی ئەبی دەردائـە پۆستی دادوەری و لە جێی ئەودا ئەبو ئیدریسی خەولانی دانا [1]، بەم شێوە ئەبو ئیدریسی لە چیرۆك گێڕانەوە خست و دادوەری پێ سپارد، ئەبو ئیدریسش وتی: لەوكارەی كە حەزم لێی بوو لاتان بردم و ئەو كارەتان پێسپاردم كە پێم خۆش نیە [2]، لە ساڵی ٨٠ ی كۆچیدا كۆچی دوایی كرد.

ب- زانا قبیصەی كوڕی زؤیبی دیمەشقی: لە عومەری كوڕی خەتتاب و ئەبو دەرداء و عبدالرحمن ی كوڕی عەوف و خەڵكانێی زۆرەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە و یەكێك بووە لە زانا باوەڕپێكراو و پایە بەرزەكانی شوێنكەوتوان – تابعین – فەرموودەی زۆریشی گێڕاوەتەوە، شەعبی ئەڵێ: زانا ترین كەس بووە بەدادوەری زەیدی كوڕی ثابت [3]، مەكحول دەربارەی ئەڵێ: كەسم نەبینیوە لە قبیصە زاناتر بێت [4]، لە ئیبن شەهابیشەوە، ئەڵێ: قبیصەی كوڕی زؤیب لە زانایانی ئەم ئوممەتە بوو [5]، لە ساڵی ٨٦ كۆچی دا وتراویشە ٨٧ و ئەشڵێن ٨٨ كۆچی دا كۆچی دوایی كردووە [6]. لە كاتی باسكردنی عبدالملك دا زیاتر لە ژیانی دواوم.

ج- ڕەجائی كوڕی حیوەی فەلەستینی: یەكێكە لە بڕێزترینی شوێنەكەوتوان – تابعین – و شێخی خەڵكی شام بووە، لە موعازی كوڕی جەبەل و ئەبو دەرداءو عبادەی كوڕی صامت و كۆمەڵێك لە زانایانی ئوممەتەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە [7]. پیاو چاكێكی شامی باوەڕ پێكراو و زانا بوو [8]، لە ڕەجائی كوڕی حیوە وە ئەگێڕنەوە كە وتویەتی: هەركەسێك تەنها هاوڕێیەتی كەسانێك بكات كە بێ كەم و كوڕتین ئەوە هاوڕێی كەم دەبێت، هەر كەسێكیش لە دڵسۆزی

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٧٥).

[2] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٧٥).

[3] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٧٦).

[4] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٢٨٣).

[5] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٨٣).

[6] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٨٣).

[7] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٨٣).

[8] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٥٥٩).

هاوەڵانی دڵنیانەبێت هەمیشە پەست و بێزار دەبێت هەرکەسێکیش زۆر گلەیی بکات و خۆش گلەیی بێت دوژمنی زۆر دەبێت[1].

ئەم زانایە پلە و پایەیەکی بەرزی هەبوو لای سولەیمانی کوڕی عبدالملك و عومەری کوڕی عبدالعزیز و خوای گەورەش خێر و بێری لەسەر دەستی دەهێنا، بەلام پاش ئەوە هێنرایە دواوە ئەویش سەرقاڵی کاروبارەکانی خۆی بوو [2]، لە ساڵی ۱۱۲ کۆچی، کۆچی دوایی کرد.

د- مەکحولی شامی دیمەشقی: زانای ئەهلی شام، لە ڕیزی ناوەندی تابیعین دا هەژمار کراوە لە ڕیزی هاوەڵانی زوهری دا، لە واثلە ی کوڕی ئەسقەعەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە کە دوایەمین هاوەڵ بوو کە لە دیمەشق دا کۆچی دوایی بکات [3].

لە ساڵی ۸۵ کۆچی دا، کۆچی دوایی کرد لە تەمەنی نەوەدو هەشت ساڵی دا [4]، زوهری دەربارەی ئەڵێ: زانایان چوارن، سەعیدی کوڕی موسەییەب لە مەدینە و شەعبی لە کوفە و حەسەن لەبەسرە و مەکحول لە شام [5]. هەروەها مەحکول زاناترین کەسی خەڵکی شام بوو، لە ساڵی ۱۱۲ کۆچی و ئەشڵێن ۱۱۳ کۆچی دا کۆچی دوایی کردووە [6].

ه- عومەری کوڕی عبدالعزیز: یەکێکە لە زانایانی خوێندنگەی شام و مەدینە، ئەمەش دوای هاتنی بۆ شام و لە ئەستۆگرتنی خەلافەت، لە بواری فیقهدا بەناوبانگ بوو شارەزاش بوو لە سوننەت، دا دوەرەکانیش لەو مەسەلانەدا بۆی دەگەڕانەوە کە ناکۆك دەبون تیایدا [7].

و- بیلالی کوڕی سەعید سکونی: پێشەوای خواویست و ئامۆژگاریکەر ئەبو عەمری دیمەشقی شێخی خەڵکی دیمەشق، باوکی هاوەڵ بووە، ئامۆژگاریەکانی کاریگەر و چیرۆکەکانی جوان و

---

[1] - الفتوى: نشأتها و تطورها د. حسين الفلاح، ل: ۸۵.

[2] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٥٥٨).

[3] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٥٦٠).

[4] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٥٦١).

[5] - هەمان سەرچاوە(٣ / ٣٨٦).

[6] - هەمان سەرچاوە(٣ / ٣٨٦).

[7] - الدعوة الى الله في العصر العباسي الاول(١ / ٥٤).

بەسوود بوو بۆ هەمووان بۆ خەڵکی شامیش وەك حەسەنی بەسری لە عێراق دا وابوو، هەروەها قورئان خوێن و دەنگ بەرزی خەڵکی شام بوو [1].

ئەوزاعی ئەڵێ: هیچ وتاربێژێکم نەبینیوە هێندەی بلال کوڕی سەعد زمانپاراو بێت [2]. لە وتارە بە هێزەکانیشی: ئەی پارێزکاران ئێوە بۆ لەناو چوون دروست نەکراون، بەڵکو لە ژیانێکەوە دەگوێزرێنەوە بۆ ژیانێکی تر، هەروەك چۆن لە پشتی پیاوە وە گوێزرانەوە بۆ ڕەحمی ئافرەت و لە ڕەحمیشەوە بۆ دونیا لە دونیاشەوە بۆ گۆڕ و لە گۆڕیشەوە بۆ مەحشەر و لەمەحشەرەوە بۆ مانەوەی هەتا هەتایی لە بەهەشت یان دۆزەخ دا [3].

هەروەها لەوتەکانی: سەیری بچوکی گوناه مەکە، بەڵکو سەیری ئەو زاتە بکە کە سەر پێچیت کردووە [4]، ئەوزاعی ئەڵێ گوێم لێ بوو ئەیوت سوێند بەخوا ئەوەندە تاوانمان بەسە کە خوای گەورە داوای دنیا نەویستیمان لێ دەکات و ئێمەش هەرتامەزرۆینی [5]. لە ساڵی سەد و دەو ئەوەندە دا کۆچی دوایی کردووە.

٢- **خوێندنگەی مەدینە :** کاتێ کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆچی دوایی کرد مەدینە پایتەختی دەوڵەتی ئیسلامی و ناوەندی خەلافەت بوو، و تیایدا ئەقڵی هاوەڵان کرایەوە بۆ هەڵهێنانی حوکمی شەرعی بۆ ئەو شتە نوێیانەی کە هاتبووە نێو کرمەڵگە ئیسلامیەکانەوە دوای زۆر بوونی فتوحات، لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتابیش دا ژمارەی زانایانی هاوەڵان ئەوانەی کە توانای فتوادنیان هەبوو گەشتە ١٣٠ هاوەڵ ئەوانەشیان کە زۆرتر فتوایان دەدا حەوت کەس بوون کە ئەوانیش: عومەر و عەلی و عبداللە ی کوڕی مەسعود و عائیشە و زەیدی کوڕی ثابت و عبداللە ی کوڕی عەباس و عبداللە کوڕی عومەر بوون [6].

---

[1] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٩٠، ٩١).

[2] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٩١).

[3] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٩١)

[4] - هەمان سەرچاوە( ٥ / ٩١)

[5] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٩١).

[6] - المدينة النبوية فجر الاسلام و العصر الراشدي(٢ / ٤٥).

زانایـانی شـوێنەکەوتوانیش – تـابعین – فیقـه و زانـست و پـەروەردە و بانگـەوازیان لەوانـەوە وەرگرت، سەبارەت بە دیارترین زانایانی شوێکەوتوانیش ئەوە سـەعیدی کـوڕی مـسیّب و عـروەی کوڕی زبیر و عمرەی کچی عبدالرحمن ی کوڕی سەعدی ئەنصاری و قاسمی کوڕی محمـدی کـوڕی ئەبوبەکری سدیق و سولەیمانی کوڕی یەسار و نافیعی خزمەتگوزاری ئیبن عومەر بـوون [1]. پێشتریش باسی ڕۆڵی زانایانی تابعین یشم لە مەدینەدا لە عومەری عبدالعزیزدا کرد.

٣- **خوێندنگەی مەککە:** ئەم خوێندنگەیە پێگەی خۆی هەبوو لە دڵی باوەڕداران دا چ دانیـشتوی مەککە بن یاخود ئەوانەی کە سەردانی مەککە دەکەن وەك حـاجی و عـەمرەکار و زیارەتکـار تەنانەت مەککە دڵی هەموو باوەڕدارێکی بەلای خۆیـدا ڕادەکێـشا، زانـستیش لـە سـەردەمی هاوەڵاندا لە مەککە دا کەم بوو، بەڵام دواتر و لـە کۆتایی سەردەمیاندا زیادی کرد، هـەروەها لەسەردەمی – تابعین – شوێنەکەوتوان و هاوەڵەکانیاندا وەك ابی نجیح و ئیبن جریج [2]، بـەڵام مەککە لە سەردەمی شوێنکەوتوان دا ڕاڤەکاری قورئان و زانای گەورەی ئوممەت ئیبن عەباسی لە خۆگرتبوو کە هەموو هەوڵ و توانایەکی خستبوویە گەڕ بۆ تەفسیر و ڕاڤـەکردنی قورئـان و هاوەڵانیشی لەسەر ئەوە پەروەردە کرد و چەندین پێـشەوای تیـادا هەڵکـەوت کـە پێـشەنگ بوون لە نێوان قوتابیانی خوێندنگەکانی تەفسیردا، زانایانیش کۆمەڵە هۆکارێکیان باس کرد کە بووەتە هۆی پیشەنگ بوونی خوێندنگەی مەککە لـە زانـستدا، گرنگترینـی ئـەم هۆکارانـە و هۆکاری سەرەکیش تیایدا پێشەوایەتی ئیبن عەباس و مامۆستا بوونی ئەو بوو تیایدا [3].

هەروەها لە دیارترینی زانایانی شوێنکەوتوان – تابعین – کە لە خوێندنگـەی مـەککی دا کاریـان دەکرد:

١- موجاهیدی کـوڕی جـبری مـەککی: فیقهـو تەفـسیری لـە ئـیبن عـەباس و هـاوەڵانی تـرەوە وەرگرتووە، زاناو شارەزای شەرع و باوەڕ پێکراو بوو و سەرچاوەیەکی گەورەی زانست بوو

---

[1] - الفتوى، د. حبيب الملاح، ل: ٨١، ٨٢.

[2] - المدينة النبوية فجر الاسلام و العصر الراشدي(٢ / ٤٨).

[3] - تفسير التابعين(١ / ٣٧١) د. محمد الخضري.

[1]، هەروەها لە موجاهیدەوە ئەڵێ: سێ جار قورئانم بۆ ئیبن عەباس خوێندەوە، لەسەر هەموو ئایەتێك دەوەستام و پرسیارم لێ دەكردكە دەربارەی چی دا بە زبووە و چۆن بووە [2]؟

قەتادە ئەڵێ: زاناترین كەسێك كە دەربارەی تەفسیر مابێتە وە موجاهیدە [3]، هەروەها موجاهید ئەڵێ: هاورێیەتی ئیبن عومەرم كرد و ئەمویست خزمەتی بكەم، بەڵام ئەو خزمەتی منی دەكرد[4].
هەروەها موجاهید هات بۆ لای سولەیمانی كوڕی عبدالملك و دواتریش لای عومەری كوڕی عبدالعزیز مایەوە و ئامادەی كۆچی دوایێ عومەریش بوو، هەروەها لە مەوجاهیدەوە هاتووە كە وتویەتی: عومەری كوڕی عبدالعزیز لەسەرەمەرگیدا پێی وتم: ئەی موجاهید خەڵكی دەربارەی من چی دەڵێن؟ وتم: ئەڵێن جادوی لێ كراوە، وتی: من جادوم لێ نەكراوە، پاشان خزمەتكارەكەی بانگكرد و پێی وت: چی وای لێ كردیت كە ژەهر خواردم بكەیت؟ وتی: هەزار دینار كە پێم دراوە لەگەڵ بەڵێنی ئازاد كردنم دا، وتی: بڕۆ هەزار دینارەكە بێنە ئەویش هێنای و عومەریش خستیە بەیتولماڵەوە و پاشان پێی وت: بڕۆ بۆ شوێنێك كە كەس ی ناسراو نەتبینێت [5].

هەروەها موجاهد ئەڵێ: نازانم كام نیعمەتیان گەورەترە، نیعمەتی هیدایەت دانم بۆ ئیسلام یاخود پاراستنم لە هەواو ئارەزوو [6].

زەهەبی دەربارەی ئەم وتەیەی موجاهید ئەڵێ: مەبەستی وەك بوون بە شیعە و قەدەریە و جوهەمیە بە [7]، لە عبدالوهابی كوڕی موجاهیدیشەوە ئەڵێ: لای باوكم بووم و یەعقوبی كوڕی هات وتی: بابە كۆمەڵە هاوڵێكمان هەیە ئەڵێن باوەڕی خەڵكی ئاسمان و زەوی یەكە، ئەویش وتی: كوڕم ئەوانە هاوەڵی من نین، خوای گەورە كەسێك كە لە گوناهدا گەوزاوە وەك كەسێك كە بێ تاوانە سەیر

---

[1] - الفتوی د. حسین الملاح، ل: ٨٠.

[2] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٤٥١).

[3] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٥١).

[4] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٥١).

[5] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٥٣).

[6] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٥٥).

[7] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٥٥).

ناکات [1]. هەروەها موجاهید لە ساڵی سەد و دودا لە کاتی سوجدەدا کۆچی دوایی کرد [2] لە تەمەنی هەشتاو سێ ساڵیدا [3].

٢- عەکرەمەی خزمەتگوزاری ئیبن عەباس: شوێنکەوتوویەکی - تابعی - مەککی باوەڕ پێکراو بوو لە ئیبن عەباس و عائیشەو ئەبو هورەیرە و ئیبن عومەر و ئیبن عەمر و عقبەی کوڕی عامر عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، ئەڵێ: چل ساڵ بەدوای زانستدا دەگەڕام، من لەبەردەرگادا فتوام دەداو ئیبن عەباس لە ماڵەوە دا بوو، هەروەها لە عکرمەوە هاتووە کە ئیبن عەباس لە ماڵەوە دا بوو، هەروەها لە عکرمەوە هاتووە کە ئیبن عەباس پێی وتوە: بڕۆ فتوا بۆ خەڵکی بدە و منیش پشتگیریت لێ دەکەم، وتم: ئەگەر دوو هێندەی ئەو خەڵکەش بێن فتوایان بۆ بدە، بەڵام ئەگەر دەربارەی شتێك پرسیاری لێ کردیت کە پەیوەندی پێوە نەبوو ئەوە فتوای بۆ مەدە، ئیبن عەباسیش وتی: بڕۆ فتوایان بۆ بدە، جا هەر کەسێك پرسیاری لێ کردیت دەربارەی شتێك کە پەیوەندی پێوە هەبوو ئەوە فتوای بۆ دەیت، بەم شێوەیە دوولەسەر سێ ی خەڵکی لە کۆڵ خۆت دەکەیتەوە [4].

عکرمەش سەفەر و گەشتی زۆری دەکرد و لای عبدالرحمن ئەلحسساسی غافقی نیشتەجێ بوو و بەرەو ئەفریقە ڕۆشت [5]، هەروەها عکرمە تۆمەتبار کرا بەوەی کە لە صفریە بە کە کۆمەڵێکن لە خەواریجەکان، بەڵام ئەم تۆمەتە ساغ نەبووەتەوە، بەڵکو ئەمە تەنها ئەڵێن و وتیانە [6].

زانایانی زانستی جەرح و تەعدیلیش بەرگریان کردوە لە عکرمە وەك حاتەمی ڕازی و ئیبن حُبّان و عەجلی و ئیبن مەندە و ئیبن عبدالبر، ئیبن حەجەر ئەمەی لە پێشەکی الفتح دا ئەمەی باس کردووە

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٤٥٥).

[2] - طبقات ابن سعد(٥ / ٤٦٧). سیر اعلام النبلاء(٤ / ٤٥٥).

[3] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٤٥٦).

[4] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٣).

[5] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٥).

[6] - سیر اعلام النبلاء(٥ / ١٥).

و وتویەتی: هیچ بیدعەیەك ی لەسەر ساغ نەبوەتەوە [1]. بۆ خاریش ئەڵێ: هیچ کەسێك لە هاوەڵانمان نیە کە قسەی عەکرەمەی بە بەڵگەنەزانیبێت [2]، لە ساڵی ١٠٥ کۆچی دا، کۆچی دوایی کردوە [3].

٣- عطـائي کوڕێ ئەبی ڕەباح: موفتی مەککە و یەکێك لە پێشەوایانی زانا، لە ئیبن عەبباس و ئەبو هـورەیرە و ام سـلیمە و عائـشە و ڕافیـع کـوڕی خـدیج و زەیـدی کـوڕی ئەرقـەم و ئـیبن زوبەیدوئیبن عومەر و ئیبن عەمر و جابر و موعاویە ئەبی سـەعید و کۆمـەڵێك لـە هاوەڵانـەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە [4]، هەروەها عطاء باوەڕ پێکراوو نابوو فەرموودەی زۆری دەگێڕایەوە، فتواش لە مەککەدا. بەو سپێردرا بوو ئیبن عەباس لەبارەیەوە دەڵێ: ئەی خـەڵکی مەککـە بـۆ دێن لای من کۆدەبنەوە لە کاتێکدا کـە ئێـوە عطـاء تـان تێدایـە، لەبـەر فراوانـی زانـست و گەورەیی پلەوپایەی لەسەردەمی ئەمەویەکاندا لە وەرزی حەجدا بانگـەوازیان دەکـرد: کـەس فەتوانەدات بۆ خەڵکی جگە لەوەی عطاء کوڕی ابی رباح، ئەمەو لە ساڵی ١١٥ ك، کۆچـی دوایی کرد [5]. ئەمانە هەنـدێك بـوون لـە زانایـانی شـوێنکەوتوان – تـابعین – لـە قوتابخانـەی مەککیدا کە هەستان بە ئەرکی بانگەواز و فێرکردن و بنیاتنانی بینای زانستی [6].

٤- **خوێندنگەی بەسرە:** کە ڕکابەری کوفە بوو لە هـەموو هونەرەکانـدا، زۆرێـك لـە هـاوەڵان تیایدا نیشتەجێ بوون، لەوانە ئەبو موسای ئەشعەری و عمرانی کوڕی حصین و ئەنەسی کوڕی مالك و خەڵکانێکی تر ئەنەسی کوڕی مالکیش دائەنرێت بـە گـەورەی زانایـانی تـابعین وەك حەسەنی بەسری و سولەیمانی و ثابـت ی بـەنانی و ڕەبیعـەی کـوڕی عبـدالرحمن و ئبراهیمـی کوڕی ابی میسرە ومحمدی کوڕی سیرین و قەتادە و... هتد [7]. هەروەها لە زانایانی قوتابخانـەی بەسری:

---

[1] - براءة السلف ممانسب اليهم من الاخلاق العتقاد، ل: ٣٩.

[2] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٣١).

[3] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٤).

[4] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٧٩).

[5] - الفتوى د. حسين الملاح، ل: ٨١، سير اعلام النبلاء(٥ / ٧٨).

[6] - الدعوة الى الله في العصر العباصي الاول(١ / ٤١).

[7] - تفسير التابعين(١ / ٤٢٣٩) عمر بن خطاب للصلا بي، ل: ٢٦٠.

أ- محمدی کوڕی سیرینی بەسری: خزمەتگوزاری ئەنەسی کوڕێ مالك، لە ئیبن عەباس و ئیبن عومەر و ئەبو هورەیرە و خەڵکانی ترەوە فەرموودەی بیستووە [1]، هەروەها لە حەبیبی کوڕی شەهیدەوە ئەڵێ: لای عەمری کوڕی دینار بووم وتی: سوێند بەخوا کەسم نەبینیوە وەك طاووس، ئەیوبی سختیانیش کە لەو کاتەدا دانیشتبوو وتی: سوێند بەخوا ئەگەر محمدی کوڕی سیرینی ببینیایە وای نەدەوت [2]. عوسمانی بەتی ئەڵێ: لەبەسرەدا کەس هێندەی ئیبن سیرین لە دادوەری دا شارەزا نەبوو [3]. حەسەنی بەسریش پێش خەڵکی تری دەخست، لە ثابتی بنانیەوە، ئەڵێ: حەسەن خۆی لە حەججاج شاردبوویەوە و لەو کاتەدا کچێکی مرد، منیش چووم بۆلای بۆ ئەوەی داوام لێ بکات کە نوێژی لەسەر بکەم، ئەوە بوو گریا و دەنگی بەرزبوویەوە پاشان وتی: بڕۆ بۆلای محمدی کوڕی سیرین و پێی بڵێ با نوێژی لەسەر بکات / ئینجا من بۆم دەرکەوت کە کەس بەلامەوە پلەوپایەی ئیبن سیرینی نیە [4]، ئیبن سیرینش ڕۆژی نا ڕۆژێك بە ڕۆژوو دەبوو [5] و بەناوبانگ بوو بە لێکدانەوەی خەو و لەم بوارەدا پێویستی بەناساندن نیە، زەهەبی دەربارەی ئەڵێت: لە ئیبن سیرینەوە لێکدانەوەی سەر سوڕهێنەری خەوهاتوو لەم بوارەدا پشتیوانی خوایی لەگەڵدا بووە [6]. جلی گرانبەها مێزەرە و چاکەتی تایبەتی شێخەکانی لەبەر دەکرد [7] و حەزی لە سوعبەت و پێکەنین بوو [8] و زۆر باش بوو لەگەڵ دایکیدا حفصەی کچی سیرین ئەڵێت: دایکی خەڵکی حیجاز بوو و حەزی لە ڕەنگ و بۆیە بوو، محمدیش ناسکترین قوماشی بۆ دەکڕی، لەکات جەژنیشدا بۆی ڕەنگ دەکرد و

---

[1] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٦٠٦).
[2] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٦٠٨).
[3] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٦٠٨).
[4] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٦١٠).
[5] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٦١٥).
[6] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٦١٨).
[7] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٦١٩).
[8] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٦١٣).

هەرگیز نەمبینیوە دەنگی بەسەردا بەرز بکاتـەوە، لەگـەڵ دایکیـشیا زۆر بـە هێواشـی قـسەی دەکرد [1].

تعلم فليس المرء يولد عالما وليس اخو علم كمن بات جاهل

وان كبير القوم لاعلم عنده صغير اذا التفت عليه المحافل

هەروەها لـە ئیبن عەونەوە هاتووە کە محمدی کوڕی سیرین ئەگەر لای دایکی ببینرایـە نەدەناسـرا یان وایان دەزانی نەخۆشە هێندە بە نزمی قسەی دەکرد [2]، دیسانەوە ئیبن عەون ئەڵێت: ئەگەر باسـی کەسێکیان بەخراپە بکردایە لای ئیبن سیرین ئـەو باسـی باشـترین شـتێکی دەکـرد کـە لـە بارەیـەوە ئەیزانی، جارێکیان کۆمەڵە کەسێك هاتنە لای و تیان / ئەگەر بە خراپە باسمان کردی گەردنمان ئـازاد بکە، ئەویش وتی: شتێکتان بۆ حەلاڵ ناکەم کە خوا حەرامی کردبێت [3]، هەروەها ئیبن سـیرین دوای حەسەنی بەسری بەسەد ڕۆژ کۆچی دوایی کرد لە ساڵی سەد و دەی کۆچیدا [4].

ب- قەتادەی کوڕی دەعامەی سدوسی: یەکێك بوو لە سەرچـاوەکانی زانـست، فـەرموودەی لـە هەندێك لە هاوەڵان و گەورە شوێنکەوتوانەوە(کبـار التـابعين) گێڕاوەتـەوە و بـاوەڕ پێکـراو بەهێز بوو لە فەرموودەدا [5].

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەربارەی ئەڵێن: قەتادە شارەزا بوو لـە تەفـسیر و جیـاوازی زانایـان دا، پاشان وەسفی دەکات بەتێگەشتن و بەهێزی لەبەر کردن و ئـەڵێ: بـە دەگمـەن کەسـێکت دەسـت بکەوێت کە پێشی بکەوێت [6]، هەروەها ئەڵێ: قەتادە زیرەکترین و بەهێزترینی خەڵکی بەسرە بوو لە لەبەرکردندا هەرچی ببیستایە لەبـەری دەکـرد، قورئـانی بـە حـەوت ڕۆژ خـەتم ئـەکرد، بـەلام لـە ڕەمەزاندا بە سێ ڕۆژ خەتمێکی دەکرد [7].

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٦١٩).

[2] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٦٢٠).

[3] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٦٢٠).

[4] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٦٢١).

[5] - الفتوى د. حسين الملاح، ل: ٨٤.

[6] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٢٧٦).

[7] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٧٧).

زەهەبی دەربارەی ئەڵێ: هەڵکەوتوو لە بەرکار(حافظ) سەردەم و پێشەنگی موفەسیر و فەرمودە ناسەکان بووە [1]. پێشەنگ و سەرچاوە بووە لە زمانی عەرەبی و ڕەچەڵەك و ڕۆژ و ڕوداوەکانی عەرەبدا [2]، یەکێك بوو لە قوتابیەکانی حەسەنی بەسری و دوازدە ساڵ لە خزمەتیدا بووە و سێ ساڵ پێکەوە نوێژی بەیانیان کردووە. و لە ساڵی سەد و هەژدە دا کۆچی دوایی کردووە [3].

٥- **خوێندنگەی کوفە:** سێ سەد کەس لە هاوەڵانی ژێر درەختەکە و حەفتا کەس لە بەشدار بوانی بەدر هاتنە کوفە، عومەری کوڕی خەتتابیش(ﷺ) گرنگی دا بە کوفە و عبداللە ی کوڕی مەسعودی بۆ نارد و ئیبن مەسعودیش هەوڵی دەدا بۆ پێگەیاندنی نەوەیەك کە بانگەوازی ئیسلام لە ئەستۆ بگرێت. و بەشێوەیەکی باش و زانستی لێی تێ بگات، کاریگەری باشیشی هەبوو لە دەروونی ئەو کەسانە کە لە دەوروبەری بوون و ئەوانەش کە دوای ئەوان هاتن، کۆمەڵێکیش لە قوتابیانی ئیبن مەسعود بە فیقه و زانست و زوهد و پارێزگاری ناویان دەرکرد بوو لەوانە: عەلقەمەی کوڕی قەیس و مەسروقی کوڕی ئەجدەع و عبیدەی سەلمانی و ئەسوەدی کوڕی یەزید و مورڕەەی جەعفی و کەسانێکی تر، بەناوبانگترینی زانایانی شوێنکەوتوانیش – تابعین – لە خوێندنگەی کوفەدا ئەمانە بوون:

أ- عامری کوڕی شورحبیلی شەعبی: زانا و هەڵکەوتووی سەردەمی خۆی بوو، یەکێك بوو لە تێگەشتوو ترینی زانایان، لە عائشە و ئیبن عومەر و سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عبداللە ی کوڕی عومە و خەڵکانێکی ترەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە، تەنانە ئەڵێن: پێنج سەد هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بینیوە [4]. بۆیە خاوەنی شوێنەوار بووە و زانست و فیقهێکی زۆری زاینوە، محمدی کوڕی سیرین ئەڵێ: بینیومە داوای فتوایان لێدەکرد لە کاتێکدا کە هاوەڵان مابوون لە کوفەدا، سەرباری ئەم زانستە فراوانەش، بەڵام تەنگا و دەبوو بە فتوادان و زۆر جار ئەیوت: نازانم، چونکە نازانمی بەنیوەی زانین دەزانی [5]. هەروەها شەعبی ئەڵێن: ئێمە زانا نین،

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٧٦).

[2] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٧٠).

[3] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٢٧٧).

[4] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٨٣).

[5] - فصل الخطاب في سيرة امير المؤمنين عم بن الخطاب، ل: ٢٦٤.

بەلام فەرموودەمان بیستووە و گێڕاومانەتەوە، چونکە زانا ئەو کەسەیە کە شتێکی زانی کاری پێ بکات [1] لە قسە خۆش و بە پێزەکانی ئەم زانایەش ئەعمەش بۆمان دەگێڕێتەوە و ئەڵێ: پیاوێك هاتەلای شەعبی وتی: ناوی ژنەکەی ئیبلیس – شەیتان – چیە؟ وتی: من ئامادەی ئەو شاییە نەبووم [2]. لە ساڵی سەد و چواردا ئەشلێن سەد و شەش یان سەد و پێنج دا کۆچی دوایی کردووە [3].

ب- حەممادی کوڕی سەلەمە: زانای خەڵکی عێراق، لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە سەردەستی ئیبراهیمی نەخعی خوێندویەتی و باشترین و زاناترین و شارەزاترینیانە لە قیاس دا و لێهاتوو ترینیان بووە لە مشتومڕو(مناظرة) [4] داو یەکێ: بووە لە زانا زیرەك و بەخشندە و بەرێزەکان، دەوڵەمەند بووە و پۆشاکی جوانی پۆشیوە و گرنگی بەخۆی داوە [5] زاناترین خەڵکی کوفە عەلی و ئیبن مەسعود بوون و زاناترین هاوەڵێشیان عەلقەمە بووە، زاناترین هاوەڵی ئەویش ئیبراهیم بووە، زاناترین هاوەڵی ئیبراهیمیش حەماد بووە، زاناترین هاوەڵی حەممادیش ئەبو حەنیفە بووە و زاناترین هاوەڵی ئەبو حەنیفەش ئەبو یوسف بوو، هاوەڵانی ئەبو یوسفیش بە هەموو شوێنێکدا بڵاو بوونەوە و شارەزا ترینیان محمد بووە، زاناترین هاوەڵی محمدیش ئەبو عبدالله شافیعی بوو ڕەحمەتی خوایان لێ بێت [6]، هەروەها حەمماد لە ساڵی سەد و بیست دا کۆچی دوایی کرد [7].

٦- **خوێندنگەی یەمەن:** لە بەناوبانگترین زاناکانی کە ڕۆڵیان هەبوو لە بڵاو کردنەوەی ئیسلام تیایدا,موعازی کوڕی جبل و عەلی کوڕی ئەبو تالیب و ئەبو موسی ی ئەشعەری و.. هتد. هەرکەسێکیش ئەیەوێ زیاتر بزانێت با بگەڕێتەوە بۆ ئەو نامە زانستیەی کە د. عبدالله الحمیری

---

[1] - سیر اعلام النبلاء (٤ / ٣١٨).

[2] - الفتوى د. الملاح، ل: ٨٣.

[3] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٢٣١).

[4] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٣٦).

[5] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٢٣٦).

[6] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٩).

[7] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٩).

نووسیویەتی بەناونیشانی الحديث و المحدثون فی اليمن فی عصر الصحابە، بەناوبانگترین زانایانی شوێنکەوتوانیش لە خوێندنگەی یەمەندا ئەمانە بوون:

أ- طاوسی کوڕی کیسان: زانای خەڵکی یەمەن و پێشەنگ و زاناترینیان دەربارەی حەڵاڵ و حەرام و یەکێکە لە گەورە شوێنکەوتوان، لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی بەڕێزەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە وەك زەیدی کوڕی ثابت و ئەبی هورەیرە و زەیدی کوڕی ئەرقەم و ئیبن عەباس [1].

لە موعازەوە(ﷺ) فەرمووەدەی بە مرسلی گێڕاوەتەوە، یەکێك بوو لە و فارسانەی کە کیسرا ناردنی بۆ داگیرکردنی یەمەن [2]، زانایەکی پایەبەرز و بەرەکەتدار بوو بۆ خەڵکی یەمەن [3]. بە خزمەت پەنجا لە هاوەڵاتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەشتووە [4].

عومەری کوڕی عبدالعزیز لەسەردەمی سولەیماندا پێی وت: پێویستی خۆت بەرزبکەرەوە بۆ ئەمیری باوەڕداران، ئەویش وتی: پێویستم بەو نیە، عومەریش سەرسام بو پێی [5]. هەروەها لەو تەکانی: ڕەوشتی گەنج تەواو نابێت هەتاوەکو ژن نەهێنێت [6]. وتوشیەتی: ڕەزیلی ئەوەیە کە مرۆڤ ڕەزیل بێت لەوەدا کە لە دەستیایەتی، پیسکەیش ئەوەیە کە حەز بکات ئەوەی کە بە دەست خەڵکەوەیە ببێتە موڵکی ئەو [7].

قەیسی کوڕێ سەعدیش دەربارەی ئەڵێت: طاوس لەناو ئێمەدا وەك ئیبن سیرین وایە لەناو ئێوەدا، هەروەها ئیبن مەدەنی ئەڵێ: سوفیان لەناو هاوەڵانی ئیبن عەباسدا کەسی بە طاوس نە دەگۆڕیەوە واتە: ئەوی بەلاوە لە هەمووان پێ باشتر بوو [8]، هەروەها طاوس(ﷺ) دوور بوو لە کار بەدەست و سوڵتانەکان مەگەرە زۆربەیان لێ بکردایە بۆ کارێك. ئەگەر داوای ئامۆژگاریشی لێ

---

[1] – هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٨).

[2] – الفتوى نشأتها و تطورها – اصوله و تطبيقها، ل: ٨٥.

[3] – سير اعلام النبلاء(٥ / ٤٣).

[4] – هەمان سەرچاوە(٥ / ٤١).

[5] – هەمان سەرچاوە(٥ / ٤٢).

[6] – هەمان سەرچاوە(٥ / ٤٨).

[7] – الطبقات(٥ / ٥٤١) اثر للعلماء في الحياة السياسية ل: ٦٦٦.

[8] – سير اعلام النبلاء(٥ / ٤٩).

بکرایه ئەوە ڕووپامایی کەسی نەدەکرد و حەقی دەوت، ئەمە و لەساڵی سەد و شەشی کۆچیدا لە مەککە کۆچی دوایی کرد [1].

ب- وەهەبی کوڕی مونەبە: باوکی عبدالله وەهەبی کوڕی مونەبە کە بەڕەچەڵەك فارسە، لە یەمەندا لە ناوچەی زماردا نیشتەجێ بوو کە دوو قۆناغ لە صنعاءوە دورە، یەکێك بوو لەوانەی کە کتێبی دەخوێندەوە و سەقاڵی خواپەرستی و دەستخستنی زانست و خۆیەکلاکردنەوە بوو بۆ ڕۆژی دوایی بوو [2]، زەهەبی لەبارەیەوە ئەڵێت: پێشەوایەکی زانا و هەواڵدەر و چیرۆکزان بووە، عجلی ش ئەڵێ: شوێنکەوتوویەکی باوەڕپێکراوە سەرپەرشتی دادوەری صنعای ئەکرد و شیرازیش لەناو زانایی شوێنکەوتوان لە یەمەندا ناوی هێناوە [3]، هەروەها وەهەب خاوەنی دانایی و زیرەکی بوو، جێ دەستی دیار بوو لە بەرەنگار بوونەوەی خەواریجەکان لە یەمەندا و خەڵکی ئاگادار کردۆتەوە لە بیرو بۆچوون و ڕاکانیان [4]، ئەمەش ئەو وتوێژەیەتی کە لەگەڵ ابی شمّری خەولانی دا ڕووی دا کاتێ کە لەگەڵ داودی کوڕی قەیس داچوونە لای وەهەبی کوڕی منبە و داوود قسەی کرد بۆ وەهەب و لەبارەی ابی شمری هاوەڵیەوە ئەڵێ: لە خەڵکانی قورئان خوێن و پیاو چاکە و خوای گەورەش زانترە بە نهێنی، بۆی باس کردم کە تووشی خەڵکانێك بووە لە حەروریەکان – خەواریج – و پێیان وتوە: ئەو زەکاتەی کەبە کاربەدەستانی دەدەیت لای خوا وەرناگیرێت، چونکە ئەوانە لە شوێنی خۆیدا خەرجی ناکەن، بۆیە دەبێ بیدەی بە ئێمە جا من وا دەزانم قسە و ئامۆژگاری تۆ لە ئامۆژگاری من باشترە بۆی، ئەویش پێی وت: ئەی خولانی ئایا دەتەوێت دوای ئەم تەمەنە زۆرە ببیت بە خەواریج و شایەتی گومڕایی بۆ خەڵکێکی لە خۆت باشتر بدەیت؟ ئەی چی دەکەیت لە کاتێکدا کە خوای گەرە ئەتوەسێنێت لەگەڵ ئەو کەسەدا کە شایەتیت لەسەر داوە، خوای گەورە شایەتی باوەڕی بۆ دەدات و تۆش شایەتی بێ باوەڕی بۆ دەدەیت؟ جا بۆ کوێ دەچیت ئەگەر ڕای تۆ پێچەوانەی ڕای خوای گەورە بوو: پێم بڵێ ئەی خولانی چیت پێ دەڵێیت؟ ئەویش وتی:

---

[1] - هەمان سەرچاوە

[2] - طبقات الفقهاء، ل: ٦٦.

[3] - اثر العلماء في الحياة السياسية في الدولة الاموية ل: ٦٦٧.

[4] - مسلم ژمارە ٢٢٤٢.

ئەوان فرمانم پێ دەکەن کە زەکات نەدەم بە کەس جگە لەوانەی کە وەك ئەوان بیر دەکەنەوە و داوای لێخۆشبون تەنها بۆ ئەو کەسانە بکەم. وتی: ڕاست دەکەی، ئەمە گرفت و درۆی ئەوانە، ئەوەی کە دەربارەی زەکات دەیلێین ئەوە بیستومە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی کردوە کە ئافرەتێك ی خەڵکی یەمەن چووەتە دۆزەخەوە لەسەر بەندکردنی پشیلەیەك [1].

ئایا مرۆڤێك کە خوای گەورە بە تاك و تەنها ئەی پەرستێت و هاوەڵی بۆ بڕیار نادات خۆشەویستڕە لای خوا بۆ تێرکردن یان پشیلەیەك؟ خوای گەورەش ئەفەرموێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ۝٨﴾ الإنسان: ٨). ئەوەش کە دەڵێن کە نابێ داوای لێخۆش بوون بکرێت تەنها بۆ کەسێك نەبێت کە وەك ئەوان بیردەکاتەوە، ئایا ئەوان باشترن یا فریشتەکان، کە خوای گەورە دەربارەیان ئەفەرموێت: ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِمَن فِي ٱلْأَرْضِ﴾ الشورى: ٥). سوێند بەخوا فریشتەکان ئەمەیان نەکردوە هەتاوەکو فەرمانیان پێ نەکرا بێت: ﴿لَا يَسْبِقُونَهُۥ بِٱلْقَوْلِ وَهُم بِأَمْرِهِۦ يَعْمَلُونَ﴾ الأنبياء: ٢٧). هەروەها ئەم کارەشیان بۆ ئاسان کراوە: ﴿وَيَسْتَغْفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ غافر: ٧). پاشان بەردەوام بوو لە وتوێژ کردن لەگەڵیدا هەتاوەکو خولانی وتی: ئێستا بەچی فەرمان دەکەیت؟ وتی: زەکاتی خۆت بدە بەوکەسەی کە خوای گەورە، کاروباری ئوممەتی پێ سپاردووە و خەڵکی لە دەورکۆ کردۆتەوە، بێگومان سامان تەنها لە خواوەیە و ئەیدات بە هەر کەسێك بیەوێت، جا ئەگەر تۆ زەکاتت دا بە کاربەدەست و سەرپەرشتی موسڵمانان ئەوە ئەرکی خۆت بە جێ هێناوە، ئەگەر لێی مایەوە ئەوە بەشی خزم و خزمەتگوزارو دراوسێ و میوانەکانتی لێ بدە، خولانیش وتی: تۆ شایەت بە کە من دەستبەرداری ڕای خەواریج بووم [2]. هەروەها وەهەب لە ساڵی سەد و دەدا ولەسەردەمی هشامی کوڕی عبدالملك کۆچی دوایی کرد [3]، ئەشڵێن یوسفی کوڕی عومەر والی

---

[1] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٥٥٦) اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ٦٦٧؛

[2] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٥٥٦) اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ٦٦٧.

[3] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٥٥٦).

یەمەن لێی داوە هەتاوەکو مردووە [1]، ڕەنگە ئەمەش بەهۆی هەڵوێستی وەهەبەوە بو بێت بەرامبەر بە ستەمی یوسفی کوڕی عومەر کە ناسراو بووە بە ستەمکاری و توندوتیژی [2].

٧- **خوێندنگەی میسر:** لە میسریشدا خوێندنگە یەك پەیدا بوو کە مامۆستاکانی لەو هاوەڵانە بوون کە کۆچیان کرد بوو بۆی لە ڕۆژگارەکانی ئازاد کردنی میسردا و لە فسطاط و ئەسکەندەریەدا نیشتەجێ بوون، وەك عومەری کوڕی عاص و عبداللە کوڕی عەمری کوڕی عاص و زبێری کوڕی عەوام، کاریگەرترین هاوەڵیش لەسەر خەڵکی میسر عقبەی کوڕی عامر بوو(ﷺ) [3]. ئەم هاوەڵانەش ڕۆڵی سەرەکیان هەبووە لە بانگەواز کردن و ڕێنمونی کردنی خەڵکی میسر بۆ ئاینی ئیسلام [4]، پاشان چینی شوێنکەوتوان – تابعین – هاتن، کە چەند پێشەوا و بانگخوازێکیان تیادا هەڵکەوت، لەوانە:

یەزیدی کوڕی ابی حەبیب: پێشەوای زانا و موفتی وڵاتی میسر، ناسراو بە ئەبورەجائی ئەزدی کە یەکێك بوو لە پایەدارترین زانایانی ئیشکەر، بە هۆی پارێزکاریەوە پلە بەرز بوویەوە هەرچەندە خزمەتگوزارێکی ڕەشت پێست بوو [5] لیثي کوڕی سەعد دەربارەی ئەڵێ: یەزیدی کوڕی ئەبی حبیب گەورە و زانامانە [6] لە ساڵی سەد و بیست و هەشت دا کۆچی دوایی کردووە [7].

٨- **خوێندنگەی باکووری ئەفریقا – تونس -:** سەرکردە ئازادیخوازەکان چوونە باکووری ئەفریقاوە و عەمری کوڕی عاص و پاشانیش عبداللە ی کوڕی سەعدی کوڕی ابی السرح لە پێشەوە یاندا بوون، پاشان موعاویەی کوڕی خدیج بەردەوام بوو لە فەتحی ئەفریقا دا، موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیانیش دانرا بەوالی میسر و ئەفریقا و پاش ئەویش عقبەی کوڕی نافعی فهەری هات و نەخشەی مەدینە قەیرەوانی دارشت و بەباشی ڕەفتاری لەگەڵ خەڵکدا

---

[1] - اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ٦٦٧.

[2] - عمر بن الخطاب للصلابي، ل: ٢٧٠.

[3] - الدعوة الى الله في العصر العباسي الاولى(١ / ٥٧).

[4] - سير اعلام النبلاء(٦ / ٣١)

[5] - هەمان سەرچاوە(٦ / ٣٢).

[6] - هەمان سەرچاوە(٦ / ٣٢).

[7] - البيان المغرب للمراكشي(١ / ١٩) الدعوة الى الله(١ / ٦١).

کردوو یەکێك بوو لە کار بەدەست و بانگخوازە باشەکان کە جیهادیان کردەوە بە شمشێر و وشە، پاشان چەند والیەکی باش کاروباری ئەفریقایان گرتە دەست کە هەموویان لەسەر هەمان ڕێڕەو بەردەوام بوون [1]. هەروەها لەسەردەمی خەلیفەی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا ئیسماعیلی کوڕی ابی مهاجری نارد وەك والی ئەفریقا لە ساڵی سەددا، ئیسماعیل بانگخوازی ئیسلام بوو بە زمان و کار و ڕەوشتی، هەربۆیە خەڵك خۆشیان ویست و ئەم خۆشەویستیەش ئاینەکەشی گرتەوە، هەروەها سوور بوو لەسەر بانگەواز کردنی بەربەر بۆ ئیسلام و ئەوانیش بەدەم بانگەوازەکەیەوە هاتن و لەسەر دەستی موسڵمان بوون، هەروەها گرنگی دەدا بە فێر کردنی حوکمە شەرعیەکان و ناساندنی بە خەڵك و شارەزاکردنیان لە حەلاڵ و حەرام دا.

عومەری کوڕی عبدالعزیزیش دەکەس لە شوێنکەوتوان – تابعین – ی لەگەڵیاندا نارد بوو لە کەسانی زانا و پایەدار، لەو کاتەشدا خەڵکی ئەفریقا هێندە نەشارەزا بوون کە نەیان دەزانی مەی خواردنەوە حەرامە ئەوە بوو ئەو زانایانە هاتن و خەڵکیان فێری حەلاڵ و حەرام کرد [2].

باس کردنی لەم دەزانایەش لە شوێنی خۆیدا دێت بە پیشتیوانی پەروەردگار لە ڕوانگەی ئەم باسەی کە ڕابورد دەربارەی خوێندنگە زانستیەکان گرنگی گواستنەوەی زانست و ئەزمونە بانگخوازیەکان بۆ نەوەکان لای سەلەف و پێشینان بۆ دەردەکەوێت، هەروەها سود لە گرنگی یەکلا کردنەوەی کۆمەڵێك لە زانایانی زیرەکی ئوممەت وەردەگرین بۆ فێر کردن و فێربوون و فتوادان و ئامۆژگاری کردن و بلاو کردنەوەی لە نێو خەڵکدا.

## چوارەم: ڕێبازی شوێنکەوتوان – تابعین – بۆ ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز:

شوێنکەوتوان ڕێبازێکی ڕوونیان گرتبەر بۆ ڕاڤەکردنی قورئانی پیرۆز و قورئانیان بە قورئان و بە سوننەت و بەوتەکانی هاوەڵان و بە پێی زمانی عەرەبی و ئیجتیهاد و بە هێزی هەڵگۆزینی حوکمەشەرعیەکان ڕاڤە دەکرد.

١- **تەفسیری قورئان بە قورئان:** شوێنکەوتوان چەندین ڕێگەیان گرتبووە بەر بۆ ڕاڤەکردنی قورئان بە قورئان و لەو ڕێگایانە:

---

[1] - هەمان سەرچاوە(١ / ٤٨). الدعوة الى الله في العصر العباسي الاول(١ / ٦٢).

[2] -

أ- ڕاڤەکردنی ئایەتێك بە ئایەتێکی تری هاوشێوە، وەك ڕاڤەکردنی ئایەتێکی بە ئایەتێکی تر کە لە هەمان بابەت دەدوێ، با وشەکانیشیان جیاواز بێت، نموونەی ئەمەش وەك ئەوەی کە لە موجاهیدەوە هاتووە دەربارەی تەفسیری فەرمایشتی: ﴿فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ﴾ البقرة: ٣٧). ئەڵێ: وتویانە: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا﴾ الأعراف: ٢٣). هەتاوەکو لێی بوویەوە [1]. هەروەها لە عەکرمەو حەسەنەوە دەربارەی فەرمایشتی: ﴿وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا﴾ الإسراء: ١١٠). ئەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەککەدا نوێژی دەکرد دەنگی بەرز دەکردەوە ئەمەش بێ باوەڕانی ئازاردەدا، پاشان خۆی و هاوەڵان ئەوەیان نەهێشت بۆیە فەرمووی: ﴿وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا﴾ الإسراء: ١١٠).
واتە: لە نوێژکردنتدا دەنگ بەرزمەکەرەوە و بە نهێنیش مەیەکە...

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ﴾ الأعراف: ٢٠٥). دەربارەی تەفسیری فەرمایشتی: ﴿قُلۡ إِن كَانَتۡ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ﴾ البقرة: ٩٤). قەتادە وتویەتی: ئەمە لەبەر ئەوەیە کە ئەوان وتویانە: ﴿لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ البقرة: ١١١). هەروەها وتویانە: ﴿نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ﴾المائدة: ١٨). لەبەرامبەریشدا پێی وتن: ﴿فَتَمَنَّوُاْ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ﴾ البقرة: ٩٤).

ب- لێکچووەکان: مەبەست پێی ڕاڤەکردنی ئایەتێکە بەشێك کەلێی بچێت وەك ڕاڤەکردنی ئەو ئایەتانە بە یەکترکەمانا و شتەکانیان لێکەوە نزیکن [2]. نموونەی ئەمەش وەك ئەوەی کە لە موجاهیدەوە هاتووە دەربارەی تەفسیری وشەی(نفس) واتە: خود بە(غیر) واتە: بەرامبەرە، ئەوەتا تەفسیری فەرمایشتی: ﴿لَّوۡلَآ إِذۡ سَمِعۡتُمُوهُ ظَنَّ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمۡ﴾ النور: ١٢). وتی: گومانی باشیان بە خۆیان برد واتە قسەی باش و خێری پێ وتن، ئایا نابینی کە دەڵێ: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ﴾النساء: ٢٩). ئەڵێ: واتە هەندێکتان هەندێکی ترتان نەکوژێت: ﴿فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ

---

[1] - فتح القدير(١ / ١١٦) تفسير التابعين(٢ / ٦١٤).

[2] - تفسير الطبري(١٨ / ٩٦) تفسير التابعين(٢ / ٦١٥).

أَنفُسِكُمْ ﴾ النور: ٦١). ئەڵێ: واتە هەندێکتان سلاو لە هەندێکی ترتان بکات [١]. لێرەدا موجاهید(نەفس) و خودی بە(غیر) واتە کەسی بەرامبەر ڕاڤە کردوە بەڵگەشی بەهاتنی چەند ئایەتێکی لێکچوو و لە قورئاندا هێناوەتەوە کە بەڵگەیە لەسەر ئەم بەشە لە ماناکەی [٢].

ج- بەڵگە هێنانەوە لەسەر ڕاڤە کردن بەسیاقی ئایەتەکە: لەم جۆرەشدا ڕاڤەکار سەرنجی سیاقی ئایەتەکە دەدات و ئەیبەستێتەوە بە پێش یان بە پاش خۆیەوە، چ لە خودی ئەم ئایتەدا بێت یان لە کۆمەڵە ئایەتێکی تردا [٣]. وەك تەفسیری فەرمایشتی: ﴿ وَتِلْكَ حُجَّتُنَآ ﴾ الأنعام: ٨٣).
موجاهد لە ڕاڤەیدا ئەڵێ بریتیە لە: ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ ﴾ الأنعام: ٨٢).

د- ڕوونکردنەوەی مُجْمَل – کۆکراوە –: لێرەشدا ڕاڤەکار هەڵدەستێ بە سەرەنجدانی ئەو ئایەتانەی قورئان کە مجمل و کۆکراوەن و پاشان بە دوای ئەو ئایەتانەدا دەگەڕێ کە لەوانەیە ڕوونکەرەوەی ئەم مجملە بێت و مجملە کەش بە ئایەتە ڕوونکەرەوە کەلێك دەداتەوە، نموونەی ئەمەش وەك ئەوەی کە لە موجاهیدەوە هاتووە دەربارەی تەفسیری: ﴿ وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴾ نوح: ١٤). وتویەتی: لە خۆڵ پاشان لە دڵۆپە ئاو پاشان لە پارچە گۆشتێك هەتاوەکو تەواو دروستی کردووە [٤]، ئەمەش ئاماژەدانە بەو ئایەتانەی کە ئەو قۆناغەی تیادا هاتووە وەك: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن سُلَـٰلَةٍ مِّن طِينٍ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلْنَـٰهُ نُطْفَةً فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقْنَا ٱلنُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا ٱلْعَلَقَةَ مُضْغَةً فَخَلَقْنَا ٱلْمُضْغَةَ عِظَـٰمًا فَكَسَوْنَا ٱلْعِظَـٰمَ لَحْمًا ثُمَّ أَنشَأْنَـٰهُ خَلْقًا ءَاخَرَ ۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحْسَنُ ٱلْخَـٰلِقِينَ ﴾ المؤمنون: ١٢ – ١٤). واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی مرۆڤمان دروست کرد لە خولاسە و پاڵفتەیە لە قوڕ. لە پاشان ئەومان کردە بەنوتفەیەك لە ئارامگایەکی قایم(مناڵدانی دایك)دا. دواتر نوتفەکەمان کرد بە خوێنی مەیبو ئینجا خوێنە مەییوەکەشمان کرد بە پارچە گۆشتێکی جووا و ئینجا ئەویشمان کرد بە ئێسقان ئینجا بە گۆشت(پەیکەر) ئێسکەکەمان

---

[١] - تفسير التابعين(٢ / ٦١٦).
[٢] - نفسير التابعين(٢ / ٦١٧).
[٣] - تفسير الطبري(١١ / ٢٠٥).
[٤] - تفسير الطبري(٢٩ / ٢٦) الدر المنثور(٨ /٢٩١).

داپۆشی پاشان ئەومان کرد بە دروست کراوێکی تر جا گەورە و پیرۆزە ئەو خوایەی کە چاکترینی بەدی هێنەرانە.

هـ- ڕاڤەکردنی گشتی بەتایبەت: لێرەشدا ڕاڤەکار هەڵدەستێ بە ڕاڤە کردنی ئایەتێك کە بە ڕواڵەت گشتیە و ڕونکردنەوەی بە ئایەتێك کە باس لە دانەیەك لە دانەکانی دەکات[1]، وەك دەفەرموێت: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ النساء: ١٢٣). حەسەنی بەسری ئەڵێ واتە: بێ باوەڕ پاشان: ﴿وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ﴾ سبا: ١٧)[2]. واتە: بێ باوەڕان، لە ڕیوایەتێکی تریشدا لێیەوە هاتووە کە وتویەتی: ﴿وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ﴾ سبا: ١٧) مەبەستی بێ باوەڕانە نەك نوێژ خوێنان[3]، ئایەتی یەکەم بە گشتی هاتووە وەك لە وشەی ﴿مَنْ﴾ واتە: " هەر کەسێك " دا دەردەکەوێت کە باوەڕدار و بێ باوەڕیش دەگرێتەوە، حەسەنیش هات و ڕوونی کردەوە کە ئەوەتایبەتبە بێ باوەڕە وە و بەڵگەشی شێوازی(حصر) و تایبەتکردن بوو لە ئایەتی دووەمدا[4].

لەوەش ڕاشکاوتر ئەویە کە لێیەوە هاتووە لە تەفسیری هەمان ئایەتدا کە ئەفەرموێت: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ النساء: ١٢٣). ئەمە بۆ کەسێکە کە خوای گەورە بیەوێ سوکایەتی پێ بکات، بەڵام هەرکەسێ کە خوای گەورە بیەوێ ڕێزی لێ بنێت ئەوە لە ئەهلی بەهەشتە: ﴿وَعْدَ ٱلصِّدْقِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يُوعَدُونَ﴾ الأحقاف: ١٦)[5].

ڕاڤەکردن بە پێویست: مەبەست لە ڕاڤەکردن بە پێویست ئەوەیە کە موفەسیر بە ڕاشکاوی ڕاڤەی ئایەتەکە ناکات، بەڵکو باس لە پێویستیەکانی دەکات و ئەیبەستێت بە ئایەتێکی ترەوە، نموونەی ئەمەش وەك ئەوەی کە لە سەعیدی کوڕی جبیرەوە هاتووە کە لە ڕاڤەی: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ﴾ البقرة: ١٥٦). وتویەتی: ئەگەر بە کەسێك بدرایە ئەوە بە یەعقوب دەدرا ئایا نەتبیستووە: ﴿

---

[1] - تفسير التابعين(٢ / ٦٢١).

[2] - تفسير الطبري(٩ / ٢٣٧) زياد المسير(٢ / ٢١٠).

[3] - تفسير الطبري(٩ / ٢٣٨).

[4] - تفسير التابعين(٢ / ٦٢٣).

[5] - تفسير التابعين(٢ / ٦٢٣).

﴿ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ ﴾ يوسف: ٨٤)[١]. ئەو دەستەواژەی ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴾ البقرة: ١٥٦) ی نەدەزانی، ئەگینا لە بری ئاخ هەڵکیشانی بۆ لە دەستدانی یوسف ئەوەی دەوت[٢].

و- ڕوونکردنەوەی نا ڕوون: یەکێك لەو ڕێگایانەی تەفسیر کە شوێنکەوتوان گرتایانەبەر بریتی یە لە ڕوونکردنەوەی نا ڕوونی ئایەتێك بە ئایەتێکی تر بۆ نەهێشتنی ناڕوونی[٣]. نموونەی ئەمەش وەك ئەوەی کە عەکرەمە پێی هەستا بۆ نەهێشتنی ناڕوونی لە وشەی(حین) – کات – و بەڵگەی بەو ئایەتە هێناویەوە کە ڕوونی دەکاتەوە کە مەبەست پێی ساڵە، وەك لێیەوە هاتووە کە فەرموویەتی: عومەری کوڕی عبدالعزیز ناردی بۆ لام و وتی: ئەی خزمەتکاری ئیبن عباس: من سوێندم خواردووە کە(حین) و ماوەیەك ئەو کارە و ئەو کارە نەکەم، جا ئەو(حین) ە چەندێکە، وتم: حینی وا هەیە کە نازانرێت و هەشە زانراوە، بۆ نموونەی ئەو(حین)ەی کە نەزانراوە فەرمایشتی خوای گەورە یە کە فەرموویەتی: ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ﴾ الإنسان: ١). سوێند بەخوا مرۆڤ نازانێت چەندی خایاندووە هەتاوەکو دروست کراوە،(حین)ی زانراویش وەك فەرمایشتی: ﴿ تُؤۡتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينِۭ بِإِذۡنِ رَبِّهَا ﴾ إبراهيم: ٢٥). کە ماوەی نێوان ساڵێك و ساڵێکی ترە، ئەویش وتی: پێکات ئەی خزمەتگوزاری ئیبن عەباس، چەند جوان بوو ئەو شتانەی کەوتت[٤].

ز- ڕوونکردنەوەی مانای(لفظ) یان ڕوونکردنەوەی کێشەیەك: ئەم جۆرەش لە تەفسیری تابعین دا زۆر هاتووە و هەڵدەستان بە ڕاڤەکردنی ئایەتەکانی قورئان بە چەند ئایەتێکی تر کەماناو وشەکانیان ڕوون دەکاتەوە[٥]. نموونەی ئەمەش وەك ڕاڤەکردنی جەسەنی بەسری بۆ: ﴿ يَوۡمَ تَرۡجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ٦ ﴾ النازعات: ٦). ئەڵێ: دوو جار فوو بە شەیپوردا دەکرێت، یەکێکیان هەموو زیندەورێك دەمرێنێت، دووەمیشیان: مردووەکانی پێ زیندوو دەبێتەوە: ﴿ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ

---

[١] - تفسير التابعين(٣ / ٢٢٤)

[٢] - تفسير الطبري(٢ / ٢٢٣).

[٣] - تفسير التابعين(٢ / ٦٢٤).

[٤] - تفسير الطبري(١٦ / ٥٨١).

[٥] - تفسير الطبري(٢ / ٦٢٦).

﴿ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴾ الزمر: ٦٨). نموونـەش زۆرە لەسـەر ڕاڤـەکردنی قورئـان بـە قورئـان لەلایـەن شـوێنکەوتوانەوە، هەرکەسێکیش زیاتری ئەوێت با بگەڕێتەوە بۆ تفسیر التابعین[١].

٢- **ڕاڤەکردنی قورئان بە سوننەت:** گومان لەوەدا نیە کە سوننەت ڕوونکەوەی قورئان، شاطبي ئـەڵێت: سـوننەت لەناوەڕۆکـدا لـە قورئانـەوە هـاتووە شتەگـشتیەکانی ڕوون دەکاتـەوە و نادیارەکانی دەردەخات و کورتەکەی شی دەکاتەوە[٢]، ئەمەش بە هۆی ئەوە وە کە پێغەمبـەری خوا(ﷺ) داناتر و شارەزاترە لە فەرمایـشتی پـەروەردگار و باشـتر لـە دەقـی ئایەتـەکان تـێ دەگات لە کەسانی تر، چونکە ئەو: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ۝٣ إِنۡ هُوَ إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ﴾ النجم: ٣ - ٤).

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: من لەگـەڵ قورئانـدا ماناکـەیم پـێ دراوە[٣]. ئـیبن تەیمیە ئەڵێ: ئەگەر کەسێك وتی: باشترین شێوازی تەفسیر کامەیە؟ ئەو وەلاّم ئەوەیە کە قورئان بە قورئان ڕاڤەبکرێت.. هەتاوەکو ئەوەی کە دەڵێت ئەگەر ئەوەت بۆ نەکرا ئەوە بە سـوننەت ڕاڤەی بکە، چونکە سوننەت ڕاڤەکەر و ڕوونکەرەوەی قورئانە، پێشەوا ئـەبو عبـداللە محمـدی کوڕی ئیدریسی شافعیی ئەڵێ: هەرشتێك کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڕیاری لەسەر دابێت ئـەوە لە قورئانەوە هێناویەتی، خوای گەورە دەفـەرموێت: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ﴾ النساء: ١٠٥). هـەروەها ئەفـەرموێت: ﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ النحل: ٤٤). هەروەها ئەڵێ: ﴿ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴾ النحـــل: ٦٤)[٤].

زانایانی یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە پشت بەستن بە سوننەت پێویستە و دەبێ کاری پێ بکرێـت و جێبەجێ بکرێت، تەنانەت مەکحول ئەڵێ: قورئـان زیـاتر پێویـستی بـە سـوننەت هەیـە هـەتاوەکو

---

[١] - تفسیر التابعین(٢ / ٦٠٨ بۆ ٦٢٧).

[٢] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٦٢٨) الموافقات(٤ / ١٢).

[٣] - سنن ابي داود ژمارە ٤٦٠٤.

[٤] - الفتاوی(١٣ / ٣٦٣).

پێویستی سوننەت بە قورئان [١]. زۆر دەقیش لە شوێنکەوتوانەوە هاتووە کە بەڵگەیە لەسەر شارەزایی باش و بە دواداچوونی وردیان بۆ سوننەت، ڕەبیعە بە زوهری وت: ئەگەر دەربارەی دەقێك پرسیارت لێ کرا چی دەکەیت؟ وتی: ئەوەی کە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووە باسی دەکەم، ئەگەر نەبوو، دەچم بۆ ئەوەی کە لە هاوەڵانەوە هاتووە، ئەگەر لەوانیشەوە شتێك نەهاتبوو ئەوە پشت بە ڕای خۆم دەبەستم [٢].

ئەوەش کە بەڵگەیە لەسەر گرنگیدانی بەهێزیان بەوەی کە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) گێڕدراوەتەوە ئەوەبە دەگمەن پێچەوانەی شتێك جوڵاونەتەوە کە ساغ بوبێتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەو شێوە ڕاڤەی کردووە، ئەمەش چەند نموونەیەکە لەم بوارەدا:

أ- ئەوەی کە لەڕاڤەی فەرمایشتی: ﴿ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ﴾ الفاتحة: ٧). پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێت: " جولەکە ﴿ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ن گاوریش ﴿ ٱلضَّآلِّينَ ﴾ و گومڕاکانن [٣] موجاهید و [٤] سەعیدی کوڕی جبیر [٥] و خەڵکانیشکی تریش بەم شێوە ڕاڤەیان کردووە. ئیبن حاتەم ئەڵێت: ناکۆکی نابینم لە نێوان ڕاڤەکار و موفەسیرەکاندا لەسەر ڕاڤەکردنی ﴿ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ﴾ بە جولەکە و ﴿وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ە بە گاورەکان [٦].

ب- هەروەها لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەربارەی فەرمایشتی: ﴿ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلۡخَيۡطُ ٱلۡأَبۡيَضُ مِنَ ٱلۡخَيۡطِ ٱلۡأَسۡوَدِ مِنَ ٱلۡفَجۡرِ ﴾البقرة: ١٨٧). هاتووە کە فەرموویەتی: " ئەوە تاریکی و ڕەشی شەو و ڕوناکی و سپێتی ڕۆژە " [٧]. لەمەشدا هیچ کەسێك لە شوێنکەوتوان ڕای جیاوازیان نەبووە و حەسەن [٨] و قەتادەش [١] هەمان ڕایان هەیە.

---

[١] - تفسير التابعين(٢ / ٦٢٩) تفسير الطبري(١ / ٣٠).

[٢] - جامع بيان العلم و فضلة(٢ / ٧٥) تفسير التابعين(٢ / ٦٣٧).

[٣] - موارد الضمآن في زوائد ابن حبان ژمارە ٢٢٤.

[٤] - تفسير الطبري(١ / ١٨٨).

[٥] - الدار المنثور(١ / ٤١).

[٦] - تفسير ابن حاتم ژمارە ٢٢، تفسير التابعين(٢ / ٦٣٨).

[٧] - البخاري، كتاب: التفسير الفتح(٨ / ١٨٢).

[٨] - تفسير الطبري(٣ / ٥١٠).

ج- هەروەها لە نموونەی ئەوەی کە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووە لە تەفسیری مانای(الظُّلْمِ) دا لە ئایەتی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يَلْبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ﴾ الأنعام: ٨٢). کاتێك کە ئەمە گرفتی لای هاوەڵان دروست کردو وتیان: کامان زوڵمی تێکەڵ بە ئیمانی نەکردووە؟ ئەویش(ﷺ) فەرمووی: ئەوە نیە، ئەی وتەکەی لوقمانتان بۆ کوڕەکەی نەبیستووە کە ئەڵێ: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ لقمان: ١٣)[٢]. ئەمەش لە شوێنکەوتوانەوە گێڕدراوەتەوە و ئیبراهیمی نەخعی و قەتادە و موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیریش وتویانە[٣].

د- هەروەها وەك ئەوەی کە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووە دەربارەی ڕاڤەکردنی(سَبْعًا مِنْ الْمَثَانِي) لە فەرمایشتی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ﴾ الحجر: ٨٧). پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ئەبی سەعیدی کوڕی معلّی ی وت:(ئایا گەورەترین سورەتی قورئانت فێرنەکەم پێش ئەوەی لە مزگەوت دەربچم؟) پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆشت و ویستی بچێتە دەرەوە، منیش یادم خستەوە و فەرمووی: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، ﴿سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِي وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ﴾ە کە پێم دراوە[٤]. ئەم تەفسیرەش لەسەعیدی کوڕی جوبەیرو حەسەن و موجاهیدە و قەتادەوە گێڕدار وەتەوە[٥].

هـ- هەروەها وەك ڕوونکردنەوەی مانای أُمَّةً وَسَطًا، کە لە فەرمایشتی: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ البقرة: ١٤٣). لە فەرموودەدا لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەربارەی: ﴿جَعَلْنَٰكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ هاتووە کە فەرموویەتی ﴿ عَدولاً) واتە: ڕاستڕەو و دادگەر[٦]، موجاهید و عطاء و قتادەش[٧] هەمان بۆچوونیان هەیە ئەمە هەندێك بوو لەو

---

[١] - تفسير الطبري(٣ / ٥١٠).

[٢] - البخاری، کتاب: التفسير الفتح(٨ / ٢٩٤).

[٣] - تفسير التابعين(٢ / ٦٣٩).

[٤] - البخاری، کتاب: التفسير الفتح(٨ / ٣٨١).

[٥] - تفسير التابعين(٢ / ٦٤١).

[٦] - مجمع الزائد(٦ / ٣١٦) رواه احمد(٣ / ٩) صحيح.

[٧] - تفسير التابعين(٢ / ٦٤١).

نموونانەی کە شوێنەکەوتوان پشتیان پێ بەستووە لە تەفسیرکردنی قورئاندا بە سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

٣- **ڕاڤەکردنی قورئان بە پێی وتەی هاوەڵان:** شوێنکەوتوان نەیان دەزانی کە چۆن لە قورئان و سوننەت وەشت وەربگرن و ئیجتیهادیش بەهەمانشێوە، ئەگەر لەلایەن هاوەڵانەوە پەروەردە نەکرا یەن و ئەزموونی ئەوانیان وەرنەگرتایە لەبواری بەڵگە هێنانەوەدا و فێربوونی شێوازەکانی دەرهێنانی حوکم و وەرگرتنی ڕیوایەت لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) و بینینی جێبەجێ کردنی کردەیی هەموو ئەو شتانە دا، شوێنەکەوتوانیش لە پەیامی هاوەڵان تێگەیشتن و فەزڵ و پلەوپایەیان دەپاراستن، ئەوەتا موجاهید ئەڵێ: زانایان هاوەڵانی محمد ن(ﷺ) [١].

هەروەها شوێنکەوتوان وتەی هاوەڵانیان پێش وتەی خۆیان دەخست شەعبی ئەڵێت: ئەگەر خەڵکی لەسەر شتێك جیاواز بوون ئەوە سەیر بکە بزانە عومەر چی کردووە؟ چونکە عومەر هیچ کارێکی نەدەکرد هەتاوەکو ڕاوێژی دەکرد، ئەشعەث - کە گێڕەرەوەی ئەمە هەواڵەیە - ئەڵێ: ئەوەم بۆ ئیبن سیرین باس کرد ئەویش وتی: ئەگەر کەسێك پێی وتیت کە ئەو لە عومەرە زاناترە ئەوە ئاگاداری بکەرەوە [٢]. ڕێبازی شوێنەکەوتوانیش بۆ وەرگرتن لە هاوەڵان بەم شێوەیە بوو:

أ- ئەگەر ئەو تەفسیرەی کە هاوەڵێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیکرد بەرزی بکردایەتەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە مەبەستی سەرەکی بوو و هیچ قسەیەکی تر جگە لەوە وەرنەدەگیرا، بەهەمان شێوە ئەگەر ئەو ڕاڤەیە لە خودی هاوەڵەکەشەوە بوایە دەربارەی هۆی دابەزینی ئایەتەکان بەشێوەیەکی ڕاشکاوانە [٣]. هەروەها لەو مەسەلانەشدا کە بواری بۆ ڕادەربڕین و ئیجتیهادی تیادا نەبوو، ئەوە لەسەری دەوەستان و لێی تێپەڕ نەدەبوون، چونکە هاوەڵان لە کاتی دابەزینی ئایەتەکاندا ئامادە بوون، نموونە ئەمەش وەك ئەوەی کە لە تەفسیری فەرمایشتی: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ﴾ الأنعام: ٦١). کە ئیبن عەباس لە بارەیەوە ئەڵێ: فریشتەی گیان کێشان کۆمەڵێ هاوکاری هەیە لەو ناو فریشتەکاندا ئیبراهیم

---

[١] - اعلام الموقعين(١ / ١٥)، تفسير التابعين(٢ / ٦٥١).

[٢] - الحلية(٤ / ٣٢٠)، تفسير التابعين(٢ / ٦٥٣).

[٣] - واتە هۆی دابەزینی ئەو ئایەتە ئەوە و ئەوەیە یان ئەو شتە ڕووی داوو ئەو ئایەتە دابەزی.

ئەمەی لیَ گێڕاوەتەوە [1]، هەر بۆیە ئەم ڕیوایەتە لە تەفسیری خودی ئیبراهیم دا هاتووە بێ ئەوەی هیچی لیَ زیاد یان کەم بکاتەوە و ئەڵێ: هاوکارانی فریشتەی گیان کێشان [2]، بەهەمان شێوەش لە قەتادە و موجاهید و ڕەبیعەوە هاتووە [3].

ب- ئەگەر ئەو تەفسیرەی کە لە هاوڵەکەوە هاتبوو ڕای تایبەت و ئیجتهادی خۆی بوایە و زمانی عەرەبی بیخواستایە ئەوە زۆرجار لایان نەدەدا لیَ ی، چونکە هاوەڵان خەڵکانی زمانپاراو و شارەزا و تێگەشتوون، بۆیە موجاهید تەنها پشتی بە تەفسیر و ڕاڤەکردنی ئیبن عەباس دەبەست لە فەرمایشتی: ﴿فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞ﴾الأنعام: ٩٨). ئیبن عەباس لە ڕاڤەیدا ئەڵێ: ﴿... فَمُسۡتَقَرّٞ...﴾ شوێنی جێنشین بوون لە زەویدا و کە دانراوە لای پەروەردگار [4]، هەروەها لە ڕێوایەتێکی تر لە ئیبن عەباسەوە هاتووە: کە ﴿فَمُسۡتَقَرّٞ﴾ ڕەحمە و ﴿وَمُسۡتَوۡدَعٞ﴾ یش پشتە [5]. ئیبن جبریش بەهەمان شێوە ئەم ئایەتەی ڕاڤە کردووە [6].

ج- ئەگەر وتەی هاوەڵان پێچەوانەی یەکتر بوایە: ئەوە شوێنەکەوتوانی ڕێبازی پێشخستن و فەزڵدانی ڕایەکیان بەسەرڕایەکی تردا دەگرتەبەر، ئەمەش بە پێی زمان یان فەرموودە یان وتەی هاوەڵێکی تر دەبوو کە هەموو ڕاکانی کۆ دەکردەوە، نموونەی یەکەمیش وەك ئەوەی کە لە تەفسیری فەرمایشتی: ﴿أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ﴾ الإسراء: ٧٨). دا هاتووە، لە ئیبن عەباسەوە هاتووە کە ﴿لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ﴾ واتە ئاوابونی خۆر [7]، هەروەها لییەوە هاتووە کە ﴿لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ﴾ واتە: لادانی لە ناوەڕاستی ئاسمان پاش نیوەڕۆ [8]، لە ئیبن مەسعودیشەوە هاتووە کە

---

[1] - تفسير البري(١١ / ٤١٠)، زاد المسير(٣ / ٥٥).

[2] - تفسير الطبري(١١ / ٤١٠).

[3] - تفسير التابعين(٢ / ٦٥٨).

[4] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٦٥٨).

[5] - تفسير الطبري(١١ / ٥٧٠) زاد المسير(٣ / ٩٢).

[6] - تفسير الطبري(١ / ٥٧٠).

[7] - هەمان سەرچاوە(١٥ / ١٣٤).

[8] - فتح القدير(٣ / ٢٥٤).

مەبەست ئاوابوونی خۆرە [١]، هەروەها لێشیەوە هاتووە کە مەبەست لادانی خۆرە لە ناوەڕاستی ئاسمان [٢].

قەتادەش بۆ مانای ﴿لِدُلُوكِ﴾ لادانی خۆری لە ناوەڕاستی ئاسمان هەڵبژاردووە و بەو شێوە ڕاڤەی کردووە [٣]، هەرچەندە لێکدانەوەی بە ئاوابوونی خۆریشی لە ئیبن مەسعودەوە گێڕاوەتەوە [٤]، لەوانەشە هۆی ئەم هەڵبژاردنەش ئەوە بێت کە لە زمانی عەرەبیدا ﴿لِدُلُوكِ﴾ بەلادان لێکدراوەتەوە، کەواتە مەبەست نوێژی نیوەڕۆیە، ئیبن جەریریش ئەمەی بەلاوە بەهێزترە و ڕای یەکەمیشی تاوتوێ کردووە [٥] لەوانەشە ئەم لە پێشتر دانانە بە هۆی(أثر) و شوێنەوارێکی بەرز کراوەوە و بێت لە نموونەی ئەوەی کە لە قەتادەوە هاتووە لە کاتێکدا کەلە سەعیدی کوڕی موسەییەبەوە ئەیگێڕێتەوە، کە وتویەتی: هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جیاواز بوون سەبارەت بە نوێژی(وسطی) و پەنجەکانی کرد بە ناویەکدا [٦]، بۆیە حەسەن پێی وابوو کە نوێژی عەسرە [٧] لەمەشدا شوێن ڕای کۆمەڵێك لە هاوەڵان کەوتبوو بەڵگەشی ئەو(أثر) و شوێنەوارە بەرز کراوەیە کە حەسەن لەسەرەوە ئەیگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی(نوێژی وسطی و ناوەڕاست نوێژی عەسرە) [٨].

هەندێ جاریش پشت بەوتەی هاوەڵێکی تر ئەبەسترێت کە مانای خودی ئایەتەکەی پێش ئەو وتانە خستووە کە لە بارەیەوە هاتوون و هەموو وتەکان پێکەوە کۆ دەکرێنەوە، نموونەی ئەمەش وەك: ڕاڤەکردنی فەرمایشتی: ﴿إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ﴾ الكوثر: ١). لێرەدا ڕاڤەی(ٱلۡكَوۡثَرَ) لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە بەوە هاتووە کە ڕووبارێکە لە بەهەشتدا [٩]، بەڵام ئیبن عەباس پێی وایە کە

---

[١] - زاد المسير(٥ / ٧٢).
[٢] - فتح القدير(٣ / ٢٥٤).
[٣] - زاد المسير(٥ / ٧٢).
[٤] - زاد المسير(٥ / ٧٢).
[٥] - تفسير الطبري(١٥ / ١٣٦، ١٣٧).
[٦] - زاد المسير(١ / ٢٨٢).
[٧] - تفسير التابعين(٢ / ٦٦١).
[٨] - تفسير الطبري(٥ / ١٩٤) ژمارە ٥٤٣٨.
[٩] - زاد المسير(٩ / ٢٤٨).

ٱلْكَوْثَرَ ) ئەو خێرە زۆرەیە کە خوا بە پێغەمبەر(ﷺ)ی بەخشیوە [1] و سەعیدی کوڕی جوبەیریش پاش ئەو هاتوە و هەمان ڕای هەبووە، ئەبو بشر بە سەعید ئەڵێ: بیستبومان کە الْكَوْثَرَ ڕووبارێکە لە بەهەشتدا لەو خێرەی کە خوا پێی بەخشیوە [2].

لێرەشدا ئیبن جوبەیریش مانای گشتی ئایەتەکەی پێ بەهێز ترە بە پشت بەستن بەوتەکەی ئیبن عەباس و گوێی بەو أثر و شوێنەوارە نەداوە کە لە بارەیەوە هاتووە، بەلاَم ئەگەر شتێکیان دەست نەکەوتایە لە هاوەلاَنەوە، ئەوە خۆیان ئیجتیهادیان دەکرد [3].

ئەم گێڕانەوە لە هاوەلاَنەوە و پشت پێ بەستن ی لە ڕاڤەکردندا بووە هۆی دەرکەوتنی چەند دەرەنجام و شوێنەوارێك لەوانە پاراستنی ڕووداو و بەسەر هاتەکانی هاوەلاَن و زانینی باردۆخیان بەوردی و جیا کردنەوەیان و پابەندبوون بە ڕێبازیانەوە و سوود لێ وەرگرتنی و پابەند بوون بە ڕاکانیانەوە [4].

٤- **زمانی عەرەبی:** شوێنکەوتوان ڕای جیاوازیان هەبووە لە بارەی سوود وەگرتن لە زمان ودانانی بەسەرچاوەیەك لەسەرچاوەکانی تەفسیر، ئەمەش لەبەر چەند هۆیەك لەوانە زانینی داب و نەریت و بەسەرهاتەکانی عەرەب و شارەزا بون لە شیعری عەرەب و تێگەشتن لە زمان لەڕووی پێش خستن و پاش خستن و لابردن و کورتبڕی و ئیشتیقاق و چەند هۆکارێکی تر [5].

٥- **ئیجتیهاد:** ئیجتیهادەکانی شوێنکەوتوان لە تەفسیردا دوای سەردەمی هاوەلاَن دەرکەوت و، چەندین بوارو لایەنی گرتەوە و زۆربەشی لەو بابەتانە بوو کە هاوەلاَن لێ بێدەنگ بوون و گرنگترنیان:

أ- ڕوونکردنەوەی مەبەستی دەق کە، ئەگەر مەبەستەکەی ناڕوون بوایە بەهۆی گشتی بوونی وشەیان پێکاتەکەیەوە.

---

[1] - الدر المنثور(٨ / ٦٤٩).

[2] - زاد المسير(٩ / ٢٤٨).

[3] - تفسير التابعين(٢ / ٦٦١).

[4] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٦٧٢ بۆ ٦٧٧).

[5] - هەمان سەرچاوە(٢ / ٦٨٩ بۆ ٧٠٧).

ب- هەڵگۆزینی هەندێ حوکم لە دەقە قورئانیەکان.

ج- ڕوونکردنەوەی جیاوازی لە نێوان ئەو وشە و مانایانە دا کەلە یەك دەچن و تەفسیرکردنی هاوشێوەکانی بەیەکتر.

د- گرنگیدانی زۆر بە وردەکاریەکانی زانستی قورئانی پیرۆز، وەك ژمارەی ئایەتەکان و وشەکانی قورئان و هتد [1]، ئیجتیهادی شوێنەکەوتوانیش لە تەفسیری ئایەتەکاندا چەند تایبەتمەندیەکی هەبوو لەوانە:

- جۆراوجۆری و هەمەچەشنی دەستەواژەکانی ئیجتیهاد.
- کورتبریەك کە نەبێتە هۆی تێکدانی مانا.
- قوڵی بیرکردنەوە و وردی ڕاڤەکردنی.
- بەهێزی هەڵگۆزینی حوکمەکان.

## پێنجەم: هەوڵەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز و شوێنکەوتوان – تابعین – بۆ خزمەتکردنی سوننەت:

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەرەتادا نەهی کرد لە نووسینەوەی شتێکی تر جگە لە قورئان هەتاوەکو لەگەڵ قورئاندا تێکەلاّ و نەبێت و خەڵکی سەرقاڵ نەبن پێوەی، پاشان پێغەمبەری خوا(ﷺ) مۆڵەتی نووسینەوەی فەرموودەی پیرۆزی دا و ڕێگری پێشووی هەڵوەشاندەوە و ڕێی دا بە نووسینەوەی فەرموودە [2].

سەلماویشە کە زۆرێك لە هاوەڵان ڕێیان داوە بە نووسینەوەی فەرموودە و لای خۆشیان نووسیویانەتەوە و قوتابیەکانیشیان لەبەردەستیاندا ئەم کارەیان کردوە و بەردەوام بوون لەسەر نوسینەوە و لەبەرکردنی فەرموودە [3]، هەڵکەوتوانی بواری زانست و خەڵکانی لێبڕاو و خەمخۆریش هەستان بە خستنە گەڕی هەوڵێکی زۆر بۆ نووسینەوەی سوننەتی پاك و کۆکردنەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پاککرنەوەی لە خلتە و خاڵ بۆ ئەم مەبەستەش شەویان دەخستە سەر ڕۆژ و چەندین بنەما و یاسایان لەم بوراەدا دانا و ئەو هەوڵە پیرۆزانەش ئەو هەموو دیوانە مەزنەی

---

[1] - تفسير التابعين(٢ / ٧١١).

[2] - عومەری کوڕی عبدالعزیز، عبدالستار الشيخ، ل: ٧٤.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٥.

لێکەوتەوە کە موسڵمانان ئێستا دەیخوێننەوە و کاری پێ دەکەن و فەزڵیش لەم بوارەدا پاش خوای گەورە بۆ ئەو زانا و هاوەڵە بەڕێزانەیە کە سەرقاڵ بوون بە نووسینەوە و گواستنەوەی هیچ پاداشتێکیش ناتوانێ قەرەبووی ئەو کارەیان بۆ بکاتەوە جگە لە پاداشتی خوایی فراوان لە ڕۆژی قیامەتدا [1].

ڕەنگە نۆبەرەی نووسینەوەی فەرمی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە لایەنێکی بەرپرسیار لە دەوڵەتی ئیسلامیدا پێی هەستابێت لەسەر دەستی عبدالعزیزی کوڕی مەڕوانی باوکی عومەر بووبێت(رضي الله عنه) کاتێ کە ئەمیری میسر بوو وەك پێشتر باسمان کرد، بەڵام ئەو نووسینەوەیەی کە بەرهەمدار بوو ئەوە بوو کە عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی هەستا، ئەمەش لە ڕێنماییەکانی دا دەردەکەوێت بۆ نووسینەوە زانست و فەرموودە و فرمانە کانی بۆ کەسانی تایبەت و گشتی لەو بوارەدا ئەوەتا لە ڕێنماییەکیدا ئەڵێ: خەڵکینە زانست بکەنە هاوتای سوپاسگوزاری و بینوسنەوە [2]، بەڵام ئەمیری باوەڕداران تەنها بەم ڕێنماییە گشتیە و هاندان بۆ نووسینەوەی زانست وازی نەهێنا، بەڵکو بە حوکمی ئەوەی کە خەلیفەی موسڵمانان بوو هەستا بە فرمانکردن بە هەندێ لە پێشەوایان بۆ کۆکردنەوەی سوننەت و فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پاڵنەریشی لەم بوارەدا ئەو ڕێ پێدانە بوو کە لە زۆرێك لە شوێنکەوتوان تابعین ەوە بینیبووی بۆ نووسینەوەی فەرموودە لەگەڵ ئەو زانیاریە زۆرەی کەهەیانبوو بۆیە عومەر لە تیاچوونی فەرموودەکان دەترسا، چونکە هەمیشە خەڵکانی بیرتیژ و بەهێز لەبواری لەبەرکردندا ئامادەنین بۆ گواستنەوە و پاراستنی بە جۆرێك کە پێویست بە نووسینەوە نەکات ئەمە جگە لە هۆکارێکی تری سەرەکی کە ئەویش بڵاوبوونەوەی دانانی فەرموودە و دزە کردنی فەرمودەی هەڵبەستراو و تێکەڵکردنی لەگەڵ فەرموودەی صحیح دا ئەمەش بەهۆی ناکۆکیە سیاسی و مەزهەبیەکانەوە وەك پێشەوا زوهری ئاماژەی پێ دەدات و ئەڵێ: ئەگەر بەهۆی ئەو فەرموودانەوە نەبێ کەلە ڕۆژهەڵاتەوە دێن و نایناسینەوە ئەوە هەرگیز ڕێم بە نووسینەوەی فەرموودە نەدەدا و خۆشم نەمدە نوسیەوە [3].

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٥.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٦.

[3] - عمر بن عبدالعزیز، عبدالستار الشیخ، ل: ٧٧.

ئەم ڕایەی زوهری یش ڕای زۆرێك لە زانایانی ئەو سەردەمە بوو کە مەترسی فەوتانی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) یان هەبوو یاخود لە تێکەڵ بوونی دەترسان لەگەڵ فەرموودەی هەڵبەستراودا، ئەمەش زانایانی سوننەتی هان دا بۆ نووسینەوە و ڕای دەسەلاتی بالآش کە خەلیفەی خواناس و زانای موجتەهید بوو هات و هەنگاوێکی یەکلاکەرەوەی هەڵگرت و بڕیاری نووسینەوەی سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دا و پاراستنی سوننەتی کردە ئەرکی دەوڵەت [1]، ئەمەش هەوڵ و هەنگاوەکانیەتی لەم بوارەدا:

١- نامەیەکی نارد بۆ پێشەوای هەڵکەوتوو ئەمیری مەدینە و زاناترین خەڵکی سەردەمی خۆی لە قەزادا: ئەبی بەکری کوڕی حەزم و فەرمانی پێکرد بەهەستان بەو کارە، ئەوەتا لە صحیحی بوخاری داهاتووە: عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ ئەبوبەکری کوڕی حەزم، کە بە دوای فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بگەڕێ و بینوسەرەوە، هیچ شتێکی تر نەنووسیت جگە لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، زانستیش بلاو بکەنەوە و دانیشن بۆ فێرکردنی خەڵك، چونکە زانست کاتێ دەفەوتێ کە نهێنی بێت [2].

هەروەها ئیبن سەعد لە عبداللە ی کوڕی دینارەوە ئەیگێڕێتەوە و ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ ئەبوبەکری کوڕی محمدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم کە تیادا هاتبوو سەیر بکە بزانە چ فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) یان سوننەتێکی پێشینان یان فەرموودەی عمرەی کوڕی عبدالرحمن هەیە بینوسە، چونکە من لە فەوتانی زانست و تیاچوونی هەڵگرانی دەترسم [3].

٢- هەروەها نامەیەکی لەم بارەیوە نووسی بۆ پێشەوا ئیبن شەهابی زوهری: ئیبن عبدالبر لە ئیبن شەهابەوە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز فەرمانی پێکردین بە کۆکردنەوەی سوننەت، ئێمەش دەفتەر دەفتەر نووسیمان و بۆ هەر ناوچەیەکی ژێر دەسەلاتی دەفتەرێکی نارد [4]، هەروەها ئەبو عوبەید ئەیگێڕێتەوە کە عومەر فەرمانی دا بە ئیبن شەهاب کە دەقەکانی

---

[1] - اصول الحديث، محمد عجاج الخطيب، ل: ١٧٦ — ١٧٧. ١٨٦.

[2] - فتح الباري(١ / ١٩٤ — ١٩٥).

[3] - الطبقات، أصول الدين، ل: ١٧٧ — ١٧٩.

[4] - جامع بيان العلم،(١ / ٩١ — ٩٢).

سوننەت سەبارەت بەو هەشت توێژە بۆ بنووسێت کە زەکاتیان پێ دەشێت و زوهریش داواکەی جێبەجێ کرد و نامەیەکی دوورودرێژی بۆ نووسی و بەوردی بۆی ڕوونکردەوە [1] لێرەشەوە ئیبن حەجەر ئەڵێ: یەکەم کەسێك کە فەرموودەی نووسیوە ئیبن شەهابی زوهری بوو لەسەری سەد ساڵی یەکەمی کۆچیدا بەفەرمانی عومەری کوڕی عبدالعزیز، پاشان نووسین و دواتر دانانی کتێب زۆر بوو و خێر و بێرێکی فراوانی لێکەوتەوە سوپاس بۆ خوا [2].

٣- عومەر فەرمانی کرد بە خەڵکی مەدینە بەگشتی و هانیدان بۆ نووسینەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ): هەموو ئەوانەی کە زانیاریان هەبوو بەشداریان تیادا کرد ئەگەرچی بە چەند فەرموودەیەکی کەمیش بێت، ئەوە بوو عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ خەڵکی مەدینە کە بە دوای فەرموودەی دابگەڕێن و بینوسینەوە، چونکە من لە نەمانی زانست و تیاچوونی هەڵگرانی ئەترسم [3].

٤- عومەر تەنها بەمەشەوە نەوەستا، بەڵکو ئەم فەرمانەی گشتاند بۆ هەموو ناوچەو شارەکان ی دەوڵەتی ئیسلامی، هەتاوەکو هەموو زانایەك هەستێت بە کۆکردنەوەی ئەو فەرموودانەی کەلایەتی یان لە هاوەڵانی بەڕێزی بیستووە [4]، هەروەها ئەیگێڕێتەوە کە وتویەتی : بە دوای فەرموودەی پێغەمبەردا بگەڕێن و کۆی بکەنەوە و لەبەری بکەن، چونکە من لە نەمانی زانست و تیاچوونی هەڵگرانی ئەترسم [5].

هەروەها عومەر(ﷺ) گرنگی دەدا بە زمانی عەرەبی وهانی خەڵکی وڵاتە ئازادە کراوەکانی دەدا بۆ فێربوون و زانینی و بەخششی پێدەدان بۆ ئەو مەبەستە، هەروەك سزای ئەو کەسەی دەدا کە هەڵەی بکردایە لە زماندا و بەخشش و موچەی کەم دەکردەوە، ئەمەش بەهۆی گرنگی زمانی عەرەبی بۆ تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) [6].

---

[1] - الاموال، ل: ٢٣١ – ٢٣٢).

[2] - فتح الباري(١ / ٢٠٨)، أصول الحديث، ل: ١٧٨، ١٨٠.

[3] - سنن الدارمي(١ / ١٣٧).

[4] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ، ل: ٧٩.

[5] - فتح الباري(١ / ١٩٥)، اصول الحديث، ل: ١٧٨.

[6] - عمر بن عبدالعزيز للشرقاوی، ل: ١٧٨.

**•ڕێباز و شێوازی نووسینەوەی فەرمووده لەلای عومەری کوڕی عبدالعزیز:**

عومەر(ﷺ) بۆ کۆکردنەوە و نووسینەوەی فەرمودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێبازێکی دروستی گرتەبەر و چەندین مەرجی توندی دانـا و چـەندین ڕەهەنـدی ئامانجـداری بەسـوودی دیـاری کـرد، ئەمەش لە چوار شتی گرنگدا دەردەکەوێت:

١- باش هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی کە سەرپەرشتی ئەم کارە دەکەن: بۆ نموونە ئەبوبەکری کـوڕی حەزم یەکێکە لـە شادەمارەکانی زانست و کەسە ناودارەکانی سـەردەمی خـۆی ئیمـام مالیـك دەربارەی ئەڵێت: کەسم نەبینیوە هێندەی ئیبن حەزم جوامێر و تەواو بێت و کەسیشم نـەبینیوە هێندەی ئەو بەهرەمەند بێت و پۆستی گرنگی پیٚ سپێردرا بێت.

بۆ نموونە پۆستی والی مەدینە و دادوەری و حەج ی پیٚ سپێردرا بوو و ئـەڵیٚ: پیـاوێکی ڕاسـتگۆ بوو فەرموودەی زۆری لابوو، ئیبن سەعدیش ئەڵیٚ: متمانە پێکرا و زانا و گەورە بو لە فەرموودەدا لە ساڵی ١٠٢ ك کۆچی دوایی کرد [1]، هەرچی زوهریشە ئـەوە زانـای نـاودار و کـەورەی سـەردەمی خۆی بووە و ناوبانگی هەموو جێیەکی گرتبوویەوە، لیث ی کوڕی سەعد ئەڵێت:

هیچ زانایەکم نەبینیوە کە هێندەی ئیبن شەهاب زیرەك بێت و فەرموودەی لە بـواری مـژدەدان و ترساندن دا(ترغیب و تدریب) دا زۆر بێت بە جۆرێك کە دەتوت: جگـە لـە ئـەم کـەس بـاش نیـە، ئەگەر باسی عەرەب و ڕەچەڵەکیشیانی بکردایە ئـەتوت تـەنها ئەمـە باشـە، ئەگـەر باسـی قورئـان و سوننەتیش ی بکردایە، ئەوە تەنها قسەی ئەو بە جیٚ بوو، عومەری کوڕی عبـدالعزیز ئـەڵیٚ: شـوێن ئیبن شەهاب بکەوە، چونکە کەسێك نەماوە هێندەی ئەو شارەزای سوننەت بێت.

٢- داوای لەوکەسانە کرد کە سوننەتی بۆ دەنووسنەوە کە هەموو فـەرموودەکان کـۆ بکەنـەوە و بینوسنەوە: بە دواداچوونی بۆ کەسـانی تایبـەت دەکـرد بـەهۆی ئـەوەی کـە ناسـرابوون بـە نووسینەوەی جۆرە فەرموودەیەکی دیاری کراو لەبەر گرنگی ئەوە بوو فەرمانی کرد بـە ئـیبن حەزم بە نووسینەوە فەرمووەدەی عەمرەی کوڕی عبدالرحمن ن چونکە نزیکترین و شـارەزاترین کەس بوو لە عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە و خاتوو عائیشەش شارەزاترین کەسە لە پێغەمبـەر

[1] - سیر اعلام النبلاء(٥ / ٣١٣ – ٣١٤).

و کاروباره تایبەتەکانی لەناو ماڵ و لەگەڵ خێزانەکانیدا [1]. ئـەم عومرەیـەش: عـومرەی کـچی عبدالرحمن ی کچی سەعدی کچی و زورارەی ئەنساری نەجاری مـەدەنی زانـا کـە قوتـابی و پەروەردە کراوی دەستی عائیشە بوو، سەعدی با پیریشی لـە هاوەڵـە پێـشینەکانی پێغەمبـەری خوایە(ﷺ)، هەروەك برای نەقیبی گـەورە ئەسـعەدی کـوڕی زورارەیـە ئـیبن مـەدەنی باسـی دەکات و زۆر بـە گـەورەیی نـاوی دەهـێنێ و ئـەڵێ: عـومرە یەکێکـە لـە متمانـە پێکـراو و شارەزایان دەربارەی عائیشە [2]. هەروەها زوهری ئەڵێ: سەردانم کرد بینـیم دەریایـەکی لـەبن نەهاتووە [3]، لە ساڵ ۹۸ ك و ئەڵێن ۱۰۶ ك کۆچی دوایی کردووە [4].

یەکێك لە ڕیوایەتەکانیش باس لەوە دەکات کە فـەرمانی کـردووە بـە ئـیبن حـەزم کـە هەرچـی دەربارەی عومەری کوڕی خەتتاب نووسراوە کۆی بکاتەوە، چونکە عومـەر زۆر مەبەسـتی بـوو کـە شوێن بڕیارەکانی فاروق و سیاسەتی سەبارەت بە خێـر و بەخـشین و صـدقات بکـەوێت. هـەروەها نامەیەکی لەم بارەیەوە نووسی بۆ کار بەدەستانی و هەمان داواشی ئاراستەی سالمی کوڕی عبـدالله ی کوڕی عومەر کرد(رضي الله عنه)، هەموو ئەمەش لەو ڕێبازە وە دەردەکەوێت کە عومەری کوڕی عبـدالعزیز گرتیەبەر بۆ شوێن پێ هەڵگرتنی باپیری – واتە عومەری کوڕی خطاب(رضي الله عنه) [5]، هـەروەها نامەیـەکی نووسی بۆ بنەماڵەی عومەری کوڕی حەزم کە نامەکەی پێغەمبەری خوام(ﷺ) بۆ بنوسنەوە سەبارەت بە بەخشین و صدقات، هەتاوەکو لە خیلافەت و بەڕێوەبردنی کاروباری ژێر دەسـتەکانیدا لەسـەری بڕوات [6].

٣- هەروەها نووسەرانی سوننەتی ڕاسپارد، بەڵکو پابەندی کـردن بـە جیـا کردنـەوەی ڕاسـت و ناڕاسـت و لاواز: عومـەر(رضي الله عنه) پـشکنینی بـۆ فـەرمووده دەکـرد، ئەمـەش بـەڕوونی لـە ڕیوایەتەکەی دارمی دا دەردەکەوێت کە عومەر تیایدا بە ئیبن حەزم ئەڵێت: ئـەوەی کـە لێـی

---

[1] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٣٢٨)، عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ، ل: ٨٠.

[2] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ، ل: ٨١.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨١ تهذيب التهذيب(١٢ / ٤٦٦).

[4] - سير اعلام التبلاء(٤ / ٥٠٨). نساء لها تاريخ، ل: ١٥٥.

[5] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ، ل: ٨١.

[6] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ، ل: ٨١.

دڵنیایت لە فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و فەرموودەی عەمرە(ﷺ) لای پێشەوا ئەحمەدیش لە العلل دا هاتووە: ئەو فەرموودانەی پێغەمبەری خوام(ﷺ) بۆ بنووسە کە لێی دڵنیایت لەگەڵ فەرموودەی عەمرەدا [1]، ئەمەش خاڵێکی زۆر گرنگە بۆ دامەزراندنی ڕێبازی نووسینەوە لەسەر بناغەیەکی تۆکمە و ڕاست و دروست[2].

٤- بە دواچوونی بۆ ڕاستی فەرمودە و گێڕانەوەی: دیارە عومەر یەکێکە لە گەورە زانایان ن و کەمتر نەبووە لە ڕووی زانستیەوە لەوانەی کە داوای نووسینەوەی فەرموودەی لێکردوون، هەر بۆیە هەستا بە بەشداری کردن لەگەڵ زانایانـدا لە تاوتوێ کردنی هەندێك لەو فەرموودانەی کە کۆیان دەکردەوە بۆ دڵنیابوونی زیاتر [3]. لەم بارەشەوە ئەبوو زەناد عبداللە ی کوڕی زەکوانی قورەیشی ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیزم بینی زانایانی کۆکردەوە و ئەوانیش چەند سوننەتێکیان بۆ کۆکردەوە ئەگەر شتێکی ببینیایە کە کاری لەسەر نەبوایە ئەیوت: ئەمە زیادەیە و کاری پێ ناکرێت [4].

● بەرهەمی ئەم نووسینەوەیە: ئەم هەوڵە بەراییە پیرۆزانە هەندێ بەروبوومی هەبوو، ئەمەش خۆی لەو دەفتەرانەدا دەبینێتەوە کە پێشەوا زوهری کۆی کردەوە، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش فەرمانی نوسینەوەی چەند دانەیەکی دا، پاشان هەر دانەیەکی لێنارد بۆ ناوچەیەك، تێبینی ئەوەش دەکرێت کە هەموو زانایەك ئەو فەرموودانەی کۆ کردەوە کە خۆی بیستبووی، هەتاوەکو لەکاتی لەبیر چوونەوەیدا بۆی بگەڕێتەوە، هەرچی نووسینەوەی فەرمیشە کە دەوڵەت پێی هەڵدەستا و بەهەرمیشی بەسەر ناوچەو شارەکاندا بلاو کردەوە، ئەوە بەهەمان شێوە بەفەرمانی عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو، هەروەها لەوبەروبوومە باشانەش ئەو ڕێبازە دروستە بوو کە عومەر گرتیەبەر بەهەستانی بەدانانی خاڵە گرنگەکان لە کاتی نووسینەوەدا ئەمەش بووە ناوکێك بۆ ڕێبازێکی بەرفراوان و هەملایەن کە دوای خۆی دەرکەوت، ئەمەش هەمووی لە وردی و تێگەشتوویی و زۆری زانست و دووربینیەوە سەرچاوەی گرتووە لەگەڵ

[1] - لە پێشەکی مسندەوە، ل: ٢٠، ٢٣ ز

[2] - عمر بن عبدالعزیز، عبدالستار الشیخ، ل: ٨٢.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨٢.

[4] - اصول الحدیث، ل: ٨٢.

کۆمەکی پشتیوانی پەروەردگار بۆی، جا ئەگەرچی عومەری کوڕی خەتاب ڕێنمایی ئەبوبەکری کرد بۆ کۆکردنەوی قورئان و ئەویش جێبەجێ کرد و هەردووکیان فەزڵی زۆریان بۆ خۆیان بەسەر ئومەتەوە تۆمار کرد، پاشان عوسمان هات و خەڵکی لەسەر یەك نوسخە قورئان یەك خوێندنەوە کۆ کردەوە کە ئەویش شێواز و خوێندنەوەی قورەیشە، ئەوە خوای پەروەردگاریش ئەم پلەوپایە مەزنەی بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز هێشتەوە و خەلاتێکی مەزنی پێ بەخشی بە هۆی فەرماندنی بە کۆکردنەوە و پاککردنەوە و نووسینەوەی سوننەت و دەوڵەتی کردە پاسەوانی سوننەت کە سەرچاوەی دووەمی تەشریع و یاسادانانە ،ئەمەش کۆمەکی و تەوفیقی خوایە بۆ زاناپایە بەرزەکان و گەورە چاکسازان کاتێك کە خۆیان بۆ پەروەردگار یەکلا دەکەنەوە و دڵسۆزانە کاری بۆ دەکەن ئەویش کۆمەکی و پشتیوانی هەنگاوەکانیان دەکات و ڕێی چاکەیان نیشان دەدات و دەروازەی خێریان لێ دەکاتەوە [1].

شاعیری لیبی ئەحمەد ڕەفیق ئەلمەهدەوی ئەڵێت:

فاذا احب الله باطن عبده ظهرت عليه مواهب الفتّاح

و اذا صفت لله نية مصلح مال العباد عليه بالا رواح [2]

ئەم نووسینەوە فەرمیەش دادەنرێت بە یەکێك لەکارە مەزن و دەستکەوتە گەورەکان کە لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا(ﷺ) بە دەست هاتووە [3].

● هەوڵەکانی شوێنکەوتوان – تابعین – بۆ خزمەتکردنی سوننەتی پاکی پێغەمبەری خوا(ﷺ): – تابعین – شوێنکەوتوان فەرمودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) یان گرتە ئەستۆ لە هاوەڵانەوە سەنەدیان بەباشی لەبەر کرد بوو، فەرمودەیان وەك ئەمانەتێك لەگەردنیاندا وەرگرتبوو کە پێویستە لەسەریان هەوڵ بدەن بۆ گەیاندنی بە خەڵکانی تر بەتایبەت کە لەسەردەمی ئەواندا ناکۆکی سیاسی و کەلامی دەرکەوت بەهۆی ئەو بێ باوەڕیەی کە خۆی لە خۆ پیشان دان وەك موسڵمان دادەبینیەوە لەگەڵ رق لێ بوونی وەك ئاین و دەوڵەت، هەروەها بەهۆی دەمارگیری بۆ ڕەگەز و زمان و هۆز و وڵات و بەهۆی پارەپەیدا کردن لە ڕێی تۆڵەسەندنەوە

---

[1] - الثمار الذكية للحركة السنوسية، ل: ١٩٨.

[2] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ، ل: ٨٣.

[3] - التابعون وجودهم في خدمة الحديث النبوي للشايجي، ل ٥٤، ئەمە نامەیەکی بچوکە بەلام زۆر بەنرخە.

و ئامۆژگاری و بەهۆی نەمانی هەندێ لـە زاهیـد و خواپەرستەکان و چـەندین هـۆی تـرەوە دانانی فەرموودە سەری هەڵدا، ئەوانیش لەم کاتەدا هەستانەوە و ئـەرکی خۆیـان لـە ئەستۆ گرت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی درۆزن و ئەوانەی کە فەرموودە یان هەڵدەبەست، لەم بوارەشدا چەندین هـەوڵی مـەزن و سوپاسـکراو وبـەدی دەکرێـت کـە ئـەتوانین لـەم خالآنـەدا کـۆی بکەینەوە:

١- **پابەندبوون بەسەنەدو داواکردنی لە کەسانی تر:**

أ- ئیبن سیرین ئەڵێ: پرسیاریان لە سەنەد نەدەکرد، بـەڵام کـاتێ ئـاژاوە ڕووی دا وتیـان: نـاوی پیاوەکانتان بڵێن: جا هەر چی لـە ئەهلی سوننەت بوایە قسەیان وەردەگیرا و هەکەرسێکیش لـە ئەهلی بیدعە بوایە فەرموودەیان ڕەت دەکرایەوە [1].

ب- لە عتبەی کوڕی ابی الحکم وەهـاتووە: کـە ئـەو لای ئیـسحاقی کـوڕی ابـی فـروە بـووە و زوهریشی لابووە، ئەڵێ: ئەبو فروە ئەیوت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) زوهریش پێی وت: خـوا لـە ناوت بەرێت ئەی کوڕی ابی فروە چەند بێ شەرمی بەدامبەر بەخوا، سەنەد بۆ فەرموودەکـەت دانانێیت، فەرموودەمان بۆ باس دەکەیت کە هیچ ئەسلێکی نیە [2].

٢- **بەستنی ئەڵقەی زانستی:** ئیبن سیرین ئەڵێ: هاتم بۆ کوفە و شەعبی ئەڵقەیەکی زانستی مەزنی هەبوو و هاوەڵانیش لەو ڕۆژەدا زۆربوون [3]. لە ئیبن شەهابیـشەوە ئـەڵێ: ڕۆژانـە سـەعید ی کوڕی جوبەیردوجار باسی بۆ دەکردین دوای نوێژی بەیانی و عەسر [4].

٣- **سووربوون لەسەر گەیاندنی فەرموودە وەك خۆی:** واتە گێڕانەوەی بەو شێوازەی کـە هـاتووە، ئەگەر ئەمەیان بۆ نەکرایەو ئەوە ماناکەیان دەگێڕایەوە، بـەڵام ڕەچـاوی مـەرج و ڕێکخـەرە – ضوابط – دیاریکراوەکانیان دەکرد [5].

---

[1] - مسلم في مقدمة، باب بيان الاسناد من الدين(١ / ١٥).

[2] - معرفة علوم الحديث للحاكم، ل: ٦.

[3] - تاريخ الاسلام، ل: ١٢٦ حوادث ١٠٤ ك.

[4] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٣٣٦).

[5] - التابعون وجوهدهم في خدمة الحديث النبوي، ل: ٥٨.

هەروەها لە ابن عونەوە ئەڵێ: ئیبراهیم وشەعبی و حەسەن مانای فەرموودەکانیان دەهێنا، بەڵام قاسم و ئیبن سیرین و ڕەجاءمان وشەی فەرموودەکەیان دەگێڕایەوە [1]. هەروەها لیثی کوڕی ابی سلیم ئەڵێ: طاوس فەرموودەی وشە بەشە دەژمارد [2]، جریری کوڕی حازمیش ئەڵێ: گوێم لەحەسەن بوو فەرموودەی دەگێڕایەوە ئەسڵەکەیان یەك بوو، بەڵام وشەکان دانراو بوون.(مانایان یەك و وشەکان جیاواز بون) [3].

**٤- دانانی پێوەری زانستی بۆ زانینی باری گێڕەرەوە و - حال الراوي - لە ڕووی ڕەخنە و ڕاستکردنەوەوە - جرح و تعدیل -:**

- وەك بەراورد کردنی ڕیوایەتی ئەو کەسانەی کە لەبەریانە لەگەڵ یەکدا، وەك ئیبن شەهاب زوهری ئەڵێ: ئەگەر عەمرە و عروە فەرموودەیان بۆ بگێڕامایەتەوە ئەوە فەرموودەکەی عەمرە ڕاستی فەرموودەکەی عروەی بۆ دەسەلماندم کاتێ تاقیم کردنەوە بینینم عروەش دەریایەکی بێ بنە [4].

- بەراورد کردنی ناو بەناوی فەرموودەی گێڕەرەوە بە فەرموودەکەی خۆی: جارێکیان هشامی کوڕی عبدالملك ویستی دڵنیابێت لە لەبەرکردنی زوهری، بۆیە خودی خۆی هەستا بە تاقیکردنەوەی و داوای لێکرد کە فەرمودە بۆ کوڕەکەی بنووسێتەوە ئەویش چوار سەد فەرموودەی پێ نوسیەوە، پاشان هشام دوای مانگێك پێی وت: ئەبو بەکر نامەکە ون بووە، ئەویش نامەیەکی تری هێناو دووبارە نووسیەوە، هشامیش لەگەڵ کتێبی یەکەمدا بەراوردی کرد و بینی یەك وشەی نەپەڕاندوە [5].

- یان بەهەڵگەڕاندنەوەی سەنەد و مەتنەکان: وەك لە حمادی کوڕی سەلەمەوە هاتووە ئەڵێ: بیستم کە گێڕەرەوەکان باش فەرموودەیان لەبەر نیە، منیش فەرموودەکانم وەردەگێڕا بۆ ثابت

---

[1] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٥٥٩).

[2] - هەمان سەرچاوە.

[3] - الجامع الاخلاق الراوي و آداب السامع(٢ / ٢١).

[4] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٤٣٦).

[5] - السنة و مكانتها في التشريع، ل: ٢٠٩.

و، ئەنەسم دەکرد بە ئیبن ابی لیلی و بە پێچەوانەوە سەرم لێ دەشێواند، بەڵام ئەو هەمووی بەڕاستی دەوتەوە [1].

- ناسینی بیدعەچی بە پشت هەڵکردنی لە سوننەت بۆ قورئان: لە ابی قلابە وە ئەڵێ: ئەگەر سوننەتت بۆ یەکێك باس کردووە وتی: واز لەوە بێنە و وەرە بۆ قورئان ئەوە بزانە کە گومڕایە[2].
- پێویستی لەبەرکردنی قورئان پێش سەرقاڵ بوون بە سوننەتەوە: لە حفصی کوڕی غیاث ەوە ئەڵێ: هاتم بۆلای ئەعمەش وتم: قسەم بۆ بکە، وتی: ئایا قورئانت لەبەر؟ وتم نەخێر، وتی: بڕۆ قورئان لەبەر بکە پاشان وەرە با قسەت لەگەڵدا بکەم، ئەڵێ ڕۆشتم و قورئانم لەبەرکرد، پاشان چوومەلای و پێی خوێندمەوە، منیش بۆم خوێندەوە ئینجا قسەی بۆ کردم.

**٥- وەڵامدانەوەی ئەوانەی کە پێویستیان بەفتوا هەیە و دادوەری کردن لە نێوان خەڵکدا:**

وەڵامدانەوەی ئەو خەڵکەی کە پێویسیان بە فتوا بوو و دادوەری کردن لە نێوانیاندا بەشێك بوو لە هەوڵەکانی شوێنکەوتوان بۆ خزمەتکردنی سوننەت، ئەوە بوو عەقلەمەی کوڕی قەیسی نەخعی چەند پێشەوایەکی وەك ئیبراهیم شەعبی پێگەیاند و دوای عەلی و ئیبن مەسعود پێشەوایەتی و فتوادانی لە ئەستۆ گرتبوو، لە هەڵسوکەوت و ڕەوشتیشیدا لە ئیبن مەسعود دەچوو و قوتابیەکانیشی پرسیاریان لێ دەکرد و لێیەوە فێردەبوون لە کاتێکدا کە هێشتا هاوەڵان مابوون [3].

هەروەها لە ابی الزنادەوە ئەڵێ: ئەو حەوت زانایەی کە لە مەدینەدا پرسیاریان لێدەکراو ڕایان وەردەگیرا بریتی بوون لە: سەعیدی کوڕی مسیّب و ئەبو بەکری کوڕی عبدالرحمن، و عروە و قاسم و عبیدیالله کوڕی عبدالله و خارجەی کوڕی زید و سلیمانی کوڕی یسار [4]، گومانیش لەوەدانیە وەڵامدانەوەی خەڵك و داوەری کردن لە نێوانیاندا پێویستی بە هەوڵ و کات و پارەیەك

---

[1] - سیر اعلام النبلاء(٥ / ٢٢٢).

[2] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٧٤٢).

[3] - المحدث الفاصل: باب أوصاف الطالب و آدابة، ل: ٢٠٣.

[4] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٤٣٨).

هەیە بۆ خۆ ئامادەکردن و خۆسازدان و ئەنجامدانی کارەکان [1] و لەگەڵ پاڵدانەوە و پشوودان دا ناگونجێ.

٦- ڕوونکردنەوەی باروحاڵەتی گێڕەرەوەکان بۆ ناسینی ئەو کەسانەی کە فەرموودەمان وەردەگرێت و ئەوانەی کە فەرمودەیان وەرناگرێت[2].

یەکێکی تر لە هەوڵەکانی شوێنکەوتوان بۆ خزمەتی سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بریتی بوو لە ڕوونکردنەوەی باری گێڕەرەوەکان(ڕاویەکان) بۆ زانینی ئەوانەی کە فەرموودەیان وەردەگیرێت ئەوانەی کە فەرموودەیان وەرناگیرێت.

أ- لە محمدی کوڕی سیرینەوە ئەڵێ: خەڵکی کوفەم بینی پێنج کەسیان پێش دەخست: هەرکەس بە حارسی ئەعوەر دەستی پێ بکردایە پاش ئەوە عبیدەی سلمانی دادە ناو هەرکامیشیان عبیدەی پێش بخستایە پاش ئەو حارسی دادە نا پاشان عەلقەمە و ئینجا مەسروق و دواتریش شورەیح[3].

ب- هەروەها لە قتادەوە ئەڵێ: ئەگەر چوار کەسم لاکۆببێتەوە، گوێ بەکەسی تر نادەم، حەسەن و ئیبن ئەلمسەییەب و ئیبراهیم و عطاء، ئەمانە پێشەوایانی ناوچە و شارەکانن [4].

ئەمە ئەو هەوڵانە بوو کە خستیانە گەڕ بۆ خزمەتکردنی فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هەرکەسیش ئەیەوێ شتی زیاتر لە بارەیەوە بزانێ بابگەڕێتەوە بۆ السنه قبل التدوین ی دکتۆر محمد عجاج الخطیب و التابعون و جهودهم فی خدمه الحدیث النبوي.

## شەشەم: ڕێبازی تەزکیە و هەڵس و کەوت لەلای شوێنەکەوتوانی قوتابخانەی حەسەنی بەسری وەك نموونە:

- حەسەنی بەسری لە سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز و دەوڵەتی ئەمەویدا: حەسەنی بەسری یەکێکە لەو کەسانەی کە لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا ژیاوە، کاریگەریەکی بەرچاوی هەبووە لەسەر ژیانی ئاینی و کۆمەڵایەتی لەسەردەمی دەوڵەتی

---

[1] - التابعون وجودهم في خرقة الحديث النبوي، ل: ٦٤.

[2] - التابعون وجودهم في خدمة الحديث النبوی.

[3] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٩١).

[4] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٨٣).

ئەمەویدا ناوی ئەبو سەعید حەسەنی کوڕی یەسارە خزمەتکاری زەیدی کوڕی ثابت(ﷺ)، یەکێکە لەگەورە شوێنەکەوتوان – کبار التابعین – و پێشەوای خەڵکی بەسرە و زانای گەورەی ئوممە بووە لەوە کاتەدا، دایکیشی(خیرە)ی خزمەتکاری ام سەلەمەی دایکی باوەڕدارانە(ﷺ) لەساڵی ۲۱ کۆچی لە مەدینە لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب دا لە دایك بووە، ئەڵێن حەسەن لەلایەن ام سلمەوە شیری پێ دراوە و پەروەردەکراوە، چونکە خیرە بۆ کڕینی شتومەك دەچووە دەرەوە و حەسەنیش دەگریا و ام سەلەمەش مەمکی دەخستە دەمیەوە، بەم پێەش ام سلمە دایکی شیری حەسەنە، ڕەوانبێژی و زانستیشی هەر لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، سروشتیشە کە ئەم منداڵە ماڵەکانی دایکی ئیمانداران بناسێت و پەروەردە و شتیان لێوە وەرگرێت، هەروەها ئاساییشە کە ببێتە قوتابی گەورە هاوەڵان لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەك ئەبو موسای ئەشعەری و عوسمانی کوڕی عەففان و عەلی کوڕی ئەبوتالیب و عبداللە ی کوڕی عومەر و عبداللە ی کوڕی عەبباس و جابری کوڕی عبداللە(ﷺ) دواتر لەگەڵ خێزانەکەیدا گواستیانەوە بۆ بەسرە و لێرەشەوە نازناوی حەسەنی بەسری لێنرا، لەو کاتەشدا تەمەنی حەسەن چواردە ساڵ بوو، ئەوە بوو حەسەن بەردەوام لە مەزگەوتدا بوو و لە کانیاوی زانستی زانایانەوە بەتایبەت لە ئەڵقەی زانای گەورەی ئوممەت عبداللە ی کوڕی عەبباسەوە زانستی وەرگرت، زۆری نەخایاند خەڵکێکی زۆر لە دەوری کۆبوونەوە لە هەموو شوێنێکەوە ڕوویان لێنا، وەك ئەشلێن قسەی وەك گوفتاری بووە وشتێکی نەدەوت کە خۆی نەیکردایە و نهێنی وەك ئاشکرای بوو، ئەگەر فەرمانی بە چاکە بکردایە لە هەموو کەس زیاتر پابەند بوو پێوەی و ئەگەر نەهیشی لە خراپە بکردایە لە هەموو کەس دورتر بوو لێوەی، پێویستی بە هیچ شتێك نەبوو کە بەدەستی خەڵکەوەبێت و چاوی لە دەستی کەس نەبوو، بەڵام هەموو خەڵك ئاتاجی ئەو زانستە بون کە لای ئەو بوو [1].

١– **هۆکارەکانی کاریگەربوونی خەڵکی پێی:** خوای گەورە چەندین چاکە و بەهرەی تیادا کۆ کردبوویەوە کە بە هۆیەوە توانی سەرنج و دڵی خەڵکی بۆلای خۆی ڕابکێشێ و بە هۆشیەوە بەهای ئاین و ئاینداران لە کۆمەڵگەدا بەرزبکاتەوە.

[1] – السنة قبل التدوين، ل: ١٤٤ هەتا ١٩٩.

دیارە حەسەن(رضي الله عنه) خاوەنی زانستێكی فراوان بوو لە تفسیر و فەرموودەدا و كەسێكیش لەو سەردەمەدا نەیدەتوانی بانگەواز بلاو بكاتەوە و چاكسازی بكات ئەگەر ئەم دوو سیفەتەی تیادا نەبوایە، هەروەها حەسەن(رضي الله عنه) زۆرێك لە هاوەلانی بینیبوو و لەگەلّ زۆربەیاندا ژیا بوو، لە ژیان و وتارەكانیشیەوە دەردەكەوێت كە بە قولّی لەم سەردەمە كۆلّیبوویەوە و شارەزایی ڕۆحی سەردەم و چۆنێتی بەرەوپێش چوونی كۆمەلّگەی ئیسلامی بوو، هەروەها شارەزا بوو لە هەلّەو لادانەكانی، خاوەنی شارەزاییەكی باش بوو و بەوردیَ سەرنجی ژیان و سەرجەم توێژەكانی و كێشە و گرفت و خالّە لاوازەكانیانی دەدا و وەك پزیشكێك ماوەیەك چارەسەی بۆ خەلّك دەنووسی [1]، لەگەلّ ئەوەشدا زۆر زمانپاراو قسە خۆش بوو و كاریگەری لەسەر گوێبیستانی هەبوو، ئەبو عەمری كوڕی عەلائەلّێ: لە حەسەنی بەسری زمانپاراوترم نەبینیوە [2].

هەروەك خاوەنی زانیارەكی كەم وێنە و زۆر وزەبەندە بوو، ڕەبیعی كوڕی ئەنەس ئەلّێ: دەساڵ هاتوچۆی حەسەنم كرد، و هەر ڕۆژە و شتێكم لیّ دەبیست كە پێشتر نەمبیستبوو، هەروەها محمەدی كوڕی سەعد ئەلّێ: حەسەن زانایەكی شارەزا و پایە بەرز و متمانە پێكراو و خواپەرست و پارێزگار بوو زانستی فراوان و زمانپاراو و جوان و پێكەوتوو بوو، هاتە مەككە و لەسەرە تەختێك دانرا و وتیان قەت شتی وامان نەدیوە، ثابیتی كوڕی قوڕڕەش وەسفی دەكات – وەك ئەبو حەیانی تەوحیدی ئەیگێڕێتەوە – و ئەلّێ: یەكێك بوو لە ئەستێرە پرشنگدارەكان لە بواری زانست و خواناسی و دونیانەویستی و پارێزكاری و فیقە وزانیاری لە مەجلیسدا خەلّكی جۆراوجۆر كۆ دەبوونەوە یەكێك فەرمودەی وەردەگرت و یەكێك تەفسیر و یەكێكیش حەلالّ و حەرام و یەكێكی تریش فتوای دەویست و هەندێكیش فێری دادوەری و قەزا دەبوون و یەكێكیش لە ئامۆژگاری دەگرت، لە هەموو ئەم بوارانەشدا وەك دەریای شەپۆلدار زانستی دەبەخشی و وەك ئەستێرەی پرشنگدار ڕووناكی بلاو دەكردەوە، هەلّوێستەكانی لە بواری فەرماندان بە چاكە وڕێگری كردن لە خراپە دا لە بیرناكرێت لای ئەمیر و كۆلكە ئەمیرەكان بە هۆی قسە یەكلاكەرەوە و وشە بە پێزەكانیەوە [3].

---

[1] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٥٦٣ تا ٥٨٨)، حیاة الحسن البصري د. روضة الخضری، الحسن البصري امام عمرة و زمانه، مرزوق علی ابراهیم، الحسن البصري، مصطفی سعید الخن، الزهد للحسن البصري. د. محمد عبدالحیم محمد.

[2] - رجال الفكر و الدعوة(١ / ٦٧).

[3] - نظرات في التصوف الاسلامي، د. محمد القهوجي، ل: ٢٢١.

لە سەرووی هەموو ئەمەشەوە خاوەنی سۆزێکی بەهێز و ڕۆحێکی بلێسەدار بوو و یەکێك بوو لە مرۆڤە هەرە دڵسۆزەکان ئەمەش هۆکاری کاریگەر بوونی دڵەکان و ئاسوودە بوونی دەروونەکان بوو بێ و نهێنی گوێڕایەڵی خەڵك بوو بۆی.

ئەو قسانەی کە دەیکردن لەدڵەوە دەهات و دەچوە دڵەوە، هەر کەباسی هاوەڵان یان وەسفی ڕۆژی دوایی بکردایە فرمێسکی ئەهێنا لە چاوان و دڵەکانی دەهەژاند[1]، مطري و ڕاق لەبارەیەوە ئەڵێ: کاتێ حەسەن هات ئەتوت لەو دنیاوە هاتووە و باسی شتێکمان بۆ دەکات کە خۆی بینیویەتی[2]، هەروەها عەوف ئەڵێ: کەسم نەبینیوە هێندەی حەسەن شارەزای ڕێگەی بەهەشت بێت[3].

هەروەها حەسەن چێژی لە باوەڕ دەبرد و لە سۆز و ویژدانیەوە قسەی دەکرد بۆیە ئەڵقەکەی لەبەسرەدا فراوانترین ئەڵقە بوو و خەڵکی کێش دەکرد وەك چۆن ئاسن و موگناتیس کێش دەکات، ئەمەش سروشتی ئەهلی دڵ و خەڵکانی دڵسۆزە لە هەموو سەردەمێکدا، گەورەترین تایبەتمەندیشی ئەوە بوو کە قسەی لە قسەی پێغەمبەران دەچوو(ﷺ) غەزالی لە إحياء علوم الدين دا ئەڵێ: وتەکانی حەسەنی بەسری لە هەموو کەس زیاتر لە قسەی پێغەمبەران دەچێت و خۆشی لە ڕەوشت و هەڵسوکەوتی دا لە هەمووان زیاتر لە هاوەڵان دەچێت، هەمووان کۆدەنگن لەسەر ئەمە [4].

لە دەرەنجامی ئەم بەخششە زۆر و فەزڵە گەورەیەش دەرکەوتنی کە سایەتیەکی بەهێز و سەرنجڕاکێش و خۆشەویست بوو لای هەمووان و خەڵکی هەموو سەرسامی بوو بوون و ملکەچی گەورەیی بوو بوون، بەڕادەیەك کە پابیتی کوڕی قره الحكيم الحراني ئەڵێ: حەسەن یەکێکە لەو کەسانەی کە ئوممەتی محمد(ﷺ) شانازی پێوە دەکات لەبەرامبەر ئوممەتەکانی تردا [5].

گەورەترین هۆکاری کاریگەری حەسەن(ﷺ) لەسەر کۆمەڵگەدا و جێگیربوونی لەدڵ و دەروونەکاندا ئەوەبوو کە ئەو لەوەتەرێکی هەستیاری دەدا و شۆڕ دەبویەوە بۆ قوڵایی و ناخی کۆمەڵگە و بەشێوەیەکی ژیرانەو بەو پەڕی دڵسۆزی بەزەییەوە ڕەخنەی لێ دەگرت، بێ گومان

---

[1] - رجال الفكر و العدوة(١ / ٦٨).

[2] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٦٨).

[3] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٥٧٣).

[4] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٥٧٥).

[5] - رجال الفكر و الدعوة(١ / ٦٨).

سەردەمی ئەو پڕی بوو لە بانگخوازی و وتاربێژ، بەلاّم کۆمەڵگە بە هیچ کەسێك وەك حەسەن کاریگەر نەبوو، دیارە ئەو دەچووە قوڵایی دڵەوە و ناوجەگەری ژیانی دەپێکا و دژ بە شەپۆل مەلەی دەکرد، چونکە خۆی دوردەگرت لە پاڵدانەوە و ڕۆچوون لە ئارەزووەکاندا کە دەردی باوی ئەو سەردەمە بوو، هەروەها هەمیشە مردن و ڕۆژی دوایی بیری خەڵکی دەخستەوە و خەڵکانی خۆشگوزەرانیش ئەمە لەیاد خۆیان دەبەنەوە و هەمیشە خۆیان بە ئاواتی درۆینەدەخەڵەتێنن و نایانەوێ کەس شتێکیان بۆ باس بکات کە ژیانیان لێ تێك بدات و ئارەزوو بازیانی لێ بشێوێنت، بۆیە حەسەن هەمیشە لە ململانێ دا بوو لەگەڵ جاهیلیەتدا، جا هیلیەتیش مل نادات بەکەس جگە لەو کەسەی کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە، حەسەنی بەسریش ئەو پیاوە بوو بۆیە کاریگەری زۆر بوو و تەوبەکار و دەست هەڵگران لە تاوان و ژیانی نەفامی پۆل پۆل لەسەر دەستی دەگەڕانەوە و شەپۆلی چاکسازی بەهێز و کاریگەری خستەڕێ، چونکە حەسەن تەنها بەوتار و ئامۆژگاری وازی نەهێنا، بەڵکو گرنگی بە پەروەردەکردنی ئەو کەسانەدا کە هاو مەجلیس و ئاشنای بون، بەم شێوەیەش بانگەواز و ڕێنمایی و پەروەردەی کردەیی و پاڵفتە کردنی ڕەوشتی و ڕۆحی پێکەوە کۆ کردبوویەوە و خەڵکانێکی زۆر بە هۆیوە ڕێگەی ڕاستیان گرت و چێژی باوەڕیان چەشت [1].

٢- **ڕوخسارەکانی سۆفیگەری سوننی لای حەسەنی بەسری:** حەسەنی بەسری بە یەکێك لە زانایانی سلوك و هەڵسوکەوت دادەنرێت کە گرنگی دەدا بە نەخۆشیەکانی دەورون و چارەسەر کردنی و زیندوو کردنەوەی دڵ و بەخشینی باوەڕ و بەها بەرزە خواییەکان پێی، هەروەها حەسەن(رضي الله عنه) بیروباوەڕی پاك و پابەندی قورئان و سوننەت بوو لە پەروەردە و فێرکردنیدا، دیارە مەسەلەی سەرەکی سۆفیگەری سوننی بریتی لە پابەندبوون بە قورئان و سوننەتەوە بە پێی ڕێبازی سەلەفی سالّح لەبیروباوەڕو پەرستش و هەڵسوکەوت و مامەڵەدا، ئەمەش لە ژیانی حەسەندا(رضي الله عنه) بەدی دەکەین، لەو مەسەلانەش کە حەسەن(رضي الله عنه) گرنگی پێ دەدا:

أ- **ڕەق بوونی دڵ و زیندوێتی و مردنی:** پیاوێك بە حەسەنی وت(رضي الله عنه): ئەی باوکی سەعید، سکالای ڕەقی دڵمت لادەکەم، ئەویش وتی: بە زیکر و یادی خوا ئاشنای بکە. هەروەها ئەڵێ: دڵەکان دەمرن و زیندوو دەبنەوە، جا ئەگەر مرد ئەوە لەسەر فەرزەکان ڕایبێنن، ئەگەر

---

[1] - هەمان سەرچاوە(١ / ٦٨).

زیندووش بوویەوە ئەوە پابەندی بکەن بە سوننەتەوە [1]. دیارە پەروەدگاریش زەمی ڕەقی دڵی کردوە و ئەفەرموێت: ﴿ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِىَ كَٱلْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ﴾البقرة: ٧٤).
واتە: لە پاشان دڵتان ڕەق بوو دوای ئەم(هەموو) موعجیزانە دڵتان وەك بەردە، بەڵكو زۆر ڕەقترە... پاشان ڕوونی دەكاتەوە كە بۆ لەبەرد ڕەقترە و ئەفەرموێت: ﴿ وَإِنَّ مِنَ ٱلْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ ٱلْأَنْهَٰرُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ ٱلْمَآءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ﴾البقرة: ٧٤). واتە: بەڕاستی بەردی وا هەیە لە چەند لاوە جۆگە ئاوی لێ هەڵ دەقوڵێ وە بێگومان هی وایان هەیە كەلەت لەت دەبێ و ئاوی لێ دێتە دەرێ وە بەڕاستی هی وایان هەیە لە ترسی خوا(لە لوتكەی شاخەكان) بەر ئەبێتەوە...

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێت: " زۆر قسە مەكەن بە بێ یادی خوا، چونكە زۆر قسە كردن بە بێ یادی خوا ڕەقی دڵی لێ دەكەوێتەوە دورترین كەسیش لە خواوە مرۆڤە دڵ ڕەقەكانن"[2]
هۆكارەكانی ڕەقی دڵیش زۆرن لەوانە: زۆر قسە كردن بە بێ یادی خوا وشكاندنی پەیمان لەگەڵ خوادا: ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً ﴾المائدة: ١٣). واتە: ئینجا بەهۆی(پاش گەز بوونەوە و) هەڵوەشاندنەوەیان بۆ پەیمانەكەیان. نەفرەتمان لێ كردن وە دڵەكانیانمان گێڕا بە دڵێكی ڕەق و ووشك...

هەروەها زۆر پێكەنین و زۆر خواردن بەتایبەت لە ماڵی حەرام و زۆر تاوانكردن و چەندین شتی تر هۆكارن بۆ ڕەق بوونی دڵ [3] كە حەسەنی بەسری(ﷺ) ئاماژەی پێداون لە قسەكانیدا، ئەو شتانەش كەڕەقی دڵ ناهێڵن زۆرن لەوانە: زۆر یاد كردنی پەروەردگار بەدڵ و زمان، خواگەورە ئەفەرموێت: ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ﴾الزمر: ٢٣). واتە: خوا جوانترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە قورئانێكە(كە ئایەتەكانی) لەیەكچووی دووپات كراوەن ئەو كەسانەی لە پەروەردگاریان دەترسن

---

[1] - الزهد للحسن البصري، ل: ١٢٣.

[2] - هەمان سەرچاوە.

[3] - سنن الترمذي ژمارە ٢٤١١ فەرموودەیەكی حسن و غەریبە.

پێستیان تەزووی پیادێ(بە بیستنی قورئان) پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێ بە یادی(قورئانی) خودا...

هەروەها پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەموێت: " ئەم دڵانە ژەنگ دێنن وەك چۆن ئاسن ژەنگ دێنێت " وتیان: ئەی چۆن ئەو ژەنگەی لابەین؟ فەرموی: بە خوێندنەوەی قورئان و زۆر یادکردنی پەروەردگار [1] حەسەنی بەسریش ئەڵێ: ئەی خەڵکینە من ئامۆژگاریتان دەکەم هەرچەندە باشتیرینتان نیم و من زۆر شلگیرم لەگەڵ دەروونی خۆمدا و باش جڵەوم نەکردووە نەمتوانیوە پابەندی بکەم بە تاعەتی پەروەردگارەوە، جا ئەگەر هەر باوەڕدارێك ئامۆژگاری براکەی نەکات هەتاوەکو خۆی تیروتەواو دەکات ئەوە ئامۆژگاریکەر نامێنێت و مۆچیاری کاران کەم دەبنەوە و کەسێك نامێنێت کە بانگەوار بۆلای خوا بکات و ئارەزووی تاعەت و نەهی لە تاوان بکات.

بەڵام کۆبوونەوەی خەڵکانی بەرچاو ڕوون و یادخستنەوەی موسڵمانان بۆ یەکتر و بوژاندنەوەی دڵەکان و ژیانەوەی باوەڕداران پارێزکاری تیایە و ئەیانپارێزێت لە یادچوونەوە، جا پابەندبن بە مەجلیسەکانی زیکرەوە خوابتانپارێزێت، چونکە لەوانەیە وشەیەك جێی خۆی بگرێت و کەسێکی بەکەم زانرا و سوود بگەیەنێت لە خوابترسن بەو شێوەی کە شیاویەتی و بە موسڵمانی نەبێت نەمرن[2].

هەروەها ئەیوت: پاك و بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە چێژی یەکلا بوونەوە بۆ خۆی خستۆتە دڵی عاریفان و شیرینی لە خزمەتدا بوونی پێ چەشتوون بە جۆرێك کە هیچ شتێك هێندەی ڕازونیاز یادی خوا کردن بەلایانەوە ئاسان و شیرین نیە دەسا پاك و بێگەردی بۆ پەروەردگار لەوەی کە ستەمکاران ئەیڵێن [3]. هەروەها ئەیوت: لە سێ شت دا بەدوایی شیرینی دا بگەڕێ ك لە نوێژ و قورئان و یادکردنی پەروەردگاردا [4]. جا ئەگەر ئەوەت دەسکەوت ئەوە سوپاسی بکە و مژدە بێت لێت، ئەگەر نا ئەوە بزانە کە دەرگات داخراوە و خەمی کردنەوەی بخۆ [5].

---

[1] - مجموع رسائل الحافظ ابن رجب(١ / ٢٦١، ٢٦٢).

[2] - البيهقي في الشعب ژمارە ١٤٢، العلل المتناهية لابن الجوزي(٢ / ٨٣٢) فەرمودەکە لاوازی تیایە.

[3] - الزهد للحسن البصري، ل: ٧٩.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٩.

[5] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٩.

باشترین جۆری یاد کردنیش خوێندنەوە و کار کردنە بە قورئان حەسەنی بە سریش ئەیفەرموو : هەرکەس ئەیەوێ بزانێ چۆنە ئەوە با کردەوەکانی بە قورئان بپێوێت، جا ئەگەر بەوشێوەیە بوو کە قورئان ئەیەوێت با سوپاسی خوا بکات و داوای زیاتر بکات ئەگەر جیاوازیش بوو گلەیی لە خۆی بکات و خێرا پەشیمان ببێتەوە[1].

هەروەها ئەیوت: ئەم قورئانە شیفایە بۆ باوەڕ داران و پێشەوای باوەڕدارانە جا هەرکەس شوێنی بکەوێت ڕێنمونی دەکرێت هەرکەسیش پشتی تێ بکات بەدەبەختی و بەلای توش دەبێت [2]، هەروەها ئەیوت: قورئان خوێنان سێ کەسن: کۆمەڵێك کە وەك شتومەکێك بەکاری دێنن هەتاوەکو بازرگانی پێوە بکەن، کۆمەڵێکیش بە جوانی ئەیخوێننەوە، بەلام یاساو سنوورەکانی پێشێل ئەکەن و پارەی دەسەڵاتدارانی پێ دەست دەخەن و بەهۆیەوە دەستدرێژی دەکەنە سەرخەڵك – ئەم جۆرەش لەهەڵگرانی قورئان زۆر بوون – خوای گەورە زیادیان نەکات، کۆمەڵێکی تریش قورئان خوێننەوە و سەرنجی مانا و ناوەڕۆکی دەدەن و خۆیان پێ تیمار دەکەن [3].

سەبارەت بەشەو نوێژیش ئەیوت: ئەگەر نەتوانێ بەشەودا نوێژ بکەیت و بە ڕۆژدا بە ڕۆژوو بیت ئەوە بزانە کە تۆ بێ بەشیت و تاوان و گوناه کۆتی کردویت [4]، پیاوێکیش پێی وت: شەو نوێژ ماندووی کردوم و ناتوانم فەرمووی: داوای لێخۆشبوون بکە برازا، چونکە ئەوە نیشانەیەکی خراپە[5]، هەروەها ئەیوت: کەسی وا هەیە گوناهێك دەکات و بەهۆیەوە لەشەو نوێژ بێ بەش دەکرێت[6].

● زۆر یادکردنی مەرگ: پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێت: " زۆر یادی تێکدەری خۆشیەکان بکەنەوە " [7]، هەروەها حەسەنی بەسری ئەفەرموێت: مەرگ ئابڕوی دونیای بردووە و بواری خۆشحاڵی تیادا بۆ هیچ خاوەن هۆشێك نەهێشتۆتەوە [1].

---

[1] - الزهدللحسن البصري، ل: ١٤٢.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٤٢.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٤٧.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٤٨.

[5] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٤٨.

[6] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٤٦.

[7] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٤٦.

هەروەها لە صالحی کوڕی ڕسم وە ئەڵێ: گوێم لە حەسەن بوو ئەیوت: ڕەحمەتی خوا لە کەسێك کە بەبینینی هەندێ ڕەفتاری لە زۆرینەی خەڵك هەڵنەخەڵەتێ: ئەی نەوەی ئادەم تۆ بەتەنها دەمریت و بە تەنهاش دەچیتە گۆڕ و بە تەنیاش لێپرسینەوەت لەگەڵدا دەکرێت ئەی ئادەمیزاد مەبەست تۆیە و بە تۆ ئەوترێ [2]. هەروەها حەسەن ئەڵێ: هەرکەسێك زۆری یادی مردن بکاتەوە ئەوە ئاسەواری ئەوە لە کردەوەی خۆیدا دەبینێت، هەر بەندەیەکیش هیوای درێژ بێت ئەوە کردەوەی خراپ دەبێت [3]، هەروەها ئەڵێن: حەسەن کەسێکی بە تەمەنی لەگەڵ جەنازیەك دا بینی و پاش بەخاکسپاردن پێی وت: ئەی پیرە مێرد، سوێندت دەدەم بە خوا ئایا وا دەزانی، ئەم مردووە حەز دەکات بگەڕێتەوە بۆ دونیا هەتاوەکو کردەوەی چاکی زیاتر بکات و داوای لێخۆشبوون لەپەروەردگار بکات، پیرەمێردەکەش وتی: بەڵێ، حەسەنیش وتی: ئەی بۆ ئێمە وەك ئەم مردووە نەکەین، پاشان ڕۆشت و ئەیوت: ئای چ ئامۆژگاریەکە ئەگەر دڵەکان زیندوو بن، بەڵام دڵی زیندووە نەماوە [4].

هەروەها ئەڵێ: کەسێك دڵنیا بێت کە مردن ی لە ڕێیە و ڕۆژیی دوایی وادەیەتی و لەبەر دەستی خوای بە دەسەڵاتدا دەوەستێنرێت حەقی خۆیەتی کە لە دونیادا ئاه و حەسرەتی زۆر بێت و بەردەوام ئارەزووی کاری چاکەی هەبێت [5].

هەروەها ئەیوت: هیچ یەقینێکم نەبینیوە کە گومانی تیادا نەبێت بووبێت بەگومانێك کە یەقینی تیادا نەبێت هێندەی یەقینمان بە مردن و ئیش و کردنمان بۆ غەیری ئەو [6]، هەروەها ئەشی وت: بەندەکانی خوا خوای گەورە پێش مەرگ هیچ وادەیەکی بۆ کردەوەکان دا نەناوە، دەسا بەردەوام بن، چونکە پەروەردگاری بالا دەست ئەفەرموێت: ﴿ وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ﴾ الحجر: ٩٩).
واتە: وە پەروەردگارت بپەرستە هەتا مردن یەخەت پێ دەگرێت.

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٤٦.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٤٦.

[3] - سنن الترمذي ژمارە ٢٣٠٧، سنن ابي ماجة ژمارە ٤٢٥٨.

[4] - الزهد للحسن البصري، ل: ٢٠.

[5] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢١.

[6] - الزهد للحسن البصري، ل: ٢٢.

هەروەها ئەیوت: ئـەی نـەوەی ئـادەم تـۆ بەتـەنها دەمردیـت و بەتـەنها لێپرسـینەوەت لـەگەڵـدا دەکرێت، ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر هەموو خەڵکی گوێڕایـەڵی پـەروەردگار بکـەن و تـۆ سەرپێـچی بکەیت ئەوە گوێڕایەڵی ئەوان هیچ سودێکی نیە بۆ تۆ ئەگەر هەموو شیان سەرپێچی خوا بکەن و تـۆ گوێڕایەڵی بکەیت هیچ زیانێك بەتۆ ناگات، ئەی نەوەی ئادەم، تاوانی تۆ تاوانی خۆتـە و بەسـەرتەوە یەو بەشێکە لە خوێن و گۆشتت، جا ئەگـەر خـۆت بپارێزیـت ئـەوە گۆشـت و خوێنـت سـەلامەت دەبێت، ئەگەرواش نەکەین ئەوە ئاگرێکی بلێسەدار و جەستەیەکی لـەناو نەچـووە و گیـانێکی نـەمر تیایدا چاوەڕێت دەکات [1].

هەروەها ئەیوت: ئەگرە سێ شت نەبوایە هیچ مرۆڤێك سەری نەدەلەقانـد: مـردن و نەخۆشـی و هەژاری، بـەلام دوای ئـەوەش ئـەو هـەر وەسـتاوە [2]، هـەروەها حەسـەن کاتێـك کـە ئـەم ئایەتـەی دەخوێندەوە: ﴿فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ﴾ لقمان: ٣٣). واتە:... کەواتە با ژیانی دنیا هەڵتان نەخەڵەتێنێ وە با شەیاتی فریودەر بە(بیانووی بەزەیی و لێ بـوردنی) خـوا نـەتان خەڵەتێنێ.

ئەیوت: کێ ئەمەی فەرمووە؟ پاشان ئەیوت: ئەوەی کە دروستی کردووە لە هەموو کەس زاناترە دەربارەی [3]. هەروەها ئەڵێت: وریای ئیش و کاری دونیابن، چونکە دونیا ئیش وکاری زۆرە و هـەر ئەوەندە مرۆڤ دەرگایەکی لـە خۆی کردەوە ئەو ئەو دەرگایە دە دەرگای تری لێ دەکاتەوە[4].

● سەردانی گۆڕسـتان و بیرکردنـەوە لـە حـاڵی ئەوانـەی کـە تیایـدان، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئەفەرموێت: " سەردانی گۆڕستان بکەن، چونکە مەرگتان بیردەخاتەوە " [5]، لە ڕیوایەتێکیشدا: " من پێشتر نەهیم کرد لـە سەردانی گۆڕستان، بەلام لـەمەودوا سەردانی بکەن، چـونکە ڕۆژی دواییتان وە بیردێنێتەوە " [6].

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٣.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٤.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٥.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٦.

[5] - مسلم ژمارە ٩٧٦.

[6] - مسلم(٢ / ٦٧٢) سنن الترمذي ١٨٦٩

حەسەنی بەسریش(ﷺ) زۆر سەردانی گۆڕستانی دەکرد، ئەوە بوو کاتێ نەواری کچی اعین ی کوڕی ضبعیه ی موجاشعی هاوسەری فەره زدەق کۆچی دوایی کرد، کە ئافرەتێك بو وەسیەتی کرد بوو کە حەسەنی بەسری نوێژی لەسەر بکات، ناودارانی بەسرەش لەگەڵ حەسەندا ئامادە بوون لەبە خاکسپاردنیدا و حەسەنیش بەسەر هێستر و فەرەزدەقیش بەسەر حوشترەکەیەوە بوو، حەسەن پێی وت: خەڵکی چی دەڵێن؟ وتی: ئەڵێت: باشترین کەس لە بەخاك سپاردەنیدا ئامادە بووە مەبەستیان تۆیە و خراپترین کەسیش مەبەستیان منە، ئەویش پێ ی وت: ئەی باوکی فیراس من باشترین کەس نیم تۆش خراپترین کەس نیت، پاشان فەرمووی: چیت ئامادە کردوە بۆ ئەم ڕۆژە؟ وتی: هەشتا ساڵە شایەتی ﴿ لااله الا الله ﴾م ئامادە کردووە.

کاتێ حەسەن نوێژی لەسەر کرد و بردیان بۆ ناوگۆڕ فەرزەدەق بە شیعر وتی:

اخاف وراء القبر ان لم يعافني　　اشد من القبر التهاباً و اضيقاً

اذا جاءني يوم القيامة قائد　　عنيف و شواق يسوق الفرزدقا

لقد خاب من اولاد دارمن مشى　　الى النار مغلولاً القلادة ازرقا

يساق الى نار الجحيم مسربلا　　سرابيل قطران لباساً معرقاً

اذا شربوا فيها الصديد رايتهم　　يذوبون من حر الصديد تمزقا

واتە: لە پاش گۆڕ ئەترسم ئەگەر خوا نەیەت بە هانامەوە، چونکە لە گۆڕ توندتر و تەنگاوترە، کاتێ لە قیامەت دا ڕاپێچکەرێکی توند و تیژ دێت کە فەرزدەق ڕاپێچ دەکات، بەڕاستی سەرشۆڕە ئەو کەسەی کە بەکۆتکراوی ڕاپێچی دۆزەخ دەکرێت و جل و بەرگی لە ئاگرە وتیایدا کیم دەخۆنەوە و ناوسکیان لەتاو گەرمی کیمەکە دەتوێتەوە.

ئەڵێ: حەسەنیش هێندە گریا هەتاوەکو بەردەمی خۆی تەڕکرد، پاشان هاتە لای فەرەزدەق و وتی: تۆ بێزار و ترین کەس بووی بەلای منەوە، بەلام ئەمڕۆ خۆشەویسترین کەسی بەلامەوە [1]، هەروەها حەسەن پەندی وەردەگرت لە سەردانی گۆڕستان و زۆری لێ ڕادەما، لە عەوانەوە ئەڵێ: حەسەن وتی: بشری کوڕی مەروان – برای عبدالملك ی کوڕی مەڕوان – کە ئەمیری میسریەکان و بە تەمەنترین کەسیان بوو، هاتەلامان و چل شەولامان مایەوە پاشان قاچی بریندار بوو و کۆچی دوایی کرد و ئێمە بردمان بۆ گۆڕستان کاتێ گەشتینەجبان گەشتین بە چوار سودان کە هاوەلاێکیان پێبوو

---

[1] - الحسن البصري، د. مصطفى الخن، ل: ٣٤٥، لة البداية و النهاية.

بۆ گۆڕیان ئەبرد، ئێمەش ڕاخەرێکمان ڕاخست و نوێژمان لەسەر کرد و ئەوانیش نوێژیان لەسەر کرد پاشان بشرمان هەڵگرت بۆ گۆڕەکەی و ئەوانیش هاوەڵەکەیان برد و پاشان هەردوولامان ڕۆشتین، کاتێ ئاوڕم دایەوە، نەمتوانی گۆڕی بشر لە گۆڕی کابرای حەبەشی جیا بکەمەوە، و هیچ شتێك هێندە بەلامەوە سەیر نەبوو [1].

هەروەها زانایان چەند شتێکی تریان باسکردووە کە ڕەقی دڵ ناهێڵێ وەك چاکە کردن لەگەڵ هەتیو و هەژاراندا و سەرنجدانی ئەو ولاتی ئەو ئوممەتانەی کە لە ناو چوون و پەند وەرگرتن لە زێدی پێشینان [2].

**ب- هاندانی بۆ دڵسۆزی و گوێڕایەڵی پەروەردگار و چاککردنی نێوان خەڵکی و بیرکردنەوە:**

● دڵسۆزی: دیارە دڵسۆزی لەکاردا کاریگەریەکی مەزنی هەیە لەسەر ڕەوشتە جوانەکان، چونکە دڵی خاوەنەکەی بەهێزدەکات و هانی دەدات بۆ کاری چاکە لەبەر ڕەزامەندی پەروەردگار و بۆ دەسخستنی ناز و نیعمەتی ڕۆژی دوایی بێ ئەوەی چاوەڕێ پاداشت و سوپاسی کەس بێت، دڵی دەکاتەوە بۆ لێبوردن و ڕەوشتە بەرزەکان و ڕق و خۆشەویستی لەبەر خوا دەبێت [3]، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٢) لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴾ الأنعام: ١٦٢ - ١٦٣). واتە:(ئەی موحەممەدی(ﷺ) بڵێ بێگومان نوێژ و(بەندایەتی) و قوربانی و ژیان و مردنم هەر بۆ خوای پەروەردگاری هەموو جیهانیانە. هیچ هاوبەشێکی نی یە و هەر بەوە فەرمانم پێ دراوە وە من یەکەمی هەموو فەرمانبەرانم(بۆ خوا).

هەروەها حەسەن ئەیوت: هەرکەس خۆی بەشتێك بڕازێنێتەوە بۆ خەڵك کەلای خوا وانیە ئەوە پێ نا شیرین دەبێت [4]، هەروەها ئەیوت: لە هەندێ لە پیاوچاکانەوە ئەگێڕنەوە کە وتویەتی: باشترین جۆری زوهد شاردنەوەی زوهدە [5]، ئەشڵێین ڕۆژێك ئامۆژگاری کردووە و کەسێك هەناسەیەکی

---

[1] - البيان و التبيين(٣ / ١٤٧) الحسن البصري د. مصطفى الفن، ل: ٣٤٩.

[2] - مجموعة رسائل الحافظ ابن رجب(١ / ٢٦٤ تا ٢٧٠).

[3] - الاخلاق بين الطبع و التطبع، ل: ٢١.

[4] - حياة الحسن البصري، روضة الحصري، ل: ١٧٠.

[5] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٧٠.

قوڵی هەڵکێشاوە ئەویش وتویەتی: مەبەستت لەو کارە چی بوو برازا؟ ئەگەر ڕاست بکەیت ئەوە خۆتت دیاری کردوە ئەگەر درۆش بکەیت ئەوە تیاچویت، خەڵکیش زۆر خۆیان ماندووە دەکرد بە نهێنی و کەس دەنگی نەدەبیستن هەروەها کەسانی پێش ئێوە هەموو قورئانیان دەخوێندەوە و دراوسێکەی هەستی پێ نەدەکرد، یەکێکی تریش شارەزادەبوو لە ئاین و هاوڕێکەی پێ ی نەدەزانی، بەهەندێ لەوانەشیان وت: چەند کەم دەجوڵێیت لە نوێژدا و چەند بە خشوعی؟ ئەویش وتی: جا تۆ چوزانی دڵم لەکوێیە؟ [1] هەروەها ئەیوت: ڕەجائی کوڕی حیوە سەیری پیاوێکی کرد کە دوای نوێژی بەیانی خەو دەیبردەوە، ئەویش پێی وت: ئاگات لە خۆ بێت خوا سەلامەتت بکات کەسێك وا نەزانێ ئەوە بەهۆی شەونخونی و نوێژەوە بووە و کردەوەکانت پوچ ببێتەوە [2] هەروەها حەسەن(رضي الله عنه) ئەڵێت: بۆیان گێڕامەوە کە پیاوێك بەلای پیاوێکدا تێپەڕیوە کە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا﴾ مریم: ٩٦). واتە: بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکەکانیشیان کردووە زۆر زوو خوای میهرەبان خۆشەویستیان دەکات(لە دڵی باوەڕداراندا).

وتی: سوێند بەخوا دەبێ بە جۆرێك خوا بپەرستم کە لە دونیا دا ناوبانگی پێ دەربکەم، ئینجا دەستی دایە نوێژ و ڕۆژی بەردەوام و هەمیشە خەریکی نوێژ و یادکردنی پەروەردگار بوو، هەر کە بەلای خەڵکیشدا تێپەڕ بوایە ئەیانوت: ئەم کابرایە دەبینن چەندە ڕیابازە ئەویش بیری کردەوە و بەخۆی وت: لە بار دایکت بچیت ئەوە بۆ هەر بەخراپەباس دەکرێیت ڕەنگە ئەمە بە هۆی خراپی نیەت و بیروباوەڕتەوە بێت، چونکە مەبەستت ڕەزامەندی پەروەردگار نەبووە، پاشان نیەتی گۆڕی و بەردەوام بوو لەسەر کردەوەکانی و خوای گەورەش خۆشەویستی کرد لە دڵی خەڵکیدا و هەر کە بەلای کۆمەڵێکدا تێپەڕ دەبوو ئەیانوت: ڕەحمەتی خوا لەم کابرایە بێت. حەسەنیش ئەیفەرموو: کردەوەکانتان بە دڵسۆزیەوە ئەنجام بدەن [3].

هەروەها ئەیوت: ئەی ئادەمیزاد پۆشاکی خواناسان دەپۆشیت و کردەوەی خراپەکارانە دەکەیت وەك خەڵکانی ملکەچ و خوا پەرست خۆت نیشان دەدەیت، بەڵام لەناوەوە لە خۆت بایی بوییت.

---

[1] - الزهد للحسن البصري، ل: ١٥٩.

[2] - الزهد للحسين البصري، ل: ١٥٩.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٦٠.

ئاگادار بە ئەمە ڕەوشتی کەسانی دڵسۆز نیە، چونکە تۆ لە قیامەت دا لەبەر دەستی کەسانێکدا دەوەستی کە چاوەناپاکەکان دەناسێت و نهێنی سینەکان دەزانێت [1]. هەروەها ئەیوت: ئەگێڕنەوە کە سەعیدی کوڕی جبیر پیاوێکی بینی کە بەکزۆلێەوە بەندایەتی دەکرد، ئەویش پێی وت: ئەی برازا ئیسلام زیندوە تۆش زیندووی ڕابگرەو مەیمرێنە خوا بتمرێنێ، هەروەها ئەیوت: هەرکەس بەخراپە باسی خۆی کرد لە ناوخەڵکدا ئەو ستایشی خۆی کردووە و ئەوەش کارێکی خراپە [2].

- هاندان بۆ تاعەتی پەروەردگار: خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴾ النساء: ٥٩). واتە: ئەی کەسانێك کە باوەڕتان هێناوە گوێڕایەڵی خوا و گوێڕایەڵی پێغەمبەر بن وە پاشانیش گوێڕایەڵی کاربەدەستە(عادیلە)کانی خۆتان بن جا ئەگەر دووبەرەکیتان هەبوو لە شتێکدا ئەوە بیگێڕنەوە بۆ لای خوا و پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر ئێوە باوەڕتان هەیە بەخوا و بەڕۆژی دوایی ئەوە باشترە وە ئاکام و ئەنجامی چاکترە.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴾ الشورى: ١٠). واتە: وە هەرشتێك کە تێیدا جیاوازبوون ئەوە بڕیارەکەی بۆلای خوا دەگەڕێتەوە ئەو خوایە پەروەردگاری منە تەنها پشتم بەو بەستووە وە هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە.

هەروەها حەسەنیش دەربارەی: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ ﴾ المؤمنون: ٦٠). ئەیوت: شت ئەبەخشن: ﴿ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ ﴾ المؤمنون: ٦٠ ئەڵێ: کاری چاکە ی زۆری ئەنجام دەدەن، بەڵام ئەترسن لەسزای پەروەردگار ڕزگاریان نەکات [3]. هەروەها لە حەسەنەوە ئەڵێ: ئەگەر شەیتان سەیری کردیت و بینی کە بەردەوامی لەسەر تاعەتی پەروەردگار و جار لە دوای جار هەوڵی لەگەڵدا دایت و بینی هەر بەردەوامیت و بێزار دەبێ لێت، بەڵام ئەگەر جارێك بەم شێوە و جارێکی بە جۆرێکی تر بویت

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٦٠.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٦٠.

[3] - الزهد للحسن البصري، ل: ٧٤.

تەماعت تیٚ دەکات [1]، هەروەها لە حەسەنەوە(رضي الله عنه) ئەڵیٚ: هرمی کوڕیٚ حیان وتی: هیچ شتیٚکم نەبینیەوە وەك ئاگر کە هەڵاتوان لیٚ ی خەوتبن و هیچ شتیٚکیشم نەبینیوە وەك بەهەشت کە خوازیارانی خەوتبن [2].

هەروەها لەو بەسەرهاتانەی کە لە حەسەنی بەسری ڕووی داوە: کاتیٚ کە عومەری کوڕی هبیرە کرا بە والی عیٚراق ناردی بۆلای حەسەن و شەعبی و فەرمانی دا کەخانوویەکیان پیٚ بدریٚت و مانگیٚك تیایدا مانەوە ئەوە بوو خزمەتگوزارەکە ڕۆژیکیان وتی: ئەمیر ئەیەویٚ بیٚتە لاتان، عومەریش هاتە ژوورەوە و خۆی دابوو بەسەر گۆچانەکەیدا، سلاوی کرد و ڕیٚزی لیٚنان وتی: ئەمیری باوەڕداران یەزیدی کوڕی عبدالملك نامەیەکی بۆ ناردووم ئەزانم ئەگەر جیٚبەجیٚ ی بکەم تیادەچم و سەرپیٚچی خوام کردووە و ئەگەر جیٚبەجیٚشی نەکەم گویٚڕایەڵی خوام کردووە، ئایا ئیٚوە هیچ چاریٚکتان پیٚیە بۆم. شەعبیش قسەی کردو کەوتە داوی ئیبن هەبیرەوە، پاشان عومەری کوڕی هبیرە وتی: ئەی تۆ چی ئەڵیٚ ی ئەی باوکی سەعید؟

ئەویش وتی: ئەی ئەمیر، شەعبی قسەی خۆی کرد، وتی: تۆ چی ئەڵیٚ باوکی سەعید؟ وتی: ئەڵیٚم لەوانەیە فریشتەیەك ی توندوتیژی پەروەردگار کە لە فەرمانی پەروەردگار دەرناچیٚت یەخەت پیٚ بگریٚت ئەی کوڕی هبیرە و لە فراوانی ئەو کۆشکەتەوە بتهیٚنیٚتە دەرەوە بۆ ناو گۆڕی تەسك و تاریك، ئەی عومەری کوڕی هەبیرە ئەگەر لە خوا بترسیت ئەوە ئەتپاریٚزیٚت لە یەزیدی کوڕی عبدالملك، بەلام یەزید ناتوانیٚ بتپاریٚزیٚت لە خوای گەورە، ئەی عومەری کوڕی هبیرە بیٚ خەم مەبە لەوەی کە خوای گەورە بە خراپترین کار سزات بدات کە بۆ یەزیدی کوڕی عبدالملك ئەنجامی ئەدەیت و دەرگای لیٚخۆشبونت لیٚ داخات، سویٚند بەخوا ئەی کوڕی هبیرە خەڵکانیٚکم لە پیٚشینانی ئەم ئوممەتە بینیوە کە لە هەڵپە کردنی ئیٚوە بۆ دونیا زیاتر لە دونیا ڕایان دەکرد و دونیاش بە دوایانەوە بوو، ئەی کوڕی هبیرە من بەشیٚویٚك ئەترسیٚنم کە خوای گەورە ترساندویتی پیٚ: ﴿ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِي وَخَافَ وَعِيدِ ﴾ إبراهيم: ١٤). ئەی عومەری کوڕی هبیرە ئەگەر لەگەڵ خوادا بیت لە گویٚڕایەڵیٚدا ئەوە لە تۆڵە و زەبری یەزیدی کوڕی عبدالملك ڕزگارت دەکات، بەلام ئەگەر بۆتاوان

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٥.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٥.

لەگەڵ یەزیدی کوڕی عبدالملك دا بیت ئەوە خوا دەتداتە دەست ئەو، ئەڵێ عومەریش گریا و قسەکانی جێبەجێ کرد و ڕۆژی دواتر خەلات و مۆڵەتی بۆ ناردن و پشکی حەسەن لەوەی شەعبی زۆر تر بوو، شەعبیش چووە دەرەوە بۆ مزگەوت وتی: خەڵکینە هەرکەسێك لە ئێوە ئەتوانێت خوای گەورە پێش بەندەکانی بخات لە گوێڕایەڵیدا بابیکات، سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە حەسەن شتێکی نەزانیوە من نەمزانێت، بەلام ویستم کوڕی هبیرە لە خۆم ڕازی بکەم، بەلام خوای گەورە دووری خستمەوە لێی [1].

هەروەها حەسەن ئەڵێ: سەرپێچی فرمانی خوا مەکەن، چونکە سەرپێچی کردنی فرمانی خوا ئاوەدان کردنەوەی ماڵێکە کە خوای گەورە بڕیاری وێران بوونی داوە [2]، هەروەها حەسەن دەربارەی: ﴿فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا﴾ الإسراء: ٢٥). ئەڵێ: ئەو کەسەیە کە بە کردەوە و بەدڵی ڕوی کردۆتەوە خوا [3].

هەروەها ئەیوت: ڕەحمەتی خوا لە کەسێك کە بەهێز بێت و ئەو بەهێزیەی لە گوێڕایەڵی و تاعەتی پەروەردگاردا بەکار بێنێت، یان لاوازبێت و خۆی لە سەرپێچی پەروەردگار بپارێزێت [4].

●**بیرکردنەوە و پەند وەرگرتن:** خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ﴾ آل عمران: ١٩٠). واتە: بەڕاستی لە درووست کردنی ئاسمانەکان و زەویدا و لە جیاوازی و گۆڕانی شەو و ڕۆژدا چەندەها بەڵگە هەیە بۆ خاوەن ژیری یەکان.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَفِىٓ أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾ الذاريات: ٢١). واتە: وە لە خودی خۆشتاندا(بەڵگەی زۆر هەیە) دەی ئایا بۆ وورد نابنەوە و سەرنج نادەن. کەواتە: بیرکردنەوە و ڕامان لەبوونەوەر و دەروونی مرۆڤ و بەڵگە بینراوەکانی پەروەردگار هۆکارێکی بەهێزە بۆباوەڕ، چونکە گەورەیی و مەزنی دەسەلاتی پەروەردگاری تیادا دەردەکەوێت و ڕێکخستن و تۆکمەیی سەر

---

[1] - الزهد للحسن البصري، ل: ٧٦.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٧.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٧.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٦.

سورهێنەری تیادا بەدی دەکرێت کە بەڵگەیە لەسەر فراوانی زانستی پەروەردگار و گشتگیری دانایی و ئەو هەموو بەخشش و بەهرە زۆرەی لە ژماردن نایەت و بەڵگەیە بۆ میهرەبانی و بەخشندەیی و چاکی پەروەردگار ئەمەش ئەخوازرێت کە ستایشی بکرێت و دڵسۆزانە بپەرسترێت ئەمەش کرۆك ونهێنی باوەڕە [1].

بەم شێوەیە حەسەن(رضي الله عنه) بانگهێشتی کردوین بۆ بیرکردنەوە و تێرامان و پەند وەرگرتن و ئەڵێت: باشترین کردەوە پارێزگاری و بیرکردنەوەیە [2]. هەروەها ئەڵێ: هەرکەس خوای گەورە بناسێت خۆشی دەوێت و هەرکەس دونیا وەك خۆی ببینێت هەڵپەی بۆ ناکات، باوەڕداریش ڕۆناچێت هەتاوەکو بێ ئاگانەبێت، هەرکە بیری کردەوە خەم دەخوات [3].

هەروەها ئەیوت: ڕەحمەتی خوا لە کەسێك کە سەرنج بدات و ڕابمێنێ و بیربکاتەوە و پەند وەربگرێت و پەندیشی وەرگرت بەرچاوی ڕوون ببێتەوە و کاتێ بەرچاویشی ڕوون بوویەوە ئارامگربێت، چونکە خەڵکێکی زۆر ڕاستیەکانیان بۆ دەرکەوت، بەلام دانیان بۆ خۆیاندا نەگرت و بێزاری دڵی داگیر کردن و نەگەشتن بە ئامانج و نەشگەڕانەوە بۆ ئەوەی کە وازیان لێ هێنا بەم شێوە دونیا و داواڕۆژیان لەکیس چوو ئەوەش دۆڕاندنێکی ئاشکرایە [4].

هەروەها ئەفەرموێت: کاتژمێرێك بیرکردنەوە باشترە لە خواپەرستی شەوێك [5]، هەروەها ئەیفەرموو: بیرکردنەوە ئاوێنەیە کە ئاشنات دەکات بە چاکە و خراپەکانت. جا هەرکەس پشتی بێ ببەستێت سەرفرازە و هەر کەسێکیش پشتگوێی بخات ئابڕوی دەچێت [6].

- **زانست و زانایان:** هەروەها ئەیوت: تێگەیشت دەفری زانستە، زانستیش بەڵگەیە بۆ کردەوە و کردەوەش چاو ساغی مرۆڤ بۆ چاکە، ئارەزووش کەشتی تاوانە و سامانیش دەردی خۆ بە زلزانانە و دونیاش بازاڕی دواڕۆژە و سەرشۆڕی و داماویش بۆ کەسێك کە بەخششەکانی

---

[1] - شجرة الايمان للسعدي، ل: ٤٩، الوسطية في القرآن، ل : ٢٣٩.

[2] - الزهد، للحسين البصري، ل: ٨٢.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨٣.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨٣.

[5] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨٣.

[6] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨٣.

خوا بۆ سەرپێچی کردنی بەکار بێنێت[1]. هەروەها ئەیوت: کاتێ خۆی کەسێك داوای زانستی دەکرد و پاش ماوەیەك لە ڕەفتار و هەڵس و کەوت و زمان و چاو و کارەکانیدا ڕەنگی دەدایەوە[2].

**ج- نەهی کردن لە هیوا درێژی و خۆبەلزانین:**

●نەهی کردنی لە هیوا درێژی: حەسەن ئەفەرموێ: باوەڕدار لە دونیا دا غەریبە و ململانێ لەسەر ناکات و دڵنیا نیە لێی، خەڵکی دڵنیان لێ ی و ئەویش بە خەیاڵیدا نایەت خۆشبەختی بۆ کەسێك کە کاری چاك بکات و چاکە پێش بخات بۆ ڕۆژی داماوی و هەژاری[3]. هەروەها ئەیوت: هەر کەسێك هیوای درێژ بێت کردەوەی خراپ دەبێت[4]، لە وتەیەکی بەنرخیدا ئەڵێ: ئەی ئادەمیزاد، تۆ چەند ڕۆژێکی، هەر کە ڕۆژێك تێپەڕی بە شێکیش لە تۆ لە گەڵیدا دەڕوات[5].

●نەهی کردن لە خۆبە گەورە زانین: حەسەن(ﷺ) ئەفەرموێت: ئەی ئادەمیزاد، چۆن خۆت بەگەورە دەزانیت لە کاتێکدا کە دووجار بە بۆری میزدا تێپەڕیویت[6]. هەروەها ئەڵێن: حەسەن(ﷺ) نەعیمی کوڕی رضوانی بینی کە بە لوتبەرزیەوە دەڕۆشت بەڕێ دا ئەویش وتی: سەیری ئەمە بکەن هیچ ئەندامێکی لەشی نیە کە بەخششێکی خوا و نەفرەتێکی شەیتانی بەسەرەوە نەبێت[7].

**٣- ئەو قوتابیانەی حەسەنی بەسری کە ناسراو بوون بە زانستی سلوك و سۆفیگەری:** حەسەنی بەسری(ﷺ) یەکێك بوو لە زانایانی ئەهلی سوننەت و گرنگی دەدا بەزانستی سلوك و مەجلیسێکی تایبەتی هەبوو لە ماڵەکەیدا کە هەموو باس و خواسەکانی تیایدا سەبارەت

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ٩٢.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٩٢.

[3] - الزهد، للحسین البصري، ل: ٨١.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨١.

[5] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨١.

[6] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٥٧٩).

[7] - سیر اعلام النبلاء(٦ / ١٥).

بەزوهد و سلوك و خواناسی بوو، هەروەها کۆمەڵێك پیاو چاك کاریگەر بوون بە قوتابخانەی حەسەنی بەسری و بوونە ئەستێرەی درەوشاوە لەناو زانایانی ئەهلی سوننەتدا، لەوانە:

أ- **ئەیوبی سختیانی:** زانای پایەبەرز و پێشەنگی زانایان، ئەبوبەکری کوڕی ابی تمیمەی کیسان[1]. متمانە پێکراو و بەهێز بوو لە فەرموودەدا و دادگەر و خواناس و خاوەنی زانستێکی فراوان بووە [2]، ئەگەر پرسیاریشی لێبکرایە دەربارەی شتێك کە هیچی لەو بارەیەوە لانەبوایە ئەیوت: پرسیار بکەن لە زانایان، زۆر جاریش ئەیوت: نازانم، تەنانەت حەممادی کوڕی زەید ئەڵێ: کەسم نەبینیوە هێندەی ئەیوب ویونس بلێ نازانم، هەروەها حەزی دەکرد زاهید و دونیا نەویستی بە نهێنی بهێڵێتەوە و ئەیوت: ئەگەر کەسێك زوهدی بشارێتەوە باشترە لەوەی کە ئاشکرای بکات [3].

هەروەها ئەیوب: چل حەجی کردووە، عبداللە ی کوڕی عومەریش دڵی ئاسوودە ئەبوو کە لە وەرزی حەجدا خەڵکانێك ببینێت کە خوای گەورە دڵی ڕوناك کردونەتەوە بە ئیمان هاوشێوەی ئەیوب [4]، هەروەها ئەیوت: هاوڕێی یەزیدی کوڕی وەلیدی کوڕی عبدالملك بوو، کاتێ یەزیدی بووبە خەلیفە وتی: خوا یە منی لە بیر ببەرەوە [5]، هەروەها هەمیشە دەم بەخەندە بوو لەگەڵ خەڵکیدا [6].

- چەند هەڵوێستێك و وتەیەکی ئەیوب:
- بە گەورە زانینی ئەهلی سوننەت: ئەیوب ئەڵێ: کاتێ ئاگادارم ئەکەنەوە کە کەسێك لە ئەهلی سوننەت کۆچی دوایی کردووە هەست دەکەم ئەندامێك لە ئەندامەکانم لێ بووەتەوە[7].
- هەڵوێستی بەرامبەر بە خەڵکی بیدعەچی و ئارەزووباز: ئەڵێت: هەتاوەکو خاوەن بیدعەی هەوڵی زیاتر بدات زیاتر لە خوا دوور دەکەوێتەوە [1]. هەروەها لە ئەیوبەوە هاتووە کە ئەبو

---

[1] - الطبقات(٧ / ٢٤٦).

[2] - تاريخ التصوف الاسلامي د. بدوي، ص: ١٨٩.

[3] - الحلية(٣ / ٤).

[4] - الحلية(٣ / ٦).

[5] - الحلية(٣ / ٩).

[6] - الحلية(٣ / ٩).

[7] - الحلية(٣ / ٩).

قلا بە وتویەتی: لەگەڵ خەڵکی نارەزوبازدا دا مەنیشن و مشتومڕیان لەگەڵدا مەکەن، چونکە من دڵنیانیم کە لە گومڕایی خۆیاندا نوقمتان نەکەن و یان گومانتان لەوشتانەدا بۆ دروست نەکەن کە ئەیزانن [2]. ئەیوبیش ئەڵێ: سوێند بەخوا ئەو یەکێك بووە لە زانا دڵ زیندوو زیرەکەکان [3].

●حەزکردنی لە گەشتنی بە برا ئیماندارەکانی: لەم بارەیەوە ئەڵێ: یەکێك لەوشتانەی کە حەجم لا خۆشەویست دەکات ئەوەیە کە بە چەند برایەکم بگەم کە لە شوێنی تردا پێیان ناگەم [4].

●پەرستشی: یەکێك بوو لە خواناسە بەناوبانگەکان کە بە باشی و زۆری پەرستش ناسراو بوو، لەگەڵ ئەمەشدا زۆر مەبەستی بوو کە پەرستشەکانی شاراوە و دڵسۆزانە بێت بۆ پەروەردگار [5]. هەروەها ئەیوب لە ناودارانی خەڵکی بەسرە و شوێنەکەوتوی شوێنکەوتوان(تابعی تابعین) بوو و ناسرا بوو بە چاکە و زانست و خواناسی [6]. حەج و عەمرەی زۆر بوو لەبەر وەسیەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەئەفەرموێت: با حەج و عەمرەتان بە دوای یەکدا بێت [7] بۆیە ئەیوب چل حەجی کرد [8]. هەروەها شەو هەڵدەستا بۆ شەونوێژ و ئەیشاردەوە، هەر کە کاتێ بەیانی دەهات دەنگی بەرز دەکردەوە وەك ئەوەی کە تازە هەستا بێت [9].

●زوهد و دونیا نەویستی: ئەیوب ئەڵێ: زوهد لە دوونیا دا سێ شتە خۆشەویسترین و بەرزترین و گەورەترینی لای خوا ئەوەیە کە زوهدی هەبێت لە پەرستنی غەیری خوا لە پاشا وبت و داروبەرد، پاشان زوهد لەو شتانەی کە خوا قەدەغەی کردوون لە وەرگرتن و بەخشیندا،

---

[1] - الامام ايوب السختياني ل: ٤٦ د. سليمان العربي.

[2] - البدع و النهي عنها، ل: ٤٨ لابن وضاح.

[3] - الامام ايوب السختياني، ل: ٤٨.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل: ٥٠.

[5] - مشاهير علماء الامصار، ل: ١٥٠ ژمارە ١١٨٣.

[6] - مسند احمد رقم ١٦٧ ئەم فەرموودەیە صحیحە و لە چەند ڕێگەیەکەوە هاتووە.

[7] - حاية الاولياء(٣ / ٥).

[8] - المعرفة والتاريخ(٢ / ٢٤١)، الامام السختياني، ل: ٥٢.

[9] - طبقات ابن سعد(٧ / ٢٤٧) الامام ايوب، ل: ٧٥.

پاشان ڕووی تێ دەکردین ئەیوت: زوهدی ئێوەش ئەی قورئان خوێنان کەمترین زوهدە لای خوا کە ئەویش زوهدە لەوشتانە دا کە حەلاڵن [1].

- گەواهی حەسەنی بەسری بۆی: حەسەن دەربارەی ئەڵێت: ئەمە گەورەی لاوانە [2]. هەروەها ئەڵێت: ئەیوب گەورەی لاوانی ئەهلی بەسرەیە [3]، سەبارەت بە گەواهی دانی ئەیوب بۆ حەسەنی مامۆستاشی ئەڵێت: حەسەن قسەی وەك مرواری وا بوو و ئەووانەی دوای ئەو دەدوان ئەتوت ئەڕشێنەوە [4]، هەڕوەها ئەڵێ کە چوار ساڵ لەگەڵ حەسەندا بووم شەرمم دەکرد پرسیارێکی لێ بکەم هێندە بەسام بوو [5].
- کۆچی دوایی: دوای تەمەنێك کە لە پەرستشی پەروەدگار و فێربوون و فێرکردن وپەروەردە و لە خوا ترسان و دەستگرتن بە سوننەت و بەگەورە ڕاگرتنی سوننەت و سەر کۆنە کردنی ئەهلی بیدعە و ئارەزوو و دڵسۆزی لە زانست و کار کردندا بۆ خوا کۆچی دوایی کرد بە هۆی نەخۆشی تاعون کە لەبەسرەدا بلاّو بوویەوە لە ساڵی ١٣١ کۆچی [6]. هەروەها ئەبو نەعیم بەسنەدی خۆی لە حمادی کوڕی زەیدەوە ئەیگێڕێتەوە و ئەڵێ: مەیمون ی باوکی حەمزە ڕۆژی هەینی پێش نوێژی هاتەلام و وتی: من دوێنێ ئەبو بەکر و عومەرم بینی لە خەودا و پێم وتن: چی هێناونی؟ وتیان: ئێمە هاتووین نوێژ لەسەر ئەیوبی سەختیانی بکەین، هەروەها ئەڵێ: ئەوە نەیزانیبوو کە ئەیوب کۆچی دوایی کردووە بۆیە پێم وت: دوێنێ ئەیوب کۆچی دوایی کرد [7].

ب- **مالیکی کوڕی دینار:** گەورەی زانایانی خواناس و، کەسێکی کەم وێنە و لە شوێنکەوتوانی باوەڕپێکراو و لەو کەسە دیارانەیە کە قورئانی نووسیوەتەوە [8].

---

[1] - حلية الاولياء(٣ / ٣) الامام ايوب: ٧٥.

[2] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٥٧٧).

[3] - طبقات ابن سعد(٧ / ٢٤٧) الامام ايوب، ل: ٧٥.

[4] - حلية الاولياء(٣ ،/ ١١) الامام ايوب، ل: ٧٥.

[5] - الوافي بالوفيات(١٠ / ٥٤، ٥٥) الامام ايوب، ل: ٩٦ ز

[6] - سير اعلام البلاء(٦ / ٢٣)

[7] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٦٢).

[8] = هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٦٢).

❖ له هه‌ڵوێست و وته‌كانی:

● كاریگه‌ر نه‌بوونی به‌ستایش و زه‌مكردن: ئه‌ڵێ: له‌و كاته‌وه كه خه‌ڵكم ناسیوه دڵخۆش نه‌بووم به‌ستایشیان و دڵگران نه‌بووم به زه‌میان، چونكه ستایش كار و زه‌مكه‌رانیان زیاده‌ڕه‌وی ده‌كه‌ن ئه‌گه‌ر زانا بۆ كاركردن فێری زانست ببێت ئه‌یشكێنن و ئه‌گه‌ر بۆ غه‌یری كاركردنیش فێری ببێت ئه‌وه وه‌ك شانازی بۆی تۆمار ده‌كه‌ن [1].

● دڵته‌نگی و خه‌مخۆری: ئه‌ڵێ: ئه‌گه‌ر خه‌م له دڵدا نه‌بوو وێران ده‌بێ، هه‌روه‌ها ئه‌ڵێ: هه‌ركه‌س له زرق و باقی دونیا دوور بێت ئه‌و زاڵ بووه به‌سه‌ر ئاره‌زوی دا [2].

● هات دزی بكات به‌ڵام ئێمه ئه‌ومان دزی: ئه‌ڵێن دزێك هاتۆته لای، به‌ڵام هیچی ده‌ست نه‌كه‌وتووه هه‌ر بۆیه مالیك هاواری لێكرد و وتی: هیچ شتێكت له ماڵی دونیا ده‌ست نه‌كه‌وت، كه واته خه‌می قیامه‌تت بخۆ؟ كابراش وتی: باشه، پاشان ده‌ستنوێژی گرت و دوو ڕكات نوێژی كرد و پاشان دانیشت و دواتر چوو بۆ مزگه‌وت، وتیان ئه‌وه كێیه؟ وتی: هات دزی بكات به‌ڵام ئێمه ئه‌ومان دزی [3].

● خۆشترین شت له دونیا دا ناسینی په‌روه‌ردگاره: ئه‌ڵێ: خه‌ڵكی دونیا له دونیا ده‌رچوون و خۆشترین شتیان تیادا نه‌چه‌شت، وتیان: ئه‌وشته چی یه؟ وتی: ناسینی په‌روه‌ردگار.

● خۆشویستنی له‌لایه‌ن ئه‌نه‌سی كوڕی مالیكه‌وه: مالیكی كوڕی دینار ئه‌ڵێ: من و ئه‌نه‌س و ثابیت و یه‌زیدی ڕقاش چووینه خزمه‌تی ئه‌نه‌س، ئه‌ویش سه‌رنجی داین و وتی: ئێوه زۆر له هاوه‌ڵانی محمد(ﷺ) ده‌چن ئێوه به‌لامه‌وه له كوڕه‌كانم خۆشه‌ویست ترن ئه‌گه‌ر له چاكه‌كاری دا له‌وان باشتر بن، من پارشێوان دوعاتان بۆ ده‌كه‌م [4].

● سه‌رچاوه‌ی بژێوی: به چوار مانگ قورئانی ده‌نوسیوه و كرێكه‌ی لای به‌قاڵێك داده‌نا و كه‌ل و په‌لی ده‌برد [5].

---

[1] - هه‌مان سه‌رچاوه(٥ / ٣٦٣).

[2] - هه‌مان سه‌رچاوه(٥ / ٣٦٣).

[3] - هه‌مان سه‌رچاوه(٥ / ٣٦٣).

[4] - سیر اعلام النبلاء(٥ / ٣٦٤).

[5] - هه‌مان سه‌رچاوه(٥ / ٣٦٤).

• کۆچی دوایی: لە ساڵی ١٢٧ ك و ئەشڵێن ١٣٠ ك کۆچی دوای کرد [١]، هەروەها مالیکی کوڕی دینار یەکێ بوو لە زانایانی ئەهلی سوننەت ن نابێت گوێ بۆ ئەو کەسانە بگریت کە شتی لاوازیان داوەتە پاڵی گوایا شتی ناشەرعی تێکەڵاوی لایەنی ڕۆحی لە ئیسلامدا کردووە[٢]. بەڵکو لە ژیاننامەیدا دەرکەوتووە کەلەسەران و پێشەوایانی بواری سلوك و خواناسیەوە یەکێکە لە قوتابیانی حەسەنی بەسری و ئەنەس کوڕی مالیك و ئەحنەفی کوڕی قەیس و سەعیدی کوڕی جوبێر و محمدی کوڕی سیرین و قاسمی کوڕی محمد [٣] زانایانی ئەهلی سوننەت.

ج- **محمدی کوڕی واسع:** پیشەوای خواویست و پێشەنگ [٤]. لەباسی فتوحاتی سەردەمی عبدالملك دا باسم لە ژیانی کردووە، بەو پێیەی لەناو سوپای قوتەیبەی کوڕی مسلم دابووە و ماوەیەك لە خوراسان دا ماوەتەوە [٥]. مالیکی کوڕی دیناریش لەبارەیەوە ئەڵێ: قورئان خوێنان سیانن: قورئان خوێنێك مەبەستی خوایە و یەکێکی تریش مەبەستی دونیایە و یەکێکیش قورئان خوێنی پاشاکانە ئاگادر بن کە محمد ی کوڕی واسع لای من لە قورئان خوێنانی خواویستە [٦].

حەسەنی بەسریش بە ڕازێنەری قورئان خوێنان ناوی کرد بوو [٧]، لە وتەکانیشی: ئەگەر بەندە بە دڵ ڕووی کردوە پەروەدگار، خوای گەورە دڵی بەندەکانی بۆ دەکاتەوە، هەروەها ئەیوت: لەگەڵ نزا و پارێزکاریدا کەمێك کردەوە بەسە [٨]، ئەمانە بەناوبانگترین قوتابیەکانی حەسەنی بەسری بوون لە زانستی سلوك دا و کاریگەریەکی زۆریان هەبوو لە ژیانی خەڵکیدا، ئەمڕۆش ئێمە زۆر پێویستمان بە زیندووە کردنەوەی ئەم زانستە هەیە کە ئێستا زۆر کەم و دەکمەنە و هەندێ خەڵکی بەناو زانا و

---

[١] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٦٤).

[٢] - تاريخ التصوف الاسلامي، ل: ٢٠٧.

[٣] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٣٦٢).

[٤] - هەمان سەرچاوە(٦ / ١١٩)

[٥] - تاريخ التصوف الاسلامي، ل: ٢١٧، اللية(٢ / ٣٥٣).

[٦] - الحلية(٢ / ٣٤٥) تاريخ التصوف الاسلامي، ل: ٢١٤.

[٧] - تاريخ التصوف الاسلامي، ل: ٢١٤.

[٨] - سير اعلام النبلاء(٦ / ١٢١).

خاوەن بیروباوەڕی نا دروست و بۆچوونی نارەوا و لادەر لافی لێ دەدەن دیارە ئوممەتیش پێویستی بە ڕێبازێکی پەروەردەیی سوننیەکە بنەماو لقەکانی لە قورئان وسوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی بەڕێز و ئەو زانا خوا ویستانەوە کە لە سەر ڕێبازی ئەوان دەڕۆن وەرگرتبێت و لەبەرامبەر شاڵاوی مادی گەری ولێشاوی ئارەزووبازی دا دەوەستن کە لە هۆکارەکانی بوژانەوە و ڕابوونی ئوممەت بریتیە لە جڵەوکردنی ئارەزووەکانی و پاککردنەوەی دەرونەکان لە نەخۆشی و دەردەکان و زیندوو کردنەوەی بەها ئیمانی یە باڵاکان وەك ترس و ئومێد ودڵسۆزی و گەڕانەوە بۆلای پەروەردگاری جیهانیان.

٤- **بێ بەری بوونی حەسەنی بەسری لە موعتەزیلە :** موعتەزیلە لافی ئەوە لێ دەدەن کە حەسەنی بەسری وەك ئەوان قەدەری بوو و لەوان بووە، و لە داودی کوڕی ابی هندەوە ئەگێڕنەوە کەوتویەتی: گوێم لە حەسەن بوو، ئەیوت: هەموو شتێك قەزاو قەدەرە و نوسراوە جگە لە تاوانەکان [1]، هەروەها چەند نامەیەك ئەهێنن کە حەسەنی بەسری(رضي الله عنه) ناردوویەتی بۆ عبدالمليكی کوڕی مروان و تیایدا وەك موعتەزیلە باسی قەدەری کردووە، هەروەها ئەڵێن: نامەکانی لەم بارەیەوە بەناو بانگن [2]، شیخ محمد ابو زهرەش زۆر دڵگەرم بووە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە حەسەنی بەسری(رضي الله عنه) ڕای لە مەسەلەی قەدەردا وەك موعتەزیلە بووە [3].

وەڵامی ئەم قسە بێ بنەمایانەش ئەمەیە:

أ- خودی موعتەزیلە دڵنیا نین لەوەی کە حەسەن(رضي الله عنه) لەوان بێت: هەر بۆیە کاتێ باسی حەسەن و وتەکەی لەبارەی قەدەروە کرا لای ئیبن ئەلمرتضی وتی: ئەگەر بڵێ ی ئەیوب گێڕاویەتیەوە، کە چووەتە لای حەسەن و دەربارەی قەدەر قسەی لەگەڵ دا کردووە ئەویش وازی لەو مەسەلە یە هێناوە ئەوە ئەڵێم: ئەگێڕنەوە کە هەڕەشەی لێکردووە بە دەسەڵات ترساندویەتی و ئەویش وازی هێناوە، بەڵام ئایا کەسێکی وەك حەسەن کە هەمیشە حەق ی ڕاشکاوانە دەربڕیوە لە دسەڵات دەترسێت؟

---

[1] - المنية الامل لابن المرتضى، ل: ١٢، القضاء و القدر، د. المحمود ن ل: ١٨٥.

[2] - القضاء و القدر في ضوء الكتاب و السنة و مذاهب الناس، ل: ١٥٦.

[3] - تاريخ الجدل ،ل: ٣٢١ – ٣٢٢.

ب- سەبارەت بەو نامەیەش کە دراوەتە پاڵی شەهرەستانی ئەڵێ: نامەیەکم بینی کە درابوویە پاڵ حەسەنی بەسری کە بۆ عبدالملکی کوڕی مەروانی نووسیوە وتیایدا پرسیاری لێکردووە دەربارەی قەدرە و زۆر کردن ئەویش بە جۆرێك وەڵامی داوەتەوە کە دەگونجێ لەگەڵ مەزهەبی قەدەری دا و تیایشدا پشتی بەستووە بە قورئانی پیرۆز و بەڵگەی ئەقڵی، ڕەنگە ئەم نامەیەش لەلایەن واصلی کوڕی عطاء وە نووسرا بێت، چونکە حەسەن(ﷺ) لەو کەسانە نەبووە کە جیاواز لە سەلەف بیربکاتەوە لە وەدا کە قەدەر بەخێر و شەڕیەوە لە خواوەیە [1]، هەرچەندە ساغیش نەبووەتەوە، کە ئەم نامەیە لەلایەن حەسەنەوە(ﷺ) نوسرا بێت، چونکە موعتەزیلە چەند وتەیەکی تر ئەدەنەپاڵ حەسەن کە سەنەدی پچڕاوە و مرتضاش کاتێ باسی -ئەهلی عەدل و توحید - دادگەری و یەکتاپەرستی دەکات ناوی حەسەنی بەسری هێناو و بەدرێژی باسی ژیانی کردووە، کاتێ ویستوشیەتی کە بیسەلمێنێت ئەو لە ئەهلی عدلە ئەڵێ: لەوتەکانی لەبارەی عەبدل و دادگەریەوە عەلی کوڕی جەعەد ئەیگێڕێتەوەو ئەڵێ: گوێم لە حەسەن بوو ئەیوت: هەر کەسێك بڵێت گوناه لە خواوەیە ئەوە لە ڕۆژی دواییدا بە ڕو ڕەشی دێتە خزمەت پەروەردگار پاشان ئایەتی: ﴿ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسۡوَدَّةٌۚ أَلَيۡسَ فِي جَهَنَّمَ مَثۡوٗى لِّلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴾ الزمر: ٦٠). واتە: لە ڕۆژی دوایی دا دەبینی ئەوانەی درۆیان بۆ خوا هەڵدەبەست ڕوویان ڕەشە ئایا لە دۆزەخ دا شوێنێك نی یە بۆ خۆ بەگەورە زانان. ئەم عەلی کوڕی جەعدەش کە ئەڵێ: گوێم لە حەسەن بوو نەگوێی لێ بووە نە پێی گەشتووە [2]، چونکە ئەم ڕیوایەتانە بچڕان لەسەنەدەکانیاندا هەیە [3].

ج- ئیبن قوتەیبەش لە حەسەنی بەسریەوە ئەیگێڕێتەوە کە حەسەن هەندێك لە مەسەلەی قەدەر دواوە و پاشان لێی پاشگەزبووەتەوە، بەڵام هەردوای ئەوە باسی ئەوەدەکات کە عطائي کوڕی یەسار و مەعبەدی جوهەنی سەردانی خەسنیان دەکرد و ئەیانپرسی و ئەیانوت: ئەی ئەبو سەعید پاشاکان خوێنی موسڵمانان ئەڕژن و سەروماڵیان دەبەن وئەمە وئەوە دەکەن و ئەڵێن:

---

[1] - المنية و الامل، ل: ١٥.

[2] - القضاء والقدر في ضوء الكتاب و السنة، ل: ١٨٦.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٧.

کارەکانمان بە پێی قەدەری خوایە، ئەویش وتی: دوژمنانی خوا درۆ دەکەن [1]، ئیبن قیتبە ئەڵێ: ئەم جۆرە قسانە لە حەسەنەوە ئەگێڕنەوە [2]. ئەمەش لەوە دەچێت کە لێیەوە گێڕدراوەتەوە کە وتویەتی – ڕاستیشی وتوە: خوای گەورە محمدی ناردووە بۆ عەرەب و ئەوانیش قەدەرین و تاوانەکانیان ئەخەنە ئەستۆی خوا و ئەڵێن: خوای گەورە خۆی بڕیاری ئەمەی داوە کە ئێمەی تێداین و زۆری لێکردووین و فەرمانی بەو شێوە پێ کردوین، خوای گەورەش ئەفەرموێت: ﴿ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً قَالُواْ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾ الأعراف: ٢٨). واتە: وە کاتێ کردەوەیەکی زۆر بەدو ناشیرینیان دەکرد(کە بە ڕووتی تەواف کردن نموونەیەکیەتی) دەیان ووت: لە باوو باپیرانمانەوە بۆ مان ماوەتەوە وە خوا فەرمانی ئەو(کردەوە)ی پێ داووین(ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ بێ گومان خوا فرمان نادا بە کردەوەی بەدوو خراپ ئایا بەدەم خواوە شتێ دەڵێن کە نایزانن و بێ ئاگان لێ ی؟

جا ئایا قسەی حەسەن لەو دو ڕیوایەتەدا بەڵگەیە لەسەر قەدەری بوونی؟ دیارە وەڵامی ئەمە ڕوونە، چونکە ئەو وەڵامی ئەوانە دەداتەوە کە قەدەر ئەکە نەپاساو بۆ بێ باوەڕی و تاوانکاری خۆیان بۆیە ئەم بەڵگە هێنانەوە و پاساوەش بەتاڵە و قسەکەی حەسەنیش ڕاستە [3].

ئیبن تەیمیەش ئاماژە بەوە دەکات کە وتویەتی: چەندین کەس تۆمەتبارکراون بەوەی کە قەدەرین و بەو شێوەیەش نەبوون، بەڵکو ڕازی نەبوون کە قەدەر بکرێتە پاساوێك بۆ تاوانکاری وەك بە پێشەوا ئەحمەد وترا: ئیبن ابی ذؤیب قەدەری بوو، ئەویش وتی: خەڵکی هەر کەسێك لەمەسەلەی تاوان کاری دا زۆریان بۆ بێنێت ئەڵێن: قەدەریە، ئەشڵێن: هەر بە هۆی ئەم قسەوە بووە کە بە حەسەنیان وتوە قەدەری [4].

د- هەروەها چەندین ڕیوایەتیش هەیە کە ئەم مەسەلەیە بە درۆ دەخاتەوە، بۆنموونە لە عومەری خزمەتکاری غفرەوە ئەڵێ: قەدەریەکان لاسایی حەسەنی کوڕی ابی لحەسەنیان دەکردەوە و

---

[1] – هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٧.

[2] – هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٧.

[3] - القضاء والقدر في ضوء الكتاب و السنة و مذاهب الناس، ل: ١٨٧.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٨.

قسەی ئەو جیاواز بوو لە قسەی ئەوان و ئەیوت: ئەی ئادەمیزاد، کەس ڕازی نەکەی بە نارازی کردنی پەروەردگار و گوێڕایەڵی کەسیش نەکەیت ئەگەر سەرپێچی پەروەردگاری لێناکەوتەوە، هەروەها سوپاسی کەس نەکەیت لەبەرامبەر بەخششەکانی پەروەردگار دا و لۆمەی کەسیش مەکە لەسەر شتێك کە پەروەردگار پێی نەداویت، خوای گەورە دروستکراوەکان و بوونەوەری بەدی هێناوە ئەوانیش لەسەر ئەو شێوە دەڕۆن کە دروستی کردوون جا هەرکەس وا دەزانێ کە سور بوونی لەسەر ڕۆژی ڕۆژی زیاد دەکاتە ئەوە با خەمی تەمەنی بخوات یان ڕەنگی بگۆڕێت یاخود ئەندامێك بۆ جەستەی یان پەنجەیەکی زیاد بکات[1].

هـ- ئاشکراشە کە موعتەزیلە کۆ دەنگن لەسەر پێنج بنەماکە، حەسەنی بەسریش بنەمای:(المنزلە – بین المنزلتین) واتە شوێنێك لە نێوان دوو شوێنەکەدا – لە نێوان بەهەشت و دۆزەخ دا – بە بیدعەداناوە بەلایەوە خاوەنەکەی لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەردەچێت، هەربۆیە واصلی کوڕی عطاء جیابوویەوە لە ئەڵقەی حەسەنی بەسری کاتێ لەم مەسەلەیەدا جیاوازی کەوتە نێوان یان ئیتر چۆن حەسەن(ﷺ) بە یەکێك لە زانایانی ئەوان دادەنرێت[2].

و- ئاشکراشە کە هەندێ لە موعتەزیلەی قەدەریە درۆیان بەدەم حەسەنی بەسریەوە کردووە، ئەوەتا عبداللە ی کوڕی احمد لە کتێبی السنة دا چەند ڕیوایەتێك دەگێڕێتەوە کە ئەوە دەسەلمێنێت، لەوانەش: ئەوەی کە لە حەمیدەوە ئەیگێڕێتەوە کە وتویەتی: حەسەن هات بۆ مەککە و زانایانی مەککەش وەك حەسەنی کوڕی مسلم و عبداللە ی کوڕی عبیدە وتیان: ئەگەر قسەت لەگەڵ حەسەندا بکردایە و ڕۆژێکی بۆ ئێمە تەرخان بکردایە، ئەڵێ منیش قسەم لەگەڵ حەسەندا کرد و وتم: ئەی باوکی سەعید براکانت حەز دەکەن ڕۆژێك لەگەڵتا دانیشتن، وتی: بەڵێ بەسەرچاو، ئینجا ڕۆژێکی بۆ دیاری کردن و پاشان لەگەڵیاندا کۆبوویەوە و حەسەن دەستی بە قسە کردن کرد و هەرگیز نەمیدوە هێندە ڕەوانبێژ و زمانپارو بێت، ئەوانیش پرسیاریان دەربارەی لاپەرەیەکی دوررو درێژ لێکرد ئەویش هەمووی بەباشی وت و تەنها لەیەك مەلەسەدا هەڵەی کرد، ئەوە بوو پیاوێك پێی وت: ئەی ئەبو سەعید کێ

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٨.

[2] - القضاء والقدر في ضوء الکتاب و السنة و مذاهب الناس، ل: ١٨٧.

شەیتانی دروست کرد؟ وتی: سبحان الله، سبحان الله جگە لە خوا دروستکەرێکی تر هەیە، پاشان وتی: خوای گەورە شەیتان و شەڕ و خەیری دروستکردووە، ئەوە بوو کابرایەکیش لەوان وتی: خوا لە ناویان بات درۆ بەدەم شێخەوە ئەکەن [1].

هەروەها حەمید بە کەسێك ئەڵێ کە لە عەمری کوڕی عبیدەوە فەرموویەکی گواستۆتەوە کە حەسەن گێڕاویەتیەوە: لە وەوەشت وەر مەگرە درۆ بەدەم حەسەنەوە دەکات [2]. هەروەها عبدالله ی کوڕی احمد لە حمادی کوڕی زەیدەوە ئەگێڕێتەوە کە وتویەتی: وتیان بە ئەیوب:

عەمر واتە عەمری کوڕی عوبەید لە حەسەنەوە ئەیگێڕێتەوە کە وتویەتی: ئەوەی کە بە هۆی بیرەوە سەر خۆش بووە جەڵدی لێ ناردێت [3]. ئەم ڕیوایەتانە و هاوشێوەکانیان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو وتەیەی کە دەڵێ حەسەنی بەسری(رضي الله عنه) قەدەری بوە یاخود لەگەڵ بۆ چوونەکانیاندا بوە ڕاست نیە [4].

دیارە مەبەستی موعتەزیلە ئەوەیە کە خۆیان بە هۆی پیاوێکی وەکو حەسەنی بەسریەوە شەرەفمەند بکەن ئەگینا چۆن بە ئەندامێکی خۆیانیان زانیوە؟ [5]، دیارە موعتەزیلە هەر بەمەوە نەوەستاون، بەڵکو ناوی خەڵکانێکی تریشیان بردووە، تەنانەت لە چینی یەکەمی خۆیاندا ناوی خولەفای ڕاشیدین و هاوەڵانیشیان هێناوە [6] ئاشکراشە ناو هێنانی ئەوانە لەناو موعتەزیلە دا مەبەست پێی پیشاندانی موعتەزیلەیە وەك خواناسترین و چاکترین کۆمەڵ [7].

لای قوتابیانی زانستە سەرعیەکان و موسڵمانانیش بە گشتی ئاشکرایە کە خولەفای ڕاشیدین و هاوەڵانی بەرێز بێ بەرین لە تۆمەتی موعتەزیلە بوون، چونکە ئەوان پێشەوا و گەورەی زانایانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتن کە لەسەر ڕێبازی پێغەمبەرایەتی ڕۆشتوون.

---

[1] - السنة لعبد الله بن الامام احمد(٢ / ١٢٦)

[2] - هەمان سەرچاوە(٢ / ١٣١)

[3] - هەمان سەرچاوە(٢ / ١٣٢).

[4] -القضاء و القدر في ضوء الكتاب و السنة، ل: ١٩١.

[5] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٩.

[6] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٨٩.

[7] - مذاهب الاسلاميين، عبدالرحمن بدوي،(١ / ٤٠).

٥- **پێشەوای دادپەروەر لە دیدی حەسەنی بەسری دا:** کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە حەسەنی بەسری نزیك بوو لێی و بە ئامۆژگاری و ڕێنمونی بەسەری دەکردەوە و ڕێبازی پێشەوای دادگەری بۆ کێشا و ئەمەش ڕۆڵێکی ئەرێنی و ئیجابی بوو لە لایەن حەسەنەوە(ﷺ) و کاری پێویستی زانای خوا ویستمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە هەولدەدات بۆ یارمەتیدانی پیاوچاکانی بڕیار بەدەست لە پێناو سەر خستنی ئیسلام دا، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر تەواوی کەسایەتی ئیسلامی حەسەن(ﷺ)، ئەوە بوو لە جیهاد و فێرکردن و پەروەردەدا بەشداری کردو پێشەوای قوتابخانەی چاکسازی کۆمەلایەتی بوو لە نێوان خەلکدا و گرنگی دەدا بە نەخۆشیەکانی دڵ و چارەسەری و، چەندین هەلوێستی سیاسیی هەبووە لەبەرامبەر شۆڕش و دەسەلاتدارە ستەمکارەکاندا، کەسایەتی سیاسیشی لەنزیکی لە عومەری کوڕی عبدالعزیز و پشتیوانی کردن و تیۆ ریزە کردنی بۆ چاکسازی و ئیصلاحی راشدین دا دەردەکەوێت کە عومەری کوڕی عبدالعزیز ڕابەرایەتی دەکرد، ئەوەتا لە نامەکەیدا کە بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیزی نوسیوە هاتووە: بزانە ئەی ئەمیری باوەڕداران: خوای گەورە پێشەوای داد پەروەردی کردووە بە ڕاستکەرەوەی هەموو لاری و لەناوبەری هەموو ستەمکار و چاککەری هەمو خراپەکار و بە هێزکەری هەموو لاوازێك و ماف سێنەرەوەی هەموو مافخوراو و ڕزگارکەری هەمو لێقەوما وێك.

هەروەها پێشەوای دادگەر ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك شوانی بەسۆز وایە بۆ حوشترەکانی، ئەو شوانە دڵسۆزەی کە باشترین لەوەڕگەیان بۆ دەدۆزێتەوە و لە تیاچوون ئەیانپارێزێت و گەرما و سەرمایان لێ دوور دەخاتەوە.

پێشەوای دادگەر ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك باوكی بەسۆزوایە بۆ منداڵەکانی بە بچوکی خەمیان دەخوات و بە گەورەیی فێریان دەکات، لە ژیانیدا بژێویان بۆ پەیدا دکات و پاشەکەوتیش بۆ پاش مردنی دەکات، هەروەها پێشەوای دادگەری ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك دایکی بەسۆز و دڵسۆز وایە بۆ منداڵەکەی: بەزەحمەت هەڵی دەگرێت لە سکیدا و بەزەحمەتیش دایدەنێت و بەمنداڵیش پەروەردەی دەکات شەونخونی بۆ دەکێشێت و بەخۆشی دڵخۆشە و بە ئازاری ئازار دەچێژێت، ماوەیەك شیری دەداتێ و ماوەیەك دەیبڕێتەوە، هەروەها پێشەوای دادگەر ئەی ئەمیری باوەڕداران سەرپەرشتی هەتیوان و دالدەدەری هەژارانە بچوکیان پەروەردە دەکات و یارمەتی

گەورەیان دەدات، هەروەها پێشەوای دادگەر ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك دڵ وایە لە نێوان جەستەدا و بەچاکی هەموو جەستە چاك دەبێت و خراپیشی خراپی هەموو جەستەی لێ دەکەوێتەوە، هەروەها پێشەوای دادگەر ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەو کەسەیە کە ئەبێتە هۆکار لە نێوان پەروەردگار و بەندەکانیدا، گوێ لە قورئان دەگرێت و ئەیەگەیەنێت بەوان و سەیری پەروەردگار دەکات و پیشانی ئەوانیشی دەدات و خۆی ملکەچی خوایە و ئەوانیش بەرەو خوا دەبات، جا تۆ لەوەدا کە خوای گەورە لە ژێر دەسەلاتدا دایناوە وەك بەندەیەك مەبە کە گەورەکەی ماڵ و منداڵی پێ سپاردوە، بەلام ئەو ماڵەکەی بەفیڕۆ داوە و منداڵەکانیشی ئاوارە کردووە، بشزانەئەی ئەمیری باوەڕداران کە خوای گەورە بۆیە سزا و یاساکانی داناوە هەتاوەکو خەڵکی لە خراپەو بەد ڕەوشتی دووربخاتەوە، هەروەها خوای گەورە تۆڵەی داناوە بۆ پاراستنی گیانی بەندەکانی، جا ئەبێ سزای ئەو کەسە چۆن بێت کە لەبری پاراستنی گیانیان خۆی ئەیانکوژێت؟

مەرگ و دوای مردنت لە یاد بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران و بێ کەسی خۆتت لەبیر نەچێت لەو کاتەدا و، خۆت ئامادە بکە بۆ مردن و دوای مردن و ئەو ڕۆژەی سەختەی کە بە دوایدا دێت، هەروەها بزانە ئەی ئەمیری باوەڕداران کە لەوێ جێیەکی ترت هەیە، جیا لەم جێیەی ئێستا چاوەڕوانیت تیادا زۆر دەبێت و خۆشەویستانت لێت جیادەبنەوە و لە چاڵێکی قوڵ دا بە تەنها جێت دەهێڵن جا توێشوو ئامادە بکە بۆ ئەو ڕۆژەی کە مرۆڤ لە براو باوك دایك و خێزان و منداڵەکانی هەڵدێت، هەروەها لە یادت بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران کە ئەگەر ئەوەی لە گۆڕدایە بلاوەی پێکرا و نهێنی دڵ و ناوسینەکان ئاشکرا کرا، ئەوە نهێنیەکانت ئاشکرا دەبن و نامەی کردەوەکانت هیچ گەورە و بچکوکێك نیە کە ئاماری نەکرد بێت ئێستاش ئەی ئەمیری باوەڕداران تۆ لە مۆڵەتدایت پێش هاتنی وادەی مەرگ و هیوابڕان بۆیە بە حوکمی نەفامان حوکمی بەندەکانی خوا مەکە و بەرێی ستەمکاران دا مەیانبە و دەسەلاتداران زاڵ مەکە بەسەر هەژاراندا، چونکە ئەوان ڕەچاوی هیچ وادە و بەڵێنێك ناکەن لەگەڵ باوەڕداران دا هەتاوەکو لەگەڵ تاوانەکانی خۆتدا تاوانی تریش نەیەتە کۆڵت و هێندەی تر باری شانت قورس نەبێت.

هەرگیز هەڵنەخەڵەتێی بەخۆشگوزەرانی ئەوانەی کە خۆشگوزەرانی ئەوان دەبێتە مایەی بەدبەختی تۆ و خۆشیەکان ی دونیایان بە لە ناوبردنی خۆشیەکانی ئەو دونیای تۆ تەواو دەبێت، هەروەها سەیری دەسەلاتی ئەمڕۆی خۆت مەکە، بەڵکو سەیری بێ دەسەلاتی سبەینێ ی خۆت بکە کە لە

چوارچێوەی مەرگ دا کۆت کراویت و لەبەردەمی پەروەردگار و فریشتەکان و پێغەمبەرانـدا وەستێنراویت و هەموو گەردن کەچ و بێ دەسەلاتن لەبەردەم دەسەلاتی خوای بەدەسەلات دا منیش ئەی ئەمیری باوەڕداران هەرچەندە ئامۆژگاریەکەم لـە ئاستی پیاوچاکانی پێش خۆمـدا نیـە، بـەلام کەمتەرخەمیم نەکردووە لە ئامۆژگاریو دڵسۆزیدا، جا ئەم نامەیەی من وەك دەرمانێك سەیر بکە کە لە خۆشەویستیێکەوە نێرداوە، هەرچەندە دەرمانەکان تاڵن، بەلام چاك بوونەوە و تەندروستی پێوەیە و سلاوی خوات لێ بێت ئەی ئەمیری باوەڕداران [1]. مانا سەرەکیەکانی ئەم نامەیەش ئەمانەن:

أ- گرنگترین ڕەوشت لە پێشەوا دا بریتیە لە دادگەری، بەلام ئەم دادگەریە ئاوێتەیـە بـە بـەزەیی باوکایەتی.

ب- لە پێشترین کەسێك بە شوێنکەوتنی سنوورەکانی پەروەردگار خودی پێشەوایە، چـونکە ئـەو ئەگەر خۆی پابەند نەبێت بە سنوورەکانەوە، ئەوە ژێر دەستەکانی هەرگیز پێوەی پابەند نابن.

ج- پێشەوا جێبەجێکاری تۆڵەیە - قصاص - بۆیە بۆی نیە کەسێك بەناڕەوا بکوژێت، دیـارە لـەو تۆڵە و کوشتنەوەشدا ژیان هەیە و لە پێناو پاراستنی ژیانی خەڵکیدایە، بۆیـە ڕەوانیـە کەسـێك ژیان لە خەڵکی بسێنێتەوە کە ئەرکی پاراستنی ژیان و گیانی خەڵکی لە ئەستۆدایە؟

د- چاکی هاوەلاتیان پەیوەستە بە چاکی دەسـەلاتدار و پێـشەوایانەوە و خراپیـشیان پەیوەسـتە بـە خراپیەوە بەرپرسیارێتیشی لە بەرامبەر کردەوەکانی دا بەرپرسـیارێتی لـە بەرامبـەر کـردەوەی ژێردەستەکانی دا ئەخوازێت، کەواتە بەرپرسیارێتیەکی زۆر مەزنی لە ئەستۆدایە.

هـ- ئەم بەرپرسیارییەش بەتایبەت لە دامەزراندنی والیەکاندا دەردەکەوێت، چـونکە ئـەو هەلانـەی کە کار بەدەست و والیـەکان دەیکـەن پێـشەوا و ئیمـام لێـی بەرپرسـیارە هەربۆیـە پێوسـتە لەسەری کە خەڵکی خۆ بە زلزان بەسەر خەڵکانی لاواز دا زاڵ نەکات، چونکە ئـەو خەڵکـە خۆبەزلزانە گوێ بە حورمەتی کەس نادەن و لە چاودێری پەروەردگاریش ناترسن، جا ئەگـەر پێشەوا یەکێك لەوانەی دیاری کـرد ئـەوە لەگـەڵ تاوانـەکانی خۆیـدا تـاوانی ئەوانیـشی لـە ئەستۆدایە [2].

---

[1] - الحسن البصري لابن الجوزي، ل: ٥٦، العقد الفريد لابن عبدربه( ١ / ١٢) تاريخ التصوف السني، ل: ١٩٧.

[2] - تاريخ التصوف الاسلامى، ل: ١٨٠.

٦- **حەسەنی بەسری وەسفی دونیا بـۆ عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز دەکـات:** حەسـەنی بەسـری نامەیەکی نووسی بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) وتیایـدا وەسـفی دونیـای بـۆ دەکـرد و ئەیوت: پاشان، ئەی ئەمیری باوەڕداران دونیا شوێنی گواستنەوە و ڕۆشتنە نەك شوێنی مانـەوە و جێگیر بوون، ئادەمیش کـاتی خـۆی وەك سـزایەك هێنرایـە دونیـا، جـا ئـەو کەسـەی کـە ئارەزووی لە دنیا یە دەبێ جێی بهێڵێت و دەوڵەمەندتیایدا هەژارە و خۆشبەخت ئەو کەسە یـە کە زۆر دڵی پێ خۆش نەکات، ئەگەر کەسێکی ژیر تاقی بکاتـەوە دەبینێـت کـە هـەر کـەس خۆشی بوێت سەرشۆڕی دەکات و هەرکەسیش کۆی بکاتـەوە دونیـا جیـای دەکاتـەوە، وەك ژەهر وایە کەسێك دەیخوات کـە نایناسـێت و کەسـێکی خۆشـی دەوێـت کـە شـارەزا نیـە و دواجاریش سەرت دەخوات، جا تۆ ئەی ئەمیری باوەڕداران وەك ئەو کەسە بە کەتیماری دەرد و برینی دەکات. ماوەماوە خۆی دەپارێزێت لە ترسی ئازاری بەردەوام، چـونکە ئـارام گـرتن لەسەر چارەسەرکردنی ئاسانترە لە تلانەوە بە ئازاریەوە، کەسی ژیریش ئەوەیە کـە خـۆی لـێ بپارێزێت و بەجوانی و ڕازاوەیی هەڵنەخەڵەتێ، چـونکە دونیـا خیانـەتکار و فریـودەرە و وەك بوك خۆی دەڕازێنێتەوە و چاوەکان بۆی دەڕوانن و دڵەکان تا مەزرۆی دەبن، بـەڵام دواجـار هاوسەرەکانیان لە ناو دەبەن جا خۆت لە گورزی بپارێزە ئەی ئەمیری باوەڕداران و ئاگات لە تێوەگلان بێت تیایدا، چونکە خۆشگوزەرانی تیایدا بێ دەرد و بەڵانیە و مانەوەش تیایدا بـەرەو تیاچوونت دەبات، بشزانە ئەی ئەمیری باوەڕداران کە ئـاوات و هیواکـانی دونیـا درۆینـەن و ڕونیەکەی لێڵیە و ژیانیش تیایدا تاڵە و کەسێکیش وازی لـێ بێنێـت سـەرکەوتووە وئـەوەش کەدەستی پێوە بگرێت نغرۆ و فەوتاوە، ژیریش ئەو کەسەیە کە لەو شتە بترسـێت کـە خـوای گەورە ترساندویەتی و بە ئاگا بێت لەوەی کە خوای گەورە ئاگاداری کردووەتەوە لێی و لـە زێدی تیاچوونەوە خۆی ئامادە بکات بۆ زێدی مانەوە.

لەکاتی مردندا یەقینی بۆدێت و دونیاش ئەی ئەمیری باوەڕداران جێ ی سـوایە و کەسـێك شـتی تیاکۆ دەکاتەوە کە ئەقڵی نەبێت و کەسێکیش پێی هەڵدەخەڵەتێ کە زانستی نـەبێت، کەسـی ژیـر و هۆشمەندیش وەك ئەو کەسە وایە کە برینی خۆی تیمار دەکـات دان بـەخۆدا ئـەگرێت لەسـەر تـاڵی دەرمان هەتاوەکو تەندروستی بۆ بگەڕێتەوە، هەروەها لە خراپی چارەنووسی لە دونیـادا دەترسـێت، سوێند بە خوا ئەی ئەمیری بـاوەڕداران دونیـا خـەوە و ڕۆژی دوایـی بێـدار بوونەوەیـە و مـەرگیش

کەوتۆتە نێوانیانەوە و بەندەکانیش لە خەوی پڕ و پوچدان، منیش قسەی ئەو دانایەت بیردەخەمەوە کە وتویەتی:

فان تنج من ذي عظيمة والا فاني لا اخالك ناجيا

واتە: ئەگەر تۆ خۆت ڕزگار بکەیت لەم مەسەلە گەورەیە ئەوە باشە ئەگینا من خۆم ڕزگار ئەکەم.

کاتێ ئەم نامەیەشی گەشت بە عومەری کوڕی عبدالعزیز هێندە گریا هەتاوەکو ئامادەبوان بەزەییان پیادا هاتەوە پاشان وتی: ڕەحمەتی خوا لە حەسەن ئەو بەردەوام لە خەوبێدار مان دەکاتەوە و بە هۆشی خۆمان دێنێتەوە، خوای گەورە لێی ڕازی بێت، چەند بەبەزەیی و ئامۆژگاریکەرێکی ڕاستگۆ و دڵسۆزە پاشان عومەر بۆی نووسی: ئامۆژگاریە بە سوودەکانت گەیشت و سوودی زۆرم لێ بینی، بەڕاستی دونیات وەك خۆی وەسف کردووە، ئاقڵ کەسێکە کە لێی بترسێت و وەك ئەوە وایە هەموو ئەوانەی کە مردنیان لەسەر نووسراوە مردبن و سلاو و ڕەحمەت ی خوات لێ بێت، کاتێ ئەم نامەیەی بەحەسەن گەشت وتی: خوای گەورە دەست بە باڵی ئەمیری باوەڕدارانەوە بگرێت چەندە حەق بێژ و ئامۆژگاری وەرگرە، بەڕاستی خوای بە گەورە ڕاگرتووە لەسەردەمی خۆیدا و بەزەیی بە ئومەتدا هاتووەتەو و بووە بە ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ خەڵك [1].

هەروەها بۆی نوسی: پاشان کارەساتی گەروە و کاری پێویست لەبەردەمتدایە و ئەبێ ئەوەت لە پێش چاو بێت، چ بە خۆ ڕزگار کردن یان پەك کەوتن [2].

٧- **هەڵوێستی بەرامبەر بەو شۆڕشانەی کە لە سەردەمی ئەو دا رووی دا** : حەسەنی بەسری(ﷺ) پێی وابوو کە گۆڕینی خراپە و نەهێشتنی گەندەڵی بە زۆر و شمشێر نابێت، بەڵکو بە تەوبە و گەڕانەوە بۆلای خوا و ئامۆژگاری کردنی کار بەدەستان دەبێت، لەم بارەیەوە ئەڵێ: چەند سەیرە ئەو کەسەی کە دەیەوێ بەزەبری شمشێر گۆڕانکاری دروست بکات، چونکە گۆڕانکاری تەنها بە تەوبەکردن دەبێت [3].

---

[1] - البخاري ذمارة ٦٧٢٤، مسلم ذمارة ١٨٤٩.

[2] - شذارات الذهب(١ / ١٣٧) حياة الحسن البصري د. روضة، ل: ١٩١.

[3] - حياة الحسن البصري، ل: ١٩٤، روضة الحصري.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەربارەی پێویستی ئارامگرتن لەسەر ئەو شتانەی کە پێت باش نیە لەلایەن دەسەڵاتدرانەوە ئەڵێت: " هەرکەس لە ئێوە شتێکی لە ئەمیرەکەی بینی با دان بە خۆیدا بگرێت، چونکە هەر کەسێك بستێك لە کۆمەڵ جیا بێتەوە و بمرێت ئەو نەفامانە دەمرێت [1] "

دوای تێگەیشتنیشی لەم فەرموودەیە و هاوشێوەکانیشی پێی وایە کە خۆسەپاندنی دەسەڵاتداران سزایە کەلەلایەن خواوە و پێویستی بە ئارامگرتن هەیە و ئەیوت: ئەگەر خەڵکی لەلایەن کار بەدەستانەوە تەنگیان پێ هەڵچنرا و ئارامیان گرت ئەوە پاش ماوەیەك دەرویان لێ دەکرێتەوە، بەڵام خێرا پەنا دەبەن بۆ شمشێر و بەم شێوەیە تووشی خێر نابن [2].

هەروەها هەڵوێستی بەرامبەر شۆڕشی ابن اشعث بەو شێوە بوو کە باسمان کرد، و پێی وابوو کە هەتاوەکو کار بەدەستان جومعە و جەماعەت بکەن و زەکات کۆ بکەنەوە و سەنگەرەکان بپارێزن و سزاکان جێ بەجێ بکەن ئەوە دروست نیە لە دەسەڵاتیان دەربچین [3] مەودودیش سەبارەت بەرێبازی حەسەنی بەسری بۆ مامەڵکردن لەگەڵ ڕاپەڕینەکاندا ئەڵێ: ئەو گومانی لەکەڵك و سودی دا هەبووە[4].

هەڵوێستیشی بەرامبەر بە شۆڕشی یەزیدی کوڕی موهەللەب ئەوەب وو کە بە نیگەرانیەوە لێی دەڕوانی بەتایبەت کە خەلیفەی دادپەروەر عومەری کوڕی عبدالعزیز بە هۆی گەندەڵیەوە بەندی کرد بوو، هەروەها لەبەر ئەوەی کە ئەگەر سامانی موسڵمانانی بخستایە بەردەستی ئەوە لە ئارەزووەکانی خۆیداسەرفی دەکرد، بۆیە حەسەن پێی وابوو کە ئیبن موهەللەب بۆ خۆی و ئارەزووەکانی تورە بووە، بۆیە حەسەن دەچوو بۆ شوێنی کۆ بوونەوەی خەڵکی لە مزگەوتدا و خۆی دەدا بە سەرشانی موعازی کوڕی سەعددا و پێی ئەوت: سەیرکە کەسێك ئەبینیت بیناسین؟ پاشان حەسەن دڵخۆش بوو کاتێ کەسێکی نەبینی لەناو کۆمەڵەکەدا کە بیناسێت یان خود لە هاوەڵانی بێت [5].

---

[1] - حياة الحسن البصري.، ل: ١٩٤؟

[2] - الخلافة و الملك للمودودي، ل: ١٤٩.

[3] - حياة الحسن البصري، ل: ١٩٦ للحصري.

[4] - تاريخ الطبري(٧ / ٤٩١).

[5] - وفيات الاعيان(٣ / ٢٨٠) حياة الحسن البصري، ل: ١٩٧.

هەر بۆیە بوێری حەسەن زیادی کرد و ڕاشکاوانە حەقی دەربری و لە مینبەر نزیـك بوویـەوە لـە کاتێکدا کە یەزید وتاری دەدا و بە دەنگێکی بەرز هاواری لە ئیبن موهەللەب کرد و وتی: " سوێند بە خوا تۆ والی بویت و سەرپەرشتیاریت هەبوو بۆیە ئەم کارەت دروست نیە.

پاشان هەڵوێستێکی بوێرانە تر وەردەگرێت لە کاتێکدا کەبینی خەڵکی ئاڵایان بەرز کردۆتـەوە و بە دوو ڕیز وەستاون و چاوەڕێی هاتنە دەرەوەی یەزیدی کـوڕی موهەللـەبن و ئـەڵێن: بـۆ ڕێبـازی هەردوو عومەر بانگمان دەکات ن حەسەنیش وتی: تا دوێنێ یەزیـد لـە گـەردنی ئەوانـەی دەدا کـە ئەیانبینن و دواتر ئەی ناردن بۆ کوڕانی مەروان و مەبەستی ڕازی کردنـی ئـەوان بـوو، بـەلام دواتـر لێیان تورە بوو ئالای یاخیبوونی هەڵکرد و وتی: من دژیان وەستاوم ئێوەش دژیان بوەسـتن و ئـەڵێ: من بانگێشتتان دەکەم بۆ ڕێبازی هەردوو عومەر، بەلام ڕێبـازی عومـەر ئەوەیـە کـە قـاچ و دەسـتی ببەسترێت و بخرێتەوە زیندان [1].

بەم شێوەیە ئامۆژگاری حەسەن و نەیاری بەرامبەر شۆرش پـەرەی سـەند و لـەوتارێکی دا وتـی: خەڵکینە، لە ماڵەکانتاندا دانیشتن و دەست هەڵگرن و لـە خـوا بترسـن و یـەکتر مـەکوژن لەسـەر دونیای لە دەستچوو و تەماعێکی کەم کە بـۆ کـەس نامێنێتـەوە و تـەنها کەسـانێکیش خۆیـانی لـێ دەپارێزن کە نەناسراو پارێز کار بن [2].

پاش ئەم وتـارەش مـەروانی کـوڕی موهەللـەب جێنـشینی یەزیـد لـە ڕاپـەڕین دا هەڕەشـی لـە حەسەن(رضي الله عنه) کرد وتی: پێم گەشتووە کە ئەم زانا گومڕاو ڕیا بازە خەڵکی سارد دەکاتـەوە، سـوێند بەخوا ئەگەر دراوسێکەی دارێك لەماڵەکەی دەربێنێت ئەوە خوێن لە لوتی دەهێنێت، سوێند بـەخوا یان دەست لە باسکردنمان هەڵدەگرێت یان مشارێکی زبر دەنێین لە گەردنی [3].

ئەوە بوو خەڵکیش لەگەڵ حەسەندا وەستان و پێان وت: ئەگـەر ویـستیان دەسـتگیرت بکـەن و مۆڵەتمان بدەیت بەرگریت لێ دەکەین. ئەویش وەڵامی دانەوە و وتی: کەواتە من ئەو کارەم کردووە

[1] - وفيات الاعيان(٣ / ٢٨٠) حياة الحسن البصري، ل: ١٩٧.

[2] - تاريخ الطبري(٧ / ٤٩٨).

[3] - تاريخ الطبري(٧ / ٤٩٨).

که داوام کردووه له ئێوه لێ ی دوروبن، فەرمانتان پێ دەکەم کە یەکتر نەکوژن و، بەلام لەسەر خۆم داوای شەڕ و کوشتارتان لێ بکەم [1].

ئەمە هەڵوێستی حەسەن بوو بەرامبەر هەموو ئاژاوەیەك و هەوڵی دەدا بۆ کۆکردنەوەی موسڵمانان و نەهی دەکرد لە جیاوازی و ناکۆکی لە نێوانیاندا [2]. هەروەها لە سەلەمی کوڕی ابی الدیال وە ئەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە حەسەنی بەسری کرد بە ئامادە بوونی هەندێك لە خەڵکی شام وتی: چی دەڵێ ی دەربارەی ئاژاوەکانی هاوشێوەی یەزیدی کوڕی موهەللەب و ئیبن ئەشعەث؟ ئەویش وتی: نە لەگەڵ ئەوانەو نەلەگەڵ ئەوانەشدا بە، پیاوێکیش لە ئەهلی شام وتی: لەگەڵ ئەمیری باوەڕدارانیش دانە بین ئەی باوکی سەعید؟ وتی: بەڵێ لەگەڵ ئەمیری باوەڕدارانیشدا مەبن [3].

بەم شێوەیە حەسەن(ﷺ) ڕێبازی ئاشتی گرتبەر لە فەرماندان بەچاکە و ڕێگری کردن لە خراپەدا و پشتیوانی شۆرشی چەکداری نەکرد لەبەر چەند هۆیەك:

أ- بانگەواز کردن بۆ دەرچوون لە چەند بوارێکدا فەوزاو پشێوی و تێکچوونی باردۆخی لێ دەکەوێتەوە و ئەو ستەم و خراپانەش کە لە کاتژمێرێك پشێوی دا دەکەوێتەوە لە چەند ساڵێك ستەم ناکەوێتەوە.

ب- پێی وا بوو کە زۆر دەرچوون لەوالی و کار بەدەست دەوڵەتی ئیسلامی لاواز دەکات و موسڵمانان بەیەکەوە خەریك دەکات و دوژمن چاویان تێ دەبڕێت و مافەکانیان پێشێل دەکات.

ج- هەروەها پێی وا بووکە یاخیبوون خوێن ڕشتنی لێ دەکەوێتەوە بێ ئەوەی هیچ حەقێك بگێڕدرێتەوە و خەڵکیش لە دەستی ستەمکارێکەوە ئەکەونە دەستی ستەمەکارێکی تر.

د- پێی وا بوو کەچارەسەری باش ئەوەیە کە هەوڵ بدرێت بۆچاکسازی کردن لەخەڵکدا ئەگەر چاکسازی کردن لە کاربەدەستاندا سوودی نەبوو، چونکە گۆڕانکاری و خراپی هەرلایەکیان پەیوەستە بە گۆڕانکاری و خراپی لاکەی تریانەوە [4].

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٧ / ٤٩٩).

[2] - حياة الحسن البصري، ل: ١٩٨ للحصري.

[3] - تاريخ الطبري(٧ / ٤٩٩).

[4] - حياة الحسن البصري، ل: ١٩٨ للحصري.

٨- **چۆن گەلێك گومڕا دەبن کە حەسەنیان تیا بێت؟** خالیدی کوڕی صفوان ئەڵێت: گەشتم بە مەسلەمەی کوڕی عبدالملك ئەویش وتی: ئەی خالید، باسی حەسەنی خەڵکی بەسرەم بۆ بکە. منیش وتم: خوا باشت بۆ بکات، بە زانیاریەوە بۆ ت باس ئەکەم من دراوسێ و هاوڕێ مەجلیس ئەوم و لە هەموو کەس باشتر دەیناسم: ئەو لە هەموو کەس زیاتر نهێنی لە ئاشکرای و قسەی لە کردەوەی دەچێت، ئەگەر دانیشتایە بۆ کارێك ئەنجامی دەدا و ئەگەر ئەنجامیشی بدایە بۆی دادەنیشت، ئەگەر فرمانی بەشتێکیش بکردایە لە هەموو کەس زیاتر پابەند دەبوو پێوەی و ئەگەر نەهیشی لێ بکردایە لە هەموو کەس دوورتر بوو لێوەی، ئەو داوای هیچی لەکەس نەدەکرد، بەڵام هەموو خەڵك پێویستیان پێی بوو، مەسلەمەش وتی: بەسە، چۆن کۆمەڵێك گومڕا دەبن کە کەسی وایان تێدا بێت [1].

هەروەها یەکێك لەوتەکانی حەسەنی بەسری ئەوەیە کە هشامی کوڕی حەسسان بۆمان دەگێڕێتەوە و ئەڵێ: گوێم لە حەسەن بوو سوێنی دەخوارد بە خوا کە هەرکەسێك شەیدای پارە و سامان بێت خوا سەرشۆڕی دەکات [2]. هەروەها ئەڵێ: خراپ ترین هاوەڵ دینار و درهەمن، سوودیان نیە بۆت هەتاوەکو لێت جیادەبنەوە [3].

٩- **کۆچی دوایی حەسەنی بەسری:** حەسەنی بەسری نەخۆش کەوت و کوڕەکەی لە تەنیشتیەوە بوو چاودێری ئەکرد و ئەویش لەسەر جێگە کەیدا کەوتبوو و ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ ی ئەکرد و کوڕەکەشی پێی وت: کەسی وەکو تۆ چۆن ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ دەکات بۆ دونیا؟ ئەویش وتی: کوڕم تەنها بۆ نەفسم وا دەکەم، چونکە هەرگیز توشی شتی وا نەبووم [4].

هەروەها ابانی کوڕی مجبرەوە لە حەسەنەوە ئەڵێ کاتێ وادەی مەرگی حەسەن هات چەند کەسێك لە هاوەڵان چوونە لای وتیان: ئەی باوکی سەعید چەند وشەیەکمان پێ بڵێ کە سوودی هەبێت بۆمان، وتی: من سێ شتتان پێ دەڵێم پاشان بڕۆن و وازم لێ بێنن بۆ ئەوەی کە ڕوم لێناوە، ئەگەر نەهیشم لە هەر شتێك کرد دەبێ دورترین کەس بن لێوەی هەروەها ئەگەر فەرمانیشم بە

---

[1] - الطبقات الکبری(٧ / ١٢١) حیاة الحسن، ل: ١٩٨.

[2] - تاریخ الجدل، ل: ٣٢٣.

[3] - سیر اعلام النبلاء(٤ / ٥٧٦).

[4] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٥٧٦).

هەرچی کرد دەبێ لـە هـەموو کـەس زیـاتر پابەنـدبن پێـوەی، بـشزانن کـە هـەنگاوەکانتان دوانـن هەنگاوێك لە بەرژەوەندی ئێوە هەنگاوی دووەم لە دژی ئێوەیە، جـا بـزانن بـۆ کـوێ دەڕۆن و لـە کوێوە دێنەوە [1].

پێش ئەوەش کە حەسەن گیانی بسپێریت لە هۆش خۆی چوو پاشان بـە هـۆش خۆیـدا هاتـەوە و فەرمووی: ئێوە لەبەهەشت و کانیاو و شوێنی بەرێزتان کردم [2]. ئەمەو لـە شـەوی هـەینی سـەرەتای ڕەجەبی سالّی سەد و دەدا [3] گیانی سپارد بە پەروەردگار و نزیکەی هەشتا و هەشت ساڵ ژیـا. وەك عبداللە ی کوڕی ئەڵێ [4]، پێش کۆچی دواییشی پیاوێك بە ئیبن سـیرینی وت: بالّندەیـەکم بینـی لـە خەومدا کە جوانترین بەردی مزگەوتی برد، ئەویش وتی: ئەگەر ئەم خـەوەت ڕاسـت بێـت حەسـەن کۆچی دوایی دەکات ئەوە بوو زۆری نەخایاند حەسەن کۆچی دوایی کرد [5].

هەردوو قوتابیەکەی ئەیوبی سختیانی و حمید الطویل شتیان و نخری کـوڕی عمـر مـەقری نوێـژی لەسەر کرد [6]، هەروەها حەمید الطویل ئەڵێ: ئێوارەی پێنج شـەممە مـرد و بـەیانی هـەینی لـە شـتنی بووینـەوە و دوای نوێـژی هـەینی هـەڵمان گـرت و بـە خاکمـان سـپارد و هـەموو خـەڵکی لـە خاکسپاردنیدا بەشدار بوون و نوێژی عەسری ئـەو ڕۆژە لـە مزگەوتـدا نـەکرا و نەشـم زانیـوە کـە لەسـەرەتای ئیـسلامەوەشتی وا ڕوی دا بێـت جگـە لـەو ڕۆژە، چـونکە هـەموو خـەڵك بـەدوای تەرمەکەیەوە بوون و کەسێك نەمابوو لە مزگەوتدا کە نوێژی عەسـر بکـات [7]، ڕەحمـەتی خـوا لـە حەسەنی بەسری نموونەی بەرزی میراتگرانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و زانایانی خوا ویست کە یـەکێك بوو لە و پیاوە مەزنانەی کە لە مێژوودا هاوشێوەی نەبووە لە زوهد و پارێزکاری و زانستی و دانایی و ئازایەتی و ئەدەبدا [8].

---

[1] - حلية الاولياء(٢ / ١٥٤).

[2] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٥٨٧).

[3] - تذكرة الحفاظ، ل: ٧٢، حياة الحسن البصري، ل: ٢٠٢.

[4] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٥٨٧).

[5] - وفيات العيان(٢ / ٧٢).

[6] - تاريخ الذهبي، له حياة الحسن البصري د. روضة، ل: ٢٠٢.

[7] - سير اعلام النبلاء(٤ / ٥٨٧).

[8] - حياة الحسن البصري، ل: ٥٠٣.

هەروەها لەو زانایانە بوو کە چالاك بوون لە دەوڵەتی زانایان دا کە عومەری کوڕی عبدالعزیز ڕابەڕایەتی دەکرد و کەمتەرخەمی نەکرد بە کات و ئامۆژگاری و ڕێنموونی و ئاراستە کردنی خەڵکدا.

## حەوتەم: عومەر و ئازاد سازیەکان و هەڵگرتنی گەمارۆ لەسەر قوستەنینە:

کاتێ کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفەی یەکەم کاری وەستاندنی فراوانخوازی بوو لەناوچە دورەکانی گۆشە و کەنارەکانی دەوڵەت دا و هەولیدا بۆ پاشەکشە پێکردنی هێزە ئیسلامیەکان لە بەرەکانی جەنگدا، یەکەم کاریشی لەم بوارەدا لەو هێزانەوە بوو کە خەلیفە سولەیمان سەر قالّی کۆکردنەوە و بەرێخستنی بوو بەسەر کردایەتی مەسلەمەی برای بۆ فەتحی قوستەنتینە ئەوە بوو ماوەی دوو ساڵ بەردەوام بو لەسەر گەمارۆدانی و دووچاری نەهامەتی زۆر بوو بە بێ ئەوەی بە ئامانجی خۆی بگات، کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیزیش بوو بە خەلیفە، نامەیەکی نوسی و داوای کرد کە مەسلەمەی کوڕی عبدالملك لە قوستەنتینە بکشێتەوە کە سولەیمان لە وشکانی و دەریاوە هێرشی بۆ کرد بوو و ئەوانیش ڕوبەڕووی با ڕودۆخێکی ناهەموار بو بوونەوە و برسێتی ناچاری خواردنی گۆشتی ولاخی کردن، بەلام سولەیمان زۆر گیر بوو لەم مەسەلەیەدا و ئەمەش عومەری نیگەران کرد بوو، بۆیە کاتێ بوو بەخەلیفە بینی کەلە بەرامبەر پەروەردگار دا وەلامێکی نابێت ئەگەر کارێکی پێ بکرێت و بۆماوەی کاتژمێرێك دوای بخات، ئەمەش وای لێکرد کە خێرا نامەیان بۆ بنوسێت [1].

ئەوە بوو عومەر نامەیەکی نووسی بۆ مەسەلەمەی کوڕی عبدالملك لە کاتێکدا کە لە خاکی ڕۆم دا بوو و فەرمانی پێکرد کە بە سوپاکەیەوە خێرا بگەڕێتەوە و ئەسپ و ئازوقەیەکی زۆریشی بۆ ناردن و خەڵکیشی هان دا بۆ یارمەتی دانیان، ئەشلێن پێنج سەد سەر ئەسپی بۆ ناردوون [2].

خەلیفەش بۆمان ئەگێڕێتەوە کە لە ساڵی ٩٩ ك عومەری کوڕی عبدالعزیز ئازوقە و ولاخێکی زۆری نارد بۆ مەسەمەی کوڕی عبدالملك لەولاتی ڕۆم و فەرمانی دا بەوانەی کە لەوێ دۆست و هاوەڵیان هەیە کە بنێرن بە شوێنیدا و مۆڵەتی گەڕانەوەی پێدان [3].

---

[1] - ابن عبدالحکم، ل ك ٣٢.

[2] - تاريخ الطبري لە عمری بن عبدالعزيز ی العل، ل: ١٤٠.

[3] - تاريخ خليفة، ل: ٣٢٦ تاريخ الاسلامي للذهبي لە العلی، ل: ١٤٠.

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز سەمحی کوڕی مالیکی خەولانی کرد بە والی ئەندەلوس و داوای لێکرد کە ئەندەلوس چۆڵ بکەن لە موسڵمانان، چونکە بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە و دەترسا دوژمن بەسەریاندا زاڵ بێت، چونکە دەریا بەربەست بوو لە نێوان ئەوان و موسڵماناندا [1]، بەڵام سەمح لەگەڵ پاشەکشە کردنی تەواو دا نەبوو لە ئەندەلوس بۆیە نامەیەکی بۆ خەلیفە نوسی کە تیایدا هاتبوو: خەڵکی لە ئەندەلوس دا زۆر بوون و تیایدا بڵاوبوونەتەوە ئایا پێویست دەکات جێی بهێڵین؟ ئینجا ئەندەلوسی لە پشاکۆیەتی ئەفریقیە – تونس – جیاکردەوە [2].

لە ڕۆهەڵاتیشدا عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ عبدالرحمن ی والی خوراسان و فەرمانی پێ کرد بە گەڕانەوەی ئەو موسڵمانانەی کەلە پشت دەریا – ئەو بەری دەریاوەن – بە خۆیان و ماڵ و منداڵیانەوە، بەڵام ئەوان ڕازی نەبوون و وتیان: با لە مرو(بنەکەی خوراسان) دا بمێنینەوە، عومەریش نامەیەکی بۆ نوسین و تیایداهاتبوو: خوایەگیان من ئەرکی سەرشانی خۆمم جێ بەجێ کرد و نامەوێ موسڵمانان غەزا بکەن و ئەوەندەیان بەسە کە ئازادیان کردووە [3]، بەڵام خەلیفە تەنها هێندە باس دەکات کە عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نوسی بۆ جەڕاحی کوڕی عبدالله ی حکمی وتیایدا هاتبوو: " غەزا مەکەن و تەنها پارێزگاری لەوە بکەن کە بەدەستتانەویە " [4]، هەروەها لەبەری وڵاتی سندیشدا: عومەری کوڕێ عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ پاشاکان و بانگەوازی کردن بۆ ئیسلام و گوێڕایەڵی و هاتنە ژێر سایەی دەسەڵاتی خەلیفە و ئەرك و مافیشیان وەك موسڵمانان دەبێت.

دیارە پێشتریش ژیان و ناوبانگی عومەریان بیستبوو بۆیە پاشاکان و سوپاکانیان موسڵمان بوون و ناوی عەرەبیان لە خۆیان نا، عەمری کوڕی موسلیمی باهیلش والی عومەر بوو لەو ناوچەیەدا [5].

دیارە وەستاندنی فراوانخوازی لە ڕێ ی بەکارهێنانی سوپاوە لەناوچەکە ناریە دوورە دەستەکانی دەوڵەتدا و کارکردنی بۆ گرتنەبەری گفتوگۆی ئاشتیانە بۆ دامرکاندنەوەی بزوتنەوە چەکداریە

---

[1] - تاریخ افتتاح الاندلس لابن القوطیة، ل: ١٢ – ١٣.

[2] - فجر الاندلس لحسین مؤنس، ل: ١٣٦ – ١٣٧، عمر بن عبدالعزیز، صالح العلس، ل: ١٤٠.

[3] - تاریخ الطبري لە عمر بن عبدالعزیز، صالح العلي، ل: ١٤٠.

[4] - تاریخ الطبري لە عمر بن عبدالعزیز، صالح العلي، ل: ١٤١.

[5] - تاریخ خلیفة، ل: ٣٢٦ ، عمر بن عبدالعزیز، للعلي، ل: ١٤١.

یاخییوەکان مانای ئەوە نیە کە ئەو ویستویەتی دەزگای سەربازی هەڵوەشێنێتەوە کە ڕەگ و ڕیشەی ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ڕۆڵی سەرەکی هەبووە لە پاراستنی دەوڵەت و فراوانکردن و چەسپاندنی ئاسایش و هێمنی تیایدا، لە ڕاستیشدا ئەو ڕێکخراوانەی کە پەیوەندیان بەلایەنی سەربازیەوە هەبوو کرۆکی ژیانی مەدەنی بوون و هیچ دەوڵەتێکیش ناتوانێ دەستبەرداری دەزگای سەربازی بێت بۆ پاراستنی سنور لە هەڕەشە و مەترسیانەی کەڕووبەڕووی، دەبنەوە، هەربۆیە دەبوو دەزگای سەربازی بهێڵرێتەوە شارەکان کە ناوەندی نیشتەجێ بوونی سەربازە عەرەبەکان بوو وەك خۆی مایەوە و بە بێ ئەوەی بیگۆڕێت یان هەڵی وەشێنێتەوە یان دەستکاری رشێکخستنی دانیشتوان و ئیداری بکات، هەروەها باردۆخەکە وای دەخواست کە لە ماوەی کورتی خەلافەتیدا چاودێری بەردەوامی جموجوڵی سەربازی سنوردار بکات لەبەرەکانی جەنگدا ئەوە بوو لە ئازەربەیجان تورکەکان هێرشیان کردە سەر موسڵمانەکان و کۆمەڵێکیان لە موسڵمانەکان شەهید کرد و کۆمەڵێکیشان بەدیل گرت، عومەر کوڕی عبدالعزیزیش حاتەمی کوڕی نوعمان باهلی بۆ ناردن و هەموو تورکەکانی لەناو برد وتەنها چەند کەسێکیان لێ دەرباز بوو و پەنجا دیلیشی لێ هێنان بۆ خناصرە بۆلای عومەر [1].

لەساڵی ١٠٠ ی کۆچیشدا ڕۆمەکان لە دەریاوە هێرشیان هێنایە سەرکەناری لازقیە وشارەکەیان ڕووخاند و خەڵکێکی زۆریان لێ بەدیل گرت عومەریش(ﷺ) فەرمانی بنیاتنانەوە و تۆکمە کردنی دا [2].

لە ساڵی ١٠١ ی کۆچیشدا، عومەر کوڕی عبدالعزیز وەلیدی کوڕی هشامی معیطی و عەمری کوڕی قەیسی کیندی کە خەڵکی حمص و صائفە [3] بوون، نارد بۆ غەزا و فەرمانی دا بە دەرکردنی خەڵکی طرندە [4] بەزۆر، چونکە مەترسی ئەوەی هەبوو کە دوژمن هێرشیان بکاتە سەر [5]، هەروەها ویستی المصیصە بڕوخێنێت لەبەر ئەوەی کە ڕۆمەکان بەبەردەوامی پەلاماریان دەدا، پاشان وازی

---

[1] - تاريخ خليفة، ل: ٣٢٦ ، عمر بن عبدالعزيز، للعلي، ل: ١٤٢.

[2] - فتوح البلدان، ل: ٢٠.

[3] - تاريخ الطبري لە عمر بن عبدالعزيز، للعلي، ل: ١٤٢.

[4] - طرندە: شوێنێکی نزیکە لە دەوڵەتی ڕۆمانیەوە.

[5] - فتوح البلدان، ل: ٢٢٠.

لەوەهێناو مزگەوتێکی گەورەی بۆ دروست کردن لەلای کفرییاوە وتەنکەرێکی بۆ دانا کە ناوی خۆی لەسەر نوسرا بوو [1] و کردی بە بەرەی پێشەوە بۆ دورخستنەوەی مەترسی ڕۆم لە ئەنطاکیة [2].

هەرچەندە خەلیفە عومەری کوڕی عبدالعزیز چالاکی سەربازی دژ بە ڕۆمەکان سنووردار کرد و ئەو سوپایەی پاشەکشە پێکرد کە گەمارۆی قوستەنتینە و هەندێ قەلای پێشەوەی ولاتی ڕۆمی دا بوو، بەلام لەگەلْ ئەوەشدا توند و پێدا گر بوو بۆ سەندنەوەی ماف و بەرگری کردن لێی، ئەمەش لە ڕیوایەتی ئیبن عبدالحکم دا دەردەکەوێت، کە باسی ئەوە دەکات کاتێك خەلیفە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) بالوێزێکی نارد بۆلای پاشای ڕۆم و چیرۆکی پیاوێکی دیلکراوی لای ڕۆمەکان بۆ گێڕایەوە کە زۆری لێ کرابوو بۆ بوون بە گاور و وازهێنان لە ئیسلام و پێیان وتبوو: ئەگەر وانەکەیت چاوت دەردێنین، ئەویش ئاینەکەی بەسەرچاوی دا هەلبژارد و بەم شێوەیە هەردوو چاویان دەرهێنا، خەلیفە عومەریش(ﷺ) نامەیەکی نارد بۆ پاشای ڕۆم و پیێ ی وت: سوێند بەخوا ئەگەر خێرا ئەو پیاوەم بۆ نەنێریتەوە هێندە سەبازان بۆ دەنێرم کە سەرەتایان لای من و کۆتاییان لای تۆ بێت [3]، ئەوەبوو پاشای ڕۆمیش وەلامی داواکاریەکەی دایەوە و پیاوەکەی بۆ ناردەوە [4]، ئەم سیاسەتە کاتیەی عومەریش پشتی بە پاراستن و تۆکمە کردنی سنورەکانی دەولەتی ئیسلامی دەبەست و زیاتر گرنگی دەدا بە فەتح و زیندوو کردنەوەی دلەکان و پاککردنەوەی دەروونی ئەو گەلانەی کە تازە موسلمان بون هەربۆیە دەستی دایە ناردنی بانگخواز و زانایان بۆ گوندنشین و بیابان نشینەکانی ناوەوەی دەولەتی ئیسلامی و ئەو گەلانەی کە زۆر پێویستیان بە ڕێنماییەکانی ئیسلام هەبوو.

### هەشتەم: گرنگی دانی بە بانەگەوازی هەمەلایەنە:

عومەر(ﷺ) هەولەکانی لە بنیاتنانی ناوەوەی دەولەت و چەسپاندنی یەکێتی و ئاسایش و بلاو کردنەوەی زانست و گەیاندنی بەهەموو تاکەکانی ئوممەت و دا چڕ کردبوویەوە ن هەروەها گرنگی دا بەبلاوکردنەوەی دادگەری لە نێوان هاولاتیان دا و نەهێشتنی دوبەرەکی و ڕق و کینە لە نێوان

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٦٣.

[2] - العلاقات العربية البيزنطينية، ل: ١١٩.

[3] - العلاقات العربية البيزنطينية، ل: ١٣١.

[4] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٣١.

موسڵمانان‌دا، دڵ و ئەقڵ و دەروونی خەڵکی کردبووە ئامـانجی ڕێنماییـەکانی ئیـسلام و پرۆژەیـەکی گەورەی دانا بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجە سەرکیە.

عومەر(ﷺ) لەو کەسانە نەبوو کە دوای پرۆژەی گەورە دەکەون و هەمیشە لە سنوری خەیاڵـدا دەژین و لێی تێپەڕ نابن، بەڵکو ئەو پرۆژەکەی خۆی کردە پرۆژەیەکی کردەیی کە شیاوی جێبـەجێ کردن بێت دوای ئەوەی کە بارودۆخی لەباری ڕەخساند و گرنتی کردەیی بۆ بەرنامەکانی دەستەبەر کرد و ئەو هۆکارانەی بۆ ڕەخساند کەِ گۆڕینی بۆ واقیعێکـی بەرجەسـتە مسـۆگەر دەکـات، چـەند هۆکاریش یارمەتیدەری بوون بۆ سەرکەوتن لەم پرۆژە بانگخوازی و پەروەردەییەدا لەوانە:

١- **دانانی یاسای تەفەڕوغ و یەکلا بوونەوەی بانگخوازان:** ئەوە بوو دەوڵـەت هەسـتا بـە دابـین کردنی چەندین زانا و بانگخواز و بیریار هەتاوەکو بە تەواوی یەکلا ببنەوە بۆ جێبەجێ کردنی پرۆژە فیکری و بانگخواز یەکانی دەوڵەت، ئازوقە و موچەشی بۆ ئەم زانایانە بڕیەوە هەتاوەکو یەکلا ببنەوە بۆ بلاو کردنەوەی زانست و کاتیان بە کاسپی کردنەوە نەڕوات [1]، چـونکە ئـەو قورئان خوێنەی کە لەبەری کردووە و بەخەڵکی دەڵێتەوە و فێـری حوکمـەکانیان دەکـات و ئەو زانایەی کە سەرپەرشتی مەجلیـسی نوسـینەوە و بلاوکردنـەوەی فـەرموودەی پێغەمبـەری خوا(ﷺ) دەکات و ئەو زانایەش کەسەیری کتێبەکانی دەکات و حوکمـە شـەرعیەکانیان لـێ دەردەهێنێ و کاروباری شەرعی فێری خەڵکی دەکات هەتاوەکو بەبەرچـاو ڕوونیـەوە خـوای گەورە بپەرستن و ئەو قوتابیەی کە خۆی یەکلا دەکاتـەوە بـۆ زانـست و لێکۆڵینـەوە و وانـە خوێندن هەموو ئەوانە ڕەنگە لەلایەن مـاڵ و منداڵـەوە سـەرقاڵیان بکـات بـۆ دابـین کردنـی پێداویستی ژیانیان، بۆیە عومەر هەستا بە هەڵگرتنی ئـەم خـەم و مۆتەکەیـە و ژیـانی خۆیـان و خێزانیانی دابین کرد هەتاوەکو ژیانێکی شیاو بەسەر بەرن لەسایەی دەوڵەتدا، ئەمەش باشـترین کارێك بوو کە پێـی هەسـتا بـەم شـیوەیەش بوەهانـدەری هـەموو ئەوانـەی کـە توانـای بـلاو کردنەوەی زانست و خزمەتکردنی ئاینی ئوممەتیان هەبوو [2]، هەروەها بـڕی سـەد دینـاری لـە

---

[1] - ملامح الانقلاب الاسلامي في خلافة عمر بن عبدالعزيز، ل: ١٨٤.

[2] - اصول الحديث، ل: ١٧٨، عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار، ل: ٧٢.

بیتولمال بڕیبویەوە بۆ هەرکەسێك کە خۆی یەکلا کردبێتەوە بۆ مزگەوتێکی گەورە لە هەر ولاتێکی ئیسلامیدا بەمەبەستی فێربوون و بلاوکردنەوەی زانست و وتنەوەی قورئان [1].

لە ئەبو بەکری کوڕی ابی مریم وە ئەلێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ والی حمص: کە فەرماندە بە پێدانی موچەی پێویست بە خەڵکانی چاکە خواز هەتاوەکو بژێوی ژیان وتنەوەی قورئان و گەیاندنی فەرموودەیان لەبیرنەباتەوە [2]، هەروەها لە ابی مریم وە ئەلێ عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ والی حمص: سەیری ئەو کەسانە بکەن کە خۆیان تەرخان کردووە بۆ وتنەوەی فیقه و لە مزگەوتدا خۆیان بەندکردووە وبواری پەیداکردنی بژێویان نیە و بە هەریەکەیان سەد دینار بدە هەتاوەکو بژێوی ژیانیانی پێ رێك بخەن، بشزانە کە باشترین خێر ئەوەیە کە خێرا ئەنجام بدرێت و والسلام وعلیك [3].

هەروەها ئازوقەی بڕیەوە بۆ ئەو کەسانەی کە باسی ژیاننامە و غەزاکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەلانیان دەکرد هەمان شتیشی بۆ ئامۆژگاریەکەر و چیرۆکەخوانان بڕیاردا بوو، ابن شبە باس دەکات کە عومەری کوڕی عبدالعزیز فەرمانی کرد بە پیاوێك کە چیرۆك و ژیاننامەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەلان بۆ خەڵك بگێڕێتەوە لە مەدینەدا و مانگی دوو دیناری بۆ بڕیەوە، کاتێ هشامی کوڕێ عبدالملك هات مانگانە بۆی کردبە شەش دینار [4].

ئیبن عبدالبر لە یحیی ی کوڕی ابی کثیرەوە ئەگێڕێتەو کە وتویەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستانی کە: ئازوقە بدەن بە قوتابیان با یەکلایی ببنەوە بۆ خوێندن.

٢- **هاندانی زانایان بۆ بلاوکردنەوەی زانست و ئاشکرا کردنی:** ئەوە بوو مزگەوتەکان بوون بە ناوەندێك بۆ فێرکردنی خەڵك و وتنەوە و نوسینەوەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و زیندوو کردنەوی سوننەت [5].

---

[1] - البدایة والنهایة، لە عمر بن عبدالعزیز، ل: ٧٢.

[2] - اخبار المدینة، لە عمر بن عبدالعزیز، عبدالستار، ل: ٧٣.

[3] - جامع بیان العلم(١ / ٢٢٨) عمر بن عبدالعزیز، عبدالستار، ل: ٧٣.

[4] - عمر بن عبدالعزیز، عبدالستار، ل: ٧٣.

[5] - اصول الحدیث، ل: ١٧٨، عمر بن عبدالعزیز، ل: ٧٣.

عەکرەمەی کوڕی عەممار ئەڵێت: گوێم لە نامەکەی عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو ئەیوت: پاشان فەرمان بکە بە ئەهلی عیلم با زانست لە مزگەوتەکاندا بڵاو بکەنەوە، چونکە سوننەت مرێنراوە [1]. ئیبن عەبد لبریش لە جەعفەری کوڕی برقانی ڕەقیەوە ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی بۆ نووسین کە: فەرمانبدە بە ئەهلی فیقھ و عیلم با ئەو زانستەی کە خوا پێی داون لە مزگەوت و مەجلیسەکانیاندا بڵاوی بکەنەوە [2].

٣- **ئاراستە کردنی ئوممەت بۆ گرنگی دان زانست:** دەربارەی ئەمەش ئەڵێت: ئەگەر توانیت ئەوە زانا بە ئەگەر نەشت توانی، ئەوە زانستخوازبە، ئەگەر ئەوەشت پێ نەکرا ئەوە خۆشت بوێن، ئەگەر نەتتوانی خۆشت بوێن ڕقت لێیان نەبێت، پاشان وتی: خوای گەورە دەروی لێ کردۆتەوە ئەگەر قبوڵی بکات [3].

٤- **ناردنی زانا یانی خواویست لە باکووری ئەفریقادا:** عومەری کوڕی عبدالعزیز زانایانی دەنارد بۆ شارو دێهاتەکان هەتاوەکو خەڵککەی فێری شەرعی خوا بکەن، وشارەزایان بکەن لێی ئەوە بوو یەزیدی کوڕی ابی مالك و حارسی کوڕی محمدی نارد بۆ بیابان هەتاوەکو خەڵکی فێری سوننەت بکەن و ئاز وقەشی بۆ برینەوە، ئەوە بوو یەزید قبوڵی کرد، بەڵام حارس قبوڵی نەکرد و وتی: من هەرگیز لەسەر زانستێك کە خوا فێری کردووم کرێ وەرناگرم، پاشان ئەوەیان باسکرد بۆ عومەر ئەویش وتی: وا نازانم ئەوەی کە یەزید کردوویەتی هیچی لەسەر بێت و خودای گەورەش نمونەی حارث مان تیادا زیاد بکات [4].

دیارە عومەریش بەم وەڵامە ئەو نەرمی و تێگەشتنە فیکریەی خستە ڕوو کەدەبێ لە زانای موسڵماندا هەبێت لە پێویستی خۆدور گرتن لە چەقبەستویی و پێداگرتن لەسەر مەسەلە ڕواڵەتیەکان ئەوە بوو ڕایگەیاند کە وەرگرتنی کرێ لەبری پێشکەش کردنی خزمەتی زانستی مەسەلەیەکی ئاساییە لەلایەکی تریشەوە داوای کرد لە پەروەردگار کە نموونەی ئەوانە زیاد بکات کە بە بێ بەرامبەر

---

[1] - جامع بيان العلم(١ / ٢٢٨)، عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار، ل: ٧٣؟

[2] - جامع بيان العلم(١ / ١٤٩).

[3] - ابن عبدالحكم لە عمر للزحيلی، ل: ٧٤ وەرگیراوە.

[4] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٦٠، ملامح الانقلاب، ل: ١٨٤.

خەڵك فێردەکەن و تەنها چاوەڕێی پاداشتی پەروەردگارن [1]، هەروەها عومەر(ﷺ) پێشەوای موفتی و زانای پایەبەرز ی مەدینە نافعی خزمەتکاری ئیبن عومەری نارد بۆ میسر هەتاوەکو فێری سوننەتیان بکات [2]، دە زاناشی لە زانایانی قوتابخانە میسری لە پیاوانی تابعین نارد بۆ ئەفریقیە – تونس – هەتاوەکو خەڵکەکەی فێری فیقھ و زانست بکەن و فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ) یان لە نێواندا بلاوبکەنەوە هەتاوەکو لەو خێرە بەهرەمەند بن کە براکانیانی گرتۆتەوە لە حیجاز و شام و عێراق دا کە بوو بوونە ناوەندێك بۆ بلاو کردنەوەی زانست [3]، هەروەها بیری لە باکووری ئەفریقاش کردەوە هەتاوەکو دڵ و ئەقڵ و دەرونیان ئاوەدان بکاتەوە بە ئاینی پەروەردگار و هەستا بە ناردنی ئەو دە زانا خوا ویستە دوای ئەوەی چەند ئامانجێکی دانا بۆ پلانە زانستیەکەی لەو هەرێمەدا لەوانە:

أ- هەڵبژاردنی چەند زانایەکی خواویست کە ناسرا بوون بە زانست و فیقھ و بانگەواز و خۆیەکلا کردنەوە بۆ پەروەردە و فێرکردن.

ب- دانانی پلانێکی درێژخایەن بۆ بلاوکردنەوەی فێرکردنی زمانی عەرەبی و نەهێشتنی نەخوێندەواری لەناو تیرە و هۆزە بەربەریەکاندا، هەتاوەکو ئاسانتر لە قورئان و سوننەت و مامەڵەکردن لەگەڵیاندا تێ بگەن.

ج- بایەخدان بە پەیوەست کردنی خەڵك بە قورئانی پیرۆزەوە کە حەبلی تۆکمەی پەروەردگارە ئەمەش بە کردنەوەی کۆمەڵە و ڕێکخراو و بۆ لەبەر کردن و باش خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.

د- ڕاگەیاندنی بیروباوەڕی ئەهلی سوننەت بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا:

ھ- ئاشناکردنی خەڵك بە حەلاڵ و حەرام [4]:

سەرەتای پیت و بەرەکەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە باکووری ئەفریقادا بە دامەزراندنی ئەمیری صالح تیایدا و ناردنی زانایانی خوا ویست بوو بۆی دەستی پێ کرد، فەرموون لەگەڵ ژیاننامەی ئەو کاربەدەست وئەو زانایانە:

---

[1] - ملامح الانقلاب الاسلامي في فلامة عمر، ل: ١٨٤.

[2] - سير اعلام النبلاء(٥ / ٩٧٩) تذكرة الحفاظ(١ / ١٠٠).

[3] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ، ل: ٦٩.

[4] - تاريخ الفتح العربي في ليبيا، ل: ١٤٨.

● **ئیسماعیلی کوڕی عبدالله ی کوڕی ابی موهاجیر**: لەلایەن عومەری کوڕی عبـدالعزیزەوە وەك والی ئەفریقا دەستنیشان کرا لە موحەڕەمی ساڵی ٩٩ – ١٠٠ ك و یەکێك بـوو لـە باشـترین ئەمیرەکان، ئیبن خەلدون ئـەڵێ: هـەموو بەربـەرەکان لەسـەردەمی ئـەودا موسـڵمان بـوون، هەروەها عومەر لەگەڵیدا دە لە زانایانی شوێنەکەوتوانی – تابعین – نـارد هـەتاوەکو خـەڵکی فێری کاروبارە شەرعیەکان بکەن و حەڵاڵ و حەرامیان بۆ ڕوون بکەنەوە [١].

ئەم ئەمیرە زۆر زاهید و خاکی بوو وَ سوور بوو لەسەر بڵاو کردنەوەی زانست و لەگەڵ خەڵکی ئەو وڵاتانەدا دادگەرانە هەڵسوکەوتی دەکرد، زۆر بەباشی فەرموودەی پێغەمبەری خـوا(ﷺ) لەبـەر بووە، ئەگێڕنەوە لە ئیبن عەساکیرەوە کەوتویـەتی: پێویـستە لەسـەرمان کـە فـەرموودەی پێغەمبـەری خوا(ﷺ) لەبەر بکەین هەروەك چۆن قورئان لەبەردەکەین، بوخاری و موسلیم و ئەبو داود و نسائی و ئیبن ماجە و ئەحمەد و زانایانی تر فەرموودەیان هێناوە لە قەیرەواندا وەك مامۆستای خـەڵك و بـڵاو کەرەوەی سوننەت بۆماوەی سێ و سێ ساڵ ماوەتەوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە لە ساڵی ١٣١ کۆچی دا [٢]. کەسایەتی ئیسماعیل لێهاتوویی و زانست و پارێزگاری تیادا کۆبـوو بوویـەوە و ئەوبەر و بوومە پیرۆزەی لێ کەوتەوە کە ڕۆڵی هەبوو لە چەسپاندنی ئیسلام لە بـاکووری ئـەفریقادا و پێویستە ئێمە گرنگی بدەین بە بەدی هێنانی ئەم سیفەتانە لە دەروونی سەرکردە و کار بەدەستاندا.

○ بەکری کوڕی سوادەی جزامی، ناسراوە بە ابـو ثمامـە کۆچـکردوو لـە ١٢٨(کۆچـی لـە ئەفریقیە): لە بـاکووری ئـەفریقا دا بـۆ مـاوەی سـێ سـاڵ ماوەتـەوە، سـەرقاڵی گێڕانـەوەی فەرمووده و فتوادان بوو و خەڵکی ئەو ناوچەیە سوودی باشیان لێ وەرگرت و فـەرموودەیان لێوە دەگێڕایەوە، فەرموودەی کۆمەڵێك لە هاوەڵانی بردە قەیرەوانەوە، لەوانە: عقبەی کوڕی عامر و سەهلی کـوڕی سـەعدی سـاعدی و سـوفیانی کـوڕی وە هـەبی خـولانی، هـەروەها کۆمەڵێك لە شوێنکەوتوانەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە لەوانە: سەعیدی کـوڕی موسـەییەب و ئیبن شەهاب ی زوهری و مامۆستاکانی گەشتونەتە نزیکەی چل مامۆستا، زۆرێك لـە خـەڵکی قەیرەوان لێیەوە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە لەوانە عبدالرحمن ی کوڕی زیـاد و ئـەبو زەرعـەی ئەفریقی، زۆر متمانە پێکراو بوو لە قسەکانیدا، موسلیم و چوار پێشەواکەی تر و بوخـاری و

---

[١] - مدرسة الحديث بالقيروان(٢ / ١٤ / ٢٢).

[٢] - هەمان سەرچاوە.

احمد و طبراني و خەڵكی تریش فەرموودەیان هێناوە و لە ڕیزی میسریەكاندا دایانناوە سەرباری زۆری ئەو ماوەیەی كە لە قەیرەواندا ماوەتەوە لەوێش كۆچی دوایی كردووە [1].

○ حعتل ی كوڕێ عاهان الرعینی القتبانی، ناسراو بە باوكی سەعید(كۆچكردوو لە نزیكەی ساڵی ١١٥ كۆچی): ئەبو عەرەب و ئیبن حەجەر و خەڵكانێكی تر بە یەكێك لە شوێنكەوتوان(تابعین) یان داناوە و فەرموودە ناس و زانا و قورئان خوێن بووە، سەرپەرشتیاری دادگای سەرباری لە قەیرەواندا دەكرد و زانستێكی زۆری بۆ ماوەی یازدە ساڵ تیادا بڵاو كردەوە، لە خەڵكی قەیرەوانیش عبیداللە ی كوڕی زحرو عبدالرحمن ی كوڕی زیاد و بەكری كوڕی سوادە كە هاوڕێ بووە لە نێردەی زانستی دا فەرموودەیان لێوەگێڕاوەتەوە زۆرێك لە ڕەخنە گران بە متمانە پێكراویان داناوە و چوار پێشەوا كە و ئەحمەد و خەڵكانی تر فەرموودەیان هێناوە و لەسەردەمی هشامی كوڕی عبدالملك دا لە ساڵی ١١٥ ك كۆچی دوایی كردووە [2].

○ حەببانی كوڕی جبلەی قورەیشی: خزمەتكاریان، عومەر(ﷺ) ناردی بۆ فێركردنی خەڵكی میسر لەساڵی ١٢٥ ك و ئەشلێن ١٢٢ ك لە قەیرەوان كۆچی دوایی كرد، فەرموودەی كۆمەڵێ لە هاوەڵانی هێنایە باكووری ئەفریقا لەوانە: ئیبن عەباس و ئیبن عومەر و عبداللە ی كوڕی عەمر و عەمری باوكی، ماوەی ٢٥ ساڵ بۆ بڵاو كردنەوەی زانست لە پایتەختی باكوری ئەفریقا – قەیرەوان – دا مایەوە و خەڵكی سوودێكی زۆریان لێ برد و خەڵكێكی زۆر فەرموودەیان لێوە گێڕایەوە لەوانە عبدالرحمن ی كوڕی زیاد و عبیداللە ی كوڕی زحر و موسی كوڕی علی كوڕ رباح و خەڵكانێك تر، هەروەها حەببان لای ڕەخنەگران متمانە پێكراوە، بوخاری لە الادب المفرد دا وابن سنجر لە مسندەكەیدا و حاكم لە المستدرك و خەڵكانێكی تر فەرموودەیان هێناوە [3].

○ سەعدی كوڕی مەسعودی تجیبی: ابو مسعود(كۆچكردوو لە قەیرەوان دا): لە كۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە لەوانە ابو الدرداء، لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فەرموودەی

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٢ / ١٤ / ٢٢).

[2] - مدرسة الحدیث بالقیروان(٢ / ٤ / ٢٢).

[3] - هەمان سەرچاوە(٢ / ١٤ / ٢٢).

به مرسل گێڕاوەتەوە و هەندێ کەس وایان زانیوە لە هاوەڵانە، بۆیە زۆربەی سەرچاوەکان هۆشداریان داوە کە ئەو هاوەڵ نیە، لە قەیرەوان دانیشتەجێ بووە و زانستێکی زۆری لە باکووری ئەفریقا دا بڵاو کردۆتەوە و مەجلیسەکانی پڕ بوو لە دانایی و ئامۆژگاری ڕەوانبێژانە و زۆرتوند بوو بەرامبەر بە کار بە دەستان لە خەڵکی قەیرەوانیش ئەم کەسایەتیانە فەرموودەیان لێوە گێڕاوەتەوە: مسلمی کوڕی یەساری ئەفریقی و عبید الله ی کوڕی زحر و عبدالرحمن ی کوڕی زیاد لە مزگەوتی ئیبن وەهەب و خەڵکانێکی تریش هەروەها دەباغ باس لەوە دەکات کە لە قەیرەواندا کۆچی دوایی کردووە دوای ئەوەی زانستێکی زۆری تیادا بڵاو کرۆدۆتەوە، بەڵام مێژووی کۆچی دوایی باس نەکردووە [1].

- طلقی کوڕی جعبانی فارسی: ئەشلێن جابان، بەڵام ئەوەی یەکەم ڕاستترە وەك لە إکمال دا هاتووە، شوێنکەوتوە – تابیعیە – بە خزمەت عومەر گەشتووە و پرسیاری لێ کردووە، زۆربەی گێڕانەوەکانی لە تابعین و شوێنکەوتوانەوە یە زانا و شەرعزان بووە، لە خەڵکی قەیرەوانیش موسای کوڕێ عەلی و ئیبن ئەنعەم فەرمودەیان لێوە گێڕاوەتەوە، بەڵام ماوەی مانەوەی تیایدا و مێژووی کۆچی دواییان باس نەکردووە.
- عبدالرحمن ی کوڕی ڕافعی تنوخی، ابو جهم کۆچکردوو لە ساڵی ۱۱۳ ك قەیرەوان دا: هەر زوو لە ساڵی ۸۰ ی کۆچیدا هاتە قەیرەوانەوە و یەکێکە لە بەرێزترین دادوەرەکانی، ئەمەش لە سەردەمی حەسسانی کوڕی نوعماندا بوو و بەردەوام بوو لەسەر بڵاو کردنەوەی زانست بۆ ماوەی سی و سێ ساڵ و خەڵکێکی زۆر لێ ی سودمەند بون، فەرموودەی کۆمەڵێ لە هاوەڵانیشی هێنایە قەیرەوان لەوانە: عبداللە ی کوڕی عەمری کوڕی عاص، لە خەڵکی قەیرەوانیش عبدالرحمن ی کوڕی زیادی ئەفریقی و عبداللە ی کوڕی زحری کینانی و بەکری کوڕی سەوادی جزامی و خەڵکانێکی تر فەرموودەیان لێوەگێڕاوەتەوە.. یەکەم کەسیش بووە کە دادوەری لە قەیرەواندا پێ سپێردراوە لە ساڵی ۱۱۳ ك دا [2].

٥- **عبداللە ی کوڕی مغیرەی کوڕی ابی بردەی کنانی:** ماوەیەکی زۆر پێش بە خەلیفە بوونی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە قەیرەواندا نیشتەجێ بوو، لای خەڵکەکە کەشی بەدادگەری و

---

[1] - عصر الدولتين الاموية و الباسية و طهور فكر الخوارج، ل: ٤٥.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٤٥.

خواپەرستی ناسرا بوو، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش کردی بە دادوەری قەیرەوان لـە سـاڵی ٩٩ ك دا، بە هۆی چاکی و دینداری و زانستیەوە و لەو پۆستە دا مایەوە هەتاوەکو لە ساڵی ١٢٣ ك دەستی لـە کارکێشایەوە، زاهید و پارێزکار و زانا بوو، بـە پێـی قورئـان و سـوننەت لەگەڵ خەڵکی قەیرەوەاندا دەجولایەوە و زانسیٚ بۆ ماوەی بیست و پێنج سـاڵ لـە نێوانیانـدا بلاٚو کردەوە، ئیبن حُبّان لە متمانە پێکراوەکاندا باسی دەکات و دانەرانی کتێبـەکان ستایـشی فەزڵ و زانست و ئاینیان کردەوە [١].

- عبداللە ی کوڕی یەزیدی معافری حبلی، ابو عبدالرحمن کۆچکردوو لـە سـاڵی ١٠٠ ك لـە قەیرەواندا: هەر زوو چووە قەیرەوانەوە، ڕەنگە ئەوەش لەگەڵ موسای کوڕی نصیر لـە سـاڵی ٨٦ کۆچیدا بوو بێ، چونکە لە ئازاد کردنی ئەندەلوس دا ئامادە بـوو، پاشـان گەڕایـەوە بـۆ قەیرەوان و خانوو مزگەوتێکی کردەوە تیایدا نیشتەجیٚ بوو، پاشان لەناو نێـردەی زانـستی دا دەستنیشان کرا، بەلاٚم کۆچی دوایی لە ساڵی ١٠٠ ك بوو، واتە دوای یەك سـاڵ لـە دیـاری کردنی، لەگەڵ ئەوەشدا مالیکی لەبارەیەوە ئەڵێت: خەڵکی ئەفریقیـە لـێـی سـوودمەند بـوون زانستێکی زۆری تیادا بلاٚو کردەوە و فەرموودەی کۆمەڵێك لەهاوەڵانی هێنایـە قەیرەوانـەوە، فەرموودەی ئەوانەشی زیاتر کرد کە خۆیان هاتبوونە قەیرەوانەوە، لـە ئـیبن عومـەر و عقبـەی کوڕی عامر و عبداللە ی کوڕی عەمرو و ئەبوزەڕەوە فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە، لـە خـەڵکی قـەیرەوانیش عبـدالرحمن ی کـوڕی زیـاد و ابـو کریـب جمیـل ی کـوڕی کریـب ی دادوەر کۆچکردوو لە ١٣٩ ك و خەڵکانێکی تریش فەرموودەیان لێی گێڕاوەتەوە، پیاوێکی ساڵح و پارێزکار و زۆر بە تەنگ بلاٚوکردنەوەی سونەتەوە بوو، کاریگەریشی لـە ژیـانی زانـستیدا – بەتایبەت بواری فەرموودە – لە قەیرەوان دا بەهێز بوو.

مزگەوتێکی بۆ ئەڵقە زانستیەکانی لە قەیرەوان دا دروست کرد و ڕەخنەگران کۆدەنگن لەسـەر متمانە پێکردنی و فەرموودەشی لای موسلیم و چوار پێشەواکەی تر هەیە و ئیبن وەهبیش لە جـامع کەیدا و ئەحمەد و زانایانی تریش فەرموودەیان هێناوە [٢].

---

[١] - عصر الدولتين الاموية و العباسية و ظهور فكر الخوارج، ل: ٤٥.

[٢] - هەمان سەرچاوە، ل: ٤٦.

•وەهەبی کوڕی حی معافری: ئیبن ابی حاتم باسی ئەوە دەکات کە کەسانێك هەن کە ناوەکەیان وەرگێڕاوە بۆ حی کوڕی وەهب، بەلاّم ئەبو زرعە ئەمەی ڕاست کردۆتەوە ن هەر زوو لە غەزای ئەفریقا دا بەشداری کردووە، چونکە پرسیاری کردوە لە ئیبن عباس کە لە ساڵی ٦٨ ك کۆچی دوایی کردوە دەربارەی دەفری خەڵکی مەغریب وەك لە الریاض و المعالم دا، یەکێکە لە ئەندامانی نێردەی زانستی کە لەلایەن عومەرەوە نێردراوە، لە قەیرەواندا نیشتەجێ بوو و زانستێکی زۆری تیادا بلاّو کردەوە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد.

فەرموودەی ئیبن عەباس و هاوەلاّنێکی تری هێنایە قەیروانەوە و فەرمودەی بە مرسلی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) گێڕأوەتەوە، لە خەڵکی قەیرەوانیش عبدالرحمن ی کوڕی زیادی ئیفریقی فەرموودەی لێوەگێڕاوەتەوە، بەلاّم سەرچاوەکان باسی حاڵیان نەکردەوە لەڕووی(جرح و تعدیل) وە [1] ئەم دەزانایەش لە باشترین زانایانی شوێنکەوتوان وتابعینن و عومەری کوڕی عبدالعزیزیش ناردنی بۆ باکووری ئەفریقا هەتاوەکو خەڵکی فێری زانست و شارەزای سەرع بکەن، ئەوانیش جێی گومانی باشی ئەوبون و بوونە پێشەنگێکی باش بۆ خەڵکی، پێش ئەم دەزانایەش کۆمەڵێکی زۆر لە شوێنکەوتوان هاتبوونە قەیرەوان و خەڵکی ئەو ناوچەیان فێری زانست و حوکمە شەرعیەکان و کردبوو [2].

ئەم دەکەسە شوێنەواری باشیان بەجێ هێشت لە بورای قورئان و تەفسیر و فەرموده و بلاّو کردنەوەی سوننەتی کردەیی و بیروباوەڕی دروست دا و، یارمەتیدەری کاربەدەستان بوون بۆ بەرەنگار بوونەوەی کۆمەڵە بێگانەو دەرەکیەکان و بلاّو کردنەوەی حوکمە شەرعیەکان لە نێوان بەربەردا، مالیکی ئەیگێڕێتەوە کە کاتی خەواریج لە دژی حنظلە ی کوڕی صفوان لە طنجە دا ڕاپەڕین لە ساڵی ١٢٢ ك حنظلة زانایانی ئەفریقای کۆکردەوە – ئەو زانایانەی کە عومەری ناردبوونی بۆ ئەفریقا – هەتاوەکو خەڵکەکە فێری شەرع و زانست بکەن ئەوانیش ئەم نامەیان نووسی هەتاوەکو هەموو موسڵمانان پەیڕەوی بکەن و باوەڕیان پێ ی هەبێت:... ئەهلی عیلم و شارەزایان دەربارەی پەروەردگار و قورئانەکەی و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەزانن کە هەموو ئەوەی کە پەروەردگار دایبەزاندووە ئەگەڕێتەوە بۆ دە ئایەت: فەرمانکەرو نەهیکەر و مژدەدەر و

---

[1] - مدرسة الحدیث بالقیروان(٢ / ١٤ بۆ ٢٢)

[2] - عصر الدولتین الامویة و العباسیة، ل: ٤٧.

ترسێنەر و هەواڵدەر و محكم و تۆكمە و متشابە و لێكچوو حەلاڵ و حەرام و پەندەكان فەرمانكەر بەچاكە و نەهی كەر لە خراپە و مژدەدەر بەبەهەشت و ترسێنەر لە ئاگر و هەواڵدەری سەرگوزەشتەی پێشینان و پاشینان، محكم و تۆكمە یەك كە كاری پێ دەكرێت و متشابهە و لێكچوویەك كە باوەڕی پێ دەهێنرێت و حەلاڵێك كە فرمان دراوە بە ئەنجامدانی و حەرامێم كە فەرمانكراوە بەدور كەوتنەوە لێی و چەند پەندێكی بە پێز و یاد خەرەوە، جا هەر كەس بەگوێ ی فەرمانكەرەكان بكات و نەهیكەرەكان لە خراپە بیگێڕنەوە ئەوە دڵخۆش دەكات بە مژدەدەرەكان و ئاگادار كە ڕەوەكانیش سوودیان پێ گەیاندەوە، هەركەسێكیش حەلاڵ بە حەلاڵ و حەرام بە حەرام بزانێت و زانیاری لەو شتانەدا كە ناكۆكی لەسەر بگێڕێتەوە بۆ پەروەردگار لەگەڵ گوێڕایەڵیەكی ئاشكرا و نیەتێكی چاك دا ئەوەی سەركەتوو سەرفراز بووە ژیانی دونیا و دوا ڕۆژی بۆ خۆی مسۆگەر كردوە والسلام علیكم [1]. بێ گومان ئەم نامەیە بە بەڵگەنامەیەكی گرنگ دادەنرێت، چونكە بەڵگەیە لەسەر ڕەسەنی زانستی ئەم نێرە دە زالستیە و ڕونی ئامانجە شەرعیەكانیان، تەنانەت ئەمان ناوڕۆكی ئەم نامەیان كورت كردۆتەوە لەبەر بە سوودی و گرنگیشی گشتێنراو لەسەر هەموو مینبەری مزگەوتەكانی ئەفریقا خوێندرایەوە [2].

٦- **نامە بانگخوازی و بانگهێشتنامەكانی بۆ پاشاكانی هیند و شوێنەكانی تر:** عومەری كوڕی عبدالعزیز نامەی بۆ پاشاكانی سند نوسی كە وڵاتەكانیان بخەنە ژێر ڕكێفی یەوە بەمەرجێك كە لە ئەرك و ماف دا وەك موسڵمانەكان بن، پیشتریش ناوبانگی عومەریان پێگەشتبوو بۆیە جیشبەی جیشبەی كوڕی داهر [3] موسڵمانان بوو و ناوی عەرەبی لە خۆی نا [4].. بەم شێوەیە پاشاكانی سند لەسەردەمی عومەر و یەزیدی كوڕی عبدالملك دا بە موسڵمانی مانەوە [5].

---

[1] - عصر الدولتين الاموية و العباسية، ل: ٤٨.

[2] - فتوح البدان، ل: ٤٢٨، عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ١٧٣.

[3] - الكامل في التاريخ، لة عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ١٧٣.

[4] - عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ١٧٣.

[5] - فتوح البلدان، ل: ٤١٥.

عومەریش کەسانێکی بۆ ناردن هەتاوەکو فێری ئاینەکەیان بکەن، هەروەها چەند نامەیەکیشی بۆ پاشاکانی پشت ڕوبار(ماوراءالنهر) نارد و بانگهێشتی کردن بۆ ئیسلام و هەندێکیان لێ موسڵمان بوو [1].

٧- **هاندانی خەڵکانی غەیرە موسڵمان بۆ هاتنە ناو ئیسلام:** عومەر هەستا بە هاندانی خەڵکانی غەیرە موسڵمان بۆ موسڵمان بوون لە ڕێی پێدان ی پارە وە بۆ دڵڕاگیر کردنیان، ئەمەش شوێنکەوتنی سونەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئیبن سەعد لە عیسی ی کوڕی ابی عطا وە - کە پیاوێکی خەڵکی شامە بەرپرسی دیوانی مەدینە بوو - باس لەوە دەکات کە عومەری کوڕی عبدالعزیز هەندێ جار پارەی بە و کەسانە دەدا کە دەیویست دڵیان ڕاگیر بکات بۆ هاتنە ناو ئیسلام [2] هەروەها ئەگێڕنەوە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز هەزار دیناری بەخشی بە پەتریارکێك - قەشەیەك - هەتاوەکو دڵی ڕابکێشێت بەلای ئیسلامدا [3].

٨- **ڕاستکردنەوەی ئەو بارە تایبەتەی کە ئەهلی کیتاب هەیانبوو:** دادگەری لەبەرامبەر ئەهلی زیمەدا - خاوەن پەیمانەکان - گاور و جولەکە - و هەڵگرتنی سەرانە لەسەریان دوای موسڵمان بوونیان کاریگەریەکی باشی هەبوو لەسەر هاتنی خاوەن پەیمانەکان بۆ نا و ئیسلام، سەرباری ئەو ئاسەواری نەرێیەی کە لەسەر بەیتولمال هەیبوو ن وەك ئەوەی لەگەڵ والی خۆی لە خوراساندا جەڕاحی کوڕی عبداللە ی حوکمی کردی کاتێ بۆی نارد و ئەیوت: بزانەکێ پێش تۆ ڕوە و قیبلە نوێژی کردووە و سەرانەی لەسەر هەڵگرە [4]، پاشان بانگهێشتی ئەهلی زیمەی کرد بۆ موسڵمان بوون، جا ئەگەر موسڵمان بوون لێیان قبوڵ بکات و سەرانەیان لەسەر هەڵگرێت، هەروەها لە ئەرك و ماف دا وەك موسڵمانانن [5] لە ئاکامی ئەم

---

[1] - البداية و النهاية، لە عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ١٧٣.

[2] - الطبقات(٥ / ٣٥٠) عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ١٧٤.

[3] - الطبقات(٥ / ٣٥٠).

[4] - تاريخ الطبري، لە عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالنم، ل: ١٧٤ ز

[5] - الطبقات(٥ / ٣٥٠).

بانگهێشتەشدا دەیان هەزار کەس هاتە نـاو ئیـسلامەوە، بۆنموونـە خوراسـاندا نزیکـەی چـوار هەزار زیمی لەسەردەستی جەڕاحی کوڕی عبداللە والی ئەو شارە موسڵمان بوون [1].

هەرچی مەغربیشە ئەوە هەموو بەربەرەکان لەسەر دەستی ئیسماعیلی کوڕی عبداللە کـوڕی أبـی موهاجیری والی عومەر لە مەغریبدا موسڵمان بوون [2]. ئەمەش بەڵگەیە لەسـەر دووربینـی عومـەر لـە گرنگیدان بەبانگەواز کردن بۆ ئیـسلام بەشـێوازی دانایانـە لـە ڕێـی ئامۆژگـاری باشـەوە هەربۆیـە بەرهەمەکەی لە بەرهەمی شێوازەکانی تـر کـەمتر نـەبوو، بـەڵکو لـەوان باشـتر بـوو و بـووە هـۆی ڕاکێشانی خەڵکانێکی زۆر بۆ ناو ئیسلام بە بێ ڕشتنی دڵۆپە خوێنێك یـاخود سـەرفکردنی پـارە بـۆ ئامادەکردنی سوپا، بێگومان ئەوانە لە بن دەستی موسڵماناندا دەژیـان و نزیکتربـوون پێیانـەوە بۆیـە لەخەڵکی تر لە پێشترن بۆبانگهێشت کردن بۆ ئیسلام.

بەم شێوەیەش ئیـسلام لەسـەردەمی عومـەری کـوڕی عبـدالعزیز دا(ﷺ) بەشـێوازی دانایانـە و ئامۆژگاری جوان بڵاو بوویەوە و بەردەوام بوو لەسـەر شـێوازی جیهـاد و تێکۆشـانی بانگخوازیانـە بەهۆی چەند زانایەکی خواویستەوە کەلە خوێندنگە زانستیەکاندا پـەروەردە بـوون و لەسـەردەمی دەوڵەتی ئەمەویدا پێ گەشتن، ئەم زانا و بانگخوازانەش بـوون کـە پـرۆژەی بـانگخوازی و زانـستی عومەری کوڕی عبدالعزیز یان خستە بواری جێبەجێ کردنەوە.

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٨٦).

[2] - فتوح البلدان، ل: ٢٣٢ — ٢٣٣ للبلاذري، عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ١٧٤.

سیاسەتی دارایی عومەر سەر پێی نەبوو، چونکە ئەو پرسیار بوو لە دەوڵەت و حسابی بۆ هەموو هەنگاوێکی خۆی دەکرد و گرنتی بۆ هەر کارێك دادەناکە دەیویست جێبەجێ ی بکات [1]. لە سیاسەتیشدا جەختی لەسەر چەند مەسەلەیەك دەکردەوە لەوانە:

- سووربون لەسەر دەست گرتن بە قورئان و سوننەتەوە، و قوربانیدان لە پێناوی دا ئەمەش لەونامانەدا دەردەکەوێت کە بۆ کار بەدەستەکانی دەنارد هەروەها لەوتارەکانیدا بۆ ژێردەستەکانی کەلە یەکێکیاندا ئەڵێت: پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاربەدەستان دوای خۆی چەند سوننەتێکیان بڕیاردا کەدەستپێوەگرتنی دەستگرتنە بە قورئانەوە و بەهێزیە لە دینداری دا، کەس بۆی نیە بیگۆڕێت یان کاربە پێچەوانەکەی بکات [2].
- چەسپاندنی بەهاکانی حەق و دادگەری و ڕەتکردنەوەی ستەم: ئەمەش بناغەی سیاسەتی عومەربوو، چونکە هەموو ئەو ئامانج و هۆکارانەی کە دەیگرتەبەر لەگەڵ ئەم بنەمایەدا دەگونجان، چەسپاندنی حەق و ڕەتکردنەوەی ستەمیش یەکێکە لە بنەماکانی شەریعەت و مەبەستێکی سەرەکیە لە مەبەستەکانی، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾الحديد: ٢٥). واتە: سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ناردووە بە بەڵگە و موعجیزەی ڕوونە. وە کتێبی(ئاسمانی)و تەرازوی دادمان لەگەڵا ناردن بۆ ئەوەی خەڵکی بەدادگەری ڕەفتار بکەن(لەناو خۆیاندا)...

ئیبن تەیمیە ئەڵێت: بناغەی شەریعەت لەسەر حیکمەت و بەرژەوەندی بەندەکان وەستاوە لە دونیاو دوا ڕۆژدا، ئەم بناغەیەش هەمووی دادگەری و بەزەیی و بەرژەوەندی و حیکمەتە، هەر مەسەلەیەکیش لە دادگەری دەرچێت بۆستەم و لە ڕەحمەتەوە بۆ دژەکەی و لەبەرژەوەندیەوە بۆ زیان و لە حیکمەتەوە بۆ بی سەروبەری ئەوە لە شەریعەت نیە [3]. عومەریش(رضي الله عنه) دەگەڕایەوە بۆ حەق

---

[1] - السياسته الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٢٧.

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٣٨.

[3] - اعلام الموقعين(٣ / ٣).

ئەگەر بۆی دەربکەوتایە کە هەڵەیە و لەوبارەیەوە ئەیوت: ئاسانترین شت بەلامەوە هەڵوەشاندنەوەی بڕیارێکی خۆمە کە دواتر هەڵەبونیم بۆ دەرکەوتبێت [1].

**یەکەم: ئامانجی سیاسەتی ئابووری لای عومەر(ﷺ):**

١- **دابەشکردنەوەی سەرلەنوێ ی داهات و سامان بەشێوەیەکی دادگەرانە:** عومەری کوڕی عبدالعزیز هەوڵی دەدا بۆ دابەشکردنەوەی سەرلەنوێی داهاتو سامان بەشێوەیەکی دادگەرانە، بەو شێوەی کە پەروەردگار پێی ڕازیە و بەهاکانی دادگەری و ڕاستی ئەیخوازێت، هەروەها عومەر چاودێری لادانەکانی پێشووی دەکرد کە پێش خەلافەتی ئەو ڕووی دا بوو و سەرنجی ئاسەوارەنێگەتیڤەکانی دەدا لەسەر دەروونی هاوولاتیان، هەروەها ڕەخنەی لەسیاسەتی دابەشکرنی سولەیمانی کوڕی عبدالملك گرت و پێی وت ك ئەبینم دەوڵەمەندەکانت دەوڵەمەندتر کردووە و هەژارەکانت پشتگوێ خستووە [2].

دیارە عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەیزانی کە جیاوازی چینایەتی و کۆمەلایەتی دەرەنجامی خراپ دابەش کردنی سامانە هەربۆیە سیاسەتی نوێی خۆی دارشت بۆ سەندنەوەی مافی هەژار و ستەملێکراوان بۆ گەشتن بەم ئامانجەش چەند هۆکارێکی کردەیی گرتبەر لەوانە:

ئەمیر و کار بەدەستەکانی لە دەستەبەرسەراگرتن و قۆرخ کردنی سامانی ئوممەت دروخستەوە و هەموو ئەو مولکانەی لێ سەندنەوە کە بە نارەوا دەستیان بەسەردا گرتبوو و گێرایەوە بۆ خاوەنەکانیان یان بۆ بەیتولمال ئەگەر خاوەنەکانیان نەناسراو بونایە یان ماڵ و مولکی گشتی بوایە.

تەرخان کردن و بەخشینی پارەی زیاتر بە چینە هەژار و نەدارەکان و چاودێری کردن و دەستەبەر کردنی ئاستی بژێوی پێویست بۆیان لە ڕێگەی زەکات و داهاتەکانی تری بەیتولمالەوە [3].
ئەم سیاسەتەشی لە بواری گێڕانەوەی مافەکاندا جێبەجێ کرد، ئامانجی سیاسەتی دابەشکردنی عومەر بریتی بوو لە گەیاندنی خەڵکی بە ئاستی بژێوی مام ناوەند و خودکەفایی، ئەمەش لەوتارەکانیدا

---

[1] - سيرة و مناقب عمر لابن الجوزي، ل: ١١٣.

[2] - سيرة عمر، لابن عبدالحكم، ل: ١٣٥.

[3] - السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٣٥.

دەردەکەوێت، ئەوە بوو ڕۆژێکیان وتاری داو وتی: " حەزم ئەکرد دەوڵەمەندەکان کۆ بوونایەتەوە و سامانیان بەشی هەژاران بدایە هەتاوەکو ئێمە و ئەوان یەکسان بین و منیش خۆم یەکەمیان بم "[1].

لە وتاریکی تریشدا ئەڵێت... هەریەکێك لە ئێوە پێداویستی خۆی بگەیەنێت بە من ئەوە بە پێی توانا هەوڵ دەدەم بۆ جێبەجێ کردنی، هەرکەسێکیش باری گوزەرانی باش نیە ئەوە حەزم دەکرد لە من و خزمەکانەوە دەس پێ بکرێت و باری گوزەرانی هەمووان وەك یەکی لێ بکرێت[2].

عومەر ئەمەی بە شێوەیەکی کردەیی جێبەجێ کرد کاتێ فەرمانی کرد بە دانەوەی قەرزی قەرزاران و کاربەدەستێکی بۆی نووسی: خەڵکانێك هەن خانوو و خزمەتکار و ئەسپ و کەل و پەلیماڵیان هەیە. عومەریش وەڵامی دایەوە، پێویستە هەر موسڵمانێك خانووی هەبێت هەتاوەکو تیایدا بحەوێتەوە و خزمەتگوزاری هەبێت خزمەتی بکات و ئەسپێکی هەبێت جیهادی دژ بە دوژمن پێ بکات و کەلوپەلی هەبێت لە ماڵەکەیدا جا هەر کەس وا بوو ئەوەش بە غارم و قەرزار دادەنرێت و قەرزی بۆ بدەنەوە[3]. کەواتە ئامانجی سیاسەتی دابەشکردنی عومەر(ﷺ) دابین کردنی خانوو و هۆکاری هاتوچۆو کەلوپەلی پێویست بوو بۆ هەموو تاکێك، چونکە ئەمانە مافی سەرەکی و پێویستن و ژیان بە بێ ئەمانە ئاسان نیە[4].

٢- **بەدیهێنانی گەشەی ئابووری و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی:** عومەر لە ڕێی چەندین هۆکارەوە هەوڵی دا بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجە، چونکە کەش و هەوایەکی گونجاوی بۆ گەشەپێدان بەدی کرد لە ڕێی پاراستنی ئاسایش و لە ناوبردنی ئاژاوە و گێڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیانەوە بەم پێیەش ژێر دەستەکان دڵنیا بوون لە مافەکانیان بە ئاسایش و هێمنیەوە لە ولاتی خۆیاندا دەژیان، هەروەها فەرمانی کرد بە بنیاتنانی شوێن و دام و دەزگا گشتیەکان کە ئەمڕۆ بە پرۆژەکانی ژێر خانی ئابووری ناو دەبرێن وگەشەکردنیش بەبێ ئەم دام و دەزگا گشتیانە بەدی نایەت وەك ڕووبار و ڕێگا و بان و پرۆژەی ئاودێری، هەروەها عومەر جەختی کردەوە

---

[1] - الدارة الاسلامية في عز العرب، محمد كرد علي / ل: ١٠٣.

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٤٢.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٧١.

[4] - السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٣٨.

لەسەر ڕێکخستنی بنەمای ئازادی ئابووری سنووردار بە چەند دیسپلین و ڕێکخەرێك ی شەرعی.

ئەوەبوو خەڵکی بڵاوبوونەوە بۆ بازرگانی کردن و وەبەرهێنانی پارە پولەکانیان و گرنگی زۆری بەکەرتی کشتوکاڵی دا، چونکە کەرتی کشتوکاڵی یەکێکە لە گەورەترین کەرتەکان لەسەر ئاستی تاکەکەسی و ڕەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوو لەسەر میزانیە و بودجەی دەوڵەت، دیارە عومەر و هەموو ئوممەت بەری ئەم سیاسەتەیان چنیەوە و خۆشگوزەرانی و ئاسودەیی وڵات و بەندەکانی گرتەوە [١]، پیاوێك لە کوڕانی زەیدی کوڕی خەتتاب وتی: عومەر تەنها دوو ساڵ و نیو خەلیفە بوو واتە سی مانگ، بەڵام کاتێ کۆچی دوایی کرد هەر پیاوە و پارەیەکی زۆری دەهێنا و ئەیوت: ئەم پارەیە دابەش بکەن بەسەر هەژاراندا، بەڵام کەسی دەست نەدەکەوت و پارەکەی دەبردەوە، چونکە عومەری کوڕی عبدالعزیز هەموو خەڵکی دەوڵەمەند کرد بوو [٢].

## دووەم: هۆکارەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ بەدیهێنانی ئامانجە ئابووریەکانی دەوڵەتەکەی:

عومەری کوڕی عبدالعزیز هەوڵی دەدا بۆ بەدیهێنانی ئامانجە ئابووریەکان بە چەند شێوازێك:

١- **دەستە بەرکردنی کەش و هەوایەکی گونجاو بۆ گەشەکردن.** عومەر هەوڵی دەدا بۆ دابین کردنی کەش و هەوایەکی گونجاو بۆ گەشەپێدان و بۆ ئەم مەبەستەش ئەم کارانەی ئەنجام دا:

أ- **گێڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان:** بەم جۆرە و کەش و هەوایەکی پڕ لە ئاسایش و هێمنی دەستەبەر بوو و بنەماکانی حەق و دادگەری و گێڕانەوەی مافەکان بۆ خاوەنەکانیان چەسپێنرا [٣]، پێشتریش باسی سیاسەتی عومەرم کرد(ﷺ) لە گێڕانەوەی ماف بۆ خاوەنەکانیان و نەهێشتنی ستەم و زۆر نمونەم لەم بارەیەوە خستە ڕوو.

ب- **ڕێگەدان بە ئازادی ئابووری سنووردار:** عومەر جەختی کردەوە لەسەر ئازادی ئابووری سنووردار و نامەی نووسی بۆ کاربەدەستانی:... بەشێك لە گوێڕایەڵی پەروەردگار کە لە قورئانەکەیدا دایبەزاندووە ئەوەیە کە خەڵکی بۆ ئیسلام بە گشتی بانگ بکرێن و خەڵکیش

---

١ - السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٤١.

٢ - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٢٨. السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٤١.

٣ - السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٤١.

بەماڵ و سامانیانەوە لە دەریا و وشکانیدا بازرگانی بکەن بێ ئەوەی ڕێگریان لێ بکرێت و دەست بهێنرێتە ڕێیان [1].

لە شوێنێکی تر دا ئەڵێت:... پرد و ڕێگاکانی هاتوچۆ یان بۆ بکەرەوە بێ ئەوەی هیچ باجێکیان لێ وەرگریت، چونکە خەڵکانی خراپەکار زیادە ڕەویان کردووە و کارێکیان کردووە کە داوای کردنیان لێ نەکراوە [2]، هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز دەستی وەرنەدەدایە نرخی شتومەك لە عبدالرحمن کوڕی شوبانەوە ئەڵێ: بە عومەری کوڕی عبدالعزیزم وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەوە بۆچی نرخی شتومەك لەسەردەمی تۆدا بەرزە لەکاتێکدا کە پێش تۆ هەرزان بوو؟ عومەریش وتی: ئەوانەی پێش من بارێکی زیاد لە پێویستیان خستبویە سەرشانی ئەهلی ذیمە و ئەوانیش ناچار بوون بۆ پەیدا کردنی ئەو پارەیە کەل و پەلەکانیان بە هەرزان بفرۆشن، بەڵام من داوای زیاتر لە توانای خۆیان لێ ناکەم، ئەوانیش بە ئارەزوی خۆیان شت دەفرۆن، ئەڵێ: وتم: ئەی بۆ نرخ دانانێیت. وتی: ئەوەی مافی ئێمە نیە، نرخ بەدەست خوایە [3]، سەبارەت بە کاڵا حەرامکراوەکانیش ئەوە بەتوندی ڕێی لە بازرگانی پێوەکردنی دەگرت، بۆ نموونە مەی لەوشتە پیسانەیە کە دروست نیە لە نێوان موسڵمانانندا مامەڵەی پێوە بکرێت لەبەر حەرامی و زیانی، چونکە خواردنەوەی دەبێتە هۆی بە حەلاڵ زانینی خوێن ڕشتن و خواردنی ماڵی حەرام، عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەڵێ: هەرکەسێك ببینین کە بیخواتەوە دوای ئاگادار کردنەوەی ئەو سزای ماڵی و دەرونی دەدەین و ئەیکەینە پەند بۆ خەڵکانی تر [4].

ئەم سیاسەتەی عومەریش لە گێڕانەوەی ماف و ڕێگەدان بە ئازادی ئابووری ڕێکخرا و بەرهەمی باشی هەبوو و خەڵکی هان دا بۆ کار و بەرهەم هێنان و ئەو بەربەستانەی نەهێشت کە بوونە ڕێگر لە بەرامبەریدا و ئەمەش بووە هۆی گەشە کردنی بازرگانی و زیاد کردنی داهاتی زەکات کە هۆکارێك بوو بۆ بەرزکردنەوەی بژێوی چینە هەژارەکان و بەهێزبوونی توانای کڕینیان ی کە

[1] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٩٤. السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٤٧.

[2] - الادارة الاسلامية، محمد كرد، ل: ١٠٥.

[3] - السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٤٨.

[4] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٠٣.

ئاراستەی بەکاربردن دەکرێت و خواست لەسەر شتومەك و خزمەتگوزاریەکان زۆر دەبێت، هەموو ئەمەش ئەبێتە هۆی بوژاندنەوەی ئابووری و بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی و خۆشگوزەرانی[1].

٢- **پەیڕەو کردنی سیاسەتێکی کشتوکاڵی نوێ:** بە گرتنەبەری چەند هەنگاوێك کە مەبەست پێی بەرزکردنەوەی بەرهەمهێنانی کشتوکاڵیە و ئەمەش وردەکاریەکانی ئەم پلانەیە:

أ- **قەدەغەکردنی فرۆشتنی ئەو زەویانەی کە خەراجی لەسەرە:** خەڵکی داوایان کرد لە عبدالملکی کوڕی مەروان و وەلید و سولەیمان کە ڕێ بدە بە کڕینی زەوی لە ئەهلی ذیمە، ئەوانیش ڕێیان پێدان بەمەرجێك کە پارەکەی – نرخەکەی – بخەنە بەیتولماڵ، کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە ئەم مەسەلەیەی وەك خۆی هێشتەوە، لەبەر ئەو میرات و مارەیی ئافرەت و قەرزدانەوەی کە تێی کەوتبوو و ئەویش نەیدەتوانی خۆی لێ دەرباز بکات، بۆیە نامەیەکی نووسی و لە ساڵی سەدی کۆچیدا بۆ خەڵکی خوێندرایەوە تیایدا هاتبوو: هەر کەسێك شتێك بکرێت دوای ساڵی سەدی کۆچی ئەوە کڕینەکەی ڕەتدە کرێتەوە، ساڵی سەدیش بە ساڵی المدة واتە(ماوە) ناوزەد کرا، ئەوە بوو خەڵکیش پاش ئەمە وازیان لە کڕینی هێنا[2]، خاوەن زەویەکانیش داوایان کرد کە لە بری خەراج، زەکاتیان لەسەر دابنێت، عومەریش وەلامی دانەوە وتی: من هیچ شتێك باشتر بۆ مانەوەی ئەوان بە موسڵمانێتی نازانم جگە لەم زەویەی کە خوای گەورە کردویەتی بە فەیئ و دەستکەوت بۆیان...

ئەبو عوبەیدە ئەڵێ: دیارە عومەر وەك فەئی لە زەوی ڕوانیوە بۆیە ڕێگری لە فرۆشتنی دەکرد[3]، هەروەها نامەیەکی نووسی بۆ مەیمونی کوڕی مهران: پاشان ڕێ نەدەیت خاوەن زەویەکان زەویەکانیان بفرۆشن، چونکە ئەوە فرۆشتنی فەیئ موسڵمانانە[4]. عومەر ڕازی نەبوو ئەو زەویەی کە خاوەنەکەی موسڵمان بووە لە زەوی خەراجەوە بکرێت بە زەوی دەیەك و عوشر[5].

---

[1] - سیاسة الانفقات العام في الاسلام، عوف الكفراوي، ل: ٣٧٢.

[2] - الخراج للريس، ل: ٣٩٠، السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٤٩.

[3] - الاموال لابي عبيد، ل: ١٢١ ژمارە ٢٥٦.

[4] - هەمان سەرچاوە ٢٥٧، ل: ١٢٢.

[5] - السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٥٠.

خەراجی لەسەر هێشتنەوە و وتی: خەراج لەسەر زەویەکەیەو عُشر و دە یەکیش لەسەر دانەویلەکەیەتی [1]، بەم شێوەیەش داهاتی سەرەکی بەرهەمهێنانی پاراست و کردیە مولکی گشتی بۆ ئوممەت نەوەکو بکرێتە چەند مولکێکی بچوك بۆ کەسەکان [2].

ب- **گرنگی دان بە کشتیاران و سوککردنی باج لەسەریان:** هەندێ لە خەلیفە ئەمەویەکان پێش عومەر باری سەرشانی کشتیارانیان قورس کرد بوو لەڕێی سەپاندنی باجی زۆرەوە، ئەمەش بووە هۆی زۆر بوون ی باجەکان و فشاری بۆ سەر خاوەن زەویەکان دروستکرد و زۆرێکیان دەستبەرداری بوون و زەویەکان لە کارکەوتن وئەمەش زیانی گەریاند بە دارایی دەولەت، هەروەها دەولەت پەنای برد بۆ شێوازی ئازاردانی خەلك لە کۆکردنەوەی باج دا ئەمەش خاوەن کێلگەکانی ناچار کرد کە ولاخ و مەڕومالاتەکانیان بفرۆشن لەتاو نالەباری گوزەران و بژێویان [3]، بەلام کاتێ عومەر کرا بە خەلیفە هەولی دا بۆ هەلوەشاندنەوەی هەموو ئەو باجانەی کە پێچەوانەی شەریعەتن، لەم بارەیەشەوە نامەیەکی نووسی بۆ کار بەدەستانی کە لە یەکێکیاندا هاتوو: خەلکی کوفە تووشی بەلا و ستەم و گرانی بوون و کاربەدەستانی خراپەکار ڕێبازێکی خراپیان بەسەردا سەپاندوون.. جا تۆ تەنها کێشی حەوتیان لێ وەرگرە [4]، نە ئایین و نە کرێی پارەلێدەرانی تیادا بێت [5]، نە دیاری نەورۆز و ئاهەنگ [6] و نە نرخی پەڕەکان و کرێ ی مالەکان [7]، عومەر قبالەی هەلوەشاندەوە کە لەبەسرە دابووبوو و وێڕای هەلوەشاندنەوەی شێوازی الخرص [8]، چونکە کرێکارەکان بەروبومەکانیان بە نرخێکی بەرز

---

[1] - الاموال، ذمارة، ٢٣٥، ل: ١١٤ لابي عبيدة.

[2] - الخراج، ل: ٢٣٩ للريس، السياسة المالية، ل: ٥٠.

[3] - الضرائب في السواد، ل: ٥٧ للدوري.

[4] - ئەو درهەمە بوو کە عبدالملك لێی دا و هەردەدانەی کێشی حەوت مسقالێ ئالتونی هەبوو.

[5] - ئایین: چەند بنەمایەکی کارگێڕی ساسانیە و رسومی ڕو پێوەکانە، زەوی خەراج و کرێی پارەلێدەران واتە: کرێی پسپۆڕانی بواری لێدانی دراو.

[6] - نەرۆز و ئاهەنگ: دوو جەژنی فارسەکان بوو کەتیادا دیاریان پێش کەشێ دەکرد.

[7] - پەڕەکان(صحف): چەند پسولەیەك بوو بۆ ئەستۆ پاکی.

[8] - قبالە: واتە: کەسێك کە دەبێتە کەفیل بۆ کۆکردنەوەی خەراج لەبەرامبەر بڕێك پارەی دیاریکراودا کە بۆ خۆی وەردەگرێت. الخرص: واتە: شوێن.

دەخەملاند و ڕاستەوخۆ پارەکەیان وەردەگرت بەم شێوەیەش باری سەرشانی کشتیارانیان قورس دەکرد، بۆیە عومەر بڕیاری دانانی باج ی دا بە پێی نرخ ڕۆژ و نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستەکەی: ئاگادارم کە فەرمانبەرەکانت لە فارس دا بەروبومەکان لێدەکەنەوە و پاشان نرخێکیان لەسەر دادەنێن کە زیاترە لە نرخی ئەو خەڵکەی کە مامەڵەی پێوە دەکەن، پاشان ئەمەیان بە حازری لێ وەردەگرن بە پێی ئەو نرخەی کە خۆیان دیاری دەکەن، ئێستاش بشری کوڕی صفوان و عبدالله ی کوڕی عجلانم ناردووە بۆ لێکۆڵینەوە لەو بارەیەوە و گێڕانەوەی ئەو نرخەی کە لە خەڵك وەرگیراوە و دیاری کردنی بە پێی ئەو نرخەی کە کشتیاران بەرو بومەکانیان پێ فرۆشتووە [1]، هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز فەرمانی دا بە هەڵوەشاندنەوەی باجێکی جێگیر لەسەر خەڵکی یەمەن، وەك خەراج لە کاتێکدا زەوی عوشر و دەیەك بوو لەم بارەیەشەوە نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستی خۆی لەیەمەن: پاشان، تۆ نامەیەکت بۆ نووسیوم و ئەڵێیت: کە پێش تۆ باجێك لەسەر شێوەی خەراج بەسەر خەڵکی یەمەندا فەرزکراوە و وەك سەرانە دەبێ لە هەموو بارۆخێکدا بیدەن، بەروبومیان هەبێت یان نا، بژێویان دابین بکات یاخود نەیکات، سبحان الله و پاشان و دووبارە سبحان الله جا هەرکە ئەم نامەیەت بە دەست گەشت ئەو واز لە هەموو ئەوشتانە بێنە کە نارەوان بۆ ئەو شتانەی کە ڕاست و دروستن و بەردەوام پابەند بە بەحەقەوە ئەگەر چی لەو پێناوەشدا سەری من و خۆشت دابنێ ی و تەنها مشتێ خۆڵەمێشمان لەیەمندا بۆ بمێنێتەوە چونکە خوای گەورە دەزانێ کە خۆشحاڵ دەبم بەوە ئەگەر لەسەر حەق بێت و السلام [2].

لە نامەکانی عومەرەوە بۆ کاربەدەستەکانی لادان و ستەمکاریەکانی سەردەمانی پێشوو و نکوڵی کردن و ڕەتکردنەوەی لەلایەن عومەرەوە دەردەکەوێت، کە کاریگەری ئابووری خراپی هەبوو، چونکە خاوەن زەویەکانی لەبەرامبەر زەویەکانیاندا لاواز کرد و ئەمەش بووە هۆی لاوازبوونی بەرهەم و بەروبووم و زیانێکی زۆری بەیتولمال و ولات گەیاند، هەرچی عومەری کوڕی عبدالعزیزیشە ئەوە سوور بوو لەسەر پابەندبوون بە حەق و گرنگیدان بە چەندێتی لەبری چۆنێتی،

---

[1] - الضرائب في السواد، ل: ٦٥.

[2] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٢٦، الخراج للريس، ل: ٢٢٩.

چونكه ئەو داهاتێكی زۆر و پڕ ستەمی ناوێت [1]. چاكسازیەكانی عومەریش ڕۆڵی هەبوو لە هەڵوەشاندنەوەی باجەنارەواكان كە هۆكارێك بوو بۆ بوژانەوەی ئابووری دەوڵەت.

ج- **چاكسازیەكان و ئاوەدانكردنەوە و زیندووكردنەوەی زەوی مردوو**: عومەر خەڵكی هان دەدا بۆ زیندوو كردنەوەی زەوی مردوو – واتە چاندنی ئەو زەویەی كە فەرامۆش كراوە و كشتوكاڵی تیادا ناكرێت – و چاككردنی زەویەكان و سازدانیان بۆ كشتوكاڵ، ئەمەشی لە نامەیەكدا نوسی بۆ كار بەدەستی كوفە، وەك یەك مامەڵە لەگەڵ زەوی ئاوەدان و پشتگوێ خراودا مەكە [2].

سەیری زەوی فەرامۆشكراو بكە و بە پێی توانای خۆی شتی لێ وەرگرە و چاكسازی تیادا بكە هەتاوەكو بەروبومی هەبێت، لە زەوی چێنراو بەرهەمداریش تەنها خەراج وەرگرە بەنەرمی و مامەڵەی جوان لەگەڵ خاوەن زەویدا ڕەفتار بكە [3].

عومەری كوڕی عبدالعزیز نووسی: هەركەسێك ئاوی بەكارهێنا بۆ بەروبومێك ئەوە موڵكی خۆیەتی [4]، لە حەكیمی كوڕی زورەیقەوە ئەڵێ: نامەكەی عومەری كوڕی عبدالعزیزم خوێندەوە كە بۆ باوكمی نارد بوو و ئەیوت: هەركەسێك زەویەكی مردووی بە چاندن یان دروستكردنی خانوویەك تیایدا ئاوەدان كردەوە و ئەو زەویەش كەسانێك بەپارەی خۆیان نەیانكڕیبوو یان بەشێكیان چاندبێت و بەشێكیان هێشتبێتەوە، ئەوە مۆڵەت بدە با سوودی لێ بەرن و بەردەوام بن لە زیندوكردنەوەیدا [5].

هەروەها عومەری كوڕی عبدالعزیز سوور بوو لەسەر سوودوەرگرتن لە زەوی صوافی [6] و پێی وابوو كە بەیتولمال خاوەنی ڕاستەقینەیەتی و نەیدەهێشت بدرێت بە كەس و فرمانی دابەوەی كە بە بەربەنیوەش بچێندرێت، ئەگەر نەیانویست ئەوە بە سێ یەك، ئەگەر بەو شێوەیەش كەس نەیویست ئەوەبە دەیەك، ئەگەر مایەوە و كەس نەبوو بیچێنێت ئەوە بەبێ بەرامبەر بچێنرێت، ئەگەر كەس بەبێ

---

[1] - السیاسة الاقتصادیة المالیة لعمر، ل: ٥٢.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٥٣.

[3] - الاصول لابي عبیدة ژمارە ١٢٠، ل: ٥٧.

[4] - الاصول ژمارە ٧١٧، ل ٣٦٩.

[5] - الاموال لابي عبیدة ژمارە ٧١٧، ل: ٣٦٩.

[6] - صوافی: ئەوەی كە سوڵتان تایبەتی ئەكات بە دەست و پێوەندەكەی خۆی، ئەشڵێن: ئەو زەویەیە كە خەڵكەكەی لەسەر لابراوەیان مردوون و هیچ میراتگرێكیان نەماوە.

بەرامبەریش نەیویس ئەوە فرمانی دا هەتاوەکو لە بیتولمال پارەی بۆ سەرف بکرێت و بچێنرێت هەتاوەکو بە بێ سوود نەمێنێتەوە [1].

هەروەها عومەر گرنگی دەدا بە کشتیاران و دوور خستنەوەی زەرەو زیان لێیان، لەم بارەشەوە ئەگێڕنەوە کە سوپایەکی خەڵکی شام بە زەویەکی چێنراوی کەسێکدا تێپەڕبوو و کشتوکاڵەکەی خراپ کردووە، کابراش عومەری لەو ڕوداوە ئاگادار کردەوە، ئەویش بە دە هەزار درهەم قەرەبووی ئەو زیانەی بۆ کردەوە [2]. بەهەمان شێوە عومەر(ﷺ) قەرزی پێشکەش بە کشتیاران دەکرد و لەنامەیەکیدابۆ کاربەدەستی لە عێراق هاتووە: سەیر بکە بزانە کێ جزیەی — سەرانەی — لەسەرە و توانای بەسەر زەویەکەیدا ناشکێ هاوکاری بکە و قەرزی پێ بدە هەتاوەکو بتوانێ زەویەکەی بچێنێت، چونکە ئێمە بۆ ساڵ و دوو ساڵ ئەوانمان ناوێت [3].

د- **عومەر و قاغە و لەوەڕگە:** عومەر قاغە — واتە تایبەت کردنی زەوی بە کەسێك و دابڕینی و قەدەغەی کردنی لە خەڵك بە گشتی قەدەغەی کرد و کردە موڵکی هەموان و نەیدەهێشت لە لایەن تاکێك یان کۆمەڵێکەوە قۆرخ بکرێت و لەوە بارەشەوە ئەیوت: وا دەبینین کە قاغە موڵکی هەموو موسڵمانانە، کاتی خۆشی دەپارێزرا و ولاخ و مەڕومالاتی هەموو موسڵمانانی تیا بوو، ئەمەش سوود و کەڵکی بۆ هەموان هەبوو، بەلام خەڵکی دەستیان تێوەردەدا و گۆڕیان، بەلام ئێمە پێمان والیە کەدەبێ وەك خۆی لێبکرێتەوە و تایبەت نەکرێت بەکەس یان کۆمەڵێك ئەمە بەباشتر دەزانین، پێشەوای موسڵمانانیش وەك کەسێك لەوان مافی هەیە تیایدا، چونکە ئەو لەوەڕگەیە بە باران ئاو دەدرێت کە خوای گەورە بۆ هەموو بەندەکانی دەبارێنێت [4].

کاتێ قاغەشی قەدەغە کرد ناوچەی النقیع ی لێ جیا کردەوە [5]، کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەرخانی کرد بۆ حوشتری زەکات [1]، کەواتە بەنەهێشتنی قاغە و بەگشتی کردنی سوود و کەڵك بە

---

[1] - الخراج، ل: ٩٩، يحيى بن آدم، السياسة المالية و الاقتصادية، ل: ٥٤.

[2] - سيرة و مناقب عمر، ل: ١١٧، لابن الجوزي.

[3] - التطور الاقتصادي في العشر الاموي، ل: ٢٠٢.

[4] - سيرة عمر، لابن عبدالحكم، ل: ٩٨.

[5] - النقيع: زێدی ناوچەی مزینەیە دوو ڕۆژە ڕێ لە مەدینەوە دوورە نقیع الخصمات یشی پێی دەوترێت کاتی خۆی عومەری کوڕی خەتاب تایبەتی کرد بە ئاژەڵی فەیئو ئەسپی جیهادەوە بڕوانە: السیاسە الاقتصادیە لعمر.

هەموان دەگات و بەروبومیشی بۆ هەمووان دەبێت، لێرەشەوە عومەر(ﷺ) زەوی قاغە – لەوەڕگە – لە موڵکی تایبەتەوە کرد بە موڵکی گشتی، هەتاوەکو بۆ بەرژەوەندی گشتی سوودی لێ وەربگیرێت[٢].

هـ- **دابینکردنی پڕۆژە بۆ بنیاتنانەوەی ژێر خانی ئابووری:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) لە هەوڵی دابینکردنی ئەم پڕۆژانە دا بوو لەو کاتەوەی کە ئەمیر بوو لە مەدینە دا هەتاوەکو بوو بە خەلیفەی موسڵمانان. ئەوە بوو گرنگی بە ئەو پڕۆژانە دەدا کە خزمەتیان بە بازرگان و کشتیار و ڕێبواران دەکرد، کاتێکیش کە والی مەدینە بوو وەلیدی کوڕی عبدالمليك نامەیەکی بۆ نووسی سەبارەت بە باشکردنی سەرچاوەکانی ئاو و لێدانی بیر ئەویش بیری الحفيری لیَ دا کە کە ئاوێکی باشی هەبوو [٣].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز بە فەرمانی وەلید فوارەیەکی ئاوی دروستکر و مزگەوتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) گەورە کرد و منارەکەی بەرزکردەوە و میوانخانە وبازاڕی لە مەدینەدا بۆ حاجیان و ڕێبواران دروستکرد [٤].

هەڵکەندنی کەنداوی ئەمیری باوەڕداران لە نێوان ڕووباری نیل و دەریای سوردا بۆ ئاسانکردنی گواستنەوەی خۆراك و ئازوقە لە میسرەوە بۆ مەککە هەتاوەکو سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز بەردەوام بوو [٥] کاربەدەستیشی لەبەسرە دا نامەیەکی بۆ نووسی و داوای خەڵکەکەی خستە پێش چاو بۆ هەڵکەندنی ڕوبارێك بۆیان، عومەریش مۆڵەتی پێداو ڕووبارەکەش لێدار و ناونرا عَدي [٦].

**سێیەم: سیاسەتی دارایی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە داهاتەکاندا:**

سیاسەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز بە داهات و خەرجیەکانیەوە بە هۆکارێك دادەنرێت بۆ بەدیهێنانی ئامانجە ئابووریەکان [٧]، بۆیە عومەری کوڕی عبدالعزیز سیاسەتی ئابووری خۆی بەزیاد

---

[١] - فتح الباري(٥ / ٣٤).

[٢] - الاتجاه الجماعي في التشريع الاقتصادي، ل: ٢٤٢.

[٣] - الحياة الاقتصادية و الاجتماعية في نجد و الحجاز في العصر الاموي، ل: ٥٦.

[٤] - خامس الخلفاء الراشدين للبدري، ل: ٥٦.

[٥] - هەمان سەرچاوە، ل: ٥٧.

[٦] - السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٥٧.

[٧] - هەمان سەرچاوە، ل: ٥٧.

کردنی بەخشین و دابەشکردنی پارە بەسەر خەڵکیدا دەست پێکرد، لەم بوارەشدا پارەیەکی زۆری بۆ گێڕانەوە مافەکان و نەهێشتنی ستەم خەرجکرد بەڕادەیەك کە پارەی بەیتولمالی عێراق ی تەواو کرد و لە شامەوە پارەی بۆ هێنا [1].

پارەیەکی باشی بۆ پرۆژە کشتوکاڵیەکان و پرۆژەکانی ژێرخانی ئابووری خەرجکرد، هەروەك پاریەکی باشیشی لە بواری چاودێری کۆمەلایەتی دا بۆ سەرجەم چینەکانی کۆمەڵکە و بواری داهاتەکاندا سەرفکرد و هەوڵی دا بۆ هەڵوەشاندنەوەی باجە نارەواکان وسەرانەی لەسەر ئەو کەسانە هەڵگرت کە موسڵمان بو بوون ئەو باجە زیادانەشی هەڵوەشاندەوە کە بەسەر کشتیاراندا سەپێنرار بوو، ئەمە جگە لە چەندین باج و کۆت و بەندی تر، هەروەك ئیمتیازات و دەستکەوتی ئەمیر و فەرمانبەرەکانی نەهێشت و مافەکانی بەیتولمالی گێڕایەوە و ئەو پارچانەی بۆ گێڕایەوە کە لێی برابوون. خەرجی سەربازی و ئیداریشی بە تەواوی کەم کردەوە [2]، هەموو ئەم رێ و شوێنانەش بوە هۆی برەودان بە تەقاندنەوەی و زەووتواناکان و گەشە کردنی کشتوکاڵ و بازرگانی و زیادبوونی داهاتەکان بە تایبەت خەراج و دەیەك و زەکات و بودجەی دەوڵەتیش زۆر و زیاد بوو، عومەریش ئەو زیادەیەی بۆ بواری بەخشینی گشتی لە پێناو بەدەست هێنانی ئامانجە ئابووریەکاندا بەکارهێنا.

ئەگەر سەیری مێژوش بکەین ئەبینین کە هەر کاتێ دەوڵەت رێك و ڕاست شەریعەتی ئیسلامی پەیرەو کردبێت ئەوە بودجە و سامانی زۆر بووە و لە پێداویستیەکانی خۆی زیاتر بووە و تاکەکانیش هەستیان بەستەم و مافخوراوی نەکردووە و هیچ بەرژەوەندیەکیان پشتگوێ نەخوراوە هەر کاتێکیش دەوڵەت لە شەریعەت لایدا بێت ئەوە هاوسەنگی دارایی تێکچووە، کەواتە بودجەی دەوڵەت پێوەری دادگەری و ستەمکاری و یاسا و پشێویەتی [3].

ئەمە و داهاتەکانی بەیتولمال لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا لە زەکات و سەرانە و خەراج و دەیەك و پێنج یەك و فەیئ پێکدەهات.

١- **زەکات:** عومەری گرنگی بە زەکات دەدا، چونکە مافێکە و پەروەردگار پێویستی کردووە بۆ هەژار و نەدار و خەڵکانی دەربەدەر و کۆیلە و، دروست نیە شلگیری و کەمتەرخەمی تیایدا

---

[1] - سيرة عمر، لابن عبدالحكم، ل: ١٢٩.

[2] - السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٥٨.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٥٨.

بکرێت، هەروەها گرنگی دەدا بە دابەشکرنی بەسەر خەڵکانی شیاودا [1]، ئـەوە بـوو فـەرمانی کرد بە والیەکانی کە بە دوادا چوون بکەن بۆ دۆزینەوەی ئـەو کەسـانەی کـە زەکاتیـان پـێ دەشێت و بەخشینی زەکات پێیان، ئەگەر خەڵکی هـەژار و نـەداریش نەبوایـە ئـەوە عومـەری کوڕی عبدالعزیز فەرمانی دەکرد بە ئازاد کردنی کۆیلە و بەکڕینەوەیان لـە خاوەنـەکانیان بـە پارەی زەکات [2].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز سوور بوو لەسەر شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەمەسـەلەی زەکاتـدا، چـونکە پێـشتر کـار بەدەسـتان کەمتەرخـەمی و شـلگیریان تیـادا کردبـوو بەشێوەیەکی نادروست وەریان گرتبوو و بۆ کەسانی نەشیاویشیان سەرف دەکرد [3]، لە ڕواڵەتـەکانی شوێنەکەوتنی بۆ سوننەتیش داواکردنی ئەو نامەیە بوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لـە بـارەی زەکاتـەوە نووسیبووی، هەروەها داواکردنی نامەی عومەری کوڕی خەتتاب و فەرماندانی بە نووسینەوەی چەند دانەیەك لێی، ئەم نامانەش باسی زەکاتی حوشتر و مانگا و مەڕ و ئاڵتون و دراو و خورما و دانەوێڵـە و مێوژی تیابوو و بڕی زەکاتی هەموویان تیادا دیاری کرابوو [4].

هەروەها عومەر سوننەتی پەیڕەو دەکرد لـە دابەشکردنی زەکات دا و لەم بوارەشدا پـەیڕەوی لـە فەرمایشتی پەروەردگار دەکرد کە ئەفـەرموویت: ﴿ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ ﴾(التوبة: ٦٠). واتـە: بەڕاسـتی خێرەکان تەنها بۆ بێ نەوایان و هەژاران و کرێکارانێك کە بەسەریەوەن(کۆی دەکەنەوە) وە ئەوانەی دڵیان دا ئەهێنری(بۆ خۆشویستنی ئیسلام) وە بۆ ئازاد کردنی بەندە و کۆیلەکان و بـۆ قـەرزاران و لە ڕێ ی(بەهێز کردنی ئایینی) خوادا و بۆ ڕێبواران ئەمە پێویست کـراوە لەلایـەن خـواوە وە خـوا زانای کاردروستە.

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز فەرمانی دەدا بە دابەشکردنی زەکات بەو جۆرەی کە خـوای گـەورە فـەرمانی کـردووە و [5]، سـوننەتی پـەیڕەو دەکـرد لـە کۆکردنـەوەی زەکاتـدا و کۆمـەڵێ

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ٦٠.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٦٠.

[3] - سيرة و مناقب عمر لابن الجوزي، ل: ١٢٩.

[4] - الاوال الابي عبيد، ل: ٤٤٧، ژمارە: ٩٣٤، السياسة المالية و الاقتصادية لعمر بن عبدالعزيز ل: ٦١.

[5] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٩٤.

کارمەندی متمانە پێ کراو و دەستپاکی هەڵبژارد و فەرمانی پێکردن بە کۆکردنەوەی زەکات بە بێ ستەم و دەستدرێژی کردن، داواشی کرد کە پسوڵەیەکی ئەستۆپاکی بۆ ئەو کەسە بنووسن کە زەکاتی لێ وەردەگرن [1]، فەرمانیشی کرد بە وەرگرتنی زەکات لە هەموو ئەو ماڵانەی کە تیایدا پێویستن، بەم پێیەش لە موچەی کارمەندان و ئەو کەلوپەلانەی کە بۆ خاوەنەکانیان گێڕدرابوویەوە و وەردەگیرا [2] هەموو هۆزێکیشی بە لە پێشتر دەزانی بۆ زەکاتی خۆیان ئەگەر زەکاتیان پێ بشیایە [3]، ئەوە بوو کاتێ کارمەندەکانی زەکاتیان بۆ هێنا فەرمانی دا بە گێڕانەوە و دابەشکردنی بەسەر ئەو ناوچانەدا کە تیایدا کۆ کراوەتەوە [4] ئەم چاکسازیە ئابووریانەش ڕۆڵی هەبوو لە زیاد بوونی داهاتی زەکات و کۆکردنەوەی بەشێوەیەکی ئاسان، چونکە دەستەبەرکردنی کەشێکی هێمن و ئارام و گرنگیدانی بە پرۆژە بنەڕەتیەکان لە بواری کشتوکاڵ و بازرگانی و پەیڕەو کرنی سیاسەتی ئازادی بازرگانی سنوردار و هەڵوەشاندنەوەی باجە ناڕەواکان بووە هۆی گەشەسەندنی بازرگانی و کشتوکاڵ و زیاد بوونی بڕی بە دەستهاتووی زەکات [5].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز لەو کەسانە نەبوو کە بواری زەکاتدانی فراوان کرد بێت، ئەمەشی لە ڕوانگەی تێگەشتنیەوە بۆ زەکاتی سامانی کشتوکاڵی و زەکاتی حوشتر و زەکاتی ماسی و هەنگوینەوە دەردەکەوت، ئەم تێگەشتنەش توانی ئەو ماڵ و موڵکانە زیاد بکات کە زەکاتیان لێ دەردرێت، ئەمەش هۆکارێکە بۆ زیاد بوونی ڕێژەی زەکاتی کۆکراوە، هەرچی بەهێز بوونی بانگەواز و زۆربوونی ژمارەی ئەو کەسانەشە کە موسڵمان بوون بە تایبەت لە خاوەن کتێبەکانی تر ئەوە دیسانەوە بوە هۆکارێکی تر بۆ زیاتر بوونی زەکات، چونکە ئەو تازە موسڵمان بوانەش دەوڵەمەند و هەژاریان تیابوو و پێویستە دەوڵەمەندەکانیان ئەو مافە شەرعیە ڕادەستی هەژارەکانیان بکەن، پارێزکاری هەڵسوکەوتی باشی عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) کاریگەری خۆی هەبوو لەسەر دانی زەکات بە دەوڵەت و بەهۆی بەهێز بوونی متمانە لە نێوان دەسەڵاتدار و هاوڵاتیاندا، ئەمەش بەدڵگەرمی و پاڵ پاڵێنی خەڵکیدا دەردەکەوێت بۆ دانی زەکات لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) ئەمەش بووە هۆی زۆر بونی داهاتی زەکات لەکاتی دابەشکردنیدا [6].

---

[1] - الاموال الابي عبد، ذمارة: ١٢٢٦، ل: ٥٢٩.

[2] - فتح الباري(٣ / ٣٢٢)، السياسة المالية و الاقتصادجية، ل: ٦١.

[3] - الاموال ذمارة ١٩١٧، ل: ٧١٢.

[4] - ملامح الانقلاب، ل: ١٣٥.

[5] - ملامح الانقلاب، ل: ١٣٥.

[6] - ملامح الانقلاب، ل: ١٣٥.

ڕیوایەتە مێژووییەکانیش دووپاتی ئەکەنەوە کە زەکات لەوکاتەدا لە پێویستی خەڵکی زیاتر بووە و کەس نەبووە وەری بگرێت [1] یەکێك لە هۆکارەکانی ئەمەش هەوڵدانی خەڵکی بوو بۆ کار و بەرهەم هێنان، ئەمەش ژمارەی ئەوکەسانەی زیاد کرد کە زەکاتیان دەدا و ژمارەی ئەوانەشی کەم کردەوە کەزەکاتیان وەردەگرت [2].

٢- **جزیە "سەرانە"**: سەرانە لە ڕووی زاراوەوە واتە: ئەو ئەرکەی - باجەی - ساڵانە کە لە بێ باوەڕ وەردەگیرێت لە بەرامبەر مانەوە و نیشتەجێ بوونی لە خاکی ئیسلامدا، دیارە ئەسڵ لە وەرگرتنی سەرانەش دا قورئان و سوننەت و ئیجماع و کۆ دەنگی موسڵمانانە [3].

عومەری کوڕی عبدالعزیزیش(ﷺ) بە پێی سوونەت ی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرانەی وەردەگرت و لەسەر ئەو کەسانەی هەڵگرت کە موسڵمان بوون، چونکە سەرانە بۆ بێ باوەڕانە و بە موسڵمابونیان لەسەریان نامێنێت [4]، هەرچەندە هەندێ لە خەلیفەکانی ئەمەوی دوای موسڵمان بوونیشیان ئەم باجەیان لێ وەردەگرتن، ئەوە بوو حەجاج لێی وەردەکرتن، چونکە وایدەزانی کە ئەوان لەبەر نەدانی سەرانە موسڵمان بوون، ئەمەش بووە هۆی بێزاری و نارەزایی خەڵك لە ئەمەوییەکان و لە حەجاج [5]، کاتێ عومەریش(ﷺ) خەلافەتی گرتە دەست خێرا سەرانەی لەسەر ئەو کەسانە هەڵگرت کە موسڵمان بوو بوون [6].

زۆر توند بوو لەم مەسەلەیەدا و نامەشی نووسی بۆ کاربەدەستانی کە تیایدا هاتبوو: هەرکەس شایەتومانی وت و ڕووی کردە قیبلە و ڕووگەی ئێمە و وەك ئێمە خەتەنەی کرد ئەوە سەرانەی لێ وەرنەگرن [7].

کاتێ ئەهلی ذیمە - گاور و جولەکە - ئەمەیان بیست و ئاشنا بوون بە دادگەری عومەر(ﷺ) ڕوویان کردە ئیسلام و موسڵمان بوونی خۆیان ڕاگەیاند، بەڕادەیەك کە کار بەدەستەکانی عومەر سکاڵایان کرد لای عومەری بەهۆی کەمبوونەوەی داهاتی سەرانە، عومەزی وەڵامی دانەوە بەوەی

---

[1] - سير اعلام النبلاء(٥ / ١٣١)، السياسة المالية و الاقتصادية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٦٩.

[2] - السياسة المالية و الاقتصادية لعمر، ل: ٦٩.

[3] - المغني لابن قدامة(١٠ / ٥٥٧).

[4] - السياسة المالية و الاقتصادية، ل: ٧٠.

[5] - الضرائب في السواد، ل: ٥٨.

[6] - الطبقات(٥ / ٣٤٥) الخراج للريس / ل: ٢٣٠.

[7] - الاموال، ژمارە: ١٢٧، ل: ٦١.

که خوای گەورە محمدی(ﷺ) بۆ ڕێنمایی کردنی خەڵك ناردووە نەك کۆکردنەوەی سەرانە لێیان[1].
دیارە ئەمەش دەرەنجامی نەرمی و میهرەبانی عومەر بوو لەگەڵ خاوەن کتێبەکاندا - ئەهلی ذیمە - و چاکەکردنی لەگەڵ کشتیارەکانیاندا و دانانی سەرانە لەسەریان هەرکەسە بە پێی توانای خۆی و گرتنەبەری سیاسەتێکی دروست و دادگەرانەبە جۆرێك کە سەرانەی کردبو بە سێ ئاستەوە بۆ دەوڵەمەند و هەژار و مام ناوەند، بە جۆرێك ڕێکیخستبوو کە خاوەن زەوی لەبەروبوم و کاسبکار لە کارەکەی و بازرگان لە بازرگانیەکەی بیدات [2].

هەروەها سەرانەی بە پێی توانای دارایی ناوچەکان دا نابوو و سەرانەی خەڵکی شام زیاتر بوو لەسەرانەی یەمەن بەهۆی دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانی خەڵکی شامەوە [3]، سەرانەی لەسەر ئەو خەڵکە هەژارەش هەڵگرت کە ناتوانن بیدەن، بەڵکو لە بەیتولمال موچەی بۆ بڕینەوە بە هەمان شێوەی عومەری کوڕی خەتتاب [4].

عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) سەرانەی لەسەر خەڵکی نەجران کەم کردەوە و فەرمانی دا بەسەر ژمێری کردنیان و بۆی دەرکەوت کە ژمارەیان کەم بووەتەوە بۆ دەیەك و سەرانەکەشیان هەروەك خۆی ماوەتەوە، ئەویش هەستا بە وەرگرتنی دوو سەد پارچە پۆشاك لێیان لەبری دوو هەزار پۆشاك کە پێشتر وەری دەگرت و سەرانەی لەسەر ئەوانەیان هەڵگرت کە مردبوون یاخود موسڵمان بو بوون [5].

ئەم چاکسازیانەش لە کۆکردنەوەی سەرانەدا چەند شوێنەوارێکی مالّی هەبوو کەلە بەرژەوەندی بەیتولمال دا بوو، بۆ نموونە لابردنی سەرانە لەسەر ئەوانەی کە موسڵمان بو بوون بووە هۆی بەهێز بونی متمانە لە نێوان دەسەڵاتدار و هاولاتیاندا و هەستکردن بە دادگەری و یەکسانی هەروەها بووە هۆی نەمانی ئەو کێشە وئاژاوایانەی کە بودجەیەکی زۆری دەوڵەتی بەهەدەر دەا، موسڵمان بوونی خەڵکانێکی زۆر لە ئەهلی ذیمەش بووە هۆی زیاد بوونی زەکات کە لە بری سەرانە لەسەریان فەرز کرا بوو، بڕی زەکاتیش لە بڕی سەرانە زیاترە ئەمە لەگەڵ بەردەوامبوونیان لەسەر دانی خەراجی

---

[1] - الطبقات(٥ / ٣٨٤).

[2] - سيرة عمر بن عبدالحكم، ل: ٩٩.

[3] - الاموال لابي عبيد ژمارە ١٠٧، ل: ٥١.

[4] - السياسة المالية و الاقتصادية لعمر، ل: ٧١.

[5] - الخراج، ل: ٢٣٢ للريس.

زەوی، بێگومان باری ئاسایش و ئارامی وڵات و دادگەری دەوڵەتیش هۆکارێك بوو بۆ زیاد بوونی بەرهەم و هاندەرێکی باش بوو بۆ بەرهەم هێنان و گەشەسەندن و بوژاندنەوەی ئابووری وڵات [1].

٣- **الخراج:** بریتیە لەو باجانەی کە دەوڵەت لەسەر ئەو زەویانەدا یدەنێت کە بە زۆر و هێز ڕزگار کراون یان بە ئاشتەوایی و ڕێککەوتن دەستی بەسەردا گیراوە [2]. ئەوە بوو ڕێژەی خەراج لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز زیادی کردوو گەشتە سەد و بیست و چوار ملیۆن درهەم [3]، ئەم زیاد بوونەش دەرەنجامی ئەو سیاسەتە چاکسازیە بوو کە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) پەیڕەوی دەکرد، ئەوە بو فرۆشتنی زەوی خەراجی قەدەغە کرد بەم پێیەش سەرچاوەی سەرەکی بەرهەمهێنانی پاراست و سیاسەتی چاکسازی و ئاوەدان کردنەوە و زیندو کردنەوەی زەوی پەیڕە و دەکرد و گرنگی دەدا بە پرۆژەکانی ژێر خانی ئابووری کەرتی کشتوکاڵی و چەندین ڕێگە و کەناڵی دروستکرد [4].

دیارە پرۆژەکانی ڕێگاوبانیش بردنە بازاڕی بەروبوومی ئاسان کرد و لێدانی کەناڵ و بیریش ئاودانی بەروبومەکانی بۆ ئاسان کردن و خەرجی و تێچوونی کەمتری دەویست، ئەم چاکسازیە خەراجیانەش بەروبوومی باشی هەبوو، بووە هۆی زیاد بوونی خەراج لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا(ﷺ) ئەوە بوو تەنها خەراج ی عێراق لەسەردەمی ئەودا گەشتە سەد و بیست وچوار هەزار درهەم، ئەمەش زۆرترە لەو ڕێژەی کە لەسەردەمانی ڕابردوودا کۆکراوەتەوە، لە کاتێکدا لەسەردەمی حەجحاجدا چل ملیون درهەم بووە لەسەردەمی عومەری کوڕی خەتابیشدا سەد ملیۆن دەرهەم [5]، سەبارەت بە خەراجی خوراسانیش لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا زیاتر بوو لە پێویستی دەوڵەت و گەشتبویە بەرزترین ڕێژە بە بەراورد لەگەڵ سەردەمەکانی تردا [6]، ئەم بەرز بوونەوە و زیادبوونەی خەراج دەوڵەتیش ئاماژەیە بۆ بەهێزی دەوڵەت لە ڕوی داراییەوە، چونکە خەراجی عێراق بەشی زۆری داهاتەکانی پێکدەهێنا [7]، ئەوەش یارمەتیدەر بوو بۆ بەدیهێنانی ئامانجە ئابووریەکان و پاڵپشتی کردنی پرۆژەکانی ژێرخانی ئابووری و پرۆژە بەرهەمهێنەکان و بەخشین ی

---

[1] - الخراج، ل: ٢٥٩ للريس، السياسة المالية و الاقتصادية، ل: ٧٢.

[2] - معجم لغة الفقهاء، ل: ١٩٤.

[3] - الخراج للريس، ل: ٢٣٨.

[4] - السياسة المالية و الاقتصادية لعمر، ل: ٧٤.

[5] - الخراج للريس، ل: ٢٣٧، ٢٣٨، السياسة المالية و الاقتصادية لعمر، ل: ٧٥.

[6] - الخراج، ل: ٢٣٧، ٢٣٨ للريس.

[7] - السياسة المالية و الاقتصادية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٧٦.

سامان و سەرفكردنی بۆ چینە هەژارەکان، ئەمەش بە هۆی ئەوەوە کە داهاتی خەراج ئازادیەکی باش لە دابەشکردن وسەرفکردیندا بەدی دەکرێت بە پێچەوانەی زەکات کە شێوازی دابەش کردنی دیاری کراوە [1].

٤- **دەیەك:** لە ڕووی زاروەوە: ئەوەیە کە لە بازرگانانی بیّ باوەڕ و ئەهلی ذیمەوە وەردەگیرێت کاتێك کە بە سنوری دەوڵەتی ئیسلامیدا تێپەڕدەبن [2] و دەیەك لە بازرگانی ئەو بیّ باوەڕەدا وەردەگیرێت کە لە جەنگدایە لەگەڵ دەوڵەتی ئیسلامیدا و نیوەی ئەو بڕەش لە بازرگانی ذیمی و خاوەن پەیمان وەردەگیرێت، لە ساڵێکیشدا تەنها یەك جار ئەو پارەیە وەردەگیرێت و بڕەکەش بیست دینارە بۆ ئەهلی ذیمە و دە دینار بۆ بیّ باوەڕی جەنگی [3].

عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) گرنگی دەدا بە ڕون کردنەوەی باجی دەیەك و بنەماکانی بۆ کارمەندەکان ڕوون کردەوە و فەرمانیشی دا بە نووسینی پسوڵەی ئەستۆ پاکی ساڵانە بۆ ئەو کەسەی کە دەیەکی دەدا هەتاوەکو دووبارە داوای لێنەکرێت، ئەو دەیەکانەشی قەدەغە کرد کە بەشێوەیەکی ناڕەوا بەسەر خەڵکی دافەرز دەکرا [4].

بەم پێیەش بازرگانی لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) پەرەی سەند و چەند داهاتێکی نوێی بۆ دەوڵەت پەیدا بوو کە توانی بەباشی بەکاری بێنێت بۆ بەخشینی گشتی ئەو ڕێوشوێنانەش کە عومەر گرتیەبەر بۆ چالاککردنی جموجوڵی بازرگانی بەم شێوەیە بوون:

أ- هەڵوەشاندنەوەی باجە زیادەکان کەبەسەر کەرتی کشتوکاڵی دا سەپێنرابوون [5]، ئەمەش بەشێوەیەکی ئەرێنی - ئیجابی - کاریگەری هەبوو لەسەر کەرتی بازرگانی کە خۆی لە دابەزینی بەرچاوی نرخی بەروبوومی کشتوکاڵی دا دەبینیەوە، ئەمەش بووە هۆی زیاد بوونی خواست لەسەری و برەوپێدانی و بازرگانی کردن پێوەی، لە سایەی ئابووریەکدا کە پشتی بە کشتوکاڵ دەبەست زیادبوونی خستنە ڕووی بەروبومە کشتوکاڵیەکان و دابەزینی نرخی بەوشێوەی کەلە سیاسەتی عومەر کەوتەوە برەوێکی زۆری لێکەوتەوە نەك تەنها لە بواری بازرگانیدا ،بەڵکو لەسەر جەم بوار و کەرتەکانی ئابووری ئیسلامیدا [6].

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ٧٦.

[2] - معجم الفقهاء، ل: ٣١٢.

[3] - المغني(١٠ / ٥٨٩)، السياسة المالية والاقتصادية، ل: ٧٦.

[4] - السياسة المالية والاقتصادية، ل: ٧٧.

[5] - سرة عمر بن عبدالعزيز، لابن عبدالحكم، ل: ١٤١.

[6] - التطور الاقتصاديى في العصر الاموي، ل ٢١٨.

ب- هەڵگرتن و نەهێشتنی باج لەسەر کەرتی بازرگانی و ڕازی بوون بە دەیەك [1] و ئەمەش کاریگەریەکی ئیجابی هەبوو لەسەر کەرتی بازرگانی و بووە هاندەرێك بۆ کارکردن لەبواری بازرگانی دا و قازانجی بازرگانی زیاد کردو لەهەمان کاتیشدا ڕێژەی ئاڵوگۆڕی بازرگانی زیاتر کرد [2].

ج- هەڵوەشاندنەوەی شێوازی توندوتیژی لە سەندنی مافە ماڵی و مادیەکانی دەوڵەت بازرگانان و خەڵکانی تر [3]. ئەمەش یەکێك بوو لە هۆکارەکانی هاندانی گەشە پێدانی بازرگانی.

د- دروستکردنی [4] ویستگە و شوێنی حەوانەوە لەسەر ڕێگای بازرگانی لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا و داواکردن لەو وڵاتانەی کە ئەو شوێنانە ئەکەوێتە سنوریانەوە کە هەستن بە میوانداری کردنی ئەو خەڵکە ڕێبوارەی کە بەناوچەکانیاندا تێپەڕ دەبێت [5] بۆ ماوەی شەو ڕۆژێك و، خزمەتی وڵاخەکانیان بکەن لەسەر حسابی دەوڵەت و ئەو ماوەیە دووبارە بکەنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە نەخۆش ی یان ئازارێکیان هەیە، سەبارەت ئەو کەسانەش کە بەم شوێنی حەوانەوانەدا تێپەڕ دەبوون و پارەیان لێ دەبڕا و هێندە پارەیان پێ دەدرا کە پێی بگەنە شوێنی خۆیان، دیارە ئەم هۆکارانەش ئاسانکاری و گرنتیەکی باش بوون و ڕۆڵی بەرچاویان هەبوو بۆ هاندانی بازرگانان و ئاڵۆگۆڕی بازرگانی [6].

هـ- نەدانی بەخشین و موچە بە بازرگانان، هەتاوەکو تاکە سەرچاوەی بژێویان بێت و بایەخی زیاتری پێ بدەن و چالاکی زۆرتری تیادا بنوێنن، بەتایبەت لەوکاتەدا کە بازرگانی ماندوێتی زۆری دەویست بە هۆی گەشت کردن بەوڵاخ لەبەر نەبوونی هۆکاری گواستنەوەی باش و ئاسان وەك لە ئەمڕۆدا ئەیبینین.

و- دانەوەی قەرزی هەرکەسێك کە قەرزی کردبێت بۆ کارێکی ڕەوا بە بێ زیادەڕەوی [7]، دیارە بازرگانەکانیش ئەچنە ئەم چوارچێوەیەوە، ئەم بڕەش بوە هۆی قەرەبوو کردنەوەی ئەو

---

[1] - التطور الاقتصادیی في العصر الاموي، ل ٢١٨.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٨.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢١٨.

[4] - سرة عمر بن عبدالعزیز، لابن عبدالحکم، ل: ٤٣٩.

[5] - زۆربەی گەشتەکان بەرەو ڕۆژهەڵات دەچوون بەمەبەستی بازرگانی.

[6] - التطور الاقتصادیی في العصر الاموي، ل ٢١٩.

[7] - الاموال لابي عبید، ل: ٢٣٤، ٢٣٥.

بازرگانانەی کە زیانیان لیّ کەوتبوو و گەڕانەوەی دووبارەیان بۆ بازرگانی کردن، بە تایبەت ئەو بازرگانانەی کە سەرمایەی بازرگانیەکەیان بەقەرز وەرگرتبوو.

ز- سووربوون لەسەر یەکخستن و کۆنترۆل کردن و دانانی پێوەر بۆ پێوانە و کێشانەکان لە هەموو ناوچەکانی ولاّتدا ئەمەشیان کرد بە مادەیەك لە مادە سەرەکیەکانی یاسای بنەڕەتی دەولّەت.

ح- ڕێنەدان بە بازرگانی کردنی والی و ئەمیرەکان و دەستیۆەردان یان سەرقاڵ بونیان پێوەی، هەتاوەکو کێبەرکێ ی شەریفانە و بەرابەری نێوان بازرگانەکان تێك نەچێت و کاریگەری خراپیان لەسەر نرخی بازار نەبێت، ئەمەش هەولّێکی عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بۆ دورخستنەوەی بازاڕ لە هەر کاریگەریەکی ناسروشتی کە ڕۆلّی هەبێت لە دیاری کردنی نرخ دا[1].

گ- ڕێنەدانی بە قۆرخ کردن: لەم بوارەشدا کۆمەلّە دوکانێکی لە حمص دا لە چەند کەسێکی خەلّکی بازارسەندەوە کە پێشتر وەلیدی کوڕی عبدالملك دەستی بەسەردا گرتبوون و کردبووی بە مولّکی تایبەت بۆ خۆی، عومەریش وەری گرتەوە و گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانی [2]. ئەم چاکسازیانەش ڕۆلّی هەبوو [3] لە گەشەکردنی بزاوتی بازرگانی لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا، ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی ڕێژەی دەیەك و داهاتی نوێ بۆ دەولّەت پەیدا بوو و عومەریش(رضي الله عنه) توانی لە پێناو بەرژەوەندی گشتی دا خەرجی بکات.

٥- **پێنج یەکی غەنیمە و فەیئ:** غەنیمە لە زاراوەدا، ئەو مالّە یەکە لە جەنگدا دژ بە بێ باوەڕان دەستی بەسەردا دەگیرێت بەزۆر و هێز [4]، فەیئیش لە زاراوە دا، هەرشتێکە کە لە بێ باوەڕانەوە بگات بە بێ کوشتار و جەنگ [5]. ئەوە بوو کاتێك عومەر بوو بە خەلیفە بەرەو چاکسازی کردن لە بارودۆخی ناوخۆی دەولّەتدا هەنگاوی نا، هەربۆیە فتەحات و ئازادسازی لەسەردەمی ئەو دا زۆر نەبوو، چونکە ئەو لە ڕێی بانگەواز و نموونەی جوانەوە خەلّکی بانگەواز کردووە و چەندین نامەی بۆ پاشاکان و گەلەکانیان ناردووە و بەهۆی

---

[1] - التطور الاقتصادیی في العصر الاموي، ل ٢١٩.
[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢٠.
[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٢٠.
[4] - الاموال لابي عبید، ل: ٣٢٣ ژمارە ٦٢٦.
[5] - الاحكام السلطانیة للماوردي، ل: ١٩٩.

ئەمەشەوە بەربەرەکان بەبێ کوشتار موسڵمان بوون [1]، هەر بۆیە ڕێژەی پێنج یەکی غەنیمە لەسەردەمی عومەر دا کەم بوو ئەوەش کە لە بەیتولمال دا بوو سەرچاوەکەی فتوحاتەکانی پێشتر بوو [2] لەگەڵ ئەوەشدا عومەری هەوڵ دەدا بۆ چاکسازی کردن لە بودجەی پێنج یەکی غەنیمەت دا و بەیتولمالێکی سەربەخۆی دانا بۆ پێنج یەکی دەسکەوت [3]، جیا لە سامان و پارەکانی تر، و فەرمانی دابە دانانی لەوشوێنە تایبەتانەدا کەلە سوورەتی ئەنفال دا باس کراوە و خەڵکانی خاوەنی پێداویستی پێش خست لە هەرکوێیەك بن [4].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) فەرمانی دا بە هێنانی دەهەزار دینار لە پشکی(ذوي القربی) واتە: " خزمان و کەسەنزیکەکان " و دابەشی کرد بەسەر بەنی هاشم دا و پشکی نێر و مێ و گەورە و بچوکی وەك یەك دیاری کرد، فاتیمەی کچی حەسەنیش نامەیەکی بۆ نووسی و سوپاسی کرد لەسەر ئەو کارەو، وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران کەسانێکت خزمەت کرد کە خزمەتگوزاریان نەبوو، ڕووتەکانت پۆشتە کردەوە و پارەو خەرجیت بۆ دابین کردن [5].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) پابەند بوو بە مافی(پێنج) یەکەوە، ئەوە بوو کاتێك ئەندەلوس فەتح کرا و و پێنج یەکیان لێ دەرنەکرد فەرمانی دا بە دیاریکردنی ئەو زەویانەی کە بەجەنگ ئازاد کرا بوون و دەرهێنانی پێنج یەك لێیان [6].

سەبارەت بە مەسەلەی فەیئی یش ئەوە شوێن قورئان و سوننەت و ژیاننامەی خەلیفەکانی ڕاشیدین و دەکەوت و نامەیەکی نووسی کە تیایدا باسی ئەو ماڵ و دەست کەوتانەی ئەکردکە خوای گەورە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەخشیبوو لە موڵك و ماڵی بێ باوەڕان بە بێ جەنگ و کوشتار و بەڵگەشی بەو ئایەتانەی سورەتی حشر هێنایەوە کە لەو بارەیەوە دابەزیون، ڕوونیشی کردەوە کە هەموو تاکێکی موسڵمانان بەش و مافی لە فەیئ دا هەیە، چونکە ئایەتەکان باسیان لە کۆچ کەران و یاریدەدەران و هەموو ئەو موسڵمانانە کردوە کە دوای کۆچ کردن بۆ مەدینە هەتاوەکو کۆتایی دونیا هاتوون [7].

---

[1] - السياسة المالية و الاقتصادیی لعمر، ل: ٨١.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨١.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨١.

[4] - الطبقات(٥ / ٣٥٠)، سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٧٢، السياسة المالية و الاقتصادیی لعمر، ل: ٨١.

[5] - الطبقات(٥ / ٣٩٠)، السياسة المالية و الاقتصادیی لعمر، ل: ٨٢.

[6] - تاريخ الاسلام، حسن ابراهيم،(١ / ٣٢٠).

[7] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٩٧.

بەم پێیەش هاوڕا ئەبێت لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتاب دا لەوەدا کە فەیئ وەقفی هەموو نەوەکانی موسڵمانان بێت لە ئێستا و داهاتوودا [1].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) بینی کە دابەش کردنی پێنج یەك و ئەو شوێنانەی کە پێی دەدرێت هەمان شێوەی دابەشکردنی فەیئە بۆیە پێی باش بوو کە تێکەڵیان بکات وەك چۆن عومەری کوڕی خەتاب ئەو کارەی کرد [2] و پاشان بۆ بەرژەوەندی گشتی موسڵمانا خەرجی دەکرد، لەم بارەشەوە نامەیەکی نووسی کە تیایدا هاتبوو:... هەرچی پێنج یەکیشە ئەوە پێشەوایانی پێشین جیاواز بوون لەبارەیەوە و بە چەندین شێوەسەرف کراوە ئێمەش سەرنجمان دا و بۆمان دەرکەوت کە لە قورئاندا لەسەر فەئی حساب کراوە و هیچ جیاوازیەکی ئەوتۆیان لە نێواندا نیە، بۆشم دەرکەوت کە عومەری کوڕی خەتابیش(ﷺ) بەو شێوە فەیئیشی سەرف کردووە و موسڵمانانیش لێی ڕازی بوون و موچە و ئازوقەی لە فەیئ بۆ دەبڕینەوە، پێی وابوو کە مافی هەتیو هەژار و ڕێبواری تیایە، پێشی وابوو کە دەبێ پێنج یەکیش بخرێتە سەر فەیئ و بەو شێوەش سەرف بکرێت کە خوای گەورە دیاری کردووە...

جا ئێوەش چاو لە پێشەوایەکی دادگەر بکەن ،چونکە ئەم دوو ئایەتە هاوڕان ئایەتی پێنج یە ك و ئایەتی فەیئ.. ئێمەش پێمان باشە کە پێکەوە کۆیان بکەینەوە و هەردووکیان بکرێن بە فەیئ بۆ موسڵمانان و قۆرخ نەکرێت لێیان [3].

بێگومان چاکسازیەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) لە داهاتەکانی فەیئ و پێنج یەکدا یارمەتیدەر بوو بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانی سیاسەتە ئابوریەکانی، ئەوە بوو هەستا دابەش کردنی پێنج یەك بەسەر ئەو بەشانەدا کە لە قورئاندا دیاری کراوە لەگەڵ پێشخستنی خەڵکی هەژار و خاوەن پێویستی لە هەرکوێیەك بن ئەمەش یارمەتی دەر بوو بۆ بەدەستهێنانی دابەشکردنەوەی دووبارەی داهات و سامان، خەڵکیش هەستیان بەدادگەری و نەمانی ستەمکرد بەهۆی ئەم سیاسەتە ڕاست و دروستەوە.

## چوارەم: سیاسەتی بەخشینی گشتی لەلای عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ):

**١- خەرجکردنی پارە بۆ چاودێری کۆمەڵایەتی لەلایەن عومەرەوە(ﷺ):** بۆ بەدیهێنانی ئامانجی دووبارە دابەشکردنەوەی داهات و سامان عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) هەوڵی دەدا بۆ زیادکردنی بەخشینی پارە بە هەژار و نەداران و دابین کردنی چاودێری تەندروستی و

---

[1] - الخراج، ابو یوسف، ل: ٢٥، السياسة المالية و الاقتصاديى، ل: ٨٢.

[2] - السياسة المالية و الاقتصاديى لعمر، ل: ٨٣.

[3] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٩٧، الاموال ژمارە ٨٣٨.

کۆمەڵایەتی بۆیان، ئەمەش چەند خواستێکی شەرعیە و لە قورئانی پیرۆز و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دا هاتووە، هەر لە ڕۆژەکانی سەرەتای خەلافەتیشەوە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) گرنگی دەدا بە شوێنکەوتنی شەرع و پابەند بوون بەڕاستی و دادگەریەوە، ئەوە بوو داوای ڕوونکردنەوەی لە زانایان کردو، ئیبن شەهابی زوهریش نامەیەکی نووسی بۆ عومەر سەبارەت بە ئەوەی کە سوننەتە لە زەکاتدا هەتاوەکو لە خەلافەتیدا کاری پێ بکرێت و تیایدا هاتبوو: پشکی خەڵکی لە پەککەوتووی تیایە بۆ هەموو هەژارێك بەگشتی پشکێکی تیایە بەمەرجێك توانای کارکردنی نەبێت وەك ئەو کارێکارەی کە لە کارەکەیدا بریندار دەبێت یان تووشی نەخۆشی یان ڕووداوێك دەبێت یاخود ئەو تێکۆشەرەی کە تووشی پێکران دەبێت لە جەنگدا، بەشی ئەو هەژارانەشی تیایەکە سواڵ دەکەن و داوای شتومەك لە دەوڵەمەندەکان دەکەن هەتاوەکو پێویستیان بە کۆمەکی نەمێنێت...

پشکێشی بۆ ئەوکەسانە دیاری کردبوو کە لە زیندان دا بوون لەوانەی کە کەسیان نیە.. پشکێك بۆ ئەوکەسانەش کە هاتوچۆی مزگەوت دەکەن و موچەیان نیە و داواش لە خەڵکی ناکەن.. پشکێکیش بۆ ئەو کەسانەی کە هەژاری و قەرزاری ڕوی تێ کردوون و قەرزاریەکەشیان لە سەرپێچی پەروەردگاردا نەبووە، بەشێکیش بۆ هەر ڕێبوارێك کە ڕێ وشوێنی نەبێت، بەم پارەیەش شوێن و خۆراك بۆ خۆی و ئالف بۆ ولاخەکەی دابین دەکرێت هەتاوەکو شوێنێکی دەست بکەوێت و پێداویستی نەمێنێت [1].

أ- **بەخشین بە هەژار و نەداران:** عومەر هەمیشە لەبیری هەژار و نەداراندا بوو، و هەوڵی دەوڵەمەند کردنی دەدان، پێشتریش چیرۆکێمان لەگەڵ فاتمەی هاوسەریدا باس کرد، کاتێ پرسیاری لێ کرد دەربارەی نهێنی گریانی، ئەویش وەلامی دایەوە: کاروباری ئوممەتی محمدم(ﷺ) گرتۆتە دەست و بیر لە هەژاری برسی و نەخۆشی لەدەست چوو و ڕوت و ڕەجاڵی ماندوو و ستەملێکراوی چەوساوە و غەریبی دیلکراو و گەورە و خاوەنی منالی کلفەت و دەکەمەوە و ئەزانم کە خوای گەورە پرسیارم لی دەکات دەربارەیان و محمد(ﷺ) لە دوای ئەوا دەبێت بە ڕکابەرم، و ئەترسم بەڵگەکانم لەبەرامبەریدا لاواز بێت و بەزەیم بە خۆمدا دێتەوە و گریانم بۆ دێت [2]. ئەم ڕووداوە سیاسەتی عومەرمان بۆ بەخشین بە چین و توێژە هەژارەکان بۆ ڕوون دەکاتەوە و پڕیەتی لە مانای و جوان و پێویستی بە چەند

---

[1] - السياسة المالية و الاقتصاديى لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٨٣.

[2] - سير اعلام النبلاء(٥ / ١٣٢)، سيرة ومناقب عمر لابن عبدالحكم، ل: ٢٤٨.

هەڵوێستەیەك هەیە بۆ هەست کردن بە گەورەیی ئەو بەرپرسیاریەتەی کـە خراوەتـە ئەسـتۆی، پێغەمبـەری خـواش(ﷺ) ئەفـەرموێت: " هـەموو تـان شـوانن و هـەموتان بەرپرسـن لـە ژێـر دەستەکانتان، پێشەوا شوانە و بەرپرسە لە ژێر دەستەکانی [1] ".

عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) کاری دەکرد بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی خەڵك، پیاوێك هاتـە خزمەت عومەر و لەبەردەستی دا وەستا و وتی: هەژاری زۆری بـۆ هێنـاوم و نەدارکـەوتوم، خـوای گەورەش سبەینێ لەبەردەستی خۆی دا سەبارەت بە من پرسیارت لێ دەکات، عومەریش خۆی دا بو بەسەر دارێکدا و هێندە گریا هەتاوەکو فرمێسکی چاوی دارەکەی تەڕکرد، پاشان پارەی بۆ خۆی و منالەکانی بڕیەوە و پێنج سەد دیناری پێدا هەتاوەکو موچەی پێ دەدرێت [2].

هەروەها گرنگی دەدا بە بێوەژن و منالەکانیان وەك لەگەڵ ئەو ژنە عێراقیە دا ڕووی دا کە پێشتر باسمان کرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەفەرموێت: " ئەو کەسەی کە هەوڵ بـۆ بێـوەژن و هـەژار دەدات وەك ئەو کەسە وایە کە لە پێناو خوادا تێ دەکۆشێت یان وەك ئەو کەسەی کە ڕۆژ بە ڕۆژوو دەبێت و شەویش شەونوێژ دەکات [3].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) خانوویەکی دابین کرد بۆ تێرکردنی هـەژار و نـەدار و ڕێبوار و [4] تەنها گرنگی دان بە هەژاران وازی نەهێنا، بەڵکو چـاودێری خـەڵکی نـەخۆش و هـەتیو گرفتارای دەکرد، ئەوە بوو نامەیەکی نووسی بۆ شارەکانی شام و ئەیوت: ناوی هەموو نابینا و کـەم ئەندام و و نەخۆشی درێژخایەن و پەککەوتەیەك کە نەتوانێ ئامادەی نوێژی جەماعەت بێت بۆ بنێرن، ئەوانیش بۆیان نارد و ئەویش بۆ هەموو نابینایەك ڕێنیشاندەر و چاوسـاغێکی دانـا و بـۆ هـەموو دوو پەککەوتوو کەم ئەندامێکیش خزمەتگوزارێکی دانا، پاشـان نامەیـەکی تـری نووسـی و داوای نـاوی هەتیو ئەو کەسانەی کرد کە بێ کەسن وبـۆ هـەر پێـنج دانەیـەکیان خزمـەتگوزارێکی دانـا کـە بـە شێوەیەکی یەکسان خزمەتیان بکات [5].

ب- **بەخشین بە قەرزاران:** قەرزاران یەکێك بوون لەو چینانەی کە عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) گرنگی پێ دەدان، ئەوە بوو ئیبن شـەهابی زوهـری نامەیـەکی نووسـی بـۆ عومـەر سـەبارەت بەبەشی کەسانی قەرزار تیایدا هاتبوو: بۆ هەرکەسێك کە لە پێناو خوادا قەرزار بوو بێت.. یان

---

[1] - البخاري ژمارە ٨٩٣.

[2] - حلية الاولياء(٥ / ٢٨٩).

[3] - البخاري ژمارە(٦٠٠٦).

[4] - الطبقات(٥ / ٣٧٨).

[5] - سيرة و مناقب عمرى لابن الجوزي، ل:(٢٠٢).

تووشی هەژاری بووبێت وقەرزی بەسەرەوە بێت و هیچی بۆ سەرپێچی پەروەردگار نەبوبێت[١]، خەڵکی متمانەی بە دینداری هەبێت، ئەوە بوو عومەر فەرانی دا بە دانەوەی قـەرزی قـەرزاران ئەوانیش بۆیان نووسی: کەسانێك هەن خانوو و خزمەتگوزار و ئەسـپ و کەلوپـەلیان هەیـە، عومەریش بۆی نوسین، پێویستە هەموو موسڵمانێك خانوویەکی هەبێت کە تیایدا پشوو بـدات و خزمەتگوزارێك کە شاگردی بـۆ بکـات و ئەسـپێك کـە بەسـەریەوە جیهـاد بکـات و کـە لوپـەلێك کـە ماڵەکـەی پـێ بڕازێنێتـەوە، بۆیـە ئـەو کەسـەش هـەر قـەرزارە و قەرزەکـەی بۆبدەنەوە[٢].

والی کوفە بڕێکی زۆر پارەی لا کۆبووبوویەوە نامەیەکی دەربارەی نووسـی بـۆ عومـەر، ئـەویش بۆی نووسی: نامەیەکت نووسیوە باسی ئەوە دەکەیت، کە پارەیەکی باشت لا ماوەتەوە دوای پێـدانی موچە بە سەربازەکان، بۆیە ئەتوانیت قەرزی ئەوانەیان بدەیتەوە کە بۆ تـاوان و خراپـەکاری قـەرزیان نەکردووە، یان ژنی هێناوە و پارە و پوڵی بەشی نەکردووە و السلام [٣].

نامەیەکیشی نووسی بۆ خەڵکی و لـە مزگەوتی کوفەدا خوێندرایەوە و تیایـدا هـاتبوو: هەرکـەس ئەمانەتێکی لایە و ناتوانێ بیداتەوە – مەبەستی قەرزە – ئەوە لـە بەیتولمال بۆی بدەنـەوە، هەرکـەێکیش ئافرەتێکی خوازبێنی کردو توانای دابین کردنی مارەیی نەبوو ئەوە لـە بەیتولمال پارەی پێ بدەن [٤]

ج- **بەخشین بە دیلەکان:** خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطْعِمُكُمْ لِوَجْهِ اللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمْ جَزَاءً وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوْمًا عَبُوسًا قَمْطَرِيرًا﴾ الإنـسـان: ٨ – ١٠).

واتە: وە خواردەمەنی دەرخواردی هەژاران و هەتیوان و دیلان دەدەن بـا حەزیـشیان لـێ ی بێت.(دەڵێن) بەڕاستی ئێمە خواردەمەنیتمان دەدەینێ هەر لەبەر خوا چاوەڕوانی ناکەین لە ئێوە نە پاداشت و نە سوپاس. بەڕاستی ئێمە لـە سزای پەروەردگارمان دەترسین لە ڕۆژێکی تـرش و تاڵ و دژوارا.

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) گرنگی دەدا بە دیل و بەخشینی پارە پێیان لە بـەیتولمال و نامەیەکیشی نوسی بۆ دیلە موسڵمانەکان لە قوستەنتینە دا [٥]. باسی ئەم نامەیەشم لـە قـسەکردنمدا

---

[١] - سيرة و مناقب عمر لابن الجوزي، ل: ٢٠٢.

[٢] - الاموال، لابي عبيدة، ژمارە: ١٨٥٠، السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٩٢.

[٣] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ١٧١. السياسة المالية و الاقتصادية، ل: ٩٢.

[٤] - هەمان سەرچاوە، ل: ٦٧.

[٥] - الطبقات(٥ / ٣٧٤.

سەبارەت بە ژیانی کۆمەڵایەتی کردووە، گرنگی بەو زیندانیانە دەدا کە لە زیندانی موسڵمانەکاندا زیندانی کرابوون بە هۆی تاوان یان تۆڵە یەکەوە، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش(ﷺ) فەرمانی دا بە چاودێری کردن و بەخشین ی پارە پێیان و، نامەی نوسی بۆ کاربەدەستەکانی و تیادا هاتبوو، هیچ موسڵمانێك لە زینداندا نەهێڵنەوە کە نەتوانێ بە پێوە نوێژ بکات، و کەسێك لە زیندانەدا مەهێڵنەوە کە خوێنی لە ئەستۆدا نەبێت و لە پارەی زەکات بەشی خۆراك و ئازوقە پارەی پێ بدەن [1]. هەروەها فەرمانی دا بە دابین کردنی خۆراك و پۆشاك لە هاوین و زستاندا بۆیان [2].

د- **بەخشین بە رێبوار و ئەو خەڵکانەی لە سەفەردا پارەیان لێ براوە:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) گرنگی بە رێبوار و ئەو کەسانە ئەدا کە لەکاتی سەفەردا پارەیان لێ براب وو، لەم بوارەشدا فرمانی دا بە بنیاتنانی میوانخانە لە رێگاکاندا بۆ خزمەت کردنی رێبواران و گرنگی پێ دانیان و نامەیەکی نووسی بۆ یەکێك لە کار بەدەستەکانی کە چەند میوانخانەیەك لە ولاتەکەیدا دروست بکە و هەر موسڵمانێك بەوێدا تێپەڕی بۆماوەی شەو و رۆژێك میوانداری بکەن و ئالفیش بۆ ولاخەکەی دابین بکەن، ئەگەر کەسێك نەخۆش بو و دوو شەو و رۆژ میوانداری بکەن، ئەگەر لێی قەومابوو ئەوە هێندە پارەی پێ بدەن کە پێی بگاتە شوێنی خۆی[3]، هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) گرنگی دەدا بە حاجیان و بەخشینی پارە پێیان و خزمەتکردنی لاواز و دەوڵەمەنکردنی هەژاران.

هـ- **بەخشین بۆ ئازادکردنی کۆیلە:** دوای ئەوەی عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) پارەی بەخشی بە کەسانی هەژار و نەدار و کەم ئەندام و خەڵکانی چەوساوە و قەرزار و رێبوار، پارە و سامانی بۆ ئازاد کردنی کۆیلەکان بەکار هێنا، کارمەندی زەکاتی ئەفریقا - تونس - ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) ناردمی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی ئەفریقا منیش کۆمکردەوە، پاشان بە دوای چەند هەژارێکدا دەگەڕام بۆ ئەوەی دابەشی بکەم بەسەریاندا، بەلام هیچ هەژارێکمان دەست نەکەوت، بۆیە چەند کۆیلەیەکم پێ ئازاد کرد [4].

پێشتریش باسی بەخشینی پارەمان کرد بۆ زانایان لەیەلان عومەرەوە هەتاوەکو یەکلا ببنەوە بۆ بانگەواز و فێرکردنی خەڵکی هەتاوەکو هەموو چینەکانی جەماوەر بگرێتەوە بە منداڵیشەوە و برێك

---

[1] - السياسة الاقتصادية و المالية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٩٣.

[2] - الخراج، ابو يوسف، ل: ٣١٥.

[3] - الطبقات(٥ / ٣٥٦.

[4] - تاريخ الطبري له السياسة المالية و الاقتصادية، ل: ٩٤.

پارەی بۆ دیاری کردن هەتاوەکو یارمەتی کەس و کاریان بدات بۆ پـەروەردەکردنیان، گرنگـی دەدا بە هاولاتیانی ئەهلی ذیمە خاوەن کتێبەکانی تر و یارمەتی هەژار و نەدارانیانی دەدا لە بەیتولمال[1].

ئەبێ ئاماژە بەوەش بدەین کە سیاسەتی دروستی عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) ڕۆڵی هەبوو لە دەوڵەمەنـدکردنی ژمـارەکی زۆر لـە موسـڵمانان و زیـادکردنی سـامانیان لـەبواری بازرگـانی و کشتوکاڵی و.. هتد دا.

هەروەها ڕۆڵـی هـەبوو لـە بـڵاو بونـەوەی ڕۆحـی ئاینـداری و خۆشویـستنی ڕۆژی دوایـی و ئارەزووی چاکەکردن لە دەرونی خەڵکدا بەمەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگار و دەسـتکەوتنی پلـەی بەرز لای، بەم پێیەش بەخشین لە پێناو پەروەردگاردا و یارمەتیدانی هەژار و نەدار و بێوەژن و هـەتیو بنیاتنانی شوێنی گشتی و لێدانی بیر و بنیاتنانی مزگەوت وشتی تر زیادی کـرد، ئەمـەش بـوە هـۆی کەمکردنەوەی ئەرکە مادیەکان لەسەر بەیتولمالی موسڵمانان لە پایتەخت و هەر ئێمە جیاجیاکاندا.

٢- **کەم کردنەوەی خەرجی گشتی دەوڵەت:** سیاسەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) لە بـواری بەخشین و خەرجکردن پـارەدا لەسـەر بنـەما گەشـەی ئـابووری یـان ئـەوەی کەبـە(قەوامـە) ناودەبرێت واتە: دوورکەوتنەوە لە زیادە ڕەوی و زۆر بەخشین بە بێ ڕوژدی و ڕەزیلی[2]، کە گرتیەبەر بۆ خەرجکردنی پارە بۆ کاروباری گشتی ولات:

أ- بڕینی ئەو ئیمتیازاتانەی کە تایبەت بـوو بـە خەلیفـە و ئـەمیرە ئەمەویـەکان، عومـەری کـوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) کەلوپەل و مافە تایبەتیەکانی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان و مافە گشتیەکانیـشی گێڕایەوە بۆ بەیتولمال، سەرەتاش لە خۆی و بنەماڵەکەوە دەستی پێکرد - وەك باسمـان کـرد - عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) هیچ شتێکی لە بەتولمال نـەدەبرد، کـاتێکیش پێیـان وت: بـۆ وەك عومەری کوڕی خەتتاب بڕێك پارە لە بەیتولمال وەرناگریت، ئـەویش فـەرمووی: عومـەر پارەی نەبوو، بەڵام من بەشی خۆم پارەم هەیە[3].

هەروەها کاتێ کە ژاوەی خەلیفـەیان هێنـا بـۆ عومـەر دوای کۆچـی دوایـی سـولەیمان، داوای هێسترەکەی کرد و فەرمانی دا بەلابردنی کەژاوەی خەلیفایەتی و فـەرش و کەلوپەلـەکانی و دانـانی لـە بـەیتولمال دا، نـەریتیش وابـوو کـە میراتگرانـی خەلیفـە جلوبـەرگ و بـۆن و کەلوپەلـە بەکارهاتووەکانی بەرن و پاشماوەکەشی بگێڕنەوە بۆ خەلیفەی نوێ، بەڵام کاتێ عومەر بوو بەخەلیفـە

---

[1] - سيرة عمر، لابن عبدالحكم، ل: ٦٥.

[2] - السياسة المالية و الاقتصادية، ل: ٩٤ - ٩٦.

[3] - العقد الفريد(٥ / ٢٢)، السياسة المالية و الاقتصادية، ل: ٩٧.

وتی: ئەمە نەموڵکی منە و نە موڵکی سولەیمان و نە موڵکی ئێوەشە، ئەی موزاحم هەمووی ببە بۆ بەیتولمال [1].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) سامانی گشتی بۆ بەرژەوەندی تایبەتی خۆی بەکار نەدەهێنا، ئەوەبوو جارێکیان ئەمیری ئوردون دووسە بەتە خورمای نارد بۆ عومەر بەوڵاخی پۆستەدا کاتێ هێنایان فەرمانی دا بە فرۆشتنی و پارەکەی دا بە ئالف بۆ ولاخەکان [2].

جارێك داوای لە کاربەدەستێکی کرد کە هەنگوینی بۆ بکڕێت، ئەویش بۆی کڕی و بەوڵاخی پۆستەدا بۆی نارد، ئەیوش فرمانی دا بەفرۆشتنی هەنگوینە کە و دانانی پارەکەی لەبیتومال دا و بەکاربەدەستەکەشی وت: هەنگوینەکەت خراپ کردین [3].

ب- **کەمکردنەوەی خەرجی کارگێڕی:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) هەوڵی دەدا بۆ ڕاهێنانی هاوکار و کاربەدەستەکانی لەسەر کەمکردنەوەی خەرجکردنی سامانی گشتی، ئەوەبوو کاتێك والی مەدینە داوای لێکرد کە پارەی مۆمی بۆ سەرف بکات وتی: سوێند بەخوا تۆ لە کاتێکدا لە شەوانی تاریکدا بە بێ چرا دەچویتە دەرەوە کە لە ئێستا باشتر بویت، ئێستاش ئەتوانی فتیلەی ماڵەوەتان بەکار بێنیت و السلام [4].

هەروەها لە نامەیەکیدا داوای چەند قەڵەمێکی لێ دەکرد بۆ نووسین ئەویش بۆی نووسی: هەر کە ئەم نامەیەت پێ گەیشت ئەوە وردتر بنووسە و زۆرتر لە پەڕەیەکدا کۆ بکەرەوە، چونکە خێر لە نووسینێکی زیاد دا نیە کە زیان بە بەیتولمالی موسڵمانان بگەیەنێت [5]، لێرەشدا خەمخۆری عومەر بۆ سامانی گشتی دەردەکەوێت ،ئەوەتا کار بەدەستەکانی ڕێنمایی دەکات بۆ سوود وەرگرتن لە داهاتەکانی دەوڵەت بە باشترین شێوە، و داواش دەکات لە کاربەدەستەکەی کە بەباشی سود لە نامەکان وەربگرێت و تا ئەتونێت دەستی پێوە بگرێت.

ج- **کەمکردنەوەی خەرجی سەربازی:** دەوڵەتی ئەمەوی چەندین جەنگی ناوخۆیی و دەرەکی بەخۆوە بینی، ئەمەش بڕێکی زۆری لە بودجەی دەوڵەت بەفیڕۆدا، لەوجەنگانەش هەڵمەتی قوستەنتینە لە سەردەمی سولەیمانی کوڕی عبدالملك دا کە بڕێکی زۆر پارەی تێچوو و شەهیدێکی زۆری تیایدا درا بە بێ ئەوەی سوودێکی ئەوتۆی هەبێت، بۆیە هەرکە عومەر بوو

---

[1] -سيرة عمر، لابن عبدالحكم، ل: ٣٥، السياسة المالية و، ل: ٩٧.

[2] - السياسة المالية و الاقتصادية لعمر بن عبدالعزيز، ل: ٩٨.

[3] - سيرة و مناقب عمر، لابن الجوزي، ل: ٢١٠.

[4] - والی مەدینە: لەو کاتەدا ئەبوبەکر کوڕی محمدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم بووە سیرە عمر لابن عبدالحكم، ل: ٦٤.

[5] - سيرة ومناقب، لابن الجوزي، ل: ١٢١.

به خەلیفە نامەیەکی نارد و داوای لە مەسلمەی کوڕی عبدالملك -سەرکردەی هەڵمەتەکە- کرد کە بگەڕێتەوە، دوای ئەوەی کە سوپاکەی تووشی تەنگاویەکی زۆر بوو.

دیارە ژیاننامەو ڕەفتاری عومەر و سیاسەتی بووە هۆی سەقامگیر بوونی بارودۆخی ناوخۆیی وڵات و هێمنی و ئاسایش باڵی بەسەردا کێشا و جەنگ و ئاژاوەکان کۆتاییان پێ هات، کاتێ خەواریجەکانیش پێی ئاشنا بوون، کۆبوونەوە و وتیان نابێت شەڕ لەگەڵ پیاوی ئاوادا بکەن [١].

بێگومان وەستانی جەنگ و نەمانی ئاژاوەش هۆکارێك بوو بۆ بەدیهێنانی کەش و هەوایەکی هێمن و باردۆخێکی جێگیر و گەشەکردنی ئابووری دەوڵەت و باشبوونی گوزەرانی چینە هەژار و کەم دەرامەتەکان هەموو ئەمانەش پاش فەزڵی خوا بە هۆی سیاسەتی دروست وحەکیمانەی عومەرەوە بوو.

---

[١] - سیرە و مناقب عمر، لابن الجوزی، ل: ٨٦. السیاسە المالیە و الاقتصادیە لعمر، ل: ١٠٠.

# باسی حەوتەم

## دەزگای دادوەری لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا و هەندێ لە بۆچوونە فیقهیەکانی

**یەکەم: لە بواری دادوەری و شایەتی داندا:**

١- **دەربارەی سیفەتەکانی دادوەری:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) وردەکاری بەکار دەهێنا لە هەڵبژاردن و دیاری کردنی دادوەرەکاندا، هەتاوەکو خەڵکی گیرۆدەنەبن بە دادوەرێك کە بە نارەوا داوەریان لە نێواندا بکات، بۆ ئەم مەبەستەش عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) پێنج مەرجی دانا بۆ دادوەر، بە جۆرێك کە بۆی نەبێت ببێت بە دادوەر هەتاوەکو ئەم مەرجانەی تیادا بەدی نەیەت کە ئەوانیش: زانست و هێمنی و پاکی و ڕاوێژ کردن و بەهێزی بوو لەوتنی ڕاستیدا [١].

لە موزاحیمی کوڕی زوفەرەوە ئەڵێ: لەگەڵ وەفدی کوفەدا هاتینە خزمەت عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەویش پرسیاری لێ کردین دەربارەی وڵات و ئەمیر و دادوەرمان، پاشان وتی: پێنج شت هەیە ئەگەر یەکێکیان لە دادوەر دا نەبوو ئەبێت بەنەنگی بۆی، ئەبێ تێگەیشتوو لەسەر خۆ و پاك و بەهێز و شارەزا بێت و پرسیاریش دەربارەی ئەو شتانە بکات کە نایانزانێت [٢].

لە ڕیوایەتێکی تریشدا لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە لە عومەری کوڕی عبدالعزیز ەوە وتویەتی: دادوەر نابێت بەدادوەر هەتا وەکو پێنج ڕەوشتی تێدانەبێت: " پاك و هێمن و زانا و ڕاوێژ کەر بێت و لە لۆمەی نەترسێت [٣]، عومەری کوڕی خەتتاب [٤] و عەلی کوڕی ئەبی تالیبیش وتەیەکی لەم شێوەیان هەیە [٥]. چوار پێشەواکەش هاوڕان لەگەڵ عومەری کوڕی عبدالعزیزدا لەم سیفەتانەدا [٦].

٢- **دەربارەی حوکمی دادوەر لەو مەسەلانەدا کە بۆی ڕوون دەبێتەوە و بەرزکردنەوەی ئەو کێشانەی کە لێی دەگیرێت بۆ کەسانی شارەزاتر:** لەوانەیە هەندێك مەسەلەی ئاڵۆز هەبن کە دادوەر سەرسام بکەن و نەتوانێ بڕیارێکی یەکلاکەرەوەی تیادا بدات ئایا لەم کاتەدا دەبێ بڕیاری چی بدات بە بێ ئەوەی ڕاستی بۆ ڕوون ببێتەوە یاخود بیسپێرێت بە کەسێکی شارەزاتر؟

---

١ - فقه عمر بن عبدالعزیز(٢ / ٢٨٥) د. محمد شقیر.

٢ - الطبقات الکبری(٥ / ٣٦٩).

٣ - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٦٩ – ٣٧٠).

٤ - المصنف، عبدالرزاق(٨ / ٢٩٩) شذارات الذهب(١ / ١٢٠).

٥ - المغني(٩ / ٣) فقه عمر بن عبدالعزیز(٢ / ٤٨٥).

٦ - حاشیه ابن عابدین(٤ / ٣٠٥) روضة الطالبین(١١ / ٩٥ – ٩٧) جواهر الاکلیل(٢ / ٢٢١) المغنی(٩ / ٣٩، ٣ – ٤، ٥٠).

عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) لەم بارەوە بڕیارێکی داوە کەوانەیە لە بواری دادوەری دا هەتاوەکو ڕۆژی دوایی، ئەویش ئەوەیە کە ئەگەر دادوەر ڕاستی بۆ ڕوون بوویەوە دەبێ بڕیاری لە بارەوە بدات، ئەگەر بۆشی ڕوون نەبوویەوە دەبێ واز لەو کێشەیە نەهێنێت و بەرزی بکاتەوە بۆ خەڵکانی شارەزاتر هەتاوەکو بڕیاری لە بارەوە بدات [1].

لە مەیمونی کوڕی مهران – کە لەو کاتەدا دادوەری جەزیرە و بەرپرسی کۆکردنەوەی زەکات بوو نامەیەکی نووسی بۆ عومەر سکاڵای گرانی ئەرکی کۆکردنەوەی زەکات و دادوەری لاکرد – ئەڵێ: عومەریش بۆی نووسی: من ئەرکێکی گرانم نەخستۆتە ئەستۆت، پارە و ماڵی پاك کۆبکەرەوە و هەرشتێکت بۆ ڕون بوویەوە بڕیاری تیادا بدە ئەگەر شتێکیشت لێ گیرائەوە بەرزی بکەرەوە بۆ خۆم، چونکە ئەگەر هەرکەسێك کارێکی پێ قورس بوو و وازی لێ بێنێت ئەوە هەرگیز هیچ کاروبارێکی ئاین و دونیا دانامەزرێت [2].

ئەم شێوازەش ڕوونی دەکاتەوە کە خوای گەورە خەڵکی بەیەك شێوە لە زانست و تێگەشتن دا دروست نەکردووە، بەڵکو چەند پلەیەکن، ئەو کەسەش کە دادوەری پێ سپێردراوە دەبێ دادوەری بکات لە نێوان ئەو خەڵکانەی کە کاروباریانی پێ سپێردراوە و بە پێی ئەو ڕاستیانەی کە بۆی ئاشکرا دەبێت، ئەگەر مەسەلەیەکیشی لێ گیرا ئەوە دەبێت ڕاوێژ بە خەڵکانی زانا بکات لەوڵاتەکەیدا، ئەگەر لای ئەوان وەڵامی دەستنەکەوت ئەوە دەبێ بەرزی بکاتەوە بۆ خەڵکانی زاناتر یان بۆ وەلی ئەمر هەتاوەکو کێشەکە ئاڕاستەی خەڵکانی تر بکات یاخود خۆی بڕیاری لە بارەوە بدات ئەگەر زانیاری هەبوو [3].

عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) چەند مەجلیسێکی زانستی هەبوو کە تیایدا ڕاوێژی بە زانایان و شەرعناسان ڕۆشنبیران دەکرد لە مەسەلە ئاینی و دونیاییەکاندا، زۆر جاریش ئەم مەجلیسانە لە کاتی حەوانەوە و پشوودانیدا بوو لەشەودا، چونکە عومەر دەیزانی کە شەو چەند زیندوو گرنگە بۆ گەشتن بەڕاستیەکان، هەروەك تێگەشتی قوڵی خۆی دەربڕی بۆ ئەو بڕیارانەی کە لە ئاکامی بە یەکگەشتنی بیروڕاکان دا بەدی دێت لەبەرهەمی فیکری باش و ئیجابی، کاتێکیش ڕەجائی کوڕی حەیوە پرسیاری لێکرد: ئەی ئەمیری باوەڕداران بە ڕۆژدا بە تەواوی سەرقاڵی و بەشێکی شەویش لەگەڵ ئێمەدا بەسەر دەبەیت؟ عومەریش وتی: کۆبوونەوە لەگەڵ زانایاندا هۆکارێکە بۆ بەهێزی و بە

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٨٧).

[2] - الخراج لابي يوسف، ل: ٢٤٠، ٢٤١.

[3] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٨٨).

پێزی بیرواکان و ڕاوێژ و مشتومڕیش دەرگای ڕەحمەت و کلیلی بەرکەتەوە هیچ ڕایەك لەگەڵیدا هەڵە نابێت [1] و بەیەککەشتنی پیاوانیش ڕاوبیرو بۆچوونیان بەهێز تر دەکات [2].

٣- **دەربارەی بەزەیی هاتنەوە بە خەڵکانی گێل و نەهی کردن لە سزادان لەکاتی توڕەییدا :** عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) نامەیەکی نووسی کە تیادا هاتبوو لە بەندەی خوا عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) ئەمیری باوەڕدارنەوە بۆ ئەمیرەکانی سوپا پاشان: ئەگەر ڕکابەری نەزان و گێل هاتە لات و خراپەکاری و کاری نارەوات لێ بینیبو، ئەوە تا ئەتوانیت ڕێنمایی بکە و نەرم بەلەگەڵیدا و فێری چاکەی بکە، جا ئەگەر فێر بوو و ڕێنمایی وەرگرت ئەوە فەزڵی خوایە، ئەگەر فێریش نەبوو ڕێنمایی وەرنەگرت ئەوەتۆ بویت بە بەڵگە بەسەریەوە، جار ئەگەر پێت وا بوو کە تاوانێکی کردووە و شایانی سزادانە ئەوە بەهۆی هەڵچوونی دەورن و توڕەیی خۆتەوە سزای مەدە، بەڵکو بە پێی حەق و دادگەری سزای بدە و بە پێی ئەو تاوانەی کە کردوویەتی، بەڵام ئەگەر تاوانەکەی لەوە گەورەتر بوو هەتاوەکو کوشتن ئەوە بیگێڕەوە بۆ زیندان و هەرگیز ئەو خەڵکانەی کەلات ئامادە ئەبن نەبنە هۆکارێك بۆ پەلەکرن لە سزادانیدا [3].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) ئەگەر بیویستایە سزای کەسێك بدات سێ ڕۆژ زیندانی دەکرد پاشان سزای دەدا نەوەکو لە کاتی توڕەییدا پەلە بکات لە دەرکردنی بڕیاری سزادانیدا [4].

دیارە سزادان لە کاتی توڕەییدا لەوانەیە ببێتە هۆی لادان لە حەق و دادگەری لەژێر فشاری توڕەییدا و ئەمەش ستەمە لە کەسی تاوانبار، هەربۆیە عومەر داوای کرد لە دادوەر کە تاوانبار زیندانی بکات هەتاوەکو توڕەیی نامێنێ پاشان لە کاتی هێمنی دا سزای بدات [5].

٤- **هەڵە کردنی والی لە لێبوردن دا باشتر لە زیادەڕەوی کردنی لە سزادان دا :** لە عقبەوە هاتووە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) وتویەتی: هەتاوەکو ئەتوانن سزا و حەد بە هۆی گومانەوە لابەن، چونکە هەڵەکردنی والی لە لێبوردن دا باشترە لە زیادە ڕەوی کردنی لە سزادان دا [6].

---

[1] - ملامح الانقلاب الاسلامي، ل: ١٨٦، عمر بن عبدالعزيز لابن عبدالحكم، ل: ١٢٤.

[2] - ملامح الانقلاب الاسلامي، ل: ١٨٦.

[3] - سيرة عمر بن عبدالعزيز ن لابن عبدالحكم، ل: ٦٨، ٦٩.

[4] - تاريخ الخلفاء للسيوطي، ل: ٢٣٦.

[5] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٢٠).

[6] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، لابن الجوزي، ل: ١٢٣، فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٩١).

٥- **دەربارەی کارنەکردن بە گومان:** عومەری کوڕی عبدالعزیز وەلیدی کوڕی هشامی معیطی دانا بەفەرماندەی سەربازەکانی قنسرین و فوراتی کوڕی موسلمیشی بەبەرپرسی خەراج داناو، ئەوانیش ناکۆکی کەوتە نێوانیان، ئەوە بوو وەلید لەگەڵ سەرانی ئەو ناوچەیەدا هاتە خزمەت عومەری کوڕی عبدالعزیز، عومەریش(ﷺ) نامەیەکی نووسی بۆ فورات و داوای هاتنی لێ کرد ئەویش هات و لە پشت جێگەکەی عومەرەوە دانیشت کاتێ سەرانی قنسرین هاتنە لای عومەر پێی وتن: چیتان ئامادە کردوە بۆ ئەمیرەکانتان و وتیان: ئایا ئەو هاتووە؟ وتی: ئەی نەتانزانیوە، وتیان: نەوەڵلا ئەیَ ئەمیری باوەڕداران، پاشان عومەر ڕوی کردە وەلیدو وتی: کەسێك کە ئەمیری قنسرین بێت و بەجێی بهێلێت و بگاتە لای من بە بێ ئەوەی کەس پێ ی بزانێت و کەس ئازار نەدات شیاوی ئەوەیە کە خاکی و پاك بێت، وەلیدیش وتی: بەڵێ ئەی ئەمیری باوەڕداران سوێند بە خوا ئەو پاکە و من ستەمم لێ کردووە، داوای لێخۆشبوون لە پەروەردگار ئەکەم و پەشیمانم لەو کارەم، عومەریش وتی: دانان بەهەڵەدا چەند جوان و بەسوودە و سووربوونیش لەسەر هەڵەچەند خراپە، پاشان هەردوو لای ناردەوە سەرەکارەکانیان، پاشان وەلید نامەیەکی بۆ نووسی - کەسێکی ڕیاباز بوو - بۆ خەڵەتاندنی عومەر و جوان پیشاندانی خۆی وتیایدا هاتبوو: من خەرجی خۆم حساب کردوە و ئەوەندە درهەم دەکات و داهاتم - موچەکەی - لەوەزیاترە، جا ئەگەر بەڕێزتان ئەتانەوێ بۆم کەم بکەنەوە، عومەریش وتی: وەلید ئەیەوێ خۆی بەوشێوەیە پیشان نەدات کە گومانی پێ ئەبرێت، ئەگەر بە هۆی گومانەوە کەسێك لەسەر لابرایە ئەوە ئەوم لادەبرد، پاشان موچەکەی بۆ کەمکردەوە بەو شێوەی کە داوای کردبوو، پاشان نامەیەکی نووسی بۆ یەزیدی کوڕی عبدالملك کە جێنشینی بوو - دیاریکرا بوو بۆ خەلیفایەتی دوای عومەر - و تیایدا هاتبوو: وەلیدی کوڕی هشام نامەیەکی بۆ نووسیوم پێم وایە ویستویەتی بە جۆرێك خۆی پیشان بدات کە خۆی بەوشێوە نیە، منیش ئەگەر بە گومان کارم بکردایە نەم دەهێشت هەرگیز کاربەدەستی من بێت، بەڵام من سەیری ڕواڵەت ئەکەم و خوای گەورە خۆی نهێنی دەزانێت، جا من سوێندی تۆ دەدەم ئەگەر من تووشی شتێك بووم و تۆ ئەم کارەت کرتە دەست و داوای گێڕانەوەی ئەو پارەیەی لێ کردی و وتی: عومەری لێی بریوم ئەوە بۆی نەگێڕیتەوە، چونکە ئەو ویستویەتی خوا بخەڵەتێنێت، بەڵام خوا ئەو دەخەڵەتێنێت، ئەوە بوو کاتێ عومەر کۆچی دوایی کرد و یەزید بوو بە خەلیفە وەلید نامەیەکی بۆ نووسی: کە عومەر پارەی لێ

بڕیوم و ستەمی لێکردوم، یەزیدیش توڕە بوو و لەسەرکار لایبرد و هەموو ئەو پارەیەی لێ سەندەوە کە لەسەردەمی عومەر دا پێ ی درا بوو و هیچ کارێکی پێ نەسپارد هەتاوەکو مرد.

٦- **دەربارەی ناردنی دیاری بۆ کاربەدەستان:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) دیاری بۆ والی هەرێم و دادوەر و کاربەدەسانی تری بە بەرتیل دادەنا و خۆشی دیاری وەرنەگرتووە لە کاتێکدا کە زۆر پێویستی بووە، هەروەها فەرمانی دەدا بە خەڵك کە دیاری پێشکەش بە کاربەدەستان نەکەن و فەرمانیشی کرد بە کار بەدەستان کە دیاری وەرنەگرن [1]، لە فوراتی کوڕی مسلم وە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) حەزی لە سێو بوو ویستی بیکڕێت، بەڵام پارەی نەبوو پێی بکڕێت، پاشان پێکەوە سوار بووین و بەلای دەوارنشینێکدا تێپەڕین و چەند منداڵێك بەلاماندا تێپەڕین و سەبەتەیەك سێویان پێبوو، عومەریش سێوێکی هەڵگرت و بۆنی کرد و پاشان گێڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، پاشان وتی: بڕۆنەوە بۆ ناو دەوارەکانتان دیاریتان بۆ یەکێك لە کاربەدەستانم ناردووە، پاشان ڕۆشت، منیش هێسترەکەم تاودا و پیایدا گەشتمەوە وتم: ئەی ئەمیری باوەڕداران، حەزت لە سێو بوو و بۆت نەکڕدرا، کاتێ بەدیاری بۆیان هێنایت گێڕاتەوە؟! وتی: پێویستم پێی نیە، وتم باشە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر دیاریان وەرنەگرتووە؟ وتی: ئەوە بۆ ئەوان دیاری بووە، بەڵام بۆ کاربەدەستانی دوای ئەوان بەرتیلە [2].

٧- **دەربارەی هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکان ئەگەر پێچەوانەی حوکمە شەرعیەکان بوو:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) لە نامەیەکدا فەرمانی دا بە ڕەتکردنەوەی چەند بڕیارێکی حاجیەکان کە پێچەوانەی بڕیاری خەڵکی بوو [3]، چونکە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) ئەو بڕیارانەی هەڵدەوەشاندەوە کە پێچەوانەی قورئان یان سونەت یان ئیجماع و کۆدەنگی موسڵمانان یاخود پێچەوانەی شورا بوو، هەر سێ پێشەواش – مالیك و شافعی و ئەحمەد پێیان وایە کە بڕیار هەڵدەوەشێتەوە ئەگەر پێچەوانەی قورئان و سونەت یان ئیجماعی موسڵمانان بێت [4].

٨- **دەربارەی سوێنددانی ئەو کەسەی کەسپاردەیەکی فەوتاندوە:** وەهبی کوڕی منبە نامەیەکی نووسی بۆ عومەر: چەند دینارێکی بەیتولمالی یەمەنم ون کردووە، عومەریش بۆی نوسی: پاشان من گومانم لە دینداری و ئەمانەتپارێزی تۆدا نیە، بەڵام گومانم لە کەمتەرخەمی کردنتدا هەیە

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٩٥).

[2] - الطبقات الكبرى، لابن سعد(٥ / ٣٧٧).

[3] - حلية الاولياء(٥ / ٢٧٠).

[4] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٩٩).

منیش پارێزگاری سەر و ماڵی موسڵمانانم، بۆیە دەبێ سوێنیان بۆ بخۆیت کە کەمتەرخەمیت نەکردووە و السلام [1].

٩- **دەربارەی کاریگەری بەڵگەی ئامادە لەسەر دواخستنی بڕیاری دادوەر:** چەند کەسێکی هۆزی قورەیش لای عومەر بوون بۆیەکلا کردنەوەی کێشەیەك، ئەویش دادوەری بۆ کردن و بڕیاری بۆ دەرکردن، بەڵام ئەوکەسەی کە بڕیارە کە لە دژی بوو وتی: خوا باشت بۆ بکات، من بەڵگەیەکی نائامادەم هەیە، عومەریش وتی: من بڕیاردان دواناخەم دوای ئەوەی کە حەقم بۆ ڕوون بوویەوە تۆش بڕۆ ئەگەر ئەو بەڵگەیەت هێناو ڕاستتر بوو لەوەی ئەوان ئەوە بڕیارە کەم هەڵدەوەشێنمەوە ئەو کاتەش دەبمە یەکەم کەسێك کە بڕیار و دادوەری خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە [2].

١٠- **خەرجی حوشتری ونبوو:** شەعبی ئەڵێ: پیاوێك حوشترێکی وون کرد بوو ولای پیاوێکی تر دۆزیەوە کە خەرجی کێشا بوو و ئالفی بۆ کڕیبوو و لەسەر ئەمە بوو بەکێشەیان و هاتنە لای عومەر کە لەو کاتەدا ئەمیری مەدینە بوو، ئەویش حوشترەکەی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکەی و ئەو پارەیەشی لێ سەند کە کابرا بۆ ئالیکی حوشترەکە سەرفی کرد بوو [3].

١١- **دەربارەی ئازادی منداڵی دۆزراوە:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) نامەیەکی نارد بۆ خەڵکی مەککە و تیایدا هاتبوو کە منداڵی دۆزراوە ئازادە [4].

١٢- **شایەتی دانی کەسێك بۆ براکەی یاخود باوکی:** هەروەها عومەری نامەیەکی نووسی: کە شایەتی برا بۆ براکەی وەرگرن ئەگەر کەسێکی دادگەر و چاك بوو [5].

**دووەم: دەربارەی خوێن و تۆڵەسەندنەوە:**

١- سەر پشك کردنی سەرپەرشتیاری کوژرا و لە نێوان لێخۆشبوون و دیە و کوشتنەوەدا، عومەر دەربارەی ئافرەتێك کە پیاوێکی کوشتبوو نوسی: ئەگەر سەرپەرشتیاران ویستیان خۆش بن با خۆش بن ئەگەر ویستیشیان بیکوژنەوە بابیکوژنەوە، ئەگەر ئارەزووشیان لێ بوو دیە وەرگرن با وەری گرن و میراتی هاوسەری ئەو پیاوە لە دەیەکە بدەن [6].

---

[1] - سيرة عمر، لابن الجوزي، ل: ١٠٤، ١٠٥.

[2] - الطبقات الكبرى(٥ / ٣٨٦).

[3] - مضف ابن ابي شيبة(٦ / ٣١٢).

[4] - هەمان سەرچاوە(٦ / ٥٣١).

[5] - هەمان سەرچاوە(٨ / ٣٤٢ – ٣٤٣ ).

[6] - المحلى(١٠ / ٣٦١) فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١١).

٢- دەربارەی چاوەڕوانی کردنی سەرپەرشتیاری کوژراو هەتاوەکو بالّغ دەبێت: عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) دەربارەی پیاوێك کە کوژرا بوو و تەنها کوڕێکی بچوکی هەبوو نووسی: چاوەڕێ بکەن هەتاوەکو ئەم مندالّە بالّغ دەبێت [١].

٣- ئەگەر هەندێك لەسەر پەرشتیاران خۆش بوون ئەوە مافی تۆڵە سەندنەوە نامێنێت: لە زوهریەوە ئەلّێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) نووسی: ئەگەر یەکێك لەسەرپەرشتیارانی کوژرا و لە بکوژ خۆش بوو ئەوە دەبێ دیە وەرگرن [٢].

٤- کوشتنەوەی بکوژانی دوای وەرگرتنی دیە: عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) ئەلّێ: ئەو دەستدرێژیەی کە خوای گەورە باسی کردووە ئەوەیە کە کەسێك دیەوەرگرێت یان تۆڵە بکاتەوە وسولّتان دا دوەریان لە نێوان دا بکات، پاشان کەسێك دوای ئەوەی کە مافی خۆی وەرگرتووە دەستدرێژی بکاتەوە سەر ئەوی تر، ئەوە دەبێ سولّتان سزای بدات و ئەگەر هەر برینێکی پێوە بو بە ئەندازەی برینەکەی لە پارەی دیەکە داشکێنێت [٣].

٥- ئەو کوژراوەی کە لە بازاڕدا دەدۆزرێتەوە: عودەی کوڕی ئەرطەئەی دادوەری بەسرە نامەیەکی نوسی بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) کە من کەسێکی کوژراوم لە بازاڕی قەسابەکاندا دۆزیوەتەوە عومەریش وەلامی دایەوە ئەو کوژراوە لە بەیتولمال دیەی بۆ دەدرێت [٤].

٦- کوژران لە قەرەبالّغیدا: ئەگەر کەسێك لە قەرەبالّغیەکدا کوژراو نەزانراکێ کوشتویەتی ئایا خوێنی بەفیڕۆ دەچێت؟ عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وا بوو کەدیەی ئەم کەسە لە بەیتولمال دەدرێت [٥] ئەوە بوو عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) دەربارەی دوو کەس کە لە قەرەبالّغیەکدا گیانیان لە دەست دا بو نووسی: با لە بەیتولمال دیەیان بۆ بدرێت، چونکە بوون بە ژێر دەست و قاچی خەلّکەوە [٦].

---

[١] - مضف عبدالرزاق(١٠ / ١١).

[٢] - هەمان سەرچاوە (٩ / ٣١٨).

[٣] - هەمان سەرچاوە (١٠ / ١٦ - ١٧).

[٤] - هەمان سەرچاوە (٩ / ٤٥٩).

[٥] - فقه عمر بن عبدالعزیز(٢ / ٣٦).

[٦] - المحلی(١٠ / ٨ / ٤).

## سێ یەم: دەربارەی دیە[1] بە هەموو جۆرەکانیەوە:

١- **بڕی دیە:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) نامەیەکی بۆ سەرکردەکانی سوپا نووسی کە دیە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا دا(ﷺ) سەد حوشتر بووە[2].

٢- **دیەی زمان:** لە سولەیمانی کوڕی موساوە ئەڵێ: لەنامەی عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) دا بۆ سەربازەکانی هاتبوو: ئەگەر هێندە لە زمان بڕابو کە نەتوانرێت قسەی پێ بکرێت، ئەوە دیەی تەواوی دەکەوێت ئەگەر لەوەش کەمتر بوو ئەوە بەئ ئەندازەی خۆی دیاری دەکرێت[3].

٣- **دیەی دەنگ و قورگ:** دیارە قورگ سەرچاوەی دەنگە و لەناو بردنی دەبێتە هۆی نەمانی دەنگ وقسە، هەر بۆیە عومەر پێی وابوو کە ئەگەر بە هۆی لێدانەوە دەنگی کەسێك نەما و نەیتوانی قسە بکات ئەوە دیەی تەواوی دەکەوێت[4]، هەروەها لێیەوە هاتووە کە وتویەتی ئەگەر قورگ بڕدرا و دەنگ نەما ئەوە دیەی تەواوی دەکەوێت[5].

٤- **دیەی زەکەر:** هەرچی زەکەریشە ئەوە لەبەرگرنگی بۆ پیاو، چونکە بە نەمانی ئارەزووی پیاو نامێنێت و ناتوانێ وەچەبخاتەوە، ئەوە عومەر پێی وابوو کە دیەی تەواوی دەکەوێت، بەلام ئەگەر لەوە کەمتر بوو ئەوە بە پێی ڕێژەی بڕینەکە دیەی پێ دەدرێت[6].

٥- **دیەی لابردنی پەردەی کچێنی:** ئەگەر پیاوێك پەردەی کچێنی ئافرەتێکی لابرد بەهۆی جوتبوونەوە ئەوە لەوانەیە ببێتە هۆی نەمانی ئارەزووی جوت بوون لەوانەشە منداڵی لێ پەیدا ببێت، لەبەر ترسناکی ئەم کارەش عومەر دیەی تەواوی بۆ بڕیارداوە، لە ڕیوایەتێکیشدا هاتوە کەسێ یەکی دیەی بۆ بڕیارداوە[7]، ئەشتوانین بەم شێوە ئەم دوو ڕایە کۆبکەینەوە و بڵێین عومەر دیەی تەواوی داناوە بۆ نەهێشتنی پەردەی کچێنی ئەگەر بوە هۆی منداڵ بوون و لە

---

[1] - دیە: ئەو پارەیە کە وەك خوێن بەکەسوکاری کوژراو دەدرێت.

[2] - مصنف ابن ابي شيبة(٩ / ١٢٨).

[3] -المصنف لعبدالرزاق(٩ / ٣٥٧) فقه عمر(٢ / ٦٦).

[4] - فقه عم بن عبدالعزيز(٢ / ٦٩).

[5] - مصنف ابن ابي شيبة(٩ / ١٧٠ ) فقه عمر(٢ / ٦٩).

[6] - مصنف عبدالرزاق( ٩ / ٣٧٢).

[7] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٧٦).

دەست دانی ئارەزوی جوت بوونی، سیٚ یەکی دیەشی بۆ بڕیارداوە ئەگەر نەبووە هۆی لە دەست دانی ئارەزوو و جوت بوون و منالبون [1]..

٦- **دیەی لوت:** بە هۆی ئەو سوود و کەلکانەی کە لوت بە مرۆڤی دەگەیەنیٚت، وەك هەناسەدان و بۆن کردن و جیاکردنەوەی بۆنەکان و ئەو جوانیەی کە بە ڕوومەتی دەبەخشیٚت و ئەو شیٚوانەی کە تووشی دەم و چاو دەبیت بە بڕینی، جگە لەوەی کە عەرەب لوت شکاندن بە گەورەترین سووکایەتی دەزانن، بۆیە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) دیەی تەواوی بڕیار دا بۆ بڕینی لەبنەوە، ئەگەر لەوەش کەمتر بو ئەوە بە ئەندازەی بڕینەکەی دیەی پیٚ دەدریٚت [2].

٧- **دیەی گویٚ:** بەو پیٚیەی کە گویٚ نیوەی سوودی بیستن بە مرۆڤ دەگەیەنیٚت و هەموو مرۆڤیٚکیش دوو دانە گویٚی هەیە بۆیە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) پیٚی وابوو کە ئەگەر گویٚ بڕدرا یان لە کار خرا وتوانای بیستنی نەما ئەوە نیوەی دیەی ئەکەویٚت [3].

٨- **دیەی قاچ:** بە حوکمی ئەوەی کە مرۆڤ بەهۆی دوو قاچەوە دەڕوات و بەیەك قاچ کەم ئەندامە و ناتوانیٚ بڕوات بەڕیٚگادا، عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) دیەی قاچی بەنیو دیە دیاری کردووە بەو پیٚیەی کە مرۆڤ دوو قاچی هەیە.

٩- **دیەی نیٚوان هەردوو برۆ:** هەندیٚ وردەکاری هەیە لەمەسەلەی دیەدا کە زانایان پیٚش عومەری کوڕی عبدالعزیز باسیان نەکردوە، بەلاّم عومەر ڕای خۆی لەبارەوە دەربڕیوە، لەو مەسەلانەش دیەی شکانی نیٚوان دوو برۆ و ڕوشانی دەم چاو بەبیٚ ئەوەی ئیٚسکی بشکیٚت [4]، لەم بارەشەوە وە ئەلیٚ: ئەگەر نیٚوان هەردو برۆشکا و دەم و چاو شیٚوا و نەگەشتە سەر ئیٚسك ئەوەیەك لەسەر چواری دیەی دەکەویٚت [5].

١٠- **دیەی نیٚوچەوان – تەویٚلّ – ئەگەر شکیٚنرا:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) دەربارەی نیٚوچەوان ئەگەر شکیٚنرا ئەلیٚ: ئەگەر ناوچەوان شکیٚنرا و چالّ بوو ئەوە سەدو پەنجا دیناری دەکەویٚت [6].

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٨٠).

[2] - مصنف ابن ابي شيبة(٩ / ٢٠٩).

[3] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٨٨).

[4] - مصنف عبدالرزاق(٩ / ٣٢٠).

[5] - هتمان سترضاوة(٩ / ٢٩١).

[6] - مصنف عبدالرزاق(٩ / ٣٦١). مصنف ابن ابي شيبة(٩ / ١٧٩).

١١- **دیەی چەناکە :** ئەگەر چەناکە شکێنرا ئەوە عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کەیەك لەسەر سێ ی دیەی ئەکەوێت و لەم بارەیەوە ئەڵێ: بۆ چەناکە سێ یەکی دیە پێویست دەبێت [1]، بەم شێوەیە عومەر بە ئیجتیهاد و ڕای دروستی خۆی بڕیار لەسەر چەند مەسەلەیەك دەدات کە پێشتر کەس بڕیاری لێ نەداوە، لەوانە دیەی چەناکە ئەگەر شکێنرا ئەوە سێ یەکی دیەی دەکەوێت لەبەر گرنگی، چونکە لەگەڵ شکانیدا ناتوانرێت خواردن بخۆرێت و دەم بکرێتەوە، دیارە ئەم ڕایەش تەنها لە عومەرەوە هاتووە.

١٢- **دەربارەی دیەی پەنجەکان :** لەبەر گرنگی پەنجەکان بە تایبەت پەنجەی دەست، عومەر پێی وا بوو کە هەر پەنجەیە کی دەست یان قاچ دەیەکی دیەی دەکەوێت، بۆ هەر ئێسکێکی پەنجەش سێ یەکی دیەی پەنجە دەدرێت جگە لە پەنجەی گەورەی دەست و پێ، چونکە لە دوئێسك پێك دێت و هەر ئێسکە و دیەی نیو پەنجەی دەکەوێت، لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە: بۆ هەر پەنجەیەك دە حوشتر یان هاوتای ئەوە لە زێڕ یان پارە دەدرێت [2].

١٣- **دیەی نینۆك :** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) نینۆکیشی لەبیر نەچووە و بۆ کەوتنی یاخود ڕەشبوونەوەی دەیەکی دیەی پەنجەی بڕیارداوە کە دە دینار دەکات [3]، ئەوەتا لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە کە ئەگەر نینۆك کەوت یان ڕەش بوویەوە ئەوە دەیەکی پەنجەی دەکەوێت کە دە دینارە [4].

## چوارەم: حەدد و سزاکان:

١- **گرنگی جێبەجێ کردنی حەددەکان :** دیارە جێبەجێ کردنی حەددەکان دەبێتە هۆی پاراستنی گیان و سەرو ماڵ و ناموسی موسڵمانان و هێمنی و ئارامی باڵ ئەکێشێت بەسەر وڵاتیاندا، بۆیە عومەری کوڕی عبدالعزیز جەختی لەسەر جێبەجێ کردنی حەدد و سزاکان دەکردەوە و لە ڕوی گرنگیەوە خستبویە ڕیزی نوێژ و ڕۆژووەوە [5]، ئەوە بوو عومەر نوسی: جێبەجێ کردنی حەددەکان لەلای من وەك بەرپا کردنی نوێژ و زەکات وایە [6].

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٩٦).

[2] - هەمان سەرچاوە(٢ / ١٠٠).

[3] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٠٢).

[4] - هەمان سەرچاوە(٢ / ١٠٣).

[5] - هەمان سەرچاوە(٢ / ١١١).

[6] - الطبقات الكبرى(٥ / ٣٧٨).

٢- **دەربارەی قەدەغەکردنی پاشگەزبوونەوە لە حەددەکان دوای گەشتنی بە ئیمام و پیشەوا:** عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە مەسەلەی حەددەکان ئەگەر بەرزکرایەوە بۆ پێشەوایان دادوەر ئەوە بواری پاشگەزبوونەوە لێی نامێنێ، بەڵکو دەبێ ئەو حەددەی کە بڕیار دراوە جێبەجێ بکرێت [١].

٣- **دەربارەی کۆبوونەوەی چەند حەددێك لەسەر یەك کەس:** لەوانەیە کەسێك چەند تاوانێك ئەنجام بدات وەك ئەوەی لەیەك کاتدا زینا و دزی و کوشتن ئەنجام بدات، ئایا لەم کاتەدا تەنها کوشتنەوەی بەسە لەبری هەموو تاوانەکان؟ یان دەبێ هەموو حەددەکانی تری بەسەردا جێبەجێ بکرێت و پاشان بکوژرێت؟ ئەو ڕیوایەتەی کە لە عومەرەوە هاتووە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دەبێ سزاو و حەددەکانی بەسەردا جێبەجێ بکرێت پاشان بکوژرێت [٢].

٤- **دەربارەی نەبڕین و لە خاچ نەدانی کەس بەبێ گەڕانەوە بۆ خەلیفە:** عومەری کوڕی عبدالعزیز پێ ی وابوو کە پێویستە لەسەر والی و کاربەدەستەکان کەلەمەسەلەی کوشتن و لە خاچ دان – لە سێدارەکاندا – بگەڕێنەوە بۆ خەلیفە و ئەو کارە نەکەن هەتاوەکو مۆڵەت لە خەلیفە وەرنەگرن بۆی [٣].

٥- **بەمەرجی داناوە بۆ جێبەجێ کردنی حەددی(قزف) تۆمەتبار کردن بە زینا کە تۆمەتبار کراو موسڵمان بێت،** عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە حەدد لەسەر ئەو کەسە پێویست نابێت کە بێ باوەڕێکی تاوانبار کردبێت بە زینا، چونکە بێ باوەڕی لە زینا گەورەترە، و ئەگەر کەسێك باوەڕی نەبێت ئەوە هیچ پێویست ناکات کە پاکێتی لەم تاوانە بسەلمێنرێت، چونکە لەوتانە خراپتری تێدایە کە بێ باوەڕیە [٤]. طارقي کوڕی عبدالرحمن و مطرف ی کوڕی طریف ئەلێن: لای شەعبی بوین و دوو پیاویان هێنایە لای، کە یەکێکیان موسڵمان و ئەوی تریان گاور بوو، هەریەکەیان ئەوی تریان ی تۆمەتبار کرد بو بە زینا، ئەویش هەشتا جلدی دا لە گاورە کەلەبەر ئەو تۆمەتەکەی دا بویە پاڵ موسڵمانەکە بە گاورەکەشی وت: تۆلەو تۆمەتە خراپتر تیایە کە بێ باوەریە و، حەددی نەدا لە موسڵمانەکە، ئەم دادوەریەش بەرزکرایەوە بۆ عبدالحمیدی کوڕی زەید، ئەویش ئەمەی لەنامەیەکدا نووسی بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز و باسی ئەو کارەی شەعبی بۆ کرد، عومەریش نامەیەکی نووسی و کارەکەی شەعبی پێ باش

---

[١] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١١٣).

[٢] - هەمان سەرچاوە(٢ / ١١٧).

[٣] - هەمان سەرچاوە(٢ / ١٢٠). سيره عمر، لابن عبدالحكم، ل: ١١٤ – ١١٥.

[٤] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٣٠).

بوو [١]. بەم شێوەیە عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وا بوو کە حەدد لەسەر ئەو کەسە جێبەجێ ناکرێت کە تۆمەت بۆ بێ باوەڕێك هەڵبەستێت، چونکە لەو تۆمەتە خراپتری تیایە کە بێ باوەڕیە و ئەگەر ئەو کارەشی تیا بێت ئەوە لە بێ باوەڕیەکەی کەمترە کە بە ئاشکرا تیایدایە [٢].

٦- **هەڵنەگرتنی حەد لەسەر باوكێك كە كوڕەكەی تۆمەتبار بكات:** ئەگەر باوکێك کوڕەکەی تۆمەتبار کرد بەزینا ئایا حەددی بەسەر دا جێبەجێ دەکرێت یان نا؟ ئایا باوك بۆی هەیە کە کوڕەکەی تۆمەتبار بکات بەشتێك کە تیایدا نەبێت؟ ئایا ئەگەر حەددی لەسەر پێویست بوو لێخۆشبوونی کوڕەکەی لێی لەسەری هەڵدەگیرێت؟ عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە ئەگەر کەسێك تۆمەتێکی دایە پاڵ کوڕەکەی ئەوە حەددی لەسەر پێویست دەبێت، بەڵام ئەگەر کوڕەکەی لێی خۆشبوو ئەوە ئەو حەددەی بەسەردا جێبەجێ ناکرێت [٣]. لە ئەبی جەریحەوە ئەڵێ: ڕوزەیق(فەرمانڕەوای ئەیلە) ئاگاداری کردمەوە کە نامەیەکی نووسیوە بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) دەربارەی پیاوێك کە بوختانی بۆ کوڕەکەی کردووە ئەویش بۆ نووسی حەدد جێبەجێ بکەن بەسەر باوکەکەدا ئەگەر کوڕەکەی لێ خۆش نەبوو [٤].

٧- **سزای تۆمەت هەڵواسین بۆ ئافرەتێكی گاور كە هاوسەری پیاوێكی موسڵمان بێت:** ئەگەر ئافرەتێکی گاور هاوسەری پیاوێکی موسڵمان بوو ئەوە تۆمەتبارکردنی سزای لەسەرە، چونکە ئەو تۆمەتە پیاو و کوڕە موسڵمانەکەشی ئەگرێتەوە بۆیە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) جەڵدی کەمتر لە حەددی دەدا لەو کەسەی کە تۆمەتباری دەکرد [٥].

لە ئەبی ئیسحاقی شەیبانییەوە لە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) ەوە ئەگێڕێتەوە کە عومەر سی و ئەوندە قامچی دا لە پیاوێك کە ئافرەتێکی گاوری تۆمەتبار کردبوو بەزینا کە خاوەنی کوڕێکی موسڵمان بوو [٦]. زوهریش لەم بارەیەوە هاوڕایە لەگەڵ عومەردا، قەتادە ئەڵێ: حەددی لێ دەدرێ

---

[١] - مصنف عبدالرزاق(٦ / ٦٤ – ٦٥).(٧ / ١٣٠ – ١٣١)

[٢] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٣٠).

[٣] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٣٣).

[٤] - مصنف ابن ابي شيبة(٩ / ٥٠٤).

[٥] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٣٦).

[٦] - مصنف عبدالرزاق(٧ / ١٣٠).

[1]، بەڵام پێشەوایانی هەر چوار مەزهەبەکە کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە حەددی لێ نادرێت، بەڵام مالیکیەکان وتویانە: تەمیێ دەکرێ لەبەر منداڵە موسڵمانەکانی [2].

٨- **دەربارەی ئەو ژنەی کە پیاوێك تۆمەتبار دەکا بەوەی زۆری لێ کردووە بۆ ئەنجامدانی زینا لەگەڵیدا:** لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە کە ئافرەتێك هاتۆتە لای و وتویەتی: فلانەکەس زۆری لێ کردووم بۆ ئەنجامدانی کاری خراپە لەگەڵیدا، عومەریش وتی: ئایا کەس ئەمەی بینیوە یان بیستویەتی، وتی: نەخێر، پاشان عومەر جەڵدی لێ دا لەبری پیاوەکە [3]، ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە سزای زیناوە نیە، بەڵکو پەیوەندی بە بوختانەوە کردنەوە هەیە، چونکە ئەو ئافرەتەی کە لافی ئەوە لێدەدات کە پیاوێك زۆری لێ کردووە بۆ ئەنجامدانی کاری خراپە لەگەڵیدا بەم قسەیەی خۆی تۆمەتبار دەکات و حەددی لەسەر پێویست دەبێ، مەگەر بەڵگەیەك بێنێت و بەهۆیەوە حەددەکەی لەسەر لاببرێت وەك بیستنی دەنگ و قیژە لەوکاتەدا یان بینینی لەلایەن کەسێکەوە بۆیە عومەر ڕازی بوو بە جەڵد کردنی ئەگەر هیچ بەڵگەیەکی نەبوو زوهری و قەتادە و ڕەبیعە و یحیی ی کوڕی سەعیدی ئەنصاریش هاوڕان لەگەڵیدا لەم مەسەلەیەدا [4].

٩- **بڕینی دەستی دز لە پێش بردنی شتومەکە دزراوەکان:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) پێی وایە کە دەستی دز نابڕدرێت هەتاوەکو کەلوپەلە دزراوەکان لە شوێنی دزیەکە دەرنەکات، لەم بارەشەوە ئەڵێ: دەستی نابڕدرێت هەتاوەکو کەلوپەلە دزراوەکە لە ماڵ دەرنەکات [5].

١٠- **گۆڕ هەڵکەنیش دزە و شایانی ئەوەیە کە دەستی ببڕێت:** هەندێ خەڵك هەیە کە کاری وا دەکەن کە مرۆڤ قیزی لێ دەکاتەوە، تەنانەت مردوش لە گۆڕدا پارێزاو نیە لە دەستی هەندێ لەو لادەرانە و جۆرە دزێك هەیە کە گۆڕهەڵدەکەنێت و کفنی مردووە دەدزێت، ئەوەتا عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) پێی وایە کە گۆڕهەڵکەن دزە و شایانی دەست بڕینە، چونکە دزی لە مردوو وەك دزی لە زیندوو وایە ئەگەر خراپتر نەبێت، لە معمرەوە ئەڵێ: ئاگادارم کە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) دەستی گۆڕ هەڵدەرەوەیەکی بڕی [6].

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٧ / ١٢٦ — ١٣٠).

[2] - المغني(٨ / ٢١٦)، فقه عمر(٢ / ١٣٧).

[3] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٤٠).

[4] - المحلى(١١ / ٢٩١ — ٢٩٢).

[5] - فقه عم ربن عبدالعزيز(٢ / ١٤٦).

[6] - مصنف ابن ابي شيبة(١٠ / ٣٤).

١١- **سزای ئەوەکەسی کە بۆ جاری دووەم مەی دەخواتەوە:** لە عبادەی کوڕی نسی یەوە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز بینی کە حەددی دەدا لە پیاوێکی بە هۆی مەی خواردنەوە، ئەوە بوو جلەکانی لەبەرداکەند و هەشتا جەڵدی لیَ دا هەندێکی بریندار بوو و هەندێکی نەبوو پاشان پێی وت: ئەگەر دووبارەی بکەیتەوە دووبارە لێت دەدەمەوە و پاشان زیندانیت دەکەم هەتاوەکو چاك دەبیت، ئەویش وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران، تەوبە ئەکەم و هەرگیز دووبارەی ناکەمەوە، پاشان عومەر وازی لیَ هێنا [١].

١٢- **سزای ئەکەسەی کەمەی ئەگێڕێت:** ئەو کەسەی کە مەی دابین دەکات و ئەیفرۆشێت یان پێشکەشی دەکات بۆ کڕیارەکانی دەبیَ سزای لەو کەسانە کەمتر نەبێت کە دەیخۆنەوە، چونکە ئەو هۆکاری هێنان و گەیاندنیەتی بەوانەی کە دەیخۆنەوە، هەر بۆیە عومەر - ساقی مەی - مەی گێڕی لەگەڵی مەی خۆراندا سەزا دەدا [٢]. لە ابن التمیمی یەوە هاتووە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) خەڵکانێکی بینی کە مەییان دەخواردەوە و مەی گێڕێکیشی بینی و لەگەڵ ئەوان و جەڵدی لە ئەویش دا [٣].

١٣- **شکاندنی پەرداخ و کەلوپەلی مەی خواردنەوە:** لە هارونی کوڕی محمدەوە لە باوکیەوە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیزم(ﷺ) بینی لە خناصرە فرمانی دا بە شکاندنی گۆزەی مەی و شکاندنی قاپە شوشەکانی [٤].

١٤- **هێنانی مەی لەلایەن بیَ باوەڕانەوە بۆ ولاتی موسڵمانان:** ئەگەر بیَ باوەڕان مەی خواردنەوەیان لە ولاتی خۆیاندا بە حەلاڵ زانی ئەوە مافی خۆیانە، بەلاَم ئایا ئەگەر هەستان بە هێنانی بۆ ولاتی موسڵمانان ڕێیان پیَ دەدرێت؟ یاخود بوار دەدرێت بە دابین کردنی بۆیان بۆ خواردنەوەی لە ولاتی موسڵمانان دا؟ پێویستە لەسەر ئەو بیَ باوەڕانەی کە لە ولاتی موسڵمانان دان کە دان بەخۆیاندا بگرن و مەی نەخۆنەوە ئەگەر ئەیانەوێت لە ولاتی موسڵمانان دا بژین، چونکە هەموو دەوڵەتێك یاسای تایبەتی خۆی هەیە و پێویستە لەسەر ئەو کەسەی کە تیایدایە ڕەچاوی بکات، یاسای دەوڵەتی ئیسلامیش فرمانی خوای جیهانیانە و ئەمە لە پێشترە بۆ بۆ ڕەچاوکردن و پابەندبوون پێوەی، لەم ڕوانگەشەوە ئەبینین کە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) ڕێگری دەکرد لەوەی کە(ئەهلی ذیمە) - گاور و جواەکان -

---

[١] - الطبقات الكبرى(٥ / ٣٦٥)، فقه عمر(٢ / ١٥٧).

[٢] -فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٥٩).

[٣] - المصنف لعبد الرزاق(٩ / ٢٣٠).

[٤] - الطبقات الكبرى لابن سعد(٥ / ٣٦٥).

مەی لەگەڵ خۆیاندا بهێننە ناو دەوڵەتی ئیسلامەوە، ئەوە بوو عومەر لە خەلافەتی خۆیدا نووسی: نابێت ئەهلی ذیمە بەمەی یەوە بێنە ناو وڵاتی موسڵمانانەوە، ئەوانیش نەیان دەهێنا[1].

١٥- **سزای جادوگەر:** لە هەمامەوە لە یەحیاوە کە کاربەدەستی عومان نامەیەکی نوسی بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) دەربارەی جادوگەرێك، عومەریش بۆی نووسی: ئەگەر دانی بەو کارەدانا یاخود بەڵگەی هەبوو لەسەری بیکوژە[2]، ئەمەش مەزهەبی سێ لە پیشەوایانە ئەبو حەنیفە و مالك و ئەحمەد[3]، هەروەها عومەری کوڕی خەتتاب(رضي الله عنه) لە سەردەمی خۆیدا نامەیەکی نوسی بۆ هەموو کار بەدەستەکانی کە هەموو جادوگەرێکی ژن و پیاو بکوژن[4].

١٦- **تەوبەدا دانی کەسانی هەڵگەڕاوە:** موسڵمانان زۆر لە کەس ناکەن بۆ موسڵمان بوون، بەڵام ڕێگەش نادەن یاری بە ئاین بکرێت، جا هەرکەسێك بە ئارەزوی خۆی موسڵمان بوو یاخود بە موسڵمانی لە دایك بوو پاشان هەڵگەڕایەوە ئەوە عومەر پێ ی وابوو کە دەبێ داوای تەوبە کردنی لێ بکرێت و بانگەواز بکرێت بۆ ئیسلام بۆماوەی سێ ڕۆژ جا ئەگەر تەوبەی کرد و گەڕایەوە بۆ ئیسلام ئەوە لێی وەردەگیرێت ئەگەر ئەو کارەش نەکرد ئەوە دەدرێت لەگەردنی[5].

١٧- **شێوازی داوای تەوبەکردن لەهەڵگەڕاوە:** لە عبدالرحمن ی کوڕی ثابت ی کوڕی ثوبانەوە لە باوکیەوە ئەڵێ: من کاربەدەستی عومەری کوڕی عبدالعزیز بووم(رضي الله عنه) و نامەیەکم بۆ نووسی: کابرایەکی جولەکە موسڵمان بووە دواتر بووەتەوە بە جولەکە و لە ئیسلام پاشگەز بوەتەوە. عومەریش بۆی نوسیم: داوای موسڵمان بوونی لێ بکە ئەگەر موسڵمان بوو وازی لێ بێنە، ئەگەر نا ئەوە لەسەر تەختەیەك پاڵی بخە و دوبارە داوای موسڵمان بوونی لێ بکە، ئەگەر موسڵمان نەبوو بیبە ستەرەوە و شمشێر بنێ لەگەردنی، ئەگەر موسڵمان بوو ئازادی بکە، ئەگەر نا بیکوژە، ئەڵێ: منیش ئەم کارەم کرد و شمشێرم نایە گردنی و ئەویش موسڵمان بوو و پاشان ئازادم کرد[6].

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٦٤).

[2] - مصنف ابن ابي شيبة(١٢ / ٢٧٤).

[3] - روضة الطالبين(١٠ / ٧٥) حاشية ابن عابدين(٣ / ٢٨٩).

[4] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٨١).

[5] - المصنف لعبد الرزاق(١٠ / ١٧٦).

[6] - مصنف ابن ابي شيبة(١٠ / ١٤٠).

د. محمد شقير ئەڵێ: هیچ وتەیەکم نەبینیوە هێندە وردەکاری لەم مەسەلەیەدا کردبێت، چونکە چوار پێشەوا کە پێیان وایە کەسی هەڵگەڕاوە پاش داوای تەوبەکردن لێ ی و ڕازی نەبوونی ئەکوژرێت [1].

١٨- **سزای ئەو ئافرەتەی کە لە ئیسلام پاشگەز دەبێتەوە:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(﵁) ڕای وا بوو کە دەبێ ئافرەتی هەڵگەڕاوە داوای تەوبەکردنی لێ بکرێت، جا ئەگەر تەوبەی کرد ئەوە باشە، ئەگینا ئەکرێت بە کۆیلە و دەفرۆشرێت بەخەڵکانێك کە لەسەر ئاینی خۆی نەبن [2]، ئەمەش ڕای قەتادەیە و ئەڵێ: ئەگیرێت و ئەفرۆشێت ئەبو بەکریش هەمان کاری کرد بەرامبەر بە ژنی هەڵگەڕاوەکان [3]، لە حەسەنیشەوە هاتووە: ژنان مەکوژن ئەگەر پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام، بەڵکو بانگەوازیان بکەن بۆ ئیسلام ئەگەر ڕازی نەبوون ئەوە بیانکەن بە کۆیلە و مەیانکوژن.

## پێنجەم: تەعزیرەکان " تەمبێ کردن ":

١- **زۆرترین ڕێژەی لێدانی تەمبێ کردن:** سزادان بە هۆی جەڵدلێدانەوە ئەبێ بە دوو بەشەوە: حەدد و تەعزیر، حەدد دەقی لەسەر هاتووە و ئەندازە و بڕی دیاری کراوە و بواری زیاد و کەمکردنی تیایە نیە، بەڵام جەلدی تەعزیر " تەمبێ کردن " ئەوە سزایەکە بۆ ئەو تاوانانەی کە حەددیان لەسەر نیە، هەر تاوانێکیش حەددی بۆ دیاری نەکرابوو ئەوە دەسپێردرێت بە فەرمانڕەوایان دادوەر وەهەتاوەکو ڕێژەکەی دیاری بکات بەو جۆرەی کە بەشیاوی دەزانێت، بەڵام عومەری کوڕی عبدالعزیز(﵁) ڕێژەیەکی دیاری کردووە کە دروست نیە لەوە تێپەڕێت، ئەمەشی بە دوو شێوە لێوەهاتووە:

یەکەمیان: دروست نیە لەسی جەڵدە تێپەڕێت، لە محمدی کوڕی قەیسەوە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز(﵁) نامەیەکی نووسی بۆ کار بەدەستی خۆی لە میسردا کە نابێت سزادان لە سی قامچی تێپەڕ بکات مەگەر ئەو تاوانە حەددی لەسەر بێت [4].

لە ڕای دووەمیش دا هاتووە : کە نابێ جەلدی تەعزیز بگاتە کەمترین حەدد – کە چل جەڵدەیە – بە پێی ئەم ڕیوایەتەش دەبێ بۆ کەسی ئازاد لە سی و نۆ جەڵدە پێتەپەڕ نەکات و بۆ کۆیلەش لە نۆزدە جەڵدە تێپەڕ نەکات و، چونکە کۆیلە بیست و ئازاد چل جەڵدە کەمترین حەددە بۆیان [1].

---

١ - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٨٨).

٢ - الطبقات الكبرى لابن سعد(٥ / ٣٦٥)

٣ - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ١٨٩).

٤ - سيرة عمر بن عبدالعزيز، لابن الجوزي، ل: ١١٧.

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستەکانی: کە خەڵکی بە پێی تاوانەکانیان سزا بدەن، با یەك قامچیش بێت، وریاش بن هەرگیز نەیگەیننە ئاستی حەددەکان[2].

**٢- نەهی کردن لە دەستگیر کردنی خەڵکی بە هۆی گومانەوە یاخود لێدانیان بە هۆی تۆمەتەوە:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) پێی وایە کە دروست نیە کاربە گومان بکرێت، یاخود لەسەر تۆمەتێك لەکەسێك بدرێت، بەم پێیەش عومەر بنەمای دادگەری و لێکۆڵینەوەی دادگەرانەی چەسپاندوە و دژبە لێکۆڵینەوەی توند و توقێنەرە، ئەمەش بۆ ئەوەی ستەم لە کەسێکی بێ تاوان نەکرێت، هەروەها عومەری پێ باشتر بوو کە ئەوکەسانە بە ناپاکی بچنە بەردەم پەروەردگار لەوەی کە ئەو بە خوێنی ئەوانەوە بچێتە خزمەتی[3].

لە ئیبراهیمی کوڕی هشامی کوڕی یەحیای غەسسانیەوە ئەڵێ: باوکم لە باپیرمەوە بۆی باسکردم وتی: کاتێ کە عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) کردمی بە والی موسڵ، منیش چوومە ئەوێ و بینیم لە هەموو شوێنێك زیاتر دزی و ماندوێتیادا ئەبینرێت منیش نامەیەکم نووسی بۆ عومەر و باردۆخی شارەکەم بۆ باسکرد و پرسیارم لێکرد دەربارەی کارکردن بە گومان و لێدانی خەڵکی بەهۆی تۆمەتەوە یاخود کار بە بەڵگە بکەم، ئەویش بۆی نووسیم: کە کار بەبەڵگە بکە وەك نەریتی هەمیشەیی موسڵمانان، چونکە ئەگەر دادگەری و حەق باشیان نەکات ئەوە خوا باشیان بۆ نەکات، یەحیا ئەڵێ: منیش بەو شێوەم کرد کاتێ ئەوشارەم بە جێهێشت بوو بەباشترین شار و کەمترین دزی و ماندوێتی تیادا دەبینرا[4].

هەروەها عدی کوڕی ئەرطأة نامەیەکی نووسی بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه):... پاشان خوای گەورە ئەمیری باوەڕداران چاکتر بکات، پێش من کار بەدەستانێك هەبوون کە ڕێژەیەکی زۆر پارەیان لە بەیتولمال بۆ خۆیان بردووە و ناتوانم لێیان وەرگرمەوە ئەگەر ئازاریان نەدەم، جا ئەگەر ئەمیری باوەڕداران ڕێگەم بدات ئەو کارە دەکەم، عومەریش وەڵامی دایەوە: زۆر سەرسامم بەوەی کە تۆ داوای مۆڵەتم لێ دەکەیت بۆ ئازاردانی مرۆڤەکان، وەك ئەوەی من بتوانم تۆ لە سزای خوا بپارێزم یاخود ڕازی بوونی من لە توڕەیی و خەشمی خوا ڕزگارت بکات. خۆت سەرنج بدە و بزانە کێ بەڵگەیەکی تەواوی لەسەر هەیە یاخود خۆی دانی نا بەشتێك دا ئەوە دادگایی بکە،

---

[1] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ١١٧.

[2] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٢١٢).

[3] - حلية الاولياء(٥ / ٢٧١)، سيرة مر بن عبدالعزيز، لابن الجوزي، ل:(١١٧ – ١١٨).

[4] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، لابن الحكم، ل: ٥٥.

هەرکەسێکیش نکولی کرد سوێندی بدە بەخوا پاشان ئازادی بکە، چونکە ئەگەر ئەوان بە ناپاکیەوە بچنە بەردەم پەروەردگار پێم باشترە لەوەی من بە خوێنیانەوە بچمە خزمەتی[1].

بەم شێوەیە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) بڕیاری گرتنەبەری لێکۆڵینەوەی دادگەرانە دەدات لەبری لێکۆڵینەوەی توند و تیژ. عطاء و عومەری کوڕی خەتابیش دژ بە کارکردن بە گومان و لێدان لەسەر تۆمەتن هەتاوەکو بەڵگەی تەواوی لەسەر نەبێت[2].

٣- **نەهی کردن لە سزادان بەسەر و ڕیش تاشین:** سەرتاشین دروشم و سونەتێکی ئیسلامە، لە حەج و عومرەدا، بەڵام هەندێ خەڵك پێچەوانەی ئەمە وەستاون تاشینی سەرو ڕیشیان وەك سزایەك بەکارهێناوە، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش نەهی لەم کارە دەکات و بە(مُثلة) و(پێ نواندن) ناوی دەبات[3]. ئەوەبوو عومەر نامەیەکی نوسی بۆ کاربە دەستێکی خۆی: کە ئاگادار بە کەس بەتاشینی سەر وڕیشی سزانەدیت[4] مەزهەبی چوار پێشەوا کەش پێیان وایە کە دروست نیە کەسێك سزا بدرێت بە تاشینی ڕیشی، لای مالیك و ئەبو حەنیفەش: نابێ سەربتاشرێت[5].

**شەشەم: دەربارەی حوکمی زیندانەکان:**

١- **پەلەکردن لە دادگایی کردنی تۆمەتباراندا:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) فەرمانی دا بە پەلەکردن لە دادگایی کردنی تۆمەتباراندا، هەر کەس پێویستی بە تەمێی کردن هەیە تەمێ بکرێت و ئازاد بکرێت، هەرکەسێکیش هیچی لەسەر ساغ نەبوویەوە ئازاد بکرێت، هەروەها پێی وابوو کە جێبەجێ کردنی حەدەکان هۆکارە بۆ کەمبوونەوەی زیندانیەکان، چونکە دەبێتە بەربەستێك لەبەردەم خەڵکی خراپەکادا و ئەیانگێڕێتەوە لە خراپە[6].

لە جەعفەری کوڕی برقانەوە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆی نووسین: ئەگەر فەرمان بدەیت بە جێبەجێ کردنی حەددەکان ئەوە خەڵکی ناوزیندان کەم دەبێتەوە و خەڵکی خراپەکاریش ئەترسن و واز لە خراپەکاری ئەهێنن، چونکە خەڵکی ناو زیندان بەهۆی درەنگ دادگایی کردنیانەوە

---

[1] - مصنف عبدالرزاق(١٠ / ٢١٧ — ٢١٩) فقه عمر(٢ — ٢١٣).

[2] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٢١٥).

[3] - الطبقات الكبرى(٥ / ٣٨٠).

[4] - مغني المحتاج(٤ / ١٩٢) جواهر الاكليل(٢ / ٢٢٥).

[5] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٢٢٥).

[6] - الخراج لابي يوسف، ل:(٣٠١)، فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٢٢٥).

زۆر دەبن و کێشەکانیان نادرێت بە دادگا، تۆش فەرمان بدە بە والیەکانت کە پەلە بکەن لە لێکۆڵینەوە لە دۆسیەی زیندانیەکان، جا هەرکەس پێویستی بە تەمیێ کردن هەبوو تەمیێ بکرێت و ئەگەر بێ تاوانیش بوو ئازادی بکەن.

٢- **گرنگیدان بە کاروباری زیندانەکان:** عومەری کوڕی عبدالعزیز لە هەموو ڕوویەکەوە چاکسازی ئەنجامدا و لە هەمو بوارەکاندا دادگەری چەسپاند، گرنگیەکی باشیشی دەدا بە کاروباری زیندانیەکان و ڕێنمایی دەکرد بۆ خزمەتکردن و دابین کردنی خواردن و جل و بەرگ بۆیان [١].

لە جەعفەری کوڕی برقانەوە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز نووسی: لە ماڵی خێر وزەکات هێندەیان بۆ سەرف بکەن کە بەشی خواردن و پێویستیان بکات.. فەرمان بدە بەدانانی بڕێك پارە بۆیان بۆ خواردن و پێویستیان و مانگانە بڕێك پارە یان پێ بدە بۆ ئەم مەبەستە، چونکە تۆ ئەگەر تەنها نانیان پێ بدەی ئەوە بەرپرسی زیندان و پۆلیسەکان، لێیان قەدەغە دەکەن، ئەم کارەش بسپێرە بە کەسێکی چاك و باوەڕدار و با مانگانە ئەو بڕ پارەیان پێ بدات، دانیشێت و یەك بە یەك بانگیان بکات و پارەکە بدات بە دەستیانەوە... جل و بەرگیشیان لە هاویندا کراس و شەڕواڵێکە و لە زستانیشدا کراس و پۆشاکێکە، بۆ ئافرەت میقنەعە و لە چکێکیشی لەگەڵدایە... هەر کەسێکیشیان مرد و خزم و سەرپەرشتیاری نەبوو ئەوە شتن و کفن کردنی لەسەر بەتیولمالە و پاشان نوێژی لەسەر بکەن و بەخاکی بسپێرن [٢].

هەروەها نامەیەکی نووسی بۆ ئەمیری سەربازەکان: بزانن کێ لە زیندان دایە و حوکمی دراوە.. چاودێری نەخۆشی ئەوانەی بکەن کە خزمە و پارەیان نیە... بشزانەکێ دەکەیتە بەرپرسی زیندان کەسێك بێت متمانەت پێی هەبێت و بەرتیل وەرنەگرێت، چونکە هەرکەس بەرتیل وەرگرێت هەموو کارێکی خراپ دەکات.

٣- **زیندانێکی تایبەت بە ئافرەتان:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) بەردەوام هەنگاوی دەنا بۆ ڕێکخستنی زیندانەکان و گرنگیدان بە کاروباری زیندانیەکان و چاودێری کردنیان ئەوە بو فەرمانی دا بە دانانی زیندانێکی تایبەت بە ئافرەتان هەتاوەکو لەگەڵ پیاواندا تێکەڵا و نەبن، ئەمەش دانانی خەڵکانی ئایندار و ئەمانەت پارێز دوو پات دەکاتەوە هەتاوەکو کاروباری زیندانەکان لە ئەستۆ بگرن [٣]، هەروەها عومەر نامەی نووسی بۆ ئەمیری سەربازەکان: بزانن

---

[١] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٢٢٦).

[٢] - الخراج لابي يوسف، ل: (٣٠٠ – ٣٠١).

[٣] - الطبقات الكبرى، لابن سعد(٥ – ٣٥٨).

کیّ لە زینداندایە و حوکمی دراوە، باچاوەڕوان نەکات و حوکمەکەی بەسەردا جێبەجیّ بکەن، هەرکەسێکیش مەسەلەکەی ڕوون نەبوو لاتان و دەرکەوت کە بەدکارو خراپەکارە ئەو زیندان سزایە بۆیان، بەلاّم زیادەڕەوی مەکەن لە سزادان دا، ئەو کەسەش خزمەت بکەن کە نەخۆش دەکەوێت و پارە وخزمی نیە، ئەگەر خەلّکانێکیشت لەسەر قەرز زیندانی کرد ئەوە لەگەلّ خەلّکی خراپەکاردا پێکەوە دایان مەنیّ و لە یەك زینداندا کۆیان مەکەرەوە، بۆ ژنانیش زیندانێکی تایبەت دروست بکە، کەسێکیش دابنیّ بۆ سەرپەرشتی زیندان کە متمانەت پێی هەبێت و بەرتیل وەرنەگرێت، چونکە هەرکەس بەرتیل وەرگرێت هەموو کارێکی پیّ دەکرێت [1].

لەمەوە تێبینی ئەوە دەکەین کە گرنگی داوە بە زیندانیەکان و سوور بووە لەسەر دادگەری لەگەلّیاندا و چاککردنەوەی ئەو شتانەی کە خەلّکانی پێش خۆی خراپەیان کردبوو.

**حەوتەم: دەربارەی حوکمەکانی جیهاد:**

١- **تەمەنی ئەو کەسەی کە ڕێی پیّ دەدرێت بەشداری بکات لە جەنگدا:** لاوانی ئەوەی یەکەمی موسلّمانان کیّ بەرکێیان دەکرد بۆ بەشداری کردن لە جەنکدا و ئەکەر یەکێکیان ڕێی پیّ نەدرایە ئەوە داخ و حەسرەتی هەلّدەکێشا و هەولّی دەدا بۆ قایل کردنی وەلی ئەمر و کاربەدەستی موسلّمانان بەوەی کە توانای جەنگی هەیە. عومەری کوڕی عبدالعزیز یش تەمەنی ئەو کەسەی بە پانزدە سالّ دیاری کرد کە ڕێی پیّ دەدا بۆ بەشداری کردن لە جەنگ دا و موچەی بۆ دەبڕیەوە، هەرکەسێکیش لەوە کەمتر بوایە بە مندالّی دادەنا و ڕێی پیّ نەدەدا کە بەشداری بکات لە جەنگدا [2].

٢- **چۆنێتی دەست پیّ کردنی جەنگ دژی خەلّکانی غەیرە موسلمان:** لە صفوانی کوڕی عەمرەوە ئەلّیّ: نامەی عومەری کوڕی عبدالعزیزمان بەدەست گەشت کە بۆ کار بە دەستێکی ناردبوو لە کاتێکدا کە خەلیفە بوو تیایدا هاتبوو: کوشتاری هیچ قەلاّیەکی ڕۆم و هیچ کۆمەلّێکیان نەکەی هەتاوەکو بانگهێشتیان دەکەی بۆ ئیسلام، جا ئەگەر پێی ڕازی بوون ئەوە وازیان لیّ

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٢٢٨).

[2] - الطبقات الكبرى(٥ / ٣٥٦) فقه عمر(٢ / ٢٢٨).

بێنە وئەگەر ڕازیش نەبوون سەرانەیان لێ وەرگرە، ئەگەر بەوەش ڕازی نەبوون ئەوە هێرشیان بۆ بکە [1].

٣- **دەربارەی ماوەی مانەوە لە جیهادا – رباط –:** مانەوە لە جەنگ و سەنگەدار – رباط – لە پێناوخوادا یەکێکە لە خۆشەویسترین کردەوەکان بەلای خواوە و پاداشتێکی زۆری لەسەرە، عومەری کوڕی عبدالعزیز یش پێی وایە کەماوەی رباط چل ڕۆژە، لەم بارەیەوە ئەڵێ: رباطی تەواو چل ڕۆژە [2].

٤- **دەربارەی حوکمی مامەڵەکردنی جەنگاوەر لە ماڵ و سامانی خۆیدا:** عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەڵێ: ئەگەر پیاوێك لە جەنگدا بوو بەسەر پشتی ئەسپەکەیەوە دەجەنگا ئەوە هەرکارێکی بە پارە و پوڵی خۆی کرد دروستە [3].

٥- **فرۆشتنی ئەسپ بە دوژمن:** فرۆشتنی چەك و گواستنەوەی یاخود فرۆشتنی ئەسپ و هەر کەرەستەیەك کە دوژمنان بەهێز دەکات لە جەنگدا دژ بە موسڵمانان، تاوانێکە بۆ هەرکەسێك کە بیکات و پێویستە ئەم کەلوپەلانە و هاوشێوەکیان قەدەغەبکرێت هەتاوەکو نەگات بە دەستی دوژمن، لەم ڕوانگەشەوە عومەری کوڕی عبدالعزیز ڕێی نەدا بە ناردنی ئەسپ بۆ هیند، بەو پێیەی کە یەکێکە لە ولاتانی بێ باوەڕ و بە دوژمنی ولاتی ئیسلامی دادەنرێت [4].

٦- **فیدیەدان بۆ ڕزگار کردنی دیلی موسلمانان بە هەر نرخێك بێت:** عومەری کوڕی عبدالعزیز جەختی دەکردەوە لەسەر پێویستی ئازاد کردنی دیلە موسڵمانەکان، ئەمەش لەو نامانەدا هاتبوو کە ئاراستەی کار بەدەستانی دەکرد و داوای لێ دەکردن کە بە هەر نرخێك بێت ئەو کارە بکەن، ئەوە بوو عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ هەندێك لەکارە بەدەستەکانی کە فدیەبدە بۆ ئازاد کردنی دیلە موسلمانەکان ئەگەر چی ئەوکارە هەموو پارە کانیشتانی پێویست بێت [5]. لە ڕەبیعەی کوڕ عطاء وە لە عومەری کوڕی عبدالعزیز ەوە هاتووە کە دە دیلی ڕۆمی لەگەڵ یەك دیلی موسڵماندا ئاڵوگۆڕ کردووە [6]. لە ڕوایەتێکی

---

[1] - فقه عمر(٢ / ٤١٥) د. شقير

[2] - الطبقات الكبرى(٥ / ٣٥٥).

[3] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣٥٥) فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٢٤).

[4] - الطبقات الكبرى لابن سعد(٥ / ٣٥٢).

[5] - فقه عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٤٢٧).

[6] - حلية الاولياء(٥ / ٣١١ – ٣١٢).

تریشدا هاتووە: کە فدیە بۆ دیلە موسڵمانەکان بدەن ئەگەر چی هەموو پارەکانیشتانی پێویست بێت [1].

٧- **فدیەدان بۆ پیاو و ژن و کۆیلە و ژیمی:** لە ڕەبیعەی کوڕی عطاء وە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی لەگەڵ نووسیم و بڕێك پارەی نارد بۆ کەناری عەدەن و لە نامەکەدا هاتبوو: کە فدیە بۆ ئازاد کردنی پیاو و ژن و کۆیلە و ذیمی بدە [2]. لەمەی پێشەوە دادگەری عومەری کوڕی عبدالعزیز بەڕوونی دەردەکەوێت کاتێك فەرمانی دا بە فدیەدان بۆ هەرکەسێك کە لەسەر زەوی موسڵماناندا دەژی ئەگەر چی کۆیلەیان ذیمیش بێت، چونکە ذیمی دەبێ بپارێزێ و بەرگری لێ بکرێت و فدیەی بۆ بدرێت ئەگەر بە دیل گیرا، ئەمەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەمەکداری بێ سنووری موسڵمانان بۆ ئەو پەیمانەی کە بە ئەهلی ذیمەیان داوە [3].

٨- **باش نەبوونی کوشتنی دیل:** لە موعەممەرەوە ئەڵێ: پیاوێك لە خەڵکی شام لەوانەی کە پاسەوانی عومەری کوڕی عبدالعزیز یان دەکرد باسی بۆ کردم و وتی: هەرگیز نەمبینیوە عومەری کوڕی عبدالعزیز دیلی کوشتبێت، تەنها یەك دیلی تورك نەبێت، ئەڵێ: چەند دیلیکی تورکیان هێنا، عومەریش فەرمانی کرد کە بکرێن بە کۆیلە، یەکێکیش لەو پیاوانەی کە هێنا بوونی وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران ئەگەر بتبینیایە ئەمە چۆن موسڵمانەکانی دەکوشت ئەوە زۆر دەگریای بۆیان، عومەر فەرمووی: بڕۆ پێشەو لێ و بیکوژە ئەویش هەستا بۆی و کوشتی [4].

بەم شێوەیە عومەری کوڕی عبدالعزیز کوشتنی دیلی پێ باش نەبوو و ئەم کارەی قەدەغە کرد بوو جگە لە یەك دیل کە ژمارەیەکی زۆر موسڵمانی کوشتبوو، بەڵام ڕێی دەدا بە کۆیلە کردنیان [5].

### هەشتەم: دەربارەی مارەبڕین و تەلاق:

١- **مارەکردنی ئافرەت بە بێ سەرپەرشتیار:** لە سوفیانەوە لە پیاوێکی خەڵکی جزیرەوە لە عومەری کوڕی عبدالعزیز ەوە هاتووە کە پیاوێك ئافرەتێکی مارە کردووە ئافرەتەکەش

---

[1] - الطبقات الكبرى، ابن سعد(٥ / ٣٥٤).

[2] - فقه عمر(٢ / ٤٣٦).

[3] - مصنف عبدالرزاق(٥ / ٢٠٥ – ٢٠٦).

[4] - فقه عمر(٢ / ٤٣٨).

[5] - مصنف ابن ابي شيبة(٤ / ١٣٢) فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٠٥).

سەرپەرشتیاری هەبوو، بەلام لە خۆی کەمتر بوو عومەریش: مارەکردنەکەی هەڵوەشاندنەوە و وتی: ئەبێ سەرپەرشتیاری ئامادەبێت ئەگینا سوڵتان خۆی ئەبێتە وەلی ئەمر و سەرپەرشتیاری[1].

٢- **بەشوودانی ئافرەت بە دوو کەسی جیاواز لەلایەن دوو سەرپەرشتیارەوە:** لە ثابتی کوڕی قەیسەوە ئەڵێ: نامەیەکم نووسی بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز دەربارەی کەنیزەکێك لە هۆزی جوهەینە کە یەکێك لە سەرپەرشتیارەکانی مارەی کرد بوو لە پیاوێك و سەرپەشتارێکی تریشی مارەی کرد بوو لە پیاوێکی تر، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش بۆی نووسی: کە چەند شایەتێکی دادگەر ببەرە لای و هەر کامیانی هەڵبژارد لێی مارەبکە.

٣- **مارەکردنی ژنێك پاش ئەنجام دانی کاری خراپ لەگەڵیدا :** ئەگەر پیاوێك زینای لەگەڵ ئافرەتێکدا کرد پاشان ویستی مارەی بکات ئایا ئەم کارەی بۆ ڕەوایە؟ عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە ئەتوانێت مارەی بکات ئەگەر خێری تیادا بەدی کرد، چونکە جیاوازی لە نێوان ئەو کەسەی کە زینای لەگەڵدا کردووە و کەسێکی تردانیە، ئەمەش ڕایەکی دروستە، چونکە ئەگەر بڵێین ئەمە دروست نیە ئەوە خەڵکی تر لە پێشترە بۆ ڕازی نەبوون بە مارە کردنی ئەمەش خراپەی زۆری لێ دەکەوێتەوە[2]. لە یەحیای کوڕی سەعیدەوە ئەڵێ: پێم گەشتووە کە پرسیاریان لە عومەری کوڕی عبدالعزیز کردەوە دەربارەی ئافرەتێك کە کارێکی خراپی ئەنجام داوە و پاشان وازی لە خراپە کردن هێناوە، ئایا مارەی بکەن؟ وتی: بەڵێ دروستە[3].

٤- **مارەکردنی هاوسەری دیل:** لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە ئەڵێ: هاوسەری پیاوی بەدیلگیراو مارە ناکرێت، چونکە دیلی موسڵمانان دەرەنجامی ئازایەتی و دەستپێشخەری خۆیەوە دیل کراوە لە جەنگ دا دژ بە دوژمنان بۆ بەرز کردنەوەی ئالای ئیسلام و بەرگری کردن لە خاکی موسڵمانان، بۆیە وەك ڕێزلێنانێك بۆ ئەو هەڵویستە جوامێرانە کە خۆی کردۆتە قوربانی لە پێناو ئاینەکەیدا پێویستە هاوسەرەکەی ئەوەی لەبەر چاو بێت و ئارام بگرێت هەتاوەکو خوای گەرە ئازادی دەکات و ئەگەڕێتەوە بۆلای، چونکە مانەوەی لە دیلێتی و نەبوونی لای ژنەکەی بە دەستی خۆی نیە، هەروەك ئازادکردنیشی شتێکی کاتیە و

---

[1] - فقه عمر(١ / ٤١٢).

[2] - مصنف ابن ابي شيبة(٤ / ٢٥٠) فقه(١ / ٤١٢).

[3] - الطبقات الكبرى ـ لابن سعد(٥ / ٣٥١).

لەوانەیە لەهەرکاتێکدا ڕووبدات، لەبەر هەموو ئەم هۆیانە کارێکی دادگەرانەیە ئەگەر هاوسەرەکەی شوونەکات هەتاوەکو لە دیلی ڕزگاری دەبێت [1].

٥- **مارەکردنی هاوسەری کەسی بێ سەرو شوێن:** ئەگەر پیاوێك بێ سەروشوێن بو و باسی نەما و نەزانرا ئایا زیندووە یان مردووە، ئایا دەبێ هاوسەرەکەی چاوەڕێی بکات و بە دیاریەوە دانیشێت؟ عومەری کوڕی عبدالعزیز پێ ی وایە کە دەبێ هاوسەری بێ سەرو شوێن چوار ساڵ دانیشێت و پاشان شوبکات [2]، ئەوە بوو عومەر نامەیەکی نوسی بۆ عەدی کوڕی ئەطأرة: کە هاوسەری پیاوی بێ سەر و شوێن چوار ساڵ دانیشێت [3]. ئەمەش ئەیسەلمێنێت کە عومەر شوکردنی پاش چوار ساڵ بەڕەوا دەزانێت، پاش ئەوەی کە چوار مانگ و دە ڕۆژیش لە عبدەدا ئەمێنێتەوە [4].

٦- **مارەیی ئافرەتێك کە پێش چوونەلای لەنەخۆشی پیاوەکەیدا تەلاق داربێت:** عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە نیوە مارەیی دەکەوێت و تەلاق دانی لەکاتی نەخۆشی مێردەکەیدا هیچ کاریگەری نیە [5]، لە عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە کە وتویەتی: نیوەی مارەیی ئەکەوێت و عیددەشی لەسەر نیە، بەڵام میراتی ناکەوێت [6].

٧- **شیربایی وەرگرتنی باوك:** عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە مارەیی موڵکی ئافرەتەکە و باوکی هەرمەرجێك بۆ دابنێت بەتاڵە و دەدرێت بە کچەکەی [7] لە ئەو زاعیەوە پیاوێك کچەکەی لەسەر هەزار دینار مارەکرد و هەزار دیناریشی بە مەرج بۆ خۆی دانا، عومەریش هەردوو هەزار دینارەکەی دا بە کچەکەی و باوکەکەی بێ بەش کرد [8].

٨- **گاڵتەکردن بە تەلاق بەڕاست وەردەگیرێت:** عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە پیاو لەسەر تەلاق لێپرسینەوەی لەگەڵ دا دەکرێت چ بەڕاستی بێت یان بە گاڵتە، لە سولەیمانی

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤١٧).

[2] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤١٨).

[3] - المحلي(١٠ / ١٣٨).

[4] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤١٨).

[5] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٢٣).

[6] - مصنف ابن ابي شيبة(٤ / ٣٣١ – ٣٣٢).

[7] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٢٥).

[8] - مصنف ابن ابي شيبة(٤ / ٢٠١).

کوڕی حەبیبی محاربیەوە ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆی نووسیم: ئەگەر لە هەرشتێکی خەڵکی گێل و نەزان خۆش بوون لە تەلاق و ئازادکرنیان خۆش نەبن [1].

٩- **دەربارەی تەلاقی زۆر لێکراو:** لەوانەیە مرۆڤ بکەوێتە هەڵوێستێکەوە کە تیایدا زۆری لێ بکرێت بۆ تەلاق، وەك ئەوەی سوێند بدرێت کە کارێك بکات یان نەیکات، لەوانەشە زۆر یان هەڕەشەی لێ بکرێت بۆ ئەوەی ژنەکەی تەلاق بدات، ئایا ئەم جۆرە تەلاقە ئەکەوێت؟ عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە تەلاقی زۆر لێکراو ناکەوێت [2] لە عومرەوە کوڕی عبدالعزیزەوە هاتووە کە ئەڵێ: تەلاقدان و ئازادکردنی ئافرەت لەسەر پیاوی زۆر لێکراو پێویست نیە [3].

١٠- **ئەگەر پیاوێك ژنەکەی نیو تەلاق دا:** وترا بە عومەری کوڕی عبدالعزیز: ئەگەر پیاوێك نیو تەلاقی ژنەکەی دا؟ وتی: ئەوە بە یەك تەلاق دادەنرێت [4].

١١- **خۆ تەلاق دانی ئافرەت کاتێ کە تەلاقی دەدرێتە دەست:** عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە ئەم جۆرە تەلاقە ئەکەوێت و ئەگەر سێ تەلاقیش بێت ئەوە هەر بەیەك تەلاق دادەنرێت، و پیاوەکەشی لە هەموو کەس لە پێشترە ئەگەر ویستی بیگێڕێتەوە لای خۆی، ئەوە بو عومەری کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی دەربارەی پیاوێکی بەنی تەمیم کە تەلاقی دبووایە دەست ژنەکەی، تیایدا ئەیوت: ئەگەر تەلاقەکەی گێڕابێتەوە بۆ پیاوەکە ئەوە هیچ نیە، بەلام ئەگەر لە دەستی خۆیدا بووبێت و خۆی تەلاق دابێت ئەوە یەك تەلاقی دەکەوێت [5].

١٢- **موسڵمان بوونی ئافرەتێك کە هاوسەرەکەی بێ باوەڕ بێت:** ئەگەر هاوسەری پیاوێکی بێ باوەڕ موسڵمان بوو ئەوە دەبێ جیا بکرێنەوە، لە محمدی کوڕی سولەیمانەوە لە باوکیەوە: کە حەسەن و عومەری کوڕی عبدالعزیز دەربارەی ئەو ئافرەتە گاورەی کە موسڵمان دەبێت و پیاوەکەی موسڵمان نیە وتویانە: بە موسڵمان بوونی لە هاوسەرێتی ئەو پیاوە دەکەوێت [6]، چونکە هەر کاتێك ئافرەت موسڵمان بو و پیاوەکەی بە بێ باوەڕی مایەوە ئەوە هاوسەرگیریان

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٠٦).

[2] - فقه عمر بن عبدالعزیز(١ / ٤٣٤).

[3] - مصنف ابن ابي شیبة(٥ / ٤٩).

[4] - مصنف ابن ابي شیبة(٥ / ٥٣). فقه عمر بن عبدالعزیز(١ / ٤٤١).

[5] - مصنف ابن ابي شیبة(٥ / ٥٣).

[6] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٩٠)، فقه عمر بن عبدالعزیز(١ / ٤٥٠).

هەڵدەوەشێتەوە و جیادەکرێتەوە [1]، ئەم جیا کردنەوەیەش دوای ئەوە دەبێت کە داوای موسڵمان بوون لە پیاوەکە دەکرێت، هەتاوەکو پیاوێکی بێ باوەڕ سەرپەرشتی ئافرەتێکی موسڵمان نەکات، جا ئەگەر پیاوەکە موسڵمان بوو ئەوە ژن ژنی خۆیەتی و ئەگەر نا ئەوە عومەری کوڕی عبدالعزیز پێی وایە کە تەلاقی دەکەوێت، بەلام ئەگەر لەکاتی مانەوە و عیدەی ئافرەتەکەدا موسڵمان بو ئەوە لە هەموو کەس لە پیشترە بۆی [2].

١٣- **ماوەی چاوەڕوانی کردنی کەسی نائامادە:** عومەری کوڕی عبدالعزیز وا دەبینێ کە زۆرترین ماوە بۆ دیار نەبوونی پیاو دوو ساڵە، دوای ئەوەش یان دەبێ پیاوەکە بگەڕێتەوە بۆلای هاوسەرەکەی یاخود دەبێ تەلاقی بدات ئەوە بوو لەم بارەیەوە نووسیی: هەر کەس دوو ساڵ لە ژنەکەی دوور کەوتەوە ئەوە با بگەڕێتەوە بۆلای یان تەلاقی بدات [3].

ئەمە هەندێك بوو لەو ئیجتیهادە فیقهی و فتوا و حوکمە قەزاییانەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز مومارەسەی کردووە و بەڵگەیە لەسەر شارەزایی فراوانی لە مەسەلە شەرعیەکاندا و توانای ئیجتهاد و هەڵگۆزینی حوکمی شەرعی لە قورئان وسوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و خەلیفە ڕاشیدیەکانی پێش خۆی و زانایانی ئوممەت، دکتۆر محمد شقیریش هەستاوە بە کۆکردنەوەی فیقهی عومەری کوڕی عبدالعزیز لە دوو بەرگدا، جا هەر کەسێك ئەیەوێ زیاتر بزانێت بابگەڕێتەوە بۆ ئەو نامەزانستیە کە پلەی دکتۆرای پێ وەرگرت لە پەیمانگای بالای قەزا لە ریاض ی پایتەختی عەرەبستانی سعودی.

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزیز(١ / ٤٥٠).

[2] - هەمان سەرچاوە(١ / ٤٥١)

[3] - هەمان سەرچاوە(١ / ٤٥٢)

# باسی هەشتەم

## تێگەشتنی عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ بواری کارگێڕی و ڕۆژەکانی کۆتایی تەمەنی و کۆچی دوایی

## یەکەم: بەناوبانگترین والی و کاربەدەستەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز:

عومەر هەستا بە هەڵبژاردنی کەسانی متمانە پێکراو بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری هاوڵاتیان لەو کەسە باشانەی کە ناسرابوون بە ئەمانەتپارێزی و زانست وتوانا و خاکی بوون و دەرون پاکی و دادگەری و ڕەوشت جوانی و بەزەیی و پێشەنگی باش و ڕاوێژکردن و ئامۆژگاری و لێهاتوویی و زیرەکی و دانایی ئیبن کثیریش دەربارەی والیەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەڵێ: زۆربەی پێشەوایان پێیان وایە کە زۆرینەی ئەو والیانەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بەکاری هێناون متمانە پێکراو بوون[1]، لەو کەسانەش:

١- **حەججاجی کوڕی عبدالله ی حکمی( والی خوراسان و سجستان )**: زەهەبی دەربارەی ئەڵێ: پێشەنگی سوپاکان و سوارچاکی کە تیبەکان بووە، باوکی عقبەی جەراح ی کوڕی عبدالله ی حکمی والی بەسرە بو لەلایەن حەجاجەوە، پاشان بووە والی خوراسان و سجستان بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز، پاڵەوانێکی ئازا و سامناك و خوناس و قورئان خوێن و بەڕێز بوو[2]، جەڕاحی حکمی ئەڵێ: چل ساڵ بە هۆی سەرمەوە وازم لە تاوان هێنا پاشان بومە پاریزکار[3]، بەرپرسی هەموو کاروبارەکانی خوراسان بوو بە دارایی و جەنگ و پەیوەندیەکانەوە [4] لە خیلافەتی هشام دا کوژرا، لە سەلیمی کوڕ عامرەوە ئەڵێ چوومە لای جەڕاح و دەستی بەرزکردەوە و ئەمیرەکانیش دەستیان بەرزکردەوە پاشان ماوەیەکی زۆر بەو شێوەمایەوە، پاشان پێی وتم: ئەی باوکی یەحیا، ئەزانی ئێمە لە چ حاڵێکدا بوین؟ وتم نەخێر، بینیم دەستتان بەرز کردەوە منیش دەستم بەرزکردەوە لەگەڵتاندا، وتی: داوای شەهیدیمان لە پەروەردگار کرد، ئەڵێ سوێند بەخوا هیچ یەکێکیان نەمایەوە کە لەو غەزایەدا شەهید نەبوبێت[5]، خەلیفە ئەڵێ: جەڕاح لە برزعەوە [6] لە ساڵی دوازەدە دا هات بۆ ئیبن خاقا و جەنگێکی توند لە

---

[1] - البداية و النهاية، لە عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار، ل: ٢٧٠.

[2] - سير اعلام النبلاء(٥ / ١٨٩)

[3] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٩٠).

[4] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٩٠)

[5] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٩٠).

[6] - برذعة: شارۆچکەیەکە لە ئەزەربەیجان.

نێوانیاندا هەڵگیرسا، جەڕاح لە ڕەمەزاندا شەهید بوو، دەستی گرت بەسەر ئەزربەیجان دا و گەشتنە نزیکی موسڵ [1] کوژرانی جەڕاحیش بەڵایەکی گەورە بوو کە بەسەر موسڵمانان داهات [2] و هەموو سەربازەکانی هێنایە گریان.

٢- **عەددی کوڕی أرگأرەی فەزاری( والی بەسرە ):** ئەمیری بەسرە بوو لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا لە عەمری کوڕی عەبسە و ئەبی ئیمامەو فەرموودەی گێڕاوەتەوە عبادی کوڕی مەنسور ئەڵێ: عەدی لەسەر مینبەری مەدائین وتاری بۆ داین و ئێمە و خۆشی خستە گریان[3]. عومەریش(ﷺ) بە ئامۆژگاری بەسەری دەکردەوە معمر ئەڵێ: عومەر نامەیەکی نووسی بۆ عەدی کوڕی أرطأرة: کە تۆ بەمێزەرە ڕەشەکەت و دانیشتنت لەگەڵ قورئان خوێناندا منت خەڵەتاند و بەڵام خوای گەورە زۆر شتی بۆ دەرخستین لەوانەی کە ئەتان شاردەوە، ئایا تۆ بەناو گۆڕستاندا هاتوچۆ ناکەیت؟ [4] عەدی هاتە سەرو یەزیدی کوڕی مهلب و قۆڵ بەستی کرد و ناردی بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز، کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز کۆچی دوایی کرد لە زیندان هەڵات و خەڵکی بانگ کرد بۆ لای خۆی و ناوی خۆی نا قەحطانی و ئاڵای ڕەشی هەڵکرد و وتی: داوای زیندووکردنەوەی مامەڵەی عومەری کوڕی خەتتاب ئەکەم، مەسلەمەی کوڕی عبدالملك یش جەنگی لە دژ ڕاگەیاند و کوشتی پاشان موعاویەی کوڕیشی گرتەوە و عەدی و کۆمەڵێکی بە ئازار کوشت لە ساڵی سەد و دوودا [5]، دار قطني دەربارەی عەدی ئەڵێ: فەرموودەی لێ وەردەگیرێت.

٣- **عبدالحمیدی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی زەیدی کوڕی خەتتاب( والی کوفە ):** پێشەوای متمانە پێکراو و ئەمیری دادپەروەر باوکی عومەری عەدەوی خەتابی مەدەنی، والی عومەری کوڕی

---

[1] - سیر اعلام النبلاء(٥ / ١٩٠)

[2] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٩٠).

[3] - سیر اعلام النبلاء(٥ / ٥٣).

[4] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٥٣).

[5] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٥٣).

عبدالعزیز لە کوفەدا، فەرموودەی کەمی گێڕاوەتەوە و خاوەنی پلەوپایەیەکی زۆر بووە لە سالّی ١١٥ ك کۆچی دوایی کردووە [1].

٤- **عومەری کوڕی هەبیرە( والی جەزیرە ):** یەکێك بووە لە کەسە ئازاو زیرەکەکان، پیاوێکی ناوداری خەلّکی شام بوو، لە سالّی ١٠٠ کۆچی دا عومەر کردی بەوالی جزیرە و ئەویش چووە ناویەوە هێرشی کرد بۆ ڕۆمەکان لەلای ئەرمینیەوە و توانی بەسەریاندا سەرکەوێت و خەلّکێکی زۆریان لێ بەدیل بگرێت. لە پۆستی والی جزیرەدامایەوە هەتاوەکو خیلافەتی یەزیدی کوڕی عبدالملك پۆستی ئەمیری عێراق و خوراسانی پێ سپارد، پاشان هشام لەسەر ئەو کارە لایبرد و خالد القسری لە شوێندا دانا و بەقۆلّبەستکراوی عابایەکی لەبەر کرد و خستیە زیندانەوە، بەلاّم خزمەتکارەکانی فێلّێکیان کرد و لە ژێر زەویەوە ڕێڕەوێکیان بۆ هەلّکەند وئازادیان کرد و پەنای برد بۆ مەسلەمەی کوڕی عبدالملك ئەویش پەنای دا و بەم شێوەمایەوە هەتاوەکو لە سالّی سەدو حەوت دا کۆچی دوایی کرد [2].

٥- **ئەبوبەکری محمدی کوڕی عەمری کوڕی حەزم( والی مەدینە ):** یەکێکە لە پێشەوا متمانە پێکراوە و دامەزراوەکان و پۆستی دادوەری و والی مەدینەی گرتۆتە ئەستۆ، لە باوکی و عبادی کوڕی تەمیم و سەلمانی ئەغەڕو عمرەی کچی عبدالرحمن و کۆمەلّێکی ترەوە فەرموودەی گێڕاوەتەوە لە ڕێزی شوێنکەوتوە بچوکەکاندا(صغار التابعین) دا هەژمار کراوە[3]، عطائی کوڕی خالد لە دایکیەوە لە هاوسەری ئیبن حەزمەوە ئەگێڕیتەوە: کە ئیبن حەزم بۆ ماوەی چل سالّ لەسەر جێگەی خۆیدا نەخەوتووە [4]، ئەلّێن داهاتی لە مانگێکدا سێ سەد دینار بووە [5].

٦- **عبدالعزیز ی کوڕی عبدالله ی کوڕی ئەسیدی ئەمەوی( والی مەککە ):** عومەر عبدالعزیزی کوڕی عبدالله ئەمەوی لە شوێنی خۆیدا هێشتەوە کە والی سولەیمانی کوڕی عبدالملك بوو،

---

[1] - هەمان سەرچاوە(٥ / ١٤٩).

[2] - هەمان سەرچاوە(٤ / ٥٦٢).

[3] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣١٤).

[4] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣١٤).

[5] - هەمان سەرچاوە(٥ / ٣١٤).

نسائی و ابن حبان به متمانه پێکراویان لە قەڵەم داوه و لە خیلافەتی هشامی کوڕی عبدالملك دا کۆچی دوایی کردووه [1].

٧- **ریفاعەی کوڕی خالدی کوڕی پابتی فەهمی( والی میسر ):** ابن تغري بردي هەواڵێك دەگێڕێتەوه کە تەنها لە ڕێی ئەوەوه هاتووه و ئەڵێ: عومەری کوڕی عبدالعزیز عبدالملکی کوڕی رفاعەی کوڕی خالدی کوڕی ثابتی فەهمی لە میسر هێشتەوەکە کەسێکی ڕەوشت بەرز و پاك و متمانە پێکراو چاکەکار و دادگەر بو لە نێوان خەڵکیدا، لیثی کوڕی سەعد و خەڵکانێکی تر فەرموودەیان لێوەگێڕاوەتەوه، پاشان لە مانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٩٩ دا لەسەر کار لایبرد بێ ئەوەی هۆی لەسەر کار لابردنی باس بکات [2] و لە شوێنیدا ئەیوبی کوڕی شوره حبیلی ی کوڕی ئەکسومی کوڕی ئەبرەهەی کوڕی صباح ی دانا [3].

٨- **ئیسماعیلی کوڕی عبیدالله ی کوڕی ئەبی موهاجیری مەخزومی( والی مەغریب ):** کەسێکی چاك و خواناس بوو، لە ساڵی ٩٩ ك دا هاتە ئیفریقیە(تونس) و ئەشڵێن لە ساڵی ١٠٠ دا بوه، پیاوێکی ڕەوشت جوان بووه ،دادگەرانە لەگەڵیاندا جولاوەتەوه و بەربەرەکان بە گشتی لەسەر دەستی موسڵمان بوون ئەویش زۆر سوور بووه لەسەر موسڵمان بونیان، عومەریش نامەی بۆ دەرنارد بۆ بانگەواکردنی ئەهلی ذیمە بۆ ئیسلام، ئەویش نامەکانی بۆ دەخوێندەوه، لە ساڵی ١٣٢ ك کۆچی دوایی کرد [4].

٩- **سەمحی کوڕی مالك لە ئەندەلوس:** ئەمیری بەناوبانگ، عومەری کوڕی عبدالعزیز کردی بە والی ئەندەلس و فەرمانی پێکرد کە زەویەکانی جیا بکاتەوه و ئەوەی کە بە زۆر و هێز ڕزگاری کردووه دیاری بکات و پێنج یەکی لێ دەربکات و وەسفی ئەندەلوسی لەنامەیەکدا بۆ بکات، ئەویش لە ساڵی ١٠٠ دا هاتە ئەندەلوس و ئەوەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز پێ ڕاسپارد بوو ئەنجامی دا، پاشان لە غەزادا لە خاکی فەرەنجەکاندا شەهید بوو [5].

---

[1] - تاريخ خليفة، ل: (٣٢٣) عمر و سياسته في رد المظالم، ل: ٢٧٣.

[2] - عمر و سياسة فير د المظالم، ل: ٢٨٩.

[3] - هەمان سەرچاوه، ل: ٢٨٩.

[4] - هەمان سەرچاوه(٢٩٣.

[5] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار، ل: ٢٧١.

ئەمانە بەناوبانگترین والیەکانی عومەری کوڕی عبدالعزیز بوون کە لە هەرێم ویلایەتەکەندا کاری پێ سپاردوون و هەموشیان کەسی باش بوون.

**دووەم: سووربوونی عومەری کوڕی عبدالعزیز لەسەر هەڵبژاردنی کاربەدەستەکانی لە خەڵکانی خواناس و چاکەکار:**

کاربەدەستانی خەلیفە و ئەمیری ناوچەکان جێگری خەلیفەن لە هەرێمەکانی خۆیاندا و ئەڵقەی پەیوەندی نێوان خەڵك و خەلیفەن، بۆیە هەر چەندە خەلیفە بە ئاگا بێت لە بەڕێوەچوونی کاروبارە سیاسیەکان، بەڵام هێشتا ناتوانێ سەرکەوتن بەدەست بێنێت ئەگەر بە باشی کار بە دەستەکانی هەڵنەبژاردبێت، کاتێ لەم بوارەش ورد دەبینەوە بۆمان دەردەکەوێت کە چەند مەرجێکی هەبووە بۆ ئەو کەسانەی کە هەڵی دەبژاردن بۆ کارکردن لەگەڵیدا، لە گرنگترینی ئەو مەرجانەش: پارێزگاری و ئەمانەت پارێزی و دینداری باش، کاتێ کە خالیدی کوڕی ڕەیانی لەسەر کار لابرد کە سەرۆکی پاسەوانەکان بوو لەسەردەمی وەلید و سولەیماندا – عومەر سەیری دەم و چاوی پاسەوانەکانی کرد و عەمری کوڕی مهاجری ئەنصاری بانگ کرد و وتی: سوێند بەخوا تۆ دەزانی ئەی عەمر کە لە نێوان من و تۆ دا هیچ خزمایەتیەك نیە جگە لە ئیسلام، بەڵام من گوێم لێت بووە کە زۆر قورئانت خوێندۆتەوە و لە شوێنێکدا نوێژت کردووە و وات زانیوە کە کەس ئاگای لێت نیە، و بەباشی نوێژەکەت ئەنجام داوە، ئەم شمشێرە بگرە ئەوە تۆم کرد بە بەرپرسی پاسەوانەکانم، هەروەها نامەی ئەنووسی بۆ کاربەدەستەکانی [1]، کە ئاگاداربن کار بە کەس نەسپێرن جگە لەوانەی کە ئەهلی قورئانن، چونکە ئەگەر خێر و چاکە لای قورئان دۆستان نەبوو ئەوە لای خەڵکی تر هەرگیز نابێت[2].

ئەگەر گومانی لە کەسێکیشدا هەبوایە لەوانەی دەیویست کارێکیان پێ بسپێرێت ئەوە پەلەی نەدەکرد تا بەباشی دەیناسی ئەوە بوو کاتێك عومەر بوو بە خەلیفە وەفدێك هاتنە لای عومەر بە سەرۆکایەتی بلالی کوڕی ابی بردە و پیرۆزباییان ئاراستە کرد و بلال وتی: ئەگەر خەلافەت کەسێکی شەرەفمەند کردبێت ئەوە تۆ خەلافەتت شەرفەمەند کردووە، و ئەگەر کەسێك خەلافەتی ڕازاندبێتەوە ئەوە تۆ خەلافەتت ڕازاندۆتەوە پاشان بە چەند دێڕە شیعرێك ستایشی عومەری کرد، عومەریش پاداشتی بە باشی دایەوە پاشان بلال لە مزگەوت دامایەوە و نوێژی دەکرد و شەو و ڕۆژ قورئانی

---

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ابن الجوزي، ل: ٣١.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٨، سراج الملوك للطرطوشي، ل: ٢٥٥.

دەخوێند، ئەمەش کاریگەری لەسەر عومەر هەبوو و ویستی بیکات بە والی عێراق، پاشان وتی: ئەمە کەسێکی خاوەن چاکەیە، دواتر کەسێکی متمانە پێکراوی نارده لای و پێی وت: ئەگەر هەوڵ بدەم بۆ ئەوەی بتکەم بەو والی عێراق چیم پێ دەدەیت؟ ئەویش بەڵێنی پارەیەکی زۆری پێدا، پیاوەکەش ئەمەی بۆ عومەر باسکرد و ئەویش دەری کرد و دووری خستەوە [1]. هەروەها حەزی نەدەکرد کار بە کەسێك بسپێرێت کە دەستی هەبوبێت لە ستەمکردن دا بە تایبەت حەججاج [2]، هەرچەندە خەڵکانی پێش عومەر حسابیان بۆ خزمایەتی و دەمارگیری کار بەدەست بۆ بنەماڵەی ئەمەوی دەکرد و پێوەر بوو بەلایانەوە بۆ دانانی کاربەدەست، بەڵام شتێك لەمانە لەلای عومەر بە پێوەردانەدەنرا، ئەوزاعی باس دەکات کە عومەری کوڕی عبدالعزیز لەماڵی خۆیدا دانیشتبوو پیاوماقوڵانی بەنی ئومەییەشی لابوو و پێی وتن: ئایا حەزدەکەن هەر یەکێك لە ئێوە بکەمە بەرپرسی کۆمەڵێ سەرباز؟ یەکێکیان وەڵامی دایەوە وتی: شتێکمان پێ دەڵێی کە نایکەیت؟ وتی: ئەم ڕاخەرەم ئەبینن؟ من ئەزانم کە کۆن دەبێ و نامێنێت، جا من پێم ناخۆشە بە قاچەکانتان پیسی بکەن، ئیتر چۆن ئاینی خۆمتان دەدەمەدەست؟ ناموسی موسڵمانانتان بدەمەدەست و بە ئارەزوی خۆتان حوکمی بکەن نەخێر ئەوە زۆر دوورە [3].

ئەم ڕێبازەش کە سیاسەتی عومەری پێ ناسرا بوو لە هەڵبژاردنی والی و کار بەدەستەکانیدا کاریگەری باشی هەبوو لەسەر سەقامگیری سیاسی لە هەرێمەکاندا ،چونکە خەڵکی ڕازی بوون لە کاربەدەستەکانی و ستایشی کارەکانیان دەکردن و کاربەدەستی هاوشێوەی حەججاج لەناو کاربەدەستەکانیدا نەبوو کە بەشێوەیەکی توند مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا بکات و لەسەر تۆمەت بیانگرێت، هەروەك خەڵکی دەمار گیریان تێدا نەبوو کە خەڵکانێك بەرزبکاتەوە و خەڵکانێك نزم بکاتەوە و ڕق و قین لە دەرونیاندا بەرامبەری دروست ببێت [4].

---

[1] - تاریخ دمشق، لە اثر العلماء في الحياة السياسة، ل: ١٨٢.

[2] - اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٨٢.

[3] - سير اعلام النبلاء(٥ / ١٣٢).

[4] - اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٨٣.

**سێ یەم: سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی دەوڵەتی دەکرد بە گەورە و بچوکەوە:**

... هەروەك چاودێری هەرێمەکانی دەکرد، دام و دەزگاکانی دەوڵەتیش کە عبـدالملك ی کـوڕی مەروان پەرەی پێ دا لەمەدا یارمەتیدەری بوون لەو دەزگایانەش دەزای پۆستە و دەزگای هەواڵگری گەورە کە بەهەموو لایەکی دەوڵەت دا بلاو بوو بوویـەوە و خەلیفـەکان بـۆ کۆکرنـەوەی زانیـاری بەکاریان دەهێنا، سەرباری ئەوەی کە عومەر وردەکاری زۆری دەکرد لە هەڵبـژاردنی والیەکانیـدا، بەلام ئەوە ڕێگر نەبوو لەوەی کە کار بۆ چاودێری جێبەجێ کردنی کاروبـاری هاولاتیـان بکـات و چاودێری بەڕێوەچوونی کاروبارەکانی دەوڵەت بێت، ئاشکراشە کـە عومـەر بـە لێـبڕان و مانـددوو نەبوون لە کارکردن دا ناسرا بوو بەڕادەیەك کە دروشمی بڕیتیی بوو لەوەی کە کاری ئەمڕۆ مەخەرە سبەینێ. جارێك پێیان وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران: ئەگەر بڕۆشـتایەیت و کـەمێك پـشوت بدایـە، ئەویش وتی: ئەی کێ کاری ئەمڕۆ جێبەجێ بکات.؟ وتیان سبەی دەیکەیت وتـی: نـەکردنی کـاری یەك ڕۆژم بەلاوەگرانە، ئیتر ئەبێ کاری دوو ڕۆژ چۆن بێت [١].

مەیمونی کوڕێ مەهران ئەڵێت ك شەوێك لە خزمەت عومەری کوڕی عبدالعزیز دا بووین و پـێم وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران بەم شێوەیە ناتوانی بژیت، تـۆ بـەڕۆژدا بـەدەم کاروبـار و پێداویـستی خەڵکیەوەی ئێستاش لەگـەڵ ئێمـەدای، خـوای گـەورەش خـۆ دەزانـی لـە کـاتی تـەنهایی دا چـی دەکەیت[٢]. ئەوە بوو زۆربەی کاتەکانی بۆ داڕشـتنی سیاسـەتی ئیـصلاحی و چاکـسازیخوازی خـۆی تەرخان دەکرد کە هـەموو بوارەکـانی ژیـانی گرتبوویـەوە وەك بوارەکـانی سیاسـەت و ئـابووری و کارگێڕی و هتد.. تەنانەت بەشێکی زۆر لەو سیاسەتانەی بە جـێ هێـشت کـە بابەتـەکانی پـرۆژەی چاکسازی هەمەلایەنەی پێك دەهێنن، ئەم سیاسەتانەشی نارد بۆ کاربە دەستەکانی بۆ پـەیڕەو کردنـی لەسەرجەم هەرێمەکاندا و زۆرجاریش چەندین ڕێنمایی پەروەردەیی لەگەڵدا دەنارد کەتیایدا باسی لە گەورەیی ئەو ئەمانەتە بۆ ئەکردن کە خراوتـە ئەسـتۆیان و ترسـی خـوا و چـاودێری و ترسـان لێـی بیردەخستنەوە و لەو کارانەدا کە ئەیکەن [٣]. ئەم ڕێنمایی و بیخستنەوەانەش کاریگەری خۆی هـەبوو لە دەورروونی کار بەدەستەکانیدا، ئەوە بوو جارێك بۆ یەکێکیانی نوسی: براکـەم درێـژی شـەوخونی

---

[١] - سیر عمر بن عبدالعزیز، ل: ٥٥، لابن عبدالحکم.

[٢] - الطبقات(٥ / ٣٧١).

[٣] - اثر العلماء في الحیاة السیاسیة، ل: ١٨٦.

خەڵكی دۆزەخت یاد دەخەمەوە لەگەڵ مانەوەی هەتاهەتاییان تیایدا، ئاگات لە خۆت بێت لە خوا دور نەخرێیتەوە و هەتاوەكو هیوا بڕاو نەبیت، كاتێ كاربەدەستەكەی نامەكەی خوێندەوە و ملی ڕێی گرتەبەر هەتاوەكو گەشتەلای عومەر عومەریش پێی وت: چی هێناویتی؟ وتی: دڵت دا چڵەكانم بەنامەكەت هەرگیز هیچ پۆستێك ناگرمە دەست هەتاكو بە خزمەت پەروەردگار ئەگەم [1].

هەروەها عومەری كوڕی عبدالعزیز بەناردنی ئەو سیاسەت و ڕێنماییانە بۆ كاربەدەستەكانی وازی نەهێنا، بەڵكو سوور بوو لەسەر چاودێری جێبەجێ كردنی و دەركەوتنی ئاسەوارەكانی لە هاولاتیانیدا، بۆیە بەردەوام پرسیاری لەو كەسانە دەكرد كە لەو هەرێمانەوە دەهاتن لەو بارەیەوە، ئەوەبوو زیادی كوڕی ابی زیادی مەدەنی لە كاتێكدا كە لە مەدینە وە هات بۆ لای عومەر ئەڵێ: عومەر پرسیاری لێكردم دەربارەی پیاو ساڵحان و ژن و پیاوەكانی خەڵكی مەدینە و.. چەند مەسەلەیەكی تری مەدینە و منیش ئاگادارم كردەوە [2].

ڕۆژێكیان عومەری كوڕی عبدالعزیز هاتە دەرەوە و لەگەڵ موزاحیم دا سوار بوو، ئەوە بوو زۆر جار چاوی بە سوارەكان دەكەوت و هەواڵی گوندەكانی لێ دەپرسین، پاشان سوارێكی خەڵكی مەدینەیان پێ گەشت و هەواڵی خەڵكی و خۆشیان لێ پرسی، ئەویش پێی وتن: ئەگەر ئەتانەوێت هەواڵەكەتان بۆ كۆدەكەمەوە ئەگەر ئەشتانەوێت بەش بەشی دەكەم، ئەوانیش وتیان: كۆی بكەرەوە بۆ مان، وتی: من مەدینەم بەجێ هێشت و ستەمكار تیایدا چەوسێنرا بوویەوە و ستەملێكرا بوو سەر خراو بوو و دەوڵەمەند زۆر بوو هەژاریش هاوكاری دەكرا، عومەر بەمە زۆر دڵخۆش بوو وتی: سوێند بەخوا ئەگەر هەموو ولاتەكان بەم شێوەیەبن ئەوە لەلام خۆشترە لەوەی كە خۆری لەسەر هەڵهاتووە [3]، كاتێ پیاوێكیش لەخەڵكی خوراسان هات و ویستی بگەڕێتەوە بۆ ولاتەكەی و داوای كرد لە عومەر بە حوشتری پۆستەدا بینێرێت، عومەریش دوای ئەوەی كە دڵنیا بوو لە ژیاننامە و ڕەوشتی وتی: ئەتوانی ئیشێكمان بۆ بكەیت و منیش لەگەڵ پۆستەدا بت نێرم؟ وتی: بەڵێ، عومەریش وتی: بەلای ولاتی هەر كار بەدەستێكماندا تی پەربویت بەوردی لە هەڵسوكەوتی بكۆڵەرەوە ئەگەر باش بوو هیچمان بۆ مەنووسە، بەلام ئەگەر خراپ بوو ئەوە بۆمان بنووسە، موزاحیم ئەڵێت:

---

[1] - اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٨٦.

[2] - اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٨٧.

[3] - سير عمر بن عبدالعزيز، ل: ١١٥

بەردەوام نامەمان لێیەوە بۆ دەهات دەربارەی کاربەدەستێکمان و لەسەر کارلامان دەبرد هەتاوەکو گەشتە خوراسان [1].

تێبینی ئەوەش دەکەین کە عومەر گرنگی بە چەند سەرچاوەیەکی جۆراوجۆر دەدا بۆ کۆکردنەوەی زانیاریەکان چونکە دەیزانی کە بۆ باش ناسینی کاروبارەکانی هاولاتیان پێویستی بە کۆکردنەوەی زانیاری ڕاست و دروست هەیە هەتاوەکو ڕێنمایی و فەرمان و نەهی بەسودی بۆ ئومەت و دەوڵەت لەسەر بنیات بنێت. ئەم چاودێریە وردەی عومەر بۆ کاربە دەستەکانی هێمنی بەسەر هەرێمەکاندا، هەروەك ئەم ڕێنمایی و چاودێریەش وای کردبوو لە والی و کاربەدەستەکان کە هەمیشە لە بیری کاردا بن، ئیبراهیمی کوڕی جەعفەر لە باوکیەوە باس دەکات و ئەڵێ: ئەبوبەکری کوڕی محمدی کوڕی عەمری کوڕێ حەزمم بینی بەشەو ڕۆژ کاری دەکرد،، چونکە عومەر هانی دا بوو بۆ ئەوە [2].

عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) پشکنەری دەنارد بۆ هەرێمەکان هەتاوەکو هەواڵی بۆ بێننەوە: ئەوە بوو سێ پشکنەری نارد بۆ خوراسان، هەتاوەکو لە گلەییەکانی خەڵك بکۆڵنەوە سەبارەت بە خەراج کە عەدی کوڕی أرطأرة لەسەر خەڵکی ئەوێ داینابوو، پشکنەرێکی نارد بۆ عێراق هەتاوەکو هەواڵی خەڵك و والیەکانی بۆ بێنن [3] هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز لە چوارچێوەی بەدوا چوونی کاروبارەکانی دەوڵەتدا چاودێری گشتی ڕاگەیاند، ئەوە بوو نامەیەکی نوسی بۆ خەڵکی حەجی لە ڕۆژی حەج گەورەدا کە تیایدا هاتبوو: من بێ بەریم لەستەمی ئەو کەسەی کەستەمی لێکردن.. ئاگادار بن مۆڵەت خواستن ی ستەملێکراو بۆ چوونەلای هیچ کار بەدەستێك لە خوارەوەی من پێویست نیە، منیش پشت و پەنای هەموو ستەملێکراوێکم، هەر کار بەدەستێکیشم لابدات لە حەق و کاربە قورئان و سوننەت نەکات ئەوە گوێڕایەڵی لەسەر ئێوە پێویست نیە.. هەر کەسێکیش کارێ بکات کە چاکسازی گشتی یان تایبەتی لێ بکەوێتەوە ئەوە لەسەد دینار هەتاوەکو سێ سەد دیناری پێ دەدرێت بە ئەندازەی ئەو کارە چاکەی کە کردوویەتی [4].

---

[1] - تاریخ دمشق، لە اثر العلماء في الحياة السياسية، ل: ١٨٨

[2] - الطبقات(٥ / ٣٤٧) اثر العلماء، ل: ١٨٨

[3] - عمر بن عبدالعزيز، للزحيلي، ل: ١٨٢

[4] - عمر لابن الاجوزي، ل: ٩٠.

بەم شێوەیە لە گەورەترین کۆبوونەوەی ئیسلامی دا خەڵکی هان دا لە ڕووی مادی و مەعنەویەوە بۆ چاودێری کردنی خۆی و کاربەدەستەکانی و ئاشکرا کردنی هەرشتێك کە پێچەوانەی قورئان و سوننەتە، ئاشکراشە کە ئوممەتی ئیسلامی پێویستی بە شتێکی تر نیە جگە لە ڕێنماییەکانی قورئان وسوننەت، ئاشکراشە کە ئوممەتی ئیسلامی پێویستی بەشێکی تر نیە جگە لە ڕێنماییەکانی قورئان و سوننەت ئەگەر پابەندبوون پێوەی مەبەستی سەرەکی بێت [1].

## چوارەم: پلاندانان لە ئیدارەی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا:

پلاندانان بەوە دەناسرێت کە ئەو کردەیە یە کە ئەنجام دەدرێت بۆ دابین کردنی پێداویستیەکانی داهاتوو و دیاری کردنی هۆکارەکانی بەدەستهێنانی [2]، هەروەها بەوە دەناسرێت کە پردی نێوان ئێستا و داهاتووە لەم پێناسە گشتیە شەوە ئەتوانین بڵێین کە پلان دانان لە ئیسلام دا بریتیە لە ئامادەبوون لە ئێستادا بۆ هەر شتێك کە ڕووبەڕووی مرۆڤ دەبێتەوە لە کارو ژیانیدا لە داهاتوودا [3]، عومەری کوڕی عبدالعزیز یش هیچ بڕیارێکی نەدەدا بەبێ پلان دانان و سەرجدانی سەرنجامی کارەکان و بەهەند وەرگرتنی، لەوانەشە بەهێزترین ئاماژە بۆ پەی بردنی عومەری کوڕی عبدالعزیز بە گرنگی پلان دانان و بیرکردنەوە لە کاروبارەکان ئەوە بێت کە بەڕەجائی وت: ئەی ڕەجاء من عەقلێکم هەیە ئەترسم خوا لەسەری ئازارم بدات [4]، ئاشکراشە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز پشتی دەبەست بە خوای گەورە پاشان بە کۆکردنەوەی زانیاری و توانای باش خوێندنەوەی و بیرکردنەو و پێشبینی کردنی ئاینده و بەدیهێنانی ئامانجە خوازراوەکان، لە بارەی ئەمەشەوە عومەر ئەڵێ: هەر کەسێ بە بێ زانیازی کار بکات ئەوەی کە خراپی دەکات زیاترە لەوەی کە چاکی دەکات [5].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) لە پلان داناندا ئامانجەکانی دا دەنا و سیاسەتەکانی هەڵدەبژارد و ڕێوشوێنەکانی دیاری دەکرد و کاری گەلاڵە دەکرد لە چوارچێوەی گەلاڵە کردنی ئامانجەکانیشدا ئامانجێکی سەرەکی هەبوو کە عومەر هەوڵی دەدا بۆ بەدیهێنانی کە ئەویش چاکسازی

---

[1] - النموذج الاداري المستخلص من عمر بن عبدالعزيز، ل: ٤١٣.

[2] - الادارة المنيف، ل: ١٤٧.

[3] - الادارة في الاسلام للضحيات، ل: ٧١.

[4] - عمر بن عبدالعزيز، لابن الجوزي، ل: ٢٦٦.

[5] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ٢٥٠، لابن الجوزي.

و نوێگەری ڕاشیدی بوو بە پێی ڕێبازی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەلافەتی ڕاشیدین و هەستان بە هەموو پێداویستیەکانی ئەم پرۆژە چاکسازیە لە بەرچاوکردنی دادگەری و حەق و نەهێشتنی ستەم و گێڕانەوەی پێکەوە گونجان لە نێوان مرۆڤ و بوونەوەر و ژیان و بەدیهێنەریاندا لە چوارچێوەی تێگەشتنی هەمەلایەنەدا بۆ ئیسلام دا، هەرچی هەڵبژاردنی سیاسەتەکانیشە وەك یەکێك لە پێویستیەکانی پلان دانان ئەوە لە جێ بەجێ کردنی نەخشەسازی کارگێڕی دا لەلایەن عومەرەوە دەردەکەوێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە سوور بوونی عومەر بوو لەسەر پابەند بوون بە قورئان و سوننەتی پیرۆزەوە و [1] ئامادە نەبوونی بۆ گوێگرتن بۆ هیچ مشتومڕێك لە مەسەلە شەرعیەکاندا، بەوپێیەی کە ئەو فەرمانڕەوای جێبەجێ کارە و شەرعیش بۆ خۆی و ژێر دەستەکانیەتی، هەر بۆیە پابەندبوون بەشەرعەوە لەسەر هاوڵاتیان پێویست کرد [2]. ئەمەش لە چوارچێوەی دیاریکردن و هەڵبژاردنی سیاسەتی گشتی دا، سەبارەت بە دیاریکردنی ڕێوشوێنەکانی وەك یەکێك لە پێویستیەکانی پلاندانان، ئەوە ئەمەش لە ڕوانگەی ئەو ڕێوشوێنانەوە ڕون دەبێتەوە کە دیاری کرد بۆ جێبەجێ کردنی ئەم سیاسەتە لەگەڵ چاو پێکەوتنی یەکەمی لەگەڵ ئومەتدا کاتێ کە چەند مەرجێکی دانا بۆ هاوڕێیەتی کە پێشتر ڕونم کردەوە، سەبارەت بەگەڵاڵە کردنی شێوازی کارکردنیش ئەوە ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو جێبەجێکارە نەك بیدعەچی – واتە جێبەجێ کەری ڕێنماییەکانی ئاینە و گوێڕایەڵیش تەنها بۆ کەسێکە کە گوێڕایەڵی خوا بکات – [3] هەروەك دەبێ بناغەی کار بەرپاکردنی دادگەری و چاکسازی و چاکەکاری بێت لەبری ستەم و تاوان و دەستدرێژی [4].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز((ڕەزای خوای لێ بێت) پلاندانی بەشێوەیەکی گشتگیر پەیڕەو دەکرد و پلان دانانیشی هەموو بوارەکانی دەگرتەوە و هیچ بوارێکی نەهێشتەوە کە لە دەرگای نەدابێت وەك بواری سیاسەت و حوکم و دادوەری و ئابووری و پەوەردە و زانست و بوارە کۆمەڵایەتیەکان سەرباری پەلاندانی بۆ کارو بارەگشتیەکان و، گرنگی بە چەند هەرێمێك دەدا

---

[1] - سیرة عمر لابن عبدالحکم، ل: ٣٥.

[2] - سیرة عمر بن عبدالعزیز، ل: ٣٦، ٣٥.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل ١٠٢.

[4] - النموذج الاداری المستخلص عن عمر بن عبدالعزیز، ل: ٤٠٠.

بەشێوەیەکی سەربەخۆ وەك خوراسان و عێراق و گرنگیشی بە چەند دەزگایەکی ڕێکخراوەیی تر دەدا وەك دادوەری و بەیتولمال و کۆکەرەوەی خەراج و... هتد.

**پێنجەم: ڕێکخستن لە ئیدارەی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا:**

ڕێکخستن هەمیشە تەواوکەری پلاندانانە بۆ بنیاتنانی ڕێوشوێنە پێویستەکان بۆ جێبەجێ کردنی پلانەکان، عومەریش ڕێکخستنی بە گرنگترین کاری ئیداری دادەنا و تێگەیشتنیشی بۆ ڕێکخستن لە هەڵسوکەوتی ئیداری خۆیدا بەرجەستە کرد بوو، ئەوە بوو لە ڕووی ڕێکخستنی ئیداری کارەوە، کارەکانی دەوڵەتی بۆ چوار بەشی سەرەکی دابەش کردبوو کە لە ژێر بەرپرسیارێتی چوار کەسی سەرەکی دا بوو کە ئەوانیش: والی و دادوەر و بەرپرسی بەیتولمال و خەلیفە بوون [1]، ئەمە جگە لە چەند ڕێکخستنێکی تری وەك: خەراج و سەربازەکان و نووسەران و پۆلیس و پاسەوان و بەرپرسی مۆر و دەرگاوان و چەند پۆستێکی تر.

---

[1] - النموذج الاداري المستخلص، ل: ٤٠١

ئەمەش ئەو کلێشەیە کە بەرپرسیارێتی کارەکان ڕێك دەخات لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا.




سەبارەت بە ڕێکخستن لە ڕووی شوێن و پەیوەندی نێوان خەلیفە و والی و کاربەدەستەکان و دیاری کردنی شێوازەکانی کار و جێبەجێ کردنەوە، ئەوە ئەتوانین بلێین کە زۆربەی نامەکانی عومەر بۆ کار بەدەستەکانی هەولێك بوو بۆ بەدەستهێنانی ئەم مەبەستە و ڕوونکردنەوەی لایەنی ڕێکخستن لە پرۆسەی کارگێڕی دا، بۆ نموونە هەستا بە ڕوونکردنەوەی شێوازی مامەڵە لە نێوان ئەو و ستەملێکراوان و چۆنێتی پەیوەندی کردن لە نێوانیاندا، ئەوە بوو مۆڵەتی دا هەتاوەکو ستەملێکراوان بە بێ مۆڵەت بچنەلای، گێڕانەوەی زۆر مەسەلە و کار بۆ ئەو ئەو شێوازەی کە لە سەردەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەلیفەکانی ڕاشدین دا لەسەری بوو، نموونەی ئەمەش فەرماندان بە گێڕانەوەی باخەکانەی لە خەیبەردا بۆ ئەو بارەی کەلەسەردەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەری بوو،

هەمان کاریشی بەفدك کرد [1]. ئەوە بوو نامەیەکی نووسی بۆ ئەبوبەکری کوڕی حەزم والی مەدینە و تیایدا ئەیوت: من سەیری فدکم کردووە و بۆم دەرکەوتووە کە بەو شێوە باش نیە و پێم باشە بیگێڕمەوە بۆ ئەو حاڵەتی کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان دا لەسەری بوو، تۆش وەریگرە بیدەرە دەست پیاوێك کە بەشێوەیەکی دروست مامەڵەی تیادا بکات و السلام علیك [2].

هەموو ئەوشتانەی بۆ کاربەدەستەکانی نووسی کە پەیوەندی بە کاروباری دارایی و بەخشین و باج و پێنج یەك و زەکات لە ماڵ و موڵکدا و ڕێکخستنی کرێکاری بازرگانی و ئەو کەسانەی کەمافیان نیە بازرگانی بکەن [3] و شتی تر.

عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) گرنگی دەدا بە ڕێکخستنی کاروبارەکانی دادوەری وەك تا کەرێگەیەك بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی خەڵك و پاراستنی مافەکانیان، چونکە هەر هەرێم و ویلایەتێك دادوەرێکی هەبوو کە بەگوێرەی قورئان و سوننەت حوکمی دەکرد، دادوەری هەرناوچەیەکیش باشترین شیاوترین دادوەر بوون لەو ناوچەیەدا [4]، وەك عامری کوڕی شورەحبیلی شەعیی لە کوفەدا [5] و حارسی کوڕی یمجدی ئەشعەری لە حمص و [6]، عومەری کوڕی سولەیمان ی کوڕی خوبەیب ی محاربی لە دیمەشق [7] و کەسانێکی تر، هەروەك عومەر خۆشی دادوەری دەکرد [8]، مەسەلەی سەرەکیش لە ڕێکخستنی دادوەریدا بریتی بوو لە گەڕانەوە بۆ حەق، چونکە گەڕانەوە بۆ

---

[1] - فدك: گوندێکە لە حیجاز کە لە نێوان ئەو و مەدینەدا دوو تاسێ ڕۆژەرێیە، خوای گەورە کردی بە فەیئ بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ دابەزیە خەیبەر و موڵکی تایبەتی خۆی بوو، چونکە ئەسپ و سوار پێیان تێ نەناوە هەروەها فدك کانیەکی ئاوی باش و دارخورمای زۆری تیایە.(٢٧٠).

[2] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ١٣١، لابن الجوزي.

[3] - سيرة عمر، لابن عبدالحكم، ل: ٧٨ — ٨٣.

[4] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٤٠٣.

[5] - عمر بن عبدالعزيز و سياسة في رد المظالم، ل: ٢٧٧.

[6] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٨٤.

[7] - هەمان سەرچاوە، ل: ٢٨٥.

[8] - النومذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٤٠٣.

حەق باشترە لە ڕۆچوون لە بەتاڵدا [1]، کاتێ خەڵکی سەمەرقەندیش سکالای قوتەیبەی کوڕی موسلیمیان کرد، دادوەرێکی بۆ دیاری کردن هەتاوەکو حوکم بکات لەو مەسەلەدا وەك پێشتر باسمان کرد، لەم ڕووداوەشدا عومەر(ﷺ) بنەمای جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکانی بەباشترین شێوە جێبەجێ کرد، ئەوە بوو کاتێ بە سکالاکەی خەڵکی سەمەرقەندی پێگەشت خۆی دادوەری لە نێوان دا نەکردن لە کاتێکدا کە توانای ئەنجامدانی ئەو کارەی هەبوو بەو پێیەی کە خەلیفەی موسڵمانانە، ئەم کارەشی نەسپارد بە سولەیمان کوڕی ئەبی سرِی کار بەدەستی خۆی لەسەمەرقەند دا نەوەکو بە کار ئارەزوو بکات یاخود بکەوێت بەقینەوە لێیان، چونکە ئەو بەناوی خەلیفەوە کار دەکات کە ڕازی نەبوو خودی خۆی ببێتە دادوەر، لەو کێشەکەدا، و ئەو کارەشی بەو سەرکردە سەربازیە نەسپارد، بەڵکو فەرمانی دا بەدانیشتنی دادوەر بۆیان، چونکە دادوەر ناکەوێتە ژێر فشارە سەربازی و سیاسیەکان و تەنها گوێ بە حوکمی خوا دەدات و شەریعەت جێبەجێ دەکات بەو شێوەی کە هاتووە.

بەم شێوەش گومانی عومەری کوڕی عبدالعزیز بەدی هات و دادوەر بڕیاری چوونە دەرەوەی عەرەبی سەمەرقەندی دا بۆ سەرباز گەکەیان، واتە فرمانی چۆڵکردنی ناوچەکەی پێدان، چونکە داگیرکردنی ناوچە کە بەشێوەیەکی نارەوا ڕووی دا بوو [2]. هەروەها ڕێکخستنەکانی عومەر کۆشکی خیلافەتیشی گرتەوە و سەر لە نوێ ڕێکی خستنەوە بە جۆرێك کە لەگەڵ تێڕوانینی خۆی دا بگونجێ وەك یەکێك لە موسڵمانان کە پێویستی بە دەسەڵات و سیمای پاشایەتی نیە، ئەوە بوو و وازی لە هەموو ڕواڵەتەکانی خیلافەت هێنا کە پێش خۆی هەبوو، چەند پۆستێکیشی هەڵوەشاندەوە وەك بەرپرسی پۆلیس کە بە شمشێرەکەیەوە لەبەردەم خەلیفەوە دەڕۆشت ئەوە بوو عومەر پێی وت: دوورکەوەرەوە لێم، پێویستم بە تۆ نیە، چونکە من کەسێکم لە موسڵمانان، پاشان ڕۆشت و خەڵکی لەگەڵیدا ڕۆشتن [3].

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ٤٠٣.

[2] - نظام الحكم في الشريعة و التاريخ الاسلامي(١ / ٤٠٧).

[3] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل ك ٦٥ لابن الجوزي.

**شەشەم: خۆ پاراستن لە گەندەڵی ئیداری لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا:**

عومەری کوڕی عبدالعزیز هەوڵی دەدا بۆ خۆپارستن لەگەندەڵی ئیداری، بە سوور بون لەسەر ئەو هۆکارانەی کە دەبنە پارێزەرلێی و داخستنی دەروازەکان بە ڕووی پەتا ئیداریەکاندا وەك ناپاکی و درۆ و بەرتیل و دیاری دان بە بەرپرس و ئەمیرەکان و زیادەڕەوی کردنی والی و ئەمیرەکان لە بازرگانی کردن و خۆشاردنەوەی بەرپرسان لە خەڵك و ئاگادار نەبوونیان لە باردۆخیان و ستەمکردن و مافخواردنی خەڵك و چەندین شتی تر، ئەمەش بەدرێژی باسی ئەو مەسەلەیەیە:

١- **باشکردنی باری گوزەرانی کاربەدەستان:** یەکەم ڕێوشوێنی ئیداری کە عومەری گرتیە بەر بۆ پاراستنی کاربەدەستان لە ناپاکی بریتی بوو لە باشکردنی باری گوزەرانی والی و کاربەدەستەکانی بە زیاد کردنی موچە بۆیان ئەمە سەرباری گرتنەوەی موچە لە خۆی و خێزانەکەی، مەبەستیشی بەمە دوورخستنەوە یان بوو لە خیانەت و ناپاکی نواندن ئەوە بوو موچە و بەخشینی کار بەدەستەکانی زیاد کرد و مانگانە سەد یان دوو سەد دیناری دەدا بەهەریەکەیان، بەڵگەشی ئەوە بوو کە ئەگەر کاربەدەستەکان تێر بن ئەوە یەکلا دەبنەوە بۆ کێشەکانی خەڵك، کاتێ وتیان: ئەی بۆ بەو جۆرەی کە سامان بەکاربە دەستەکانت دەبەخشیت بە منداڵەکانتی نابەخشیت؟ وتی: هیچ مافێکی خۆیانیان لێ قەدەغە ناکەم و مافی خەڵکی تریشیان پێ نادەم، بەهۆی ئەم ڕێ و شوێنە شەوە عومەر توانی دوو شتی گرنگ بەدەست بێنێت:

أ- داخستنی دەرگای خیانەت و ئەوەی کە والە کاربەدەستەکان دەکات کە خیانەت بکەن و ماڵی موسڵمانان بدزن.

ب- مسۆگەر کردنی یەکلا بوونەوەی والی و کاربەدەست و ئەمیرەکان بۆ کار و پێداویستیەکانی موسڵمانان [1].

٢- **سوربوونی لەسەر دوور خستنەوەی خەڵك لە درۆ:** مەیمونی کوڕی مەهران ئەڵێ: چومە لای عومەری کوڕی عبدالعزیز و لەو کاتەشدا کار بەدەستی کوفەی لابوو، عومەری زۆر تووڕە بوو لێی، منیش وتم: ئەوە چیەتی ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەویش ئاگاداری کردمەوە کە وتویەتی: هەرکەسێکم دەست بکەوێت کەشایەتی درۆی دابێت زمانی دەبڕم، ئەڵێ: وتم: ئەی

---

[1] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٣١٤.

ئەمیری باوەڕداران ئەو بەڕاستی نەبووە و ئەوکارەی نەدەکرد. وتی: سەیری ئەم پیاوە پیرە ناکەن – ڕازی نەبوو بە قسەکەی مەیمون – ئەگەر دوو پلەوپایە باشەکەیان درۆبێت ئەوە هەردووکیان خراپە [1]. بەم شێوە عومەر هەوڵی دەدا بۆ بنەبڕکردنی گەندەڵی ئیداری بە هۆشداری دان لەو دەرەنجام و هۆکارانەی کە لە ئاکامی درۆ و فێڵ کردن لە بڕیاردان دا پەیدا دەبێت.

٣- **ڕێ نەدان بە وەرگرتنی دیاری و بەخشش:** ئەوە بوو وەڵامی ئەو کەسی دایەوە کەوتی ئایا پێغەمبەری خوا(ﷺ) دیاری وەرنەگرتوە؟ [2] وتی بەڵێ:(بەلاّم ئەوە بۆ ئەوان دیاری بوو بۆ ئێمە بەرتیلە) هەروەها عومەر وەرگرتنی دیاری هەڵوەشاندەوە کە پێشتر والیە ئەمەویەکان وەریان دەگرت بەتایبەت دیاری نەورۆز و فیستیڤاڵ کە چەند دیاریەك بو لە بۆنە و چەژنی فارسەکاندا دەبەخشرا، عومەری کوڕی عبدالعزیزیش نامەیەکی نوسی بۆ کار بەدەستەکانی هەتاوەکو بۆ خەڵکی بخوێنرێتەوە و تیایدا بڕیاری هەڵوەشاندنەوەی دیاری وەرگرتن و ئەو کرێ و نرخەی دابوو کە لە نەورۆز و ئاهەنگ دا وەردەگیرا [3]، والی و کاربەدەستەکانیشی ئاگادار کردووە لەوەی کە داخوازیەکانی خەلیفە یاخود یەکێك لە ئەندامانی خێزانەکەی وەك شتێکی پێویست و مسۆگەر وەرگرن، وەك ئەوەی کە ڕووی دا لە کاتێکدا کە فاتیمەی کچی عبدالملك ی خێزانی عومەر ناردی بۆ کوڕی مەعدی کەریب و داوای هەنگوینی لێکرد لە هەنگوینی سنین یان لوبنان، ئەویش بۆی نارد عومەریش پێی وت: سوێند بەخوا ئەگەر دوبارەی بکەیتەوە، بۆ هەتاهەتایە لە پۆستەکەت دورت دەخەمەوە و هەرگیز سەیری نێوچەوانت ناکەم [4].

٤- **نەهی کردن لە زیادە ڕەوی و دەست بلاّوی:** ئەوە بوو چەند بڕیارێکی دا کە بەڵگەیە لەسەر سووربوون و گرنگی دانی زۆری بەسامان موڵکی موسڵمانان، لەو بڕیارانەش وازهێنانی لە ڕواڵەتەکانی خەلیفایەتی، ئەوە بوو کاتێ کە ژاوەیان بۆ هێنانی پرسیاری کرد و وتی: ئەمە چیە؟ وتیان چەند کەژاوەیە کە تا ئێستا کەس سواری نەبووە و خەلیفە لەسەرەتای وەرگرتنی

---

[1] - البداية و النهاية، له النموذج الاداري، ل: ٣١٥.

[2] - النموذج الاداري، ل: ٣١٥.

[3] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، ل: ١٣٤ لابن الجوزي.

[4] - النموذج الاداري المستخلص، ل: ٣١٦.

پۆستی خەلیفایەتی دا سواری دەبێت، ئەویش بەجێ ی هێشت و چوو بەدوای هێسترەکەیدا وتی: ئەی موزاحم – خزمەتکارەکەی – ئەو ماڵ و سامانە بگێڕەوە بۆ بەیتولمال، هەروەها چەندین فەرش و ڕاخەری بۆ ڕاخرا، کە پێشتر بۆ خەلیفە ڕادەخرا لەسەرتای دەست بەکاربوونیەوە، بەڵام ئەو لەسەریان دانەنیشت و وتی: ئەی موزاحم هەموو ئەمانە بگێڕەوە بۆ بەیتولمال، پاشان سواری هێسترەکەی بوو و چوە بۆ لای ئەو فەرش و ڕاخەری کە کەس لەسەری دانەنیشتیوو و بۆ خەلیفەکان ڕادەخرا و بە نوکەپێ پاڵی پێوە نا و وتی: ئەی موزاحم ئەمانە بخەرەوە سەر ماڵی موسڵمانان [1]، هەروەك ڕێوشوێنێکی تری گرتەبەر بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی زیادەڕەوی لە دەوڵەتدا، کاتێکیش مەیمونی کوڕی مهران لە کاتێکدا کە پێکەوە لە کاروباری خەڵك دەکۆڵینەوە، پێی وت: بۆ ئەم تۆمارانە [2] بە پێنووسی گرانبەها دەنووسرێت و زۆری تیادا نانووسرێت لە کاتێکدا کە موڵکی بەیتولمالی موسڵمانانە؟ ئەویش نامەیەکی نووسی بۆ کاربەدەستان: با لەم پەڕانەدا نەنوسن و پەڕەی درێژ بەکار نەهێنن، ئەڵێ: پاشان پەڕەکان بچوك کرایەوە و لە بستێك زیاتر نەبوو [3]. پێشتریش باسی نامەکەی عومەرمان کرد بۆ ئەبی بەکری کوڕی محمدی کوڕی حەزمی ئەنساری والی مەدینە دەربارەی مۆمەکان و ڕێنمایی کردنی لەلایەن عومەرەوە سەبارەت بە چۆنێتی نووسین کاتێ کە پێی وت: ئەگەر ئەم نامەیەی منت پێ گەشت ئەوە قەڵەمەکەت تیژبکە و وردبنوسە وشەکان کۆبکەرەوە و پێویستیەکی زۆر لەیەك پەڕەدا کۆبکەرەوە، چونکە موسڵمانان پێویستیان بە قسەیەکی زیادە نیە کەزیان بە بەیتولمالیان بگەیەنێت و السلام علیك [4].

ئەمە نەریتی عومەرە لەهەر مەسەلەیەکدا کە تایبەت بێت بە سامانی موسڵمانانەوە، بچوك بێت یان گەورە و لەگەڵ هەموو والیەکاندا، چونکە بەڵگە نەویستە کە عومەر تەنها لەگەڵ والی مەدینەدا بەم شێوە نەبووە، بەڵکو ئەمە هەموو والی و کاربەدەستەکانی گرتۆتەوە، ئەوە بوو عومەر هەوڵی دەدا

---

[1] - سيرة عمر، لابن عبدالحكم، ل: ٣٣.

[2] - تۆمار – طوامير: کۆی طومارة واتە: پەڕەی گەورە لسان العرب(١ / ٥٠٣)

[3] - سيرة عمر، لابن الجوزي، ل: ٨٨.

[4] - سيرة عمر لابن عبدالعزيز، لابن عبدالحم، ل ك ٥٥.

بۆ دەستگرتن بە پارە و کەمکردنەوەی خەرجی بەیتولمال هەتاوەکو ڕێگر بێت لە زیادەڕەوی و دەست بلاوی [1].

٥- **ڕێگری کردن لە بازرگانی کردنی والی و کاربەدەستان:** لەنامەیەکیدا بۆ کار بەدەستەکانی هاتووە: ڕامان وایە کە نابێ هیچ پێشەوا و کاربەدەستێك بازرگانی بکات لە سنووری دەسەلاتی خۆیدا، چونکە ئەمیر هەرکاتێ بازرگانی بکات شتەکان قۆرخ دەکات و دەستی بەشتانێك دەگات کە مەترسیدارە، هەرچەندە مەبەستیشی نەبێت [2] ئەمەش بەلگە یە لەسەر دەرککردنیعومەر بەوەی کە بازرگانی کردنی کاربەدەست والیەکان بەدەر نیە لە دوو شت:

یان دەبێ سەقالی بازرگانیەکەی بێت و کاروباری موسلمانانی لەبیر بچێت، یاخود بەهۆی پۆستەکەیەوە بازرگانی قۆرخ بکات و شتانێکی دەست بکەوێت کە مافی ئەو نیە، بەم بڕیارەش عومەر دەروازەیەکی مەترسیداری داخست کە لەوانەیە ببێتە هۆکار بۆ گەندەلیەکی ئیداری درێژخایەن و کاریگەر [3].

دوای هەشت سەدەش ئیبن خەلدون هات و لە(مقدمە) مەزنەکەیدا دوای چەندین ئەزمونی درێژ و لێکۆلینەوەی فراوان شتانێکی نووسی کە تێڕوانینە ڕاستگۆیانە و حیکمەتە کاریگەرەکانی عومەری سەلماند کاتێ وتی: بازرگانی کردنی دەسەلاتدار زیانبەخشە بۆ هاولاتیان و باجیان لەسەر زیاتر دەکات [4].

٦- **کردنەوەی کەنالی پەیوەندی لە نێوان والی و هاولاتیان دا:** خەلکانی دەوروبەری خەلیفە بوو بوونە ڕێگر لەبەردەم گەشتنی خەلکی بە خەلیفە و ئەم دەست و پێوەندە بەربەستێکی ئاسنینیان دروست کردبوو بە دەوری خەلیفە دا بەجۆرێك کە تەنها ئەو شتانەی لێی تێ پەڕدەبوون کە ئارەزویان لێ بوو، یاخود لە بەرژەوەندیان بوو. هەرچی عومەری کوڕی عبدالعزیزیشە ئەوە دیاری و خەلاتی مادی بۆ ئەو کەسانە ڕاگەیاند بوو کە لە ڕاستی

---

[1] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٣١٩.

[2] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، لابن عبدالحكم، ل: ٨٣.

[3] - النموذج الاداري المستخلص، ل: ٣٢٠.

[4] - مقدمة ابن خلدون لە رجال الفكر و الدعوەی نەدەویەوە،(١ / ٤٦).

مەسـەلەکان ئاگاداریـان ئـەکردەوە، یـاخود ئامۆژگـاری دەکـەن بەشـتێك کـە بەرژەوەنـدی موسڵمانان و دەوڵەتەکەیانی تیابوو، ئەوە بوونامەی نووسی بۆ ئامادە بوان لە وەرزی حەجدا: پاشان هەرکەسێك بێتە لامان بۆ ڕەتکردنەوەی ستەمێك یان شتێك کە خوای گەورە بەهۆیـەوە بەرژەوەندیەکی تایبەت یان گشتی بەدەست بێنێت ئەوە لەسەد دینارەوە هـەتاوەکو سـێ سـەد دیناری پێ دەدرێت بە پێی ئەو فرمان بە چاکەی کە پێی هەستاوە و دووری ئەو ڕێگەیەی کـە بڕیویەتی، بەڵکو خوای گـەورە بەهۆیـەوە حـەقێك بـچەسپێنێت و بـە تاڵێـك لەناوبـەرێت و دەروازەیەکی خێر بکرێتەوە [1].

هەروەها فەرمانی دا بە کاردەبەست ووالیەکان کە سووربن لەسەر کردنەوەی کە ناڵی پەیوەندی لە نێوان خۆیان و هاولاتیان و گوێ بیستبوون و زانینی بارودۆخیان، چونکە ئەوە دەبێتـە ڕێگـر لـە ستەمکردن و دەستدرێژی کردنە سەر مافی خەڵکانی تر و بوار بـۆ هـەر تاکێـك ئەرەخـسێت بـەبێ ئەوەی پەنا بۆ چەند شێواز و ڕێگایەك بەرێت کە پەیوەندی بە ئیسلامەوە نیە [2].

٧- **هەستانی بە لێپرسینەوەی والیەکان دەربارەی سامانی بەیتولمال:** کاتێ کە عومەری کـوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە هەستا بە دەستگیر کردنی یەزیدی کوڕی مهلّب ی والی خوراسـان، کاتێ کە هێنایانە بەردەستی پرسیاری لێ کرد دەربارەی ئەو برە پارەیـەی کـە بـۆ سـولەیمانی کوڕی عبدالملك نووسیبووی ئـەویش وتـی: مـن لای سـولەیمان ئـەو پلەوپایـەم هـەبوو کـە ئەیزانیت، بۆیە نامەشـم نووسـی بـۆ سـولەیمان هـەتاوەکو خـەڵکی بیبیـستن، ئەشـزانیت کـە سولەیمان شتێکی نەدەبرد کە من بمویـستایە و کارێکیـشی نـەدەکرد کـە پێم نـاخۆش بوایـە، عومەریش پێی وت: حوکمی تۆ تەنها زیندانی کردنە، جا لە خوا بترسە و مـافی ئـەو خەڵکـە بگێڕەوە، چونکە ئەوە مافی موسڵمانانە و نـاتوانم دەسـت بـەرداری بم، پاشـان گێڕایـەوە بـۆ زیندان، ئەویش لە زینداندا مایەوە هەتاوەکو هـەواڵی نـەخۆش کـەوتنی عومـەری بیـست [3]، هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) هەمیشە هەواڵی والیەکانی دەپرسی و چـاودێری و لێپرسـینەوەی لەگەڵـدا دەکـردن وئـەوە بـوو نامەیـەکی نووسـی بـۆ یـەکێکیان و

[1] - رجال الفكر و الدعوة(١ / ٤٧).

[2] - النوذج الاداري المستخلص، ل: ٣٢٠.

[3] - تاريخ الطبري(٧ / ٤٦٠ و ٤٦١ و ٤٦٢)

ئەیوت:(لۆمەکارانت زۆر بوون و ستایشکارانت کەم بوونەتەوە جا یان دەبێ دادگەر بیت یان دەبێ واز لە کارەکەت بێنیت [1] والسلام.

**حەوتەم: مەرکەزی بوون و لامەرکەزی بوون لە ئیدارەی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا:**

عومەری کوڕی عبدالعزیز بنەمای کرکۆدنەوە و هاوسەنگی کردنی لە نێوان مەرکەزی بوو و لامەرکەزی بوون دا جێبەجێ کرد لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا ئەویش بە جێبەجێ کردنی هەریەکێکیان بە پێی چەند پێوەرێکی دیاری کراو، لێرەشدا چەند هەڵوێست و ڕێوشوێنێك دەخەینە ڕوو کە ئەمە ڕوون دەکاتەوە، لەو فەرمانانەش کە بەڵگەیە لەسەر پەیڕەو کردنی مەرکەزی بوون لە بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا ئەوەی کە لە نامەیەکدا نووسی بۆ کاربەدەستی خۆی لە کوفە و تیایدا هاتبوو:... من ئەو کارانەم پێ سپاردووی کە خوای گەورە پێی سپاردووم، بەڵام پەلەمەکە لە دەست بڕین و لەسێدارەداندا هەتاوەکو پرسم پێ دەکەیت [2]، لێرەدا عومەر بەرژەوەندی ئوممەتی لە جێبەجێ کردنی مەرکەزیەتدا دەبینی، چونکە مەسەلە کە زۆر گرنگ بوو، لەوانەشە شمشێریش پێش لەسەر کار لابردنی بکەوێت و ئەوکاتەش بەرژەوەندی ئوممەت لەپەلەکردن لە مەسەلەی کوشتن و لە سێدارەداندا نابێت، هەریەکەشیان سزای خۆی وەردەگرێت زوبێت یان درەنگ، هەروەها عومەر لێکۆڵینەوەی دادگەرانەی لە لێکۆڵینەوەی توندوتیژ پێ باشتر بوو [3].

جا ئەبێ لەمەسەلەیەکی گرنگ تردا چۆن بێت کە مەسەلەی کێشانی گیانی مرۆڤێکە [4]، هەروەك شتی تری گشتگیر تر هەبوو لەمەشدا عومەر بۆ کاربەدەست و دادوەرەکانی ڕوون کردەوە کە دەبێ پابەندبن بە شێوازی مەرکەزیەوە تیایدا، کە ئەویش ئەو شتانەیە کە ئوممەت تووشی دەبێت و پێشینەی لە قورئان و سوننەتدا نیە، ئەوە بوو نامەیەکی نووسی بۆ کار بەدەستەکانی و تیایدا سیاسەتی خۆی بۆ ڕوون کردنەوە وتی:.. سەبارەت بەو مەسەلانەی کە پێش هاتوون بۆ ئوممەت و لە قورئان و سوننەتدا حوکمیان نەهاتوو ئەوە پێشەوا و خەلیفەی موسڵمانان بڕیاری لەبارەوە دەدات و بەکەمتر لە ئاستی

---

[1] - عمر بن عبدالعزيز، عبدالستار الشيخ، ل: ٢٧٥.

[2] - تاريخ الطبري له النموذج الاداري، ل: ٣٢٢.

[3] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٣٢٣.

[4] - هقمان سترضاوة، ل: ٣٢٣.

خۆی لێ ناڕوانێ و پێویستە لەسەر ئەو کەسانەش کە لە خوار خەلیفەوەن بەرزی بکەنەوە بۆی و ڕازی بن بەوەی کە بڕیاری لەسەر دەدات [1].

لە بوارێکی تریشدا شێوازی مەرکەزی بە پێویست دەزانی، ئەوە بوو زیاتر لە والیەکی دانا بۆ عێراق و سجستان و خوراسان و عومانیش ڕاستەوخۆ پەیوەست بوون بە خەلیفەوە، هەروەها والیەکی دانا بۆ ئەندەلوس بێ ئەوەی پەیوەست بێت بە والی ئەفریقیەوە [2]، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز مەرکەزیەتی ڕەچاو دەکرد و گەڕانەوە بۆی بە پێویست دەزانی.

●سەبارەت بە پەیڕەوکردنی لامەرکەزیەتیش ئەم نموونانە دەخەینە پێش چاو: ئەگێڕنەوە کە عومەر نامەیەکی نووسیوە بۆ عروەی کوڕی محمد کاربەدەستی خۆی لە یەمەندا و وتویەتی: پاشان ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم و فرمانت پێ دەکەم کە مافەکان بگێڕیتەوە بۆ موسڵمانان و سەرم لێ بدە و گوێ بەماوەی نێوانی من و خۆت نەدەیت و لە مەرگ نەترسیت، تەنانەت ئەگەر نامەم بۆ نووسیت کە مەڕێکی زەوتکراوی موسڵمانێك بگێڕەوە ئەوە دەبێ بنوسی ئایا سپی بێت یان ڕەش! جا مافی موسڵمان بگێڕەوە و مەگە ڕێرەوە بۆ من [3].

لەم بڕیارەشدا وردەکاریەکی زۆربەری دەکرێت لە دیاری کردنی ئەوشتەی کە خوازراوە لە مەرکەزی بوون و لامەرکەزی بوون، ئەوەش وای لێ کرد کە لێرەدا شێوازی لامەرکەزیەت هەڵبژێرێت بەرژەوەندی ئوممەت بوو [4]، ئەوەش هەڵوێستێکی ترە و بەڵگەیە لەسەر ئارەزوی عومەر بۆ پەیڕەو کردنی لامەرکەزی بوون، ئەوە بوو نامەیەکی نووسی بۆ عەدی کوڕی أرطأرة و تیایدا هاتبوو، پاشان تۆ بەردەوام پیاو دەنێری بەسەرماو گەرما و پرسیام لێ دەکەیت دەربارەی سوننەت، وەك ئەوەی بتەوێ بەوە پلەوپایەی من بەرزبکەیتەوە، بەلام سوێند بەخوا تەنها حەسەنت بەسە مەبەستی حەسەنی بەسریە – جا هەرکە ئەم نامەیەت پێگەیشت ئەوە پرسیار لە حەسەن بکە بۆ من و

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، لابن عبدالحكم، ل: ٦٣.

[2] - الادارة في العصر الاموي، نجدة الخماش، ل: ١٠٧.

[3] - الطبقات(٥ / ٣٨١).

[4] - النموذج الاداري المستخلص من ادارة عمر، ل: ٣٢٤.

خۆت و موسڵمانان[1]. عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) لامەکەزیەت و نەگەڕانەوە بۆی بە پێویست دەزانی لەمەسەلە ڕۆتینیەکاندا لەگەڵ بوونی کەسانێك کە متمانەی بە زانستیان هەیە وەك حەسەنی بەسری(ﷺ)، چونکە حەسەن شیاوی ئەوەیە کە پرسیاری لیٚ بکرێت بۆ عومەر و عەدی والی و هەموو موسڵمانان[2]، ئەم هەڵوێستەش ئاوڕدانەوەیەکی عومەریانەیە بۆ ڕێزگرتن و قەدرزانینی زانا خواویستەکانی هاوشێوەی حەسەنی بەسری و دانانی لە شوێنی شیاوی خۆی دا، چونکە نەتەوەکان کاتیٚ پێش دەکەون کە ڕێز لە زانا خواویستەکانیان بگرن و لە شوێنی شیاوی خۆیاندا دایان بنێن.

بێگومان عومەر بنەمای هاوسەنگی لە نێوان مەرکەزی بوون و لامەرکەزی بوون دا پەیڕەو دەکرد و چەند پێوەر و هۆکارێکیش هەبوو کە پاڵی پێوە دەنا بۆ هەرشتێك لەوانە کە ئەتوانین لەمانە دا کورتی بکەنەوە:

١- پەیوەست بونی هەڵوێستەکە ڕیٚ و شوێن بەرژەوەندیەکی تایبەت یان گشتیەوە.

٢- گرنگی ئەو مەسەلەی کە پەیڕەوکرنی مەرکەزیەتی تیادا دیاری دەکرێت، بۆ نموونە ئەو ڕێوشوێنەی کە پەیوەندی بە کوشتن و لە سێدارە دانەوە هەیە شیاوی ئەوەیە کە مەرکەزیەتی تیادا ڕەچاو بکرێت.

٣- پێشهات و مەسەلە نوێکان لەوانەی کە لە قورئان و سوننەت دا نەهاتوون زۆر گرنگ و بەبایەخن.

٤- ڕەچاو کردنی دووری نێوان خەلیفە و والیەکان لە ڕووی جوگرافیەوە.

٥- ڕەچاوکردنی کات و ئەو زەرەو زیانەی کە لێی دەکەوێتەوە کە لەوانەیە ببێتە هۆی مردن.

٦- بوونی کەسێك کە پشتی پیٚ ببەستێت و دڵنیا بێت لە خۆی و زانیاریەکانی و متمانەی پیٚ ی هەبێت.

٧- کاریگەری دانان لەسەر خێرایی و دروستی ئەنجامدانی کار.

٨- ڕەچاوکردنی بەخشینی متمانە بەدادوەر و والی و کار بەدەستەکان.

لە سایەی ئەم پێوەرانەدا عومەری کوڕی عبدالعزیز مەرکەزی بوون و لامەرکەزی بوونی پێکەوە کۆ کردەوە بەرەچاوکردنی هاوسەنگی لە نێوان و دیاری کردنی پلەی گونجاو بۆ پەیڕەو کردنی

---

[1] - النوذج الاداري، ل: ٣٢٤، حلية الاولياء(٥ / ٣٠٧).

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٣٢٤.

هەریەکێکیان، بەم پێیەش عومەر هاوڕایە لەگەڵ تیۆریستەکان(مُنَظـر) و زانایانی بواری کارگێڕی لە پەی بردن بەڕەهەندکانی ئەم بنەمایە [1].

**هەشتەم: بنەمای مرونەت – نەرمی نواندن – لە ئیدارەی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا:**

عومەری کوڕی عبدالعزیز مرونەت و نەرمی دەنواند لەلێك گەشتن و وتوێژ و فیکر و جێبەجێ کردنی فەرمانەکان و پابەندبوون پێوەی لەو نموونانەش، ئەوەی کە مەیمونی کوڕی مهران دەیگێڕێتەوە کە عبدالملکی کوڕی عومەری کوڕی عبدالعزیز وتی: بابەگیان چی ڕێگرتە لە بەدیهێنانی ئەو دادگەریەی کە ئەتەوێت؟ سوێند بە خوا گوێم لێ نیە ئەگەر بەیەکەوە لە مەنجەلێکدا بکولێنرێن. عومەریش وتی: کوڕی خۆشەویستم من خەڵکی لەسەر خوو ڕەوشتێکی قورس ڕادێنم و نامەوێت دادگەری زیندوو بکەمەوە دوای دەخەم هەتاوەکو تەماعێکی دونیایان بخەمە بەردەم هەتاوەکو ئەگەر بۆیەکەمیان تورە بوون بۆ دوومیان ڕازی بن [2]، هەروەها ئەڵێ: خەڵکی هەرگیز بەگوێیان نەکردووم لەو حەقەدا کە ویستومە مەگەر شتێك لە دونیام پێشکەش کردبن [3].

بەم ڕاگەیاندنەش ئاشکرای کرد کە جێبەجێ کردنی ئامانجەکان جۆرە مرونەت و چاوپۆشیەکی ئەوێت و مەسەلەکە بەو جۆرە نیە کە کوڕەکەی ئەیبینێت کە بەلایەوە گرنگ نیە ئەگەر لەمەنجەلێکدا بکولێنرێن لە پێناو بەدی هێنانی دادپەروەریدا بێ ئەوەی حساب بۆ هیچ شتێك بکات [4].

ئەمەش هەڵوێستەیەکی ترە لەگەڵ عبدالملك ی کوڕی داو ئەمەش ئەو گفتوگۆیەیە کە لە نێوانیاندا ڕووی دا: کوڕ: ئایا دڵنیایت لەوەی لەخەودا نەمریت، لەکاتێکدا کەستەمێکی زۆرت خراوتە پێش چاو و هێشتا مافی خوات تیادا نەداوە؟

باوك: کوڕی خۆم، دەرونم ئەسپەکەمە، ئەگەر نەرم نەبم لەگەڵیدا نامگەیەنێتەجێ، من ئەگەر زۆر بکەم لە خۆم و دەست و پێوەندەکەم زۆر نابات و هەموو ئەکەوین، من وەك چۆن چاوەڕێی پاداشتم لە کاتی بێداریدا بە هەمان شێوە چاوەڕێی پاداشتم لە کاتی خەودا خوای گەورەش ئەگەر بیویستایە

---

[1] - النوذج الاداري المستخلص، ل: ٣٢٦.

[2] - سيرة عمر، لابن الجوزي، ل: ٨٨.

[3] - النوذج الاداري المستخلص، ل: ٣٢٨.

[4] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ١٠٦.

قورئان بەیەك جار دابەزێنێت دای دەبەزاند، بەلاَم تەنها یەك ئایەت و دو ئایەتی دا ئەبەزاند هەتاوەكو باوەڕی جێگیر كرد لە دلّیاندا.

كوڕی خۆم.. ئەوەی من تیایدام بەلامەوە لە بنەماڵە ئەمەویەكەت گەورەترە، ئەوان توانا و دەسەلاّتیان هەیە و خەڵكی زۆریان بەدەوردایە، بۆیە ئەگەر هەموو ئەو كارانە لە ڕۆژێكدا بكەم ئەوە ئەترسم لە دەرەنجامەكەی، بەلاّم هەرجارە مافی خەڵكی لە یەكێك یان دوانیان ئەسێنمەوە، ئەمەش ئاگاداریە بۆ خەڵكانی تر و سەركەوتوترە [1]. لێرەدا عومەر تێگەشتنی ژیرانەی خۆیمان دەخاتە پێش چاو لە بەڕێوەبردنی بزوتنەوە چاكسازیە نوێخوازیەكان دا و بەڕێوەبردنی ئەو بەرنامانەی كە مەبەستی ڕیشەكێش كردنی ستەم و چەوساندنەوە و بلاّوكردنەوەی دادپەروەری و یەكسانیە [2]، چونكە كاتێ ئەڵێ: من ئەگەر خۆم هاوكارانم ماندوو بكەم ئەوە زۆر نابات من و ئەوان پێكەوە دەكەوین و لەناودەبرێین. لێرەدا ڕوونی دەكاتەوە كە وزەی مرۆڤ سنوودارە، توانای لێبڕانی بەردەوامیش سنوری خۆی هەیە، مرۆڤیش بۆ جێبەجێ كردنی ئەركەكانی پێویستی بەكات هەیە بۆ جێ بەجێ كردنی ئەو ئەركانە و بەرجەستە كردنیان لە كەسایەتیدا و دەركەوتنیان لە شێوەی بە هاوبنەمای بالاّ دا كە تێكەڵ بە خوێن و هزری مرۆڤ ببێت، بەبێ ئەمەش مرۆڤ ناتوانێت ئەو بەهایانە لە واقیعدا بەرجەستە بكات و لە ناخیدا كەڵەكە دەبێت و ڕۆژ بە ڕۆژ فشاری زیاتری بۆ سەر دروست دەكات هەتاوەكو لە ڕۆژێكدا مرۆڤ لە ژێر ئەو فشارەدا دەڕوخێت.

ئەوەی كە سەرنجی مرۆڤیش ڕادەكێشێت ئەو دەستەواژەیەتی كە دەڵێ:.. من مافی خەڵكی لە یەكێك و دوان ئەسەنمەوە و ئەمەش بەكەسانی تر دەگات و ئاگاداریە كە بۆیان و سەركەوتووترە، لێرەدا عومەر گرنگی دەستكەوت و كاركردن دەخاتە ڕوو و ئاماژە بە ڕۆڵی گرنگی دەدات، چونكە زۆرن ئەوانەی كە وتاریان داوە و سووربوونی خۆیان لەسەر گۆڕانكاری لە پێناو چاكسازی و نوێگەریدا ڕاگەیاندووە و ئارەزوی خۆیان بۆ ڕاپەڕین و شۆڕشی گەورە دەربڕیوە، بەلاّم بەخۆیان و قسە و دروشمەكانیانەوە كەوتن و لەناوچوون، چونكە تەنها قسەیان پێ بوو..، بەلاّم عومەر ئەم ڕیفۆرمخوازە مەزن و زانا ژیرە ئەیەوێ كردەوە پێشكەش بكات و كردەوەكانیشی توند و تیژ و بێ پلان و بەرنامە نەبن، ماف لە كەسێك و دوان و دەسێنێتەوە و ئەمەش بە خەڵكی تر دەگات و بەم

[1] - ملامح الانقلاب، ل: ١٧٣.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٧٣.

شێوە چاکسازی دەرونی هەمووان دەگرێتەوە وەك چۆن ڕوناکی تاریکی لەناو دەبات، ئـەم عومـەرە نەرم و ژیرە نەیدەویست کارێك بکات بێ ئەوەی کەمێك ماڵی دونیای تیابێت هـەتاوەکو بەهۆیـەوە دڵی خەڵکی بێنێتەوە [1]، کەیش ناتوانێ بڵێ ئەمە دەست هەڵگرتنە لە ئامانجی چاکسازی گشتگیرەوە بۆ چاکسازیەکی لاوەکی کە خۆی لە پینە و پەڕۆ کردن دا دەبینێتـەوە، چـونکە هـەر لـە سـەرەتای وەرگرتنی بەرپرەسارێتیەوە نەمانبینیوە کە عومەر تەنازول و پاشەکشە بکات لە ئەرکەکانی بەرامبەر بە ئوممەتەکەی یان لـەو ئامانجانەی کە قورئان و سوننەت خستویانەتە ڕوو، بـەڵکو لێـرەدا ئـەو شـێوازە زیندوەمان ئەخاتە پێش چاو کە توانای بەدیهێنانی هەموو ئـەو ئامانجانـەی هەیـە... بێگومـان فـشاری بەردەوام تەقینەوەی لێ دەکەوێتەوە، ئەو تەقینەوەیـەش هەرچـەندە بـچوك ولاواز بێـت، بـەڵام هـەر سوتێنەر و تێکدەرە، جا ئەگەر بەرپرس و سەرکردەکان توانای خۆلادان لـەو سـوتان وتێکدانـە یـان هەبێت بە شێوازێکی زیندوو کە بگونجێت لـەگەڵ پێکهاتەی دەروونی مرۆڤ دا بۆ دەبـێ پـشتگوێ ی بخەن و نەیگرنەبەر [2].

ئەوە بوو کاتێك عبدالملکی کوڕی پێ وت: ئەی ئەمیری باوەڕداران فەرمانی خوا جێبەجێ بکە و مەترسە بابەیەکەوە لە مەنجەڵێکدا بمانکولێنن، ئایا لێرەدا وەڵامی خەلیفـەی نـەرم و نیـان چـی بـوو: کوڕی خۆم، ئەگەر ئەوەی تۆ دەیڵێ ی بیکەم ناچـاری پـەنابردن بـۆ شمـشێرم دەکـەن خێـریش لـە خێرێکدا نیە کە تەنها بە شمشێربچەسپێنرێت [3].

بێگومان خەلیفەیەك بەو ژیری و نەرمیە ناکرێت بێزاری دەربڕێت لە گەشـتن بـە ئامانجـەکانی [4]. لەمەشەوە نەرم نیانی و مرونەتی عومەر دەردەکەوێت لە جێبـەجێ کردنـی سیاسـەتی گـشتی دا کـە خۆی لە چەسپاندنی دادگەری و بڵاکردنەوەی ئیسلام و بنیاتنانی دەوڵـەتی ئیـسلامیدا دەبینیـەوە [5]. ئەمەش چەند نموونەیەکە لەسەر جێبەجێ کردنی بنەمای مرونەت و نەرمی نواندن:

---

[1] - ملامح الانقلاب: ل: ١٧٤.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٧٤.

[3] - الكامل في التريخ، لة ملامح الانقلاب وة، ل: ١٧٥.

[4] - ملامح الانقلاب، ل: ١٧٥.

[5] - النموذج الاداري، ل: ٣٢٩.

١- **پەلە کردنمان لێت وات لێ نەکات کە نوێژ لەکاتی خۆی دوا بخەیت:** ڕۆژێکیان هاتە ناو پاسەوانەکانی و وتی: کامتان ئەو پیاوە دەناسێت کە ناردمان بۆ میسر؟ وتیان هەموومان دەیناسین - کابرایەك بوو پێش ماوەیەك بۆ کارێك نارد بوو بۆ میسر - وتی: با کەم تەمەنترینتان بڕوات بۆم بانگ بکات، ئەڵێ: ئەمە لە ڕۆژی هەینی دا بووو، پاشان کابرا چوو بە شوێنیدا و وای دەزانی کە عومەر وایزانیوە ئەو دواکەوتووە لە ڕۆشتندا بۆیە وتی: پەلەم لێ مەکە هەتاوەکو خۆم کۆدەکەمەوە، پاشان خۆی ئامادە کرد و هاتە خزمەت عومەر، عومەریش(ﷺ) پێی وت: پەلەمەکە، ئەمڕۆ ڕۆژی هەینیە، نەڕۆیت هەتاوەکو نوێژی جومعە دەکەیت، ئێمە بۆ کارێکت ئەنێرین کە کاری موسڵمانانە جا پەلە کردنمان لێت وات لێ نەکات کە نوێژەکانت دوا بخەیت [١]. لەم هەڵوێستەشداعومەر مرونەت و نەرمیەکی زۆر نیشاندا، هەرچەندە ئەو نوێنەریشی بۆ کاروباری موسڵمانان دەنارد و دەیوابە بەخێرا ئەو کارە بکرێت [٢].

٢- **بۆ نەمایتەوە هەتاوەکو بەربانگ بکەیتەوە پاشان دەهاتیت:** عومەری کوڕی عبدالعزیز کار بەدەستی خۆی لە خوراساندا بانگ کردووە ئەویش بەپەلە خۆی گەیاندە لای خەلیفە و کاتێ گەشتە بارەگای خەلافەت لە دیمەشق، خەلیفە ئاسەواری ماندوێتی پێوە بینی و پرسیاری لێکرد: کەی کەوتیتە ڕێ؟ وتی: لە مانگی ڕەمەزاندا عومەریش وتی ڕاستیان کردووە بە کەسێکی وشك وەسفیان کردوی!! بۆ نەمایتەوە هەتاوەکو بەربانگ بکەیتەوە پاشان دەهاتیت [٣].

٣- **زۆر لە خەڵکی مەکە و ماندوویان مەکە و باری گران مەخەرە سەرشانیان:** ئیبن سەعد باسی ئەوە دەکات کە مەیمونی کوڕی مهران کە بەرپرسی دیوانی دیمەشق بوو، وتی: موچەیان بڕیەوە بۆ پیاوێکی نەخۆش وتم: نەخۆش دەبێ خزمەت بکرێت، بەڵام ئەگەر موچەی پیاوێکی ساغی پێ بدرێت ئەوە نابێت، ئەوە بوو لای عومەری کوڕی خەتتاب سکاڵایان لە دژ کرد بووم و وتبویان: ئەو توشی زەحمەت و بارگرانیمان دەکات، ئەڵێ: ئەویش نامەیەکی بۆ

---

١ - سيرة عمر بن الجوزي، ل: ١٠٦.

٢ - النموذج يالاداري، ل: ٣٣٠.

٣ - تاريخ الطبري له النوذج الاداري، ل: ٣٣٠.

نووسیم: ئەگەر ئەم نامەیەت پێ گەیشت ئەوە زۆر مەکە لە خەڵکی و باری سەرشانیان قورس مەکە، چونکە من ئەوەم پێ باش نیە [1]. لێرەدا عومەر لە ڕوانگەی نەرمی نواندن و ئاسانکردنی کارەکانەوە ئەمەی بۆ نووسی [2].

٤- **نەرمی نواندن لە گفتوگۆ و لێك گەیشتن دا:** لە ڕاستی دا گفتوگۆی هێمنانە و موناقەشە کردنی بەڵگە، بەبەڵگە شێوازی عومەر بوو لە وتوویژ و مشتومڕەکانیدا – وەك لەگەڵ خەواریج دا ئاماژەمان پێدا – ئەوە بوو خەڵکانێك لە حەروریەکان – خواریج – هاتنە لای عومەری و شتانێکیان بیرخستەوە، هەندێ لە ئامادەبوانیش داوایان لێکرد کە بیانترسێنێت و ڕوو بگۆڕێت لەگەڵیاندا، بەڵام عومەری کوڕی عبدالعزیز هەر نەرم بوو لەگەڵیاندا، هەتاوەکو توانی ڕازیان بکات و قایل بن بەوەی کە موچە و ئازوقەی لێ وەرگرن هەتاوەکو ماوە و بەوشێوە بەجێیان هێشت، کاتێ چوونە دەرەوە عومەر کێشای بەڕانی یەکێك لە ئامادەبواندا و وتی: ئەگەر توانیت دەرمانێك دابین بکەیت بۆ هاوڕێکەت بێ ئەوەی داخی بکەیت، ئەوە هەرگیز داخی نەکەیت [3]، بەم شێوەیە لە هەموو شێوازەکانی مامەڵەکردنیدا نەرمی دەنواند [4].

٥- **مرونەتی فیکری:** عومەری کوڕی عبدالعزیز نەرم بوو لەڕووی فیکریەوە، و خۆی لادەدا لە چەقبەستن و توندڕەوی، ئەوە بوو جارێکیان – عومەر یەزیدی کوڕی مالیك و حارثی کوڕی محمدی نارد بۆ ئەوەی خەڵکی فێری سوننەت بکەن و موچەی بۆ بڕینەوە – وەك باسمان کرد – یەزیدیش ڕازی بوو، بەڵام حارث ڕازی نەبوو وتی: لەبری زانستێك کە خوا فێری کردووم کرێ وەرناگرم، پاشان ئەمەیان گێڕایەوە بۆ عومەر، ئەویش وتی: وا نازانین ئەوەی کە یەزید کردویەتەی هیچی تیا بێت و خوای گەورەش نموونەی حارث مان تیادا زیاد بکات [5].

---

[1] - الطبقات(٥ / ٣٨٢).

[2] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٧٦ - ٧٨.

[3] - النموذج الاداري، ل: ٣٣١.

[4] - سيرة و مناقب عمر بن عبدالعزيز، لابن عبدالحكم، ل: ١٣٧.

[5] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي ن ل: ٢٧٥.

لێرەدا هەڵوێستێکی دیاریکراوی بەرامبەر ئەو دوو زانایە نەگرتە بەر سەرباری جیاوازی هەڵوێستیان لەبەرامبەر وەرگرتنی کرێ دا لەسەر فێرکردنی خەڵکی، ئەوە بوو پشتگیری وەرگرتنی کرێ ی کرد لەبەرامبەر فێر کردنی خەڵکی دا ن پاشان نزای کرد کە خوا نموونەی حارث زیاد بکات. بەم شێوەیە نەرمی دەرکەوت لە پشتگیری کردنی هەردوو هەڵوێستەکە لەیەك کاتدا، وێڕای جیاوازیان، ئەمەش لە چوارچێوەی باوەڕ بوونی تەواوی دا بوو بە پێویستی بنەمای مرونەت وەك وتی: حەزم نەدەکرد هاوەڵانی محمد(ﷺ) جیاواز نەبوونایە، چونکە ئەگەر جیاواز نەبوونایە، هیچ مۆڵەتێك نەدەبوو [1]، هەروەها ئەیوت: حوشترە سوورەکان هێندەی جیاوازی هاوەڵانی محمد(ﷺ) لام خۆشەویستترنین [2]، ئەمانە چەند بەڵگەیەك بوون لەسەر جێ بەجێ کردنی بنەمای مردونەت لە بەڕێوەبردنیدا ئەم مرونەت و نەرمی نواندنەش ڕێگر نەبوو لە بەردەم جێبەجێ کردنی بڕیارەکان و بەدی هێنانی ئامانجە دەستنیشان کراوەکان و گەشتن بە هیوا و خواستەکاندا [3].

### نۆیەم: گرنگی کات لە ئیدارەی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا:

عومەری کوڕی عبدالعزیز زۆربەی کاتەکانی ئەگەر نەڵێین هەمووی لە بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دەوڵەتدا یان لە کارێکدا کە بەرژەوەندی کشتی تیادا بوایە یاخود جێبەجێ کردنی مافی خوا لە پەرەستشدا بەسەر دەبرد، ئەوە بوو شەوی لە نوێژ و موناجات دا بەسەر دەبەرد و دوای نوێژی وەتریش قسەی لەگەڵدا کەسدا نەدەکرد [4]. هەر لە چوارچێوەی سوود وەرگرتن لەکاتی گونجاودا عومەر وتویەتی: شەو ڕۆژ کار لە تۆدا – واتە مرۆڤ – دەکەن ن تۆش کاریان تیادا بکە [5].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز سوودی لە کاتەکانە وەردەگرت بۆ ئەنجامدانی کارەچاکەکان و پەلە کردن لە ڕێنمایی کردن و لێکۆڵینەوەی خێرا لەمەسەلەکان و وەرگرتنی بڕیارە ئیداریەکان و خۆلادان و لە هەر شتێك کە ئەبێتە هۆی دواخستنی کارێك یان بەرژەوەندیەك

---

[1] - الطبقات(٥ / ٣٨١).

[2] - النوذج الاداري، ل: ٣٣١.

[3] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٢١٠ – ٢١١.

[4] - الدارة في التراث الاسلامي(١ / ٢٧٩) البرعي و عابدين.

[5] - سيرة عمر بن عبدالعزيز، لابن عبدالحكم، ل: ٣٢.

گرنگترین بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو خێراییە بوو کە لە بە ئەنجامگەیاندنی سێ بڕیاردا نواندی، وەك ابن عبدالحكم باسی دەکات و ئەیگێڕێتەوە و ئەڵێ: کاتێ کە سولەیمان بەخاك سپێردرا – بە خاکسپاردنیشی دوای نوێژی مەغریب بوو – عومەر داوای قەڵەم و کاغەزێکی کرد و سێ نامەی نووسی، چونکە لەبەر خوای گەورە نەیدەتوانی دوای بخات بۆیە یەکسەر بە ئەنجامی گەیاند، خەڵکیش دەربارەی نووسینی ئەم نامانە ووتیان: ئەمە بۆ ئەوەندە لەپەیەتی؟ نەدەکرا پەلەنەکات هەتاوەکو ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی؟ ئەمە خۆشەیدای کورس و دەسەڵاتە: بێگومان عومەر هەرگیز پەلەی نەبوو ئارەزوی ئەو کارەشی نەدەکرد کە پێی سپێدراو بوو، بەڵکو ئەو لێپرسینەوەی لەگەڵ دەروونی خۆیدا کرد و بۆی دەرکەوت کە ناتوانێ ئەو کارە دوابخات، نامەی یەکەمیش پەیوەندی بە خودی خۆیەوە نەبوو، بەڵکو زیاتر پەیوەندی بەو موسڵمانانەوە بوو کە لە قوستەنتینیە دا غەزایان دەکرد و تووشی برسێتی و ماندوێتیەکی زۆر بوو بوون و ئەویش فەرمانی دا بە گەڕانەوەی مەسلەمەی کوڕی عبدالملك و کۆتایی هێنان بە گەمارۆکە، دیارە عومەری پێی وابوو کە ڕەوانیە کاروباری موسڵمانان لە ئەستۆ بگرێت و گەڕانەوەی سوپای تەنگ پێ هەڵچنراو و ماندوو دوابخات، بۆیە پەلەی کرد لە نووسینی ئەو نامەیە لە پێناو کۆتایی هێنانی بەنەهامەتی سوپای گەمارۆدەر [1].

لە ڕاستیدا ئەو بارودۆخەی کە موجاهیدانی قوستەنتینەی تیابوو بواری نەدەدە بە دواخستنی بڕیاری کشاندنەوەیان، هەر بۆیە ئەم بڕیارەی عومەر لە کاتی خۆیدا بوو [2]، هەروەها نامەیەکی نووسی و داوای لەسەر کارلابردنی ئوسامەی کوڕی زەیدی تنوخی کرد و کە بەرپرسی خەراجی میسر بو بە هۆی ستەمکاری و ناپاکیەوە، نامەیەکی تریشی نووسی بڕیاری لەسەر کار لابردنی یەزیدی کوڕی ئەبو مسلم ی دا، لە ئەفریقا دا بە هۆی ستەمکاریەوە [3].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز گرنگی دەدا بەکات لە ڕووی هەڵبژاردنی کاتی گونجاوەوە بۆ ڕاگەیاندنی ڕێنمایی و بڕیارە ئیداریەکان و ئاسان گەیاندنیان، بۆیە کاتێ بانگەوازکەرانی بەکار دەهێنا بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵك گونجاو ترین کاتی هەڵدەبژارد بۆ ئاگادار کردنەوەی خەڵك لە

---

[1] - النوذج الاداري المستخلص من اجارة عمر، ل: ٣٣٧.

[2] - هەمان سەرچاوە، ل: ٣٣٧ - ٣٣٨.

[3] - هەمان سەرچاوە، ل: ٣٣٩.

ڕووی زۆری ئامادە بوان یاخود لە ڕووی پیرۆزی شوێن و پلەو پایە وە کەوا دەکات گرنگی زۆری پێ بدرێت وەك وەرزی حەج کە کۆبوونەوەی ساڵانەی موسڵمانانە، هەتاوەکو لەو ڕۆژەدا وتار بدات یاخود نامەیەك بنووسێت بۆ موسڵمانان سەبارەت بەو کاروبارانەی کە زۆر بە گرنگی دەزانێت بۆیان چونکە بە هەڵبژاردنی ئەو کاتە گونجاوە دوو مەسەلەی بۆ بەدی دێت، یەکەمیان: گەیاندنی ئەو ڕێنمایی و بڕیار و ڕێوشوێنە بە زۆرترین کەس لە موسڵمانان و لە خەڵکی هەموو ناوچەو وڵاتەکان، دووەمیشیان: ئەو بڵاو بوونەوە خێرایەی کە ڕاگەیاندنی ئەم بڕیار و ڕێوشوێن و ڕێنماییە بە خۆیەوە دەبینێت کاتێك کە لەناو ئەو ژمارە زۆرەدا بڵاو دەکرێتەوە لە و کاتە پیرۆزەدا[١].

نموونەی ئەم نامانەش ئەو نامەیەی کە بۆ خەڵکی نووسی لە وەرزی حەج دا کە تێیدا هاتبوو: پاشان، من خوا دەکەم بە شاهید و بێ بەریبوونی خۆمی بۆ دەردەبڕم لەم مانگە پیرۆز و وڵاتە پیرۆزە ڕۆژی حەجی گەورەیەدا کە من بێ بەریم لەستەمی هەرکەسێك کە ستەمی لێکردوون و دەستدرێژی کەسێك کە دەستدرێژی کرد و نەتەسەر، لەوەی کە فرمانم پێ کردبێت یان پێی ڕازی بووبم یان مەبەستم بووبێت مەگەر کارێك کەوا لێی تێ گەشتبم یان بەباشی بۆم ڕوون نەکرابێتەوە و بەدوادا چوونی پێویستم بۆ نەکردبێت ئومێدیشم وایە کە خوای گەورە لە کارانەم خۆش بووبێت، چونکە ئەو ئاگادارە لە سووربوونی من لەسەر ستەمنەکردن و هەوڵدانم بۆ دادگەری، ئاگاداربن هیچ ستەملێکراوێك مۆڵەتی ناوێ هەتاوەکو دەکاتە لای من و من پشتیوانی هەر ستەملێکراوێکم، هەر کار بە دەستێکیشم بێ نیازی خۆی لە حەقڕەوی و پابەندبوون بە قورئان و سوننەتەوە نیشان دا ئەو گوێڕایەڵی لەسەرتان پێویست نیە، و کاری دەدەمە دەست ئێوە هەتاوەکو دەگەڕێتەوە بۆ حەق ئاگاداریش بن نابێ پارە لەدەست دەوڵەمەندەکانتاندا قۆرخ ببێت و نابێ پێش هەژارەکانیش بخرێن لە فەئی دا هەر کەسێکیش دەستی دایە کارێکی چاکە کە سوودی بۆ بەرژەوەندی گشتی یان تایبەتی موسڵمانان هەبوو ئەوە لە دوو سەد تا سێ سەد دیناری پێ دەدرێت بە پێی ئەو ماندوو بوون و زەحمەتەی کە تووشی هاتووە، ڕەحمەتی خوا لە کەسێك کە سەفەرێك بە گران نازانێت کە خێری تیایە بۆ موسڵمانان، ئەگەر لە دروشم و کارەکانی حەجیشم نەکردنایە ئەوە چەند کارێکی دروستم بۆ دیاری دەکردن کە خوای گەورە بۆی زیندوو کردونەتەوە و چەند بە تاڵێکیش کە خوای بۆی لە

---

[١] - حلية الاوايلاء(٥ / ٢٩٢ – ٢٩٣).

ناو بردوون و ئەوەش تەنها فەزڵی خوایە و تەنها سوپاسگوزای ئەوبن، چونکە منیش ئەگەر خوای گەورە بمداتە دەست خۆم ئەوە وەك خەڵكی تر دەبم و السلام[1].

ئەمەش نامەیەكی بە پێزی ئەمیری باوەڕداران عومەری كوڕی عبدالعزیز بوو بۆ ڕووبەڕوو بەوونەوەی ستەم و چەسپاندنی دادگەری، چونكە ئەو لێبڕاوانە هەوڵی دەدا بۆ نەهێشتنی ئەو ستەم و چەسپاندنی دادگەری، بەڵام پێشبینی ئەوەشی دەكرد كە كۆمەڵێ ستەم هەبێت كە بە ئەو نەگەشتبێت، بۆیە ئەم نامەیەی نووسیِ و لە وەرزی حەج دا ڕایگەیاند كە وەفدی زۆربەی ناوچە و ولاتە موسڵمانەكانی تێدایە، هەتاوەكو گەردنی خۆی ئازاد بكات لەوستەمە شاراوانەی كە پێی نەگەشتووە.

لەم نامەیەشدا بێ بەری بوونی خۆی ڕاگەیاند لەو كاربەدەستانەی كە ستەمیان لە دەست ڕوو دەدات و تاعەتی بەستونەتەوە بە تاعەتی خواوە، ئەمەش وا دەكات لە موسڵمانان كە هەر كەسێكیان چاودێرێك بێت بەسەر ئەمیری باوەڕدارنەوە و هەوڵبدات بۆ دامەزراو تر كردنی ئەگەر چاكەكار بوو و ڕاستكردنەوەی ئەگەر لە ڕێی ڕاست لایدا جوانترین شتێكیش كە لەم نامەیەدا هاتووە دابینكرنی ڕێژەیەك پارەیە بۆ كەسێك كە هەوڵ دەدات بۆ چاكسازی كردن لە كاروبارەكانی ئوممەتدا، ئەمەش مسۆگەر كردنی خەرجی ئەو كەسە دەگەیەنێت كە سەفەر دەكات لەو پێناوەدا هەتاوەكو بیركردنەوە لە دابین كردنی پارە و خەرجی ئەو سەفەرە نەبێتە ڕێگر لە بەردەم بە ئەنجام گەیاندنی دا، پاشان نامەكەی بە سوپاسی كردنی پەروەردگار كۆتایی پێ دێنێت لەسەر كۆمەكی كردنی بۆ ئەو چاكسازیە ی كەلەسەر دەستی بەدی هات، ئەمەش نموونەی ئیخلاص و دڵسۆزیە بۆ خوای پەروەردگار بە جۆرێك كە بەشی دەرونی تیادانامێنێت و تەنها فەزڵ و چاكە بۆ پشتیوانی و لوتفی پەروەردگارە[2].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر جێبەجێ كردنی بنەمای پشكنین و ڕەچاو كردنی گرنگی كات لەلایەن عومەرەوە(رضي الله عنه) ئەوە بوو عومەری لە ئیدارە كردنی كات دا تەنها بە سوود وەرگرتن لە كات و پەی بردن بە گرنگی وازی نەهێنا، بەڵكو بەتەواوی ئیدارەوە هەموو پێداویستیەكانی سوود وەرگرتن

---

[1] - حلية الاولياء(٥ / ٢٩٢ – ٢٩٣).

[2] - التاريخ الاسلامي(١٦ / ١٥١).

لە کاتی دەکرد لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەستن پێوەی هەر لە گرنگی وەرگرتنی بڕیارەکان و ئاراستە کردن لە کاتی پێویستدا و کار کردن بۆ خۆلادان لە دواکەوتن و هۆکار و پاڵنەرەکانی[1].

## دەیەم: بنەمای دابەشکردنی کار لە ئیدارەی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا:

عومەری کوڕی عبدالعزیز بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە ئاماژەی بە بنەمای دابەشکردنی کار و لێپرسراوێتیەکانی دەوڵەت کردبوو، ئەوە بوو لەو نامەیەدا کە بۆ عقبەی کوڕی زەرعەی طائي نووسی بوو، پاش دانانی بە والی خوراسان هاتبوو:.. دەسەلات چەند پایەیەکی هەیە کە بەبێ ئەوە ناتوانرێت جێگیر بێت، والی پایەیەکە و دادوەر پایەیەکە و بەرپرسی بەیتولمال پایەیەکە، پایەی چوارەمیش منم – مەبەستی خەلیفەیە –[2] ئەمە لە ڕووی دابەشکردنی سەرەکی گشتیەوە، چونکە سەربارەی ئەم چوار پایە سەرەکیەی ئیدارەکەی کە ئەوانیش: والیەکان والی هەریمەکان دەگرێتەوە دادوەری کە داوەروەکان دەگرێتەوە و دارایی دەوڵەت کە بەرپرسی بەیتولمال دەگرێتەوە چوارەمیش دەسەلاتی باڵای دەوڵەتەکە خەلیفە و ئەمیری باوەڕداران دەگرێتەوە جگە لەمانە ئەرکەکانی دەوڵەت چەند دابەشکردنێکی لاوەکیشی هەیە کە هەندێکیان پەیوەستن بە ئەمیری جیهادەوە، کە ئەوکاتە منصوری کوڕی غالب سەرپەرشتی دەکرد[3]، بەرپرسی غەزای هاوینانیش وەلیدی کوڕی هشام و عەمری کوڕی قەیسی سکونی بوو[4] بەشێکی تریش پەیوەندی بە ئاسایشی ناوخۆوە هەبوو، لەمەشدا عومەری کوڕی یەزیدی کوڕی بشری کەلبی کردە بەرپرسی پۆلیس[5]، بەرپرسی پاسەوانانیشی سپارد بە عومەری کوڕی ئەبی مهاجری کوڕی ئەبی مسلمی ئەنساری، حبیشی خزمەتگوزاریشی کردە دەرگاوان و خالی پەڕینەوەی دیاری کردوو سەرپەرشتیاری بۆ دانا وەك جەوازی – پەڕینەوەی – میسر کە عومەری کوڕی زریقی ئەیلی لەسەر دانا کە ئێستا بە خاڵی گومرك ناسراوە[6] بەشی سێیەمش تایبەت بو بە نووسینی و نووسەران کە لیثی کوڕی ابی رقیه و ام الحکم ی کچی

---

[1] - النموذج الاداري، ل: ٣٤٠.

[2] - تاريخ الطبري، النوذج الاداري، ل: ٣٤٢.

[3] - سيرة عمر لابن عبدالحكم، ل: ٧١.

[4] - تاريخ خليفة، ل: ٣٢٤.

[5] - تاريخ خليفة، ل: ٣٢.

[6] - عمر بن عبدالعزيز و سياسته في رد المظالم، ل: ٣٤٤.

ابی سوفیانی تیادا بوو [١]، مۆر و خاتەمیش سپێردرا بوو بە نوعەیمی کوڕی سەلامە [٢]، بەشێکیش هەبوو کە سەرپەرشتی کاروباری دارایی ئەکرد، و چەند لقێکی لێ دەبوویەوە وەك خەراج کە عقبەی کوڕی زرعەی طائي یەکێك بوو لە والیەکانی [٣].

دەزگای صدقاتیش کە عومەری کوڕێ عبداللە ی کوڕی عبدالرحمن ی کوڕی عوتبەی قورەیشی [٤] لەسەر بوو کە هاوشێوەی دەزگای دراوە لە ئێستادا و عومەری کوڕی ابی حملەی قورەشی سەرپەرشتی ئەکرد، هەروەها دەزگای خەراجی ناوەندی کە صاڵحی کوڕی جبیری غدانی [٥] بەپرسی بوو.

سەبارەت بە بواری فێرکردنیش ئەوە عومەر مەجلیسی فێربوونی بەردەوامی لە مزگەوتەکاندا دامەزراند، کەسانێکی ڕاسپارد هەتاوەکو لەسەرەتا هەستن بە شارەزا کردن و فێرکردنی گەڕۆك، خەڵکانێکیشی ڕاسپارد بە بانگەواز کردن بۆ لای خوا و فەرمان دان بە چاکە و نەهی کردن لە خراپە و خانەی تایبەت بە فتوادانی دامەزراند و لە میسردا و سپاردی بە سێ کەس لە زانایان [٦]. جگە لەمانەش چەند دەزگایەکی تر هەبوو وەك دەزگای نوێژ و دەزگای حەج و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی و دەزگای پۆستە و چەند دەزگایەکی تر کە بوار نیە باسی هەموویان بکەین، بەم شێوەیە عومەری کوڕی عبدالعزیز بنەمای دابەشکردنی کاری لە دەوڵەتەکەیدا جێبەجێ کرد و [٧]، پیاوێکی نموونەیی دەوڵەت بوو.

ئەمە و عومەری کوڕی عبدالعزیز لە زۆر کاتدا مافی دەدا بەوالیەکانی بۆ دیارکردنی وەزیرەکانیان و پێکهێنانی ئەنجومەنی شورا، مافی سەرپەرشتی کردنی سوپای ویلایەت و پاراستنی ئاسایشی ناوخۆی ویلایەتەکەشیان هەبوو، لەگەڵ بودجەی پێویست بۆ هەر ویلایەتێك لەگەڵ سەرپەرشتی کردن و چاودێری کردنیدا... هتد.

---

[١] - تاریخ خليفة، ل: ٣٢٤.

[٢] - تاریخ خليفة، ل: ٣٢٥.

[٣] - تاريخ الطبري، له النموذج الادارية، ل: ٣٤٤.

[٤] - امرؤ دمشق في الاسلام، ل: ٤٨.

[٥] - عمر بن عبداالعزيز و سياسته فرد المظالم، ل: ٢٩٥.

[٦] - تاريخ خليفة، ل: ٣٢٤.

[٧] - البداية والنهاية، له النوذج الاداري، ل: ٣٤٤.

ئەمە هەندێك بوون لە ڕوخسار و ئاماژەكانی تێگەشتنی عومەری كوڕی عبدالعزیز بۆ بەڕێوەبردنی دەوڵەت.

لە هۆكارەكانی سەركەوتنی پرۆسەی چاكسازی و ڕیفۆرم خوازی عومەری كوڕی عبدالعزیز:

چەند هۆكارێكی جۆراوجۆر هەبوون كە یارمەتیدەر بوون بۆ سەركەوتنی پرۆژەیەكی چاكسازیخوازی لەوانە:

١- ڕەوشتە كەسیەكانی وەك زانست و پارێزگاری و لە خواترسان و دونیا نەویستی و لێبوردەیی و خاكی بوون و میهرەبانی و یەكلاكردنەوە و دادگەری، لەگەڵ توانای ئیداری مەزن لە هونەری پلاندانان و ڕێكخستن و بەڕێوەبردن و ئاراستە كردن و ناسینی خەڵكدا.

٢- بوونی تێڕاونینێكی چاكسازی خواز و نوێگەر كە خاوەنی سیماونیشانەی دیار بێت و ئامانجی گێڕانەوەی دەوڵەت و ئوممەت بێت بۆ ڕێبازی خەلافەتی ڕاشیدین لەسەر ڕێڕەوی پێغەمبەرایەتی.

٣- كۆبوونەوەی ئوممەت لە دەوری ئەم پرۆژەیە كاتێ ڕاستگۆیی و دڵسۆزی سەر پەرشتیارەكەی بۆ دەركەوت.

٤- بوونی كۆمەڵێك زانای خواویست لەسەردەمی ئەودا كە بارهێنرا بوون بۆ پێشەوایەتی كردنی دەوڵەت و ئوممەت ئەوە بوو كاتێ هەل و مەرج ڕەخسا بەگەشتنی عومەری كوڕی عبدالعزیز بە دەسەلات، بواری داهێنانی بۆ ڕەخساندن و داهێنانیان كرد و سەلماندیان كە شیاوی ئەو ئەركە مەزنەن كە خراوەتە ئەستۆیان، ئەمەش وانەیەكی گرنگە دەربارەی گرنگی تێر وتەواوی زانستی شەرعی و ئەمانەت پارێزی و تەقوا لە تەنیشت توانا سەركردەییەكانیەوە لە كەسایەتی زانا خواویستەكاندا، چونكە ئەمە یارمەتیان ئەدات بۆ چەسپاندنی شەرعی خوا لە ڕێی پۆستەكانی دەوڵەت و بەڕێوەبردنی جەماوەرەوە و لێك تێ گەشتن سەبارەت بە پرۆژەی ئیسلامی گەورە.

٥- سووربوون لەسەر كاركردن بەشەرع لە هەمو كارێكی بچوك و گەورەدا، لەسەر ئاستی دەوڵەت و ئوممەت بەم پێیەش سەرختنی خوایی دەستەبەر دەبێت خوای گەورە ئەفەرموێت:

﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ﴾ الأعراف: ٩٦). واتە: وە

ئەگەر دانیشتوانی شارەکان باوەڕیان بهێنایە و خۆیان بپاراستایە(لە قەدەغە کراوەکانی خوا) بەڕاستی دەرگای بەرەکاتی ئاسمان و زەویمان بۆ دەکردنەوە...

- کاریگەری پابەندبوون بە حوکمەکانی قورئان و سوننەت لەسەر دەوڵەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ): ڕامان لە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ژیانی نەتەوە گەلان شارەزاییەکی باش دەبەخشێت بە مرۆڤ دەربارەی کاریگەری سوننەت و یاساکانی پەروەردگار لەسەر دەرون و بوونەوەر، ڕونترین نموونەش بۆ یاساکانی پەروەردگار و سوننەتەکانی قورئانی پیرۆزە خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴾ النساء: ٢٦). واتە: خوا دەیەوێت بۆتان ڕوون بکاتەوە وە ڕێنموونیتان بکات بۆ ڕێ و شوێنی ئەوانەی لە پێش ئێوەوە بوون(لە خواناسان) و لێیان خۆش ببێت وە خوا زانای کاردوستە.

سوننەتەکانی پەروەدگاریش بەلێکۆڵینەوە ڕوون دەبێتەوە لەوەی کە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ساغ بووەتەوە بە تێڕامان لە سوننەتی پیرۆزی(ﷺ)، ئەوە بوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەل و ڕوداوەکانی دەقۆستەوە هەتاوەکو چەند سوننەتێك پیشانی هاوەڵانی بدات، نموونەی ئەمەش وەك ئەوەی کە حوشترەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە بە(العضباء) ناسرا بوو هیچ وڵاخێك پێشی نەدەدایەوە، بەڵام جارێکیان عەرەبێکی دەشتەکی بە وڵاخەکەیەوە پێشی دایەوە ئەمەش قورس بوو بەلای هاوەڵانەوە(ﷺ) پێغەمبەری خواش(ﷺ) سوننەتێکی پەروەدگاری خستە پێش چاو یان و فەرمووی: " خوای گەورە لەسەر خۆی پێویست کردووە کە هەرشتێك لە دونیاندا خۆی زۆر بەرز بگرێت دای دەگرێت و ئەهێنێتە خوارەوە [1] " قورئانی پیرۆزیش ڕێنمایی کردوین بۆ شوێنکەوتنی شوێنەواری سوننەتەکان لە شوێنەکاندا بەڕۆشتن و هەوڵدان لە کاتەکانیشدا بەسەرنجدانی مێژوو و ژیاننامەکان، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴾ آل عمران: ١٣٧ - ١٣٨). واتە: بێگومان ڕابورد لە پێش ئێوەوە چەند ڕێ و یاسایەك(باوێك) ئینجا ئێوە بگەڕێن بەزەویدا و سەرنج بدەن ئایا

---

[1] - البخاري، کتاب: الجهاد و السیر، ژمارە ٢٨٧٢.

چۆن بوو سەرئەنجامی بێ بڕواکان. ئەمە ڕوون کردنەوەیە بۆ هەموو خەڵکی و ڕێنموونیی و ئامۆژگاری یە بۆ لە خوا ترسان.

هەروەها قورئان ڕێنمایی کردووین بۆ ئاشنا بوون بە سوننەتەکان بەهۆی تێڕوانین و بیرکردنەوەوە، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿قُلْ فَانتَظِرُوا إِنِّي مَعَكُم مِّنَ الْمُنتَظِرِينَ﴾ یونس: ١٠٢).

**لە تایبەتمەندیەکانی سوننەت و یاسا خواییەکان:**

١- قەدەرێکی پێشوەخت بڕیار لەسەر دراون: خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿مَّا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا﴾ الأحزاب: ٣٨) واتە: حوکمی خوا و فرمانی کە بڕیاری داوە دەبێت و ڕەتکردنەوە و لادان لێی نیە، هەرچی بوێت دەبێت و هەرچی نەوێت نابێت.

٢- نەگۆڕ و جێگیرن: خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَّئِن لَّمْ يَنتَهِ الْمُنَافِقُونَ وَالَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَالْمُرْجِفُونَ فِي الْمَدِينَةِ لَنُغْرِيَنَّكَ بِهِمْ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا (٦٠) مَّلْعُونِينَ أَيْنَمَا ثُقِفُوا أُخِذُوا وَقُتِّلُوا تَقْتِيلًا (٦١) سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا﴾ الأحزاب: ٦٠ – ٦٢). واتە: بەڕاستی ئەگەر کۆتایی نەهێنن دوو ڕووان وە کەسانێ لە دڵیاندا نەخۆشی هەیە و پڕوپاگەندەچییەکان لە مەدینەدا ئێمە تۆ هان دەدەین(بە جەنگ کردن) لە دژیان پاشان ماوەیەکی کەم نەبێ(لە مەدینە دا) دراوسێت نابن(دەردەکرێن).(ئەوانە) نەفرین لێ کراون لەهەر کوێ بەر دەست کەوتن بە دیل دەگیرێن و هەر بە کوشتن دەکوژرێن. خوا(ئەوەی کردووە) بە سوننەت و باو لەناو کەسانێ کە پێشتر بوون هەرگیز باوو سوننەتی خوا گۆڕانی بۆ نییە.

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿وَلَوْ قَاتَلَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوَلَّوُا الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا (٢٢) سُنَّةَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا﴾ الفتح: ٢٢ – ٢٣). واتە: ئەگەر ئەوانەی کافرن جەنگیان لە دژتان بکردایە بێ گومان(تێ دەشکان و) هەڵدەهاتن پاشان دەستیان نەدەکەوت هیچ دۆست و پشتیوانێك. خوا(ئەوەی کردووە) بە سوننەت و باو لەناو کەسانێ کە پێشتر بوون هەرگیز باوو سوننەتی خوا گۆڕانی بۆ نییە.

٣- بەردەوامن و ناوەستن: خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴾ الأنفال: ٣٨). واتە:(ئەی موحەممەد(ﷺ)) بڵێ: بە ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون ئەگەر کۆتایی بهێنن(بەبێ بڕوایی یەکەیان) بەڕاستی(خوا) دەبورێ لە هەرچی لەوە و پێش کردوویانە، بەڵام ئەگەر بگەڕێنەوە(سەر کردەوەی پێشوویان) ئەوە بەڕاستی باو یاسای پێچشینە(خراپە)کان چی بوو(بۆ ئەمانیش دووبارە دەبێتەوە).

٤- دواکەوتن و لادانی بۆ نیە و پێچەوانە جوڵانەوەشی سوودی نیە، خوای گەورە ئەفەرموێ: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوٓاْ أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَءَاثَارًا فِى ٱلْأَرْضِ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَرِحُواْ بِمَا عِندَهُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِۦ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَٰنُهُمْ لَمَّا رَأَوْاْ بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى قَدْ خَلَتْ فِى عِبَادِهِۦ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ غافر: ٨٢ - ٨٥). واتە: دەی ئایا بە زەویدا نەگەڕاون تا ببینن سەرەنجامی کەسانێ کە بەر لەوان بوون چۆن بووە کەلەمان زۆر تر و بەهێزتریش بوون وە شوێنەواریشیان لە زەویدا(زیاتر بوو) ئەنجا ئەوەی کرد بوویان(لە دنیادا) سوودی پێ نەگەیاندن. جا کاتێ پێغەمبەرەکانیان بە بەڵگە ڕوونەکانەوە هاتنە لایان دڵخۆش بوو بەو زانینەی هەیان بوو ئەو(سزای) گاڵتەیان پێ دەکرد چوار دەوری دان. ئەنجا کاتێ سزاوی بەتینی ئێمەیان بینی ووتیان: باوەڕمان بە خوای تاك و تەنیا هێنا وە بێ باوەڕین بەو شتانەی کردبوومانە هاوبەشی خوا. جا باوەڕ هێنانەکەیان هیچ سوودی نەبوو بۆیان لە کاتێکدا سزای ئێمەیان دی باوو سوننەتی خوا هەر وا بووە پێشتر لەگەڵ بەندەکانی دا وە لەوێدا بێ باوەڕان زەرەرمەند بوون.

٥- نکوڵیکاران سوودی لێ وەرناگرن ،بەڵام پارێزکاران پەندی لێ وەردەگرن، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴾ آل عمران: ١٣٧ - ١٣٨). واتە: بێگومان رابورد لە پێش ئێوەوە چەند ڕێ و یاسایەك(باوێك) ئینجا ئێوە بگەڕێن بەزەویدا و سەرنج بدەن ئایا چۆن

بوو سەرئەنجامی بێ بڕواکان. ئەمە ڕوون کردنەوەیە بۆ هەموو خەڵکی و ڕێنموونیی و ئامۆژگاری یە بۆ لە خوا ترسان.

٦- بەسەر خواناس و خوانەناس دا جێبەجێ دەبێت: دیارە باوەڕداران - کە پێغەمبەران بەرزترین پلەوپایەیان هەیە لە نێوانیاندا سوننەتەکانی پەروەردگار ئەیانگرێتەوە و خوای گەورەش چەند سوننەتێکی هەیە کە پەیوەندی بەو شوێنەوارانەوە هەیە کە بۆ کەسێك پەیدا دەبێت چ ملکەچی شەرعی خوا بێت یان پشتی تێ بکات[1].

هەروەها حوکم کردن بەوەی کە خوا دایبەزاندوە چەند شوێنەوارێکی دونیایی و دوا ڕۆژی هەیە ئەو ئاسەوارە دونیاییانەش کە لە دەوڵەتی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا بەرجەستە بوو بوو ئەمانەن:

١- **جێنشینی و پایەدار بوون:** وەك بینیمان خوای گەورە عومەری کوڕی عبدالعزیز پایەدار کرد لە زەوی دا، بەهۆی سووربوونیەتی لەسەر بەرپاکردن و پیادە کردنی شەرعی خوا لە خودی خۆی و خێزان و دەور و بەرو ئوممەتیدا و دڵسۆزی نواندنی بۆ پەروەردگار لە پرۆژەی چاکسازی ڕاشدین دا، خوای گەورەش کۆمەکی کرد و پشتی گرت، عومەر مەرجەکانی پایەدار بوونی جێبەجێ کرد و بەڵێنی پەروەردگاری بۆ هاتە دی: ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ كَمَا ٱسْتَخْلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ ٱلَّذِى ٱرْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِى لَا يُشْرِكُونَ بِى شَيْـًٔا ﴾(النور: ٥٥). واتە: خوا بەڵێنی داوە بەو کەسانەتان کە باوەڕیان هێناوە وە کردەوەی چاکەکانسان کردووە کە بێگومان دەیانکاتە جێ نشینی(خەڵکی تر) لە زەویدا هەروەك ئەوانی(ئیمانداارانی) پێش ئەمانی کردە جێ نشین وە ئاینەکەیان بۆ دەچەسپێنێ ئەو(ئاینە)ی کە خوا پێی ڕازی بووە بۆیان وە ترس و بیمیان بۆ دەگۆڕێ بە ئاسایش و ئارامی(لەو کاتەدا ئیتر) هەر من دەپەرستن و هیچ هاوبەشیەکم بۆ بڕیار نادە. ئەمەش سوننەتێکی خوایی جێبەجێ بوو نەگۆڕە لەو گەل و نەتەوانە دا کە شێلگیرانە و لێبڕاوانە هەوڵ دەدەن بۆ پیادەکردنی شەرعی خوا.

٢- **ئاسایش و هێمنی:** شۆرش و ڕاپەڕینەکان لەسەردەمی ئەمەویدا بەشێوەیەکی زۆر و توند دژ بە دەسەلاتی ئەو کاتە ئەنجام دەدرا بە تایبەت لەلایەن خەواریجەکانەوە ،بەڵام عومەری کوڕی

---

[1] - الحكم و التحاكم في خطاب الوحي(٢ / ٦٦٧، ٦٦٩).

عبدالعزیز توانی لە ڕێی گفتوگۆ و وتوێژەوە زۆرینەیان قایل بکات و سەردەمی ئەو بە ئاسایش و هێمنی ناسرا بو بەهۆی دادگەری حوکم و نەهێشتنی ستەم و ڕێزگرتنی لـە هـەموو چـین و توێژەکانی کۆمەڵگە و سووربوونی لەسەر جێبەجێ کردنـی شـەریعەت لـە هـەمو بوارەکـانی ژیانـدا خـوای گـەورە ئەفـەرموێت﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ الأنعام: ٨٢). واتە: ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە و بڕواکـەیان تێکـەڵ بەسـتەم(هـاوەڵ دانان) نەکردووە هێمنی و ئاسایش تەنها بۆ ئەوانەیە هەر ئەوانەش ڕێنمایی کراوون.

٣- **سەرکەوتن وسەرفرازی:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(رضي الله عنه) سوربوو لەسـەر سەرخـستنی ئـاینی خوا بە هەموو توانایەکیەوە و سوننەتی پەروەردگاریشی تیادا بەدی هـات کەسەرخـستنی ئـەو کەسانەیە کە ئاینەکەی سـەردەخەن، چـونکە خـوای گـەورە گرنتـی داوە بـەو کەسـەی کـە دامەزراوە لەسەر پەیامەکەی کە بە دەسەڵات و هێـزی خـۆی سـەری بخـات، خـوای گـەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ الحـج: ٤٠ – ٤١). ئەوەتا خوای گەورە بەڵێن دەدات بەو کەسەی کەسەری دەخـات، سەرخستنیـشی سەرخستنی قورئان و ئاین و پێغەمبەرەکەیەتی نەك سەرخستنی کەسانێك کـە حـوکم بەشـتێك دەکەن کە خوا داینەبەزاندووە وقسە لە شتێکدا دەکـات کـە نایزانێـت [١] وەك لـە ئـەمڕۆ دا دەیبینین.

٤- **شەرەف و سەروەری:** ئـەو شـەرەفە گـەورە و سـەروەریە مەزنـەی کەلـە کتێبـەکانی مێـژوودا دەربارەی ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی عبدالعزیز تۆمار کـراوە بـەهۆی پابەندبوونیـەوە بوو بە قورئان و سوننەتی پێغەمبەری خوا وە(ﷺ) ئەو کەسەش کە شانازی دەکات بـە خـۆدا نەپاڵ قورئان کەسەروەری و ناوبانگی پێوەبەنـدە، ئـەوە پێـی خستۆتە سـەر ڕاستـە شـەقام و سوننەتی خوای پێکاوە لە ڕێزنان و شەرفمەندکردنی ئـەو کەسـەی کەدەسـت دەگرێـت بـە قورئـان و سـوننەتەوە، خـوای گـەورە ئەفـەرموێت: ﴿لَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ كِتَٰبًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا

---

[١] - صفحات مشرقة من التاريخ الاسلامي للصلابي(٢ / ٣٠٦).

﴿تَعۡقِلُونَ﴾ الأنبياء: ١٠). ئیبن عەباس ئەفەرموێت: واتە شەرەفمەندی ئێوەی تیایە [1]. بێگومان شەرەف و سەروەری ئەم ئوممەتەش لە دەستگرتنی بە حوکمەکانی ئیسلام دایە.

٥- **بەرەکەتی ژیان و خۆشگوزەرانی لەسەردەمی دا:** خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡقُرَىٰٓ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَفَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَرَكَٰتٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذۡنَٰهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ﴾ الأعراف: ٩٦). واتە: وە ئەگەر دانیشتوانی شارەکان باوەڕیان بهێنایە و خۆیان بپاراستایە(لە قەدەغە کراوەکانی خوا) بەڕاستی دەرگای بەرەکاتی ئاسمان و زەویمان بۆ دەکردنەوە، بەڵام بڕوایان نەهێنا(بە پێغەمبەرەکەیان) ئەنجا ئێمەش ئەوانمان گرت و سزامان دان. بەهۆی ئەو خراپانەوەی دەیان کرد.

لەڕاستی دا بەرپا کردنی شەرعی خوا و پیادەکردنی حوکمەکانی پیت و بەرەکەتی مادی و مەعنەوی بۆ ئوممەت دێنێت، هەرکەسێك باوەڕ و پارێزکاری تیادا بەرجەستە بێت خوای گەورە بەم بەخششە خواییە مەزنە خەڵاتی دەکات ئەو بەرەکەتەش کە خوای گەورە وادەی بەو باوەڕدارانە داوە کە بە دڵنیایی و یەقینەوە پارێزکاری دەکەن چەند جۆرێکی جیاوازە، دەقەکانیش ڕوونی ناکەنەوە و دیاریشی ناکەن، ئاماژەی دەقە قورئانیەکەش ئەولێزمەیە وێنا دەکات کە لە هەموو لایەکەوە دادەبەزێ و لە هەموو لایەکەوە هەڵدەقوڵێ بە بێ دیاری کردن و ڕوونکردنەوە، چونکە ئەو بەرەکەتە بە هەموو جۆر و ڕەنگ و شێوەکانیەوە کە خەڵکی پێ ی ڕانەهاتوون و بەخەیاڵیشیاندا نایەت، ئەگەر لە واقیعی حاڵ دا بۆیان بەدی نەیەت [2].

خەڵکیش ئەم بەرەکەتەیان لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا هەست پێ کرد و بینی بەشێوەی مادی بێت یان مەعنەوی، ئەوە بوو کتوپڕ بینیان کە بەرەکەتی ژیان و خۆشگوزەرانی هەموو خەڵکی گرتۆتەوە و دارایی دەوڵەت بەهێز بووە، خەڵکی لە هەموو ناوچەیەك لە ناوچەکانی خیلافەتی دەوڵەتی ئەمەوی بەرفراوان دا لە سایەی ئاسایش و ئارامی دا دەژیان، بە جۆرێك کە بەزەحمەت کەسێك دەسدەکەوت کەشیاوی زەکات بێت و وەری بگرێت، ئەمەش بوو بەگرفتی دەوڵەمەند و خاوەنی پارەکان و چارەسەرێکی پێویستی دەویست، یەحیای کوڕی سەعید ئەڵێ:

---

[1] - تفسیر ابن کثیر(٣ / ١٧٠).

[2] - رجال الفکر و الدعوة(١ / ٥٨).

عومەری کوڕی عبدالعزیز ناردمی بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی ئەفریقیەوە منیش کۆمکردەوە، و داوای کۆمەڵێ هەژارم کرد هەتاوەکو پێیان بدەم، بەڵام هیچ هەژارێکمان دەست نەکەوت و کەس نەبوو کە لێمان وەربگرێت، چونکە عومەر خەڵکی دەوڵەمەند کردبوو [1]. ئەم سوودە گشتیانەش لەبەرەکەتی ئەو حکومەتە ئیسلامیەیە کەشەرعی خوا پیادە دەکات.

٦- **بڵاوبوونەوەی چاکە و وەلانانی خراپە:** لە نێوان شەریعەت و ڕەوشت دا تۆکمە ترین و بەهێزترین پەیوەندی هەیە، چۆن نا لە کاتێکدا کە پەیامی ئیسلام یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانی: پاککردنەوەی ڕەوشت و پەروەردەکردنی مرۆڤە لەسەر کردەوەی چاك، خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿لَقَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ آل عمران: ١٦٤). مانای(يُزَكِّيهِمْ) واتە: فەرمانیان پێ دەکات بە چاکە و نەهیان لێ دەکات لە خراپە هەتاوەکو دەرونیان پاك بێتەوە لەو پیسی و چەپەڵیەی کە لە کاتی هاوەڵگەری و نەفامیدا تیایاندا بوو [2].

هەروەها عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) گرنگی دەدا بە بڵاو کردنەوەی چاکە و ڕووبەڕوو بوونەوەی خراپە و لەگەڵیشیدا قوتابخانەی – وە عز و ئیرشاد – بە ئامۆژگاری و ڕێنمایی و پاککردنەوە و پەروەردە کردن هەنگاوی دەنا کە حەسەنی بەسری و ئەیوبی سختیانی و مالکی کوڕی دینار لە ڕابەرانی بوون، ئەم قوتابخانەیەش چەند ئەنجامێکی سەرسوڕ هێنەری بە دەست هێنا لە بڵاو کردنەوەی چاکەو نەهێشتنی خراپە دا، ئەمەش نوێگەریەکی گەورەی لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا بەدی هێنا لە ئاراستەی ئوممەتی ئیسلامی و کۆمەڵگەی ئیسلامی و بەرەو پێش چوون لە زەوق و ڕەوشت و مەیل و حەزەکاندا لەو ماوەکورتەدا، طبری لە مێژوەکەیدا دەیگێڕێتەوە: وەلید خاوەنی بینا و دانانی کارگەو زەوی بوو، خەڵکیش لەسەردەمی دا بەیەك دەگەشتن و پرسیاریان لەیەك دەکرد دەربارەی بینا و کارگەکان، سولەیمانیش هات و خاوەنی مارەیی و خواردنی باش بوو، خەڵکیش لەسەردەمی دا بەیەك دەگەشتن و پرسیاریان لە یەکتر دەکرد

---

[1] - هەمان سەرچاوە(١ / ٥٨).

[2] - تفسیر ابن کثیر(١ / ٤٠١)، الحکم و التحاکم(٢ / ٦٩١).

دەربارەی ژن هێنان و کەنیزەکەکان، کاتێ عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو بە خەلیفە خەڵك بەیەك دەگەشتن و بەیەکیان دەوت ئەم شەو چی دەکەیت و چەنێك قورئان لەبەر دەکەیت و کەی خەتمەکەت تەواو دەکەیت و چەند ڕۆژ لە مانگێکدا بە ڕۆژوو دەبیت [1]؟

٧- **هیدایەت و دامەزراوی:** لەو وتارەی عومەری کوڕی عبدالعزیز دا کە ناردی بۆ خوێندنەوەی لە وەرزی حەجدا بۆ خەڵکی هاتبوو:... ئەگەر بەهۆی سەرقاڵکردنتان لە کارەکانی حەج نەبوایە، ئەوە چەند حەقێکم دەخستە پێش چاوتان کە خوای گەورە بۆی زیندوو کردونەتەوە و چەند بەتاڵێك کە ڕزگاری کردوون لێی، فەزڵیش لەمەدا تەنها بۆ خوای گەورەیە و ئێوەش سوپاسی کەسی تر نەکەن، چونکە ئەگەر ئەو – پەروەردگار – منیشی بدایەتە دەست خۆم ئەوە منیش وەك خەڵکی تر دەبووم و السلام علیکم [2]، گومانیش لەوەدا نیە کە عومەری کوڕی عبدالعزیز سوور بووە لەسەر پیادەکردنی شەریعەت لەدەوڵەتەکەیدا و بەهۆی ئەوەشەوە خوای گەورە بەخششێکی زۆری پێ بەخشی کە ئەویش هیدایەت و ڕێنمونی و دامەزراوی لەسەر حەق بوو خوای گەورە ئەفەرموێت: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾ النساء: ٦٥). واتە: نەخێر(وانی یە کە خۆیان بە باوەڕدار نیشان دەدەن) سوێند بە پەروەردگارت بڕوا دارنین تاتۆ نەکەنە دادوەر لە هەر ئاژاوە و دووبەرەکی یەکی نێوانیان دا لە پاشان هەست نەکەن لە دەروونیاندا بە هیچ بێزاری یەك لەو بڕیارەی تۆ داوتە و مل کەچ نەکەن بە ملکەچی یەکی تەواو.

پاش ئەمەش خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴾ النساء: ٦٦ – ٦٨). واتە: وە بێگومان ئەگەر ئێمە پێویستمان بکردایە لەسەریان کە یەکتری بکوژن(واتە باوەڕداران بێ باوەڕان بکوژن) یان لە ماڵەکانتان دەربچن ئەوەیان نەدەکرد کەمێکیان نەبێت وە ئەگەر بەڕاستی ئەوان کاریان بکردایە بە

---

[1] - تاریخ الطبري، لە رجال الفکر و الدعوة(١ / ٥٩).

[2] - حلیة الاولیاء(٥ / ٢٩٢ – ٢٩٣).

پیّ ی ئەو ئامۆژگاریانەی دەکران ئەوە باشتر بوو بۆیان وە دامەزراوتر دەبوون(لەسەر ئایینەکەیان).
جا ئەو کاتە بێگومان پێمان دەبەخشین لەلایەن خۆمانەوە چاداشتێکی گەورە وە ڕێنموونیمان دەکردن بۆ ڕێگای ڕاست.

ئەو مەسەلەیەش کە ئامۆژگاریان بۆ کراو بەڵێنی خێریان پێدراوە بۆی: بریتیە لە کارکردن و پیادەکردنی شەریعەت و گوێڕایەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، چونکە ئەگەر ئەوان گوێڕایەڵی ئەو شتانە بن کە فرمانیان پیّ کراوە ئەوە خوای گەورە دامەزراویان دەکات لەسەر حەق و ئیتر لە دینداریان دا تووشی شلەژان و دوو دڵی نابن و ئەو ڕێنموونیە یان پیّ دەبەخشێت کە لاری تیادا نیە بە جۆرێك کە بیانگەیەنێتە پاداشتی گەورە [1].

لە ڕاستیدا هیدایەت و دامەزراوی لەسەر دینداری، بەخششێکە خوای گەورە بەو کەسانەی دەبەخشێت کە دڵیان گوێڕایەڵی فرمانی بێت و ئەندامەکانی لەشیان ملکەچی بڕیاری ئەوبێت [2].

بێگومان خەلافەتی عومەری کوڕی عبدالعزیز بەڵگەیەکی مێژوویە بەسەر ئەو کەسانەوە کە هێشتا وەك توتی ئەو وشە و قسانە دەڵێنەوە کە ئەڵێت: ئەو دەوڵەتەی کە لەسەر حوکمەکانی ئیسلام وشەریعەت بنیات دەنرێت هەمیشە ڕووبەڕووی گرفت و قەیران دەبێتەوە و ئەگەری هەرەسهێنانی لە هەموو کات و ساتێکدا هەیە، و ئەم دەوڵەتە تەنها خەونە، بەلام مێژوو بەردەوام ڕووبەڕووی ئەوانە دەوەستێت [3] و ئەڵێت: ﴿قُلْ هَاتُوا۟ بُرْهَـٰنَكُمْ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ﴾ البقرة: ١١١).

ئەوەش کەمنی سەرسام کردووە لەم لێکۆڵینەوە مێژوویەمدا، پەیوەست بوونی نەوە و جیلە ئیسلامیەکانە لە نێوان خۆیاندا لە ڕێی چەند ئەڵقەیەکی توند و تۆڵەوە کە کاریگەری لەسەر یەکتر هەیە، بۆ نموونە سوڵتان نورەدین زەنکی لە ساڵی ٦٨ ك کۆچی دوایی کردووە، شێخی زانا ابو حفص معین الدین عومەری کوڕی محمەدی کوڕی خضري ئەربیللی ژیانی عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆ نووسیوە هەتاوەکو هەمان ڕێباز و ڕێڕەو بگرێتەبەر، بێگومان ڕوخسارەکانی چاکسازی و نوێگەری ڕاشدی سەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزیش بەرهەمی خۆی لە دەوڵەتی زەنکی دا

[1] - فتح القدير(١ / ٤٨٥).
[2] - الحکم و التحاکم(٢ / ٦٩٠).
[3] - رجال الفكر و الدعوة( ١ / ٥٩).

دابەدەستوە کاتێ کە ئەو زانا گەورەییەی دۆزیەوە کە ڕوخسارەکانی پرۆسەی چاکسازی بۆ کێشان کە ئەویش شێخ ابو حفص معین الدین بوو، سەرکردەی سەربازی و ڕابەری سیاسیش – نورەدین زەنکی – باوەڕی هێنا بە دروستی ئەو ڕێبازە، ئەوەتا ئەبوحەفص لە پێشەکی کتێبەکەیدا کە پێشکەشی کرد بە نورەدین دەربارەی عومەری کوڕی عبدالعزیز ئەیوت:.. دەبێ بزانین کە چاو کردن لە پێشینانی پیاو چاك پاداشت تەواو تر و یاد و باسیش زیاتر دەهێڵێتەوە، شوێنکەوتنی ڕێباز و سوننەتی خەلیفە ڕاشید و مەهدیەکانیش نهێنی چاك و هەڵسوکەوت باش دەکات، خوای گەورەش فەرمانی داوە بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) کە چاو بکات لە پێشینانی ئەم ئوممەتە و ئەفەرموێت: ﴿ أُوْلَئِكَ الَّذِينَ هَدَى اللَّهُ فَبِهُدَاهُمْ اقْتَدِهِ... ﴾ سورة الانعام، آية(٩٠).

واتە: ئەوانە(ئەو پێغەمبەرانەی باس کران) کەسانێك بوون خوا ڕێنمونیی کردن دەی پەیڕەوی ڕێگە و ڕێبازی ئەوان بکە(ئەی موحەممەد(ﷺ))...

هەروەها ئەفەرموێت: ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ ﴾هود: ١٢٠). واتە: هەموت بۆ دەگێڕینەوە لە هەواڵی پێغەمبەران(علیهم السلام) ئەوەی کە دڵی تۆی پێ دامەزراو بکەین...

بۆیە عومەر سوور بوو لەسەر کۆکردنەوەی ژیاننامە باش و شوێنەوارە دیارەکان منیش بە پێویستم زانی کە یارمەتی بدەم و توانای خۆم بخەمە گەڕ بۆ پشتیوانی کردنی بۆ دوو پاتکردنەوەی خۆشەویستی ڕاستگۆیانە و برایەتی توند و تۆڵی نێوانمان، ئەوە بو توانا و هەوڵی خۆمم خستە گەڕ بۆ کۆکردنەوەی ژیاننامەی ئەو خۆشبەختە ڕێنوماییکراوە و داوام لە پەروەردگاری بالاّ دەست کرد کە کۆمەکیم بکات و بۆم ئاسان بکات کاتێ کە سینەم گوشاد بوو بۆی و ئاماژەکانی کۆمەکیم بەدی کرد، دەست بەجێ هەستام بە کۆکردنەوەی ژیاننامەی دەوڵەمەند و بەنرخی وەك هاوکاریەك لەسەر چاکە و خواناسی[١].

بەڕاستی ئەم شێخە بەڕێزە میتۆدێکی زانستی بۆ نوورەدین زەنکی پیشکەش کردوە بەهۆی خستنە ڕووی ژیانی عومەری کوڕی عبدالعزیزەوە، ئەوە بوو دەوڵەتی بیروباوەڕی بنیاتنا و حوکمی بەشەریعەت کرد و دادگەری پیادە کرد و باجی هەڵگرت لەسەر ئوممەت، هەوڵی دا بۆ

---

[١] - الکتاب الجامع لسیرة عمر بن عبدالعزیز(١ / ٢).

زیندووکردنەوەی سوننەت و نەهێشتنی بیدعە و ناسنامەی ئوممەتی تۆخ کردەوە و گیانی خەباتکردنی زیندو کردەوە و زانستی بلاو کردەوە و ڕۆلی هەبوو لە بەدهێنانی خۆشگوزەرانی و بەرەو پێش چوون دا، خۆشی بە تەنها دنیایەك بوو لە دنیانەویستی و پارێزگاری و پەرستش و ڕاستگۆیی و دلسۆزی دا و هەرکەسێکیش ئەیەوێ زیاتر بزانێت بابگەڕێتەوە بۆ الجهاد و التجدید فی القرن السادس الهجری، عصر نورالدین و صلاح الدین ی محمد حامد الناصر.

بێگومان شوێنەواری پیادەکردنی شەرعی خوا لەناو ئەو گەلانەدا کە فەرمان و نەهیەکانی پەروەردگاری جێبەجێ کردووە دیاردەیەکی ئاشکراو دیارە بۆ لێکۆلەری مێژوو، ئەو شوێنەوارە باشانەش کە لە دەولەتی عومەر و دەولەتی نورەدین زەنکی و یوسفی کوڕی تاشفین و دەولەتی محمد الفاتح دا هەبوو ئەو سوننەت و یاسا خواییانەن کە بەردەوام و جێگیرن و هەرگیز گۆڕانیان بەسەردا نایەت، بۆیە هەرسەرکردایەتیەکی موسلمان هەولبدات بۆ بەدیهێنانی ئەم خواستە پیرۆزو گرنگ و کارە مەزنە و مەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگار بێت ئەوە پێی دەگات ئەگەر چی پاش ماوەیەکیش بێت بە مەرجێك بەباشی لەو سوننەت و یاسایانە گەشتبێت و بەجوانی سودیان لێ وەردەگرێت و ئاسەواری ئەم پیادەکرنەش لە تاك و کۆمەلگە و دەولەت و سەرکردەکانیان دا بەدی دەکات. ئاشکراشە کە مەبەست لەم لێکۆلینە وە مێژوویە ئیسلامیانە سوود وەرگرتنی راستەقینەیە لەوانەی کە پێش ئێمە کەوتن بە باوەڕ لە جیهاد و زانست و پەروەردە و هەولدانی بێ وچانیان بۆ پیادە کردنی شەرعی خوا و دەست گرتن بە سوونەت و یاساکانی پەروەردگار و تێگەشتن لێی و ڕەچاو کردنی پلە بەندی و قۆناغ بەندی وبەرزکردنەوەی گەلان بەرەو تەواوکاری(تکامل) ئیسلامی خوازراو، بێگومان ئەوسەرکەوتن و تەوفیقاتە خوایە مەزنانەی کەلە مێژووی ئوممەتەکەماندا تۆمار کراوە لەسەردەمی کەسانێك بەدی هاتووە کە دلسۆز بوون بۆ پەروەردگار و ئاینەکەی و ڕێبازەکەیان پیادە کردووە و مەبەستیان ڕەزامەندی پەروەردگار بووە و لەسەر و هەموو شتێکەوە حسابیان بۆ کردووە.

**● ڕۆژەکانی کۆتایی ژیانی عومەری کوڕی عبدالعزیز و کۆچی دوایی( رضي الله عنه ):**

١- **دوامەین وتاری عومەری کوڕی عبدالعزیز:** دوایەمین وتاری عومەر ئەوەبوو کە لە خەناصرەدا دای و تیایدا وتی: " خەلکینە، ئێوە بەگالتە دروست نەکراون و هەرواش وازتان لێ ناهێنرێت، بەلکو وادەیەکتان بۆ دانراوە کە خوای گەورە تیایدا دادەبەزێت بۆ حوکم کردن و

یەکلا کردنەوە کێشەکانتان، سەرشۆڕ و خەسارەتمەندیش کەسێکە کە لە ڕەحمەتی خوا دەربچێت کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە و بەهەشتی لیَ قەدەغەبکرێت کە پان و بەرینی بە ئەندازەی زەوی و ئاسمانەکانە، ئاگاداربن کە سەلامەتی و پەنادان لە ڕۆژی دوایی دا بۆ کەسێکە کە پارێزگار و لە خواترس بێت، و دونیای لەناو چوو بفرۆشێت بە دوا ڕۆژی هەتاهەتایی و کەم بە زۆر و ترس و دڵەڕاوکیَ بە هێمنی و ئاسایش بگۆڕێتەوە، ئایا نابینن کە ئێوە بەرەو نەمان و تیاچوون دەڕۆن و دوای ئێوە ئەوانەی کە دەمێنن جێتان دەگرنەوە هەتاوەکو ئەگێڕدرێتەوە بۆ باشترین میراتگر کە پەروەردگارە. هەموو ڕۆژێکیش کەسێك دەنێژن کە بەرەو لای خوا دەگەڕێتەوە، وادەی مەرگی هاتووە و ئەیخەنە درزێکی زەویەوە پاشان بە دانەپۆشراوی و بەبیَ ڕاکێشان بە جێی دێڵن، لە دۆستەکانی جیا بوەتەوە و هۆکارەکانی لە دەست چوە لە خاك دانیشتە جیَ بووە و ڕووبەڕووی لێپرسینەوە دەبێتەوە و بارمتەی کارەکەیەتی و ئاتاجە بەوەی کە پێشی خستووە و بیَ پێویستە لەوەی کە جێی هێشتووە، جا لە خوا بترسن پێش هاتنی مەرگ و بەسەر چوونی کاتی، سوێند بە خوا من کاتیَ ئەم قسەیە دەکەم وانازنم کەس لە من گوناهی زیاتر بیَ، بۆیە داوای لێخۆش بوون لە پەروەردگار دەکەم و پەشیمانی بۆ دەردەبڕم هەریەکێکیش لە ئێوە کە پێویستی بە دەستمان بگات ئەوە حەز دەکەم بە پێی توانا پێویستیەکەی بۆجیَ بە جیَ بکەم، هەرکەسێکیش لە ئێوە ئەوەی کە هەمانە بەشی بکات ئەوە حەزدەکەم هاوکاری بکەم هەتاوەکو ژیانی ئێمە و ئەو یەکسان دەبێت، سوێند بەخوا ئەگەر خۆش گوزەرانیم بویستایە، ئەوە زمانم پاراو و شارەزا بوو بە هۆکارەکانی، بەڵام بڕیاری خوا و سوننەتی دادگەرانەی پێشکەوتن کە تیادا ڕێنمونیمان دەکات بۆ گوێڕایەڵی و نەهی دەکات لەسەر پێچی، پاشان چمکی کراسەکەی بەرزکردەوە و گریا و خەڵکی دەوروبەری هێنایە گریان. دواتر دابەزی، ئەمە دوا وتاری بوو و هەتاوەکو مرد وتاری نەدا ڕەحمەتی خوای لیَ بێت "[1].

٢- **ژەهر دەرخوارد دانی:** ڕیوایەتەکان جیاوازن دەربارەی هۆی نەخۆشی و مردنی عومەری کوڕی عبدالعزیز، لەکاتێکدا کە ڕیوایەتەکان باسی ئەوە دەکەن کە هۆی نەخۆش کەوتن و مردنی ترسانی بوە لە خوای گەورە و گرنگیدانی بووە بە کاروباری خەڵك، وەك لە فاتیمەی کچی

---

[1] - تاريخ الطبري(٧ / ٤٧٥).

عبدالمليكی هاوسەریەوە دەیگێڕنەوە و هەروەك ئیبن سەعد لە الطبقات دا لە ئیبن لهیعەوە باسی دەكات [١]، بەڵام هۆكارێكی تر بۆ مردنی باس كراوە كە ئەویش پێدانی ژەهرە، دیارە بەنی ئومەییە قەڵس و بێزار بوو بوون بە سیاسەتەكانی عومەری كوڕی عبدالعزیز كە لەسەر بنەمای دادگەری بنیات نرابوو و ڕێگر بو لە چێژ بردن و بەهرەمەند بوون لە خۆشیەك كە بۆ خەڵكانی تر نەبێت، بەڵكو بەنی ئومەییە ی وەك خەڵكانی ئاسایی دەوڵەتی ئیسلامی لێ كرد بوو و ئەو مافانەی لێ سەندنەوە كە زەوتیان كردبوو و بواری نەدەدا بە ئارەزووی خۆیان شت بكەن، لە ئاكامدا چەند كەسانێك لەبەنی ئومەیە هەستان بە پیلان گێڕان لە دژی و ژەهریان كردە شەربەتەوە بۆی [٢]، ئەمەش دوورو سەیر نیە كە یەكێك لەوانە پێی هەستێت هەتاوەكو ڕزگاری ببێت لێی، ئەم كارەش لە ڕێی ئەو خزمەتگوزارەیەوە بووە كە خواردن و خواردنەوەی پێشكەش دەكرد، وادەگێڕنەوە كە بەڵێنی پێدانی هەزار دیناریان بە خزمەتگوزارەكەی داوە لەگەڵ بەڵێنی ئازاد كردنیدا ئەگەر ئەو پلانە جێبەجێ بكات، ئەم خزمەتگوزارەش هەركاتێ بیویستایە ئەو كارە بكات تێكدەچوو پاشان هەڕەشەی كوشتنیان لێكرد ئەگەر ئەو كارە نەكات، ئەوە بوو لە كاتێكدا كە بە ترساندن و مژدە پێدان هەڵنرا بوو ژەهری لەسەر نینۆكی هەڵگرتوو و كاتێ شەربەتی برد بۆ عومەر ژەهرەكەی فڕێ دایە ناویەوە پاشان بردی بۆ عومەر(رضي الله عنه)، ئەویش خواردیەوە هەركە گەشتە ناوسكی هەستی پێ كرد [٣].

لە موجاهیدەوە هاتووە ئەڵێ: عومەر(رضي الله عنه) پێی وتم: خەڵكی چی دەربارەی من دەڵێن؟ وتم: ئەڵێن جادوت لێكراوە؟ وتی: من جادوم لێ نەكراوە، پاشان خزمەتگوزارەكەی بانگ كرد و پێی وت كە چی وای لێ كردیت كە ژەهرم دەخوارد بدەیت؟ وتی: هەزار دینار كە پێم دراوە و بەڵێنی ئەوەی كە ئازادم بكەن، عومەریش وتی: هەزار دینارەكە بێنە ئەویش هێنای و عومەریش خستیە بەیتولمالەوە، پاشان پێ ی وت: بڕۆ بۆ شوێنێك كە كەس نەتبینێتەوە [٤].

---

[١] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٣) الحلية(٥ / ٣٤٢).

[٢] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٣)

[٣] - سيرة عمر لابن الجوزي، ل: ٣١٦ — ٣١٧.

[٤] - تذكرة الحفاظ(١ / ١٢٠).

کەواتە: هۆکاری ڕاستەقینەی نەخۆشی و مردنی ژەهر پێدانیەتی وەك ڕیوایەتەکان باسیان لێوە کردووە [1]، بێ گومان لێخۆشبوونی لەو خزمەتگوزارەی کە ژەهری دەرخوارد دا و بووە هۆی کوشتنی لەگەڵ ئەوەدا کە توانای کوشتن ی هەبوو بە خراپترین شێوە ،هەروەها پرسیار لێکردنی دەربارەی هۆی ژەهر پێدانی لە کاتێکدا کە توانای هەبوو بە زۆر دانپیادانانی مسۆگەر بکات و پاشان فرمانی تۆڵە سەندنەوە لە هەموویان بدات نموونەیەکی بەرزی لێبوردەییە، دیارە بەرزترین و بەنرخترین شت بەلای عومەرەوە(ﷺ) ئەوە بوو کە ڕێژەی چاکەکانی زیاد بکات بۆیە لێبوردنی پێ باشتر بوو لەسەر خستنی ئارەزوو و دەرونی [2].

٣- **عومەری شوێنی گۆڕەکەی خۆی دەکرێت:** خاکی بوونی عومەری کوڕی عبدالعزیز بە ئەندازێك بو کە کاتێ باسی شوێنی چوارەمیان بۆ کرد لە ژوورەکەی عائشەدا کە گۆڕی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەبوبەکر و عومەری تیایە و، وتیان: ئەگەر نزیك ببوایەتەوە لە مەدینە هەتاوەکو لەگەڵ ئەواندا بنێژرایەیت، ئەویش فەرمووی: سوێند بەخوا ئەگەر خوای گەورە ئازارم بدات بەشتێك – جگە لە ئاگر، چونکە بەرگەی ناگرم – ئەوە بەلامەوە خۆشەویسترە لەوەی کە خۆم بەشیاو بزانم بۆ ئەوە [3] بۆیە عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) شوێنی گۆڕەکەشی بەپارەی تایبەتی خۆی کڕی ئەمەش بەهۆی پارێزکاری و لێپرسینەوەی توندیەوە بوو بۆ دەروونی خۆی.

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە کە – لە نەخۆشی مردنیدا – بە خەڵکانی دەوروبەری وتووە لە شوێنی گۆڕەکەم لەو قەشەیە بکڕن، کابرای گاوریش پێی وت: سوێند بە خوا من نزیکی و دراوسییەتی تۆ بەبەرەکەت دەزانم ئەی ئەمیری باوەڕداران، ئەوەش ڕێزێکە بۆ من کە گۆڕەکەت لە زەوی مندا بێت و بەبێ پارە پێتی دەدەم و گەردنت ئازاد بێت، بەلام عومەر ڕازی نەبوو و وتی: یان شوێنی گۆڕەکەم پێ دەفرۆشن یان لە شوێنێکی تر دەیکرم، پاشان داوای نرخی زەویەکەی کرد کە ڕیوایەتەکان جیاوازن دەربارەی و ئەڵێن: دوو دینار بووە و ئەشلێن شەش وتراویشە سێ دینار، ئەوە بوو

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٤).

[2] - التاريخ الاسلامي(١٦ / ٢٢٩).

[3] - سيرة عرم بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٣٢١ – ٣٢٤، فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٥).

پارەکەیان هێنا و دای بەکابرای گاور، خاوەن زەوەیەکەش وتی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێت کە لێمان دوور بکەوێتەوە پارەکەم لێ وەرنەدەگرت [1].

٤- **وەسیەتی بۆ یەزیدی کوڕی عبدالملکی جێنشینی:** عومەر کوڕی عبدالعزیز نامەیەکی نووسی بۆ یەزیدی کوڕی عبدالملك - لە نەخۆشی مەرگیدا - و تیایدا هاتبوو: بەناوی خوای گەورە و میهرەبان: لە بەندەی خوا عومەر - ئەمیری باوەڕداران بۆ یەزیدی کوڕی عبدالملك، سلاوت لێ بێت: من سوپاسی ئەو خوایە دەکەم کە جگە لەو خوایەکی تر نیە پاشان من ئەم نامەیەت بۆ دەنووسم لە کاتێکدا کە لەسەرەمەرگدام، ئەشزانیت کە من بەرپرسم لەوەی کە پێم سپێردراوە و پاشای دونیا و قیامەت لێم دەپرسێتەوە لەسەری و ناتوانم هیچ کردەوەیەکی خۆمی لێ بشارمەوە، چونکە دەفەرموێ: ﴿ فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيْهِم بِعِلْمٍ وَمَا كُنَّا غَائِبِينَ ﴾ الأعراف: ٧).
واتە: جا سوێند بەخوا بەڕاستی(ئەوەی کردوویانە) بۆیان دەگێڕینەوە لە ڕووی زانیاریەوە وە ئێمە هیچ کاتێ بێ ئاگا نەبووین(لێیان).

جا ئەگەر خوای میهرەبان لێم خۆش ببێت ئەوە سەرفراز دەبم و لە مەترسی گەورە ڕزگارم دەبێت، ئەگەرە لێشم برەنجێ ئەوە قوڕ بەسەرم چیم بەسەر دێ، داوا ئەکەم لەخوا تاك و تەنها و بێ هاوەڵ کە بمپارێزێت لە ئاگر بە ڕەحمەتی خۆی ڕەزامەندی خۆی و بەهەشتم پێ ببەخشێت، تۆش لەخوا بترسە و ئاگات لە ژێردەستەکانت بێت، چونکە تۆش ماوەیەکی کەم دوای من دەمێنیتەوە پاشان دەگەڕێیتەوە خزمەت خوای بەئاگا و بەبەزەیی [2].

لە ڕیوایەتێکیشدا هاتووە:... سولەیمانی کوڕی عبدالملك بەندەیەك بوو لە بەندەکانی خوا، خوای گەورە مراندنی و منی دیاری کرد بە جێنشینی و دوای منیش یەزیدی کوڕی عبدالملکی دیاری کرد، ئەگەر ئەو کارەی منیش بۆ ژن هێنان و پارە کۆکردنەوە بوایە ئەوە خوای گەورە دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانیەکی بێ وێنەی پێ دەدام، بەلام لە لێپرسینەوەیەکی توند و ورد دەترسم، لەسەری جگە لەوەی کە خوای گەورە ڕێی پێداوم والسلام علیکم و رحمە اللە.

---

[1] - سيرة عرم بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٣٢٢ - ٣٢٣

[2] - سيرة عرم بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٣١٨ - ٣١٩

لێرەدا عومەری کوڕی عبدالعزیز بە پێی توانا ئامۆژگاری یەزیدی کوڕی عبدالملکی جێنشینی خۆی کرد و بەباشی ئاگاداری کردەوە و ترساندی لەسەر دەنجامی ئەم کارە و نموونەی زۆری بۆ هێنایەوە و داوای پەندوەرگرتن لە پێشینانی لێ کرد و بەباشی ئاگاداری کردەوە [1].

٥- **وەسیەتی بۆ منداڵەکانی لەسەرەمەرگیدا:** کاتێ نەخۆشی زۆری بۆ عومەری کوڕی عبدالعزیز هێنا مەسلەمەی کوڕی عبدالعزیز هاتە لای و وتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران: تۆ دەمی منالەکانت بەستوە بەرامبەر بەم سامانە، جا ئەگەر وەسیەتت بکردایە و بتسپاردایە بە من و خزمەکانت هەتاوەکو ئەرکی ئەوانت لە کۆڵ بکەینەوە، کاتێ عومەر ئەمەی بیست: وتی: دامنیشێنن ئەوانەش دایاننیشاند ئینجا وتی: گوێم لە قسەکەت بوو ئەی مەسلەمە، ئەوە کە دەڵێی: دەمی منداڵەکانم بەستوە لەبەرامبەر ئەو سامانە دا ئەوە من هیچ شتێکم لێ قەدەغە نەکردون کە مافی خۆیان بێت و شتێکیشم پێ نەداون کە مافی خەڵکی تر بێت، دەربارەی وەسیەتیشم بۆیان ئەوە وەسیەتم بۆ کردوون بەوەی: ﴿ إِنَّ وَلِيِّيَ اللَّهُ الَّذِي نَزَّلَ الْكِتَابَ وَهُوَ يَتَوَلَّى الصَّالِحِينَ(١٩٦) ﴾ سورة الاعراف.

واتە: بەڕاستی پشتیوان و دۆستی من هەر خوایە ئەو(خوایە)ی کە قورئانی ناردە خوارەوە وە هەر ئەویش پشتیوانی چاکەکاران دەکات.

منالەکانی عومەریش یەکێکن لە دو کەس: یان پیاو چاکە و خوا دەوڵەمەندی دەکات، یان پێچەوانەی ئەوەیە کە نامەوێ من یەکەم کەسێك بم کە هاوکاری بکەم بە پارە بۆ سەرپێچی کردنی پەروەردگار پاشان وتی منالەکانم بۆ بانگ بکەن، کاتێ هاتنە لای و بینینی ئاو بە چاوی داهاتە خوارەوە و وتی: چەند کوڕێکم دەوێ بەهەژاری جێیان بهێڵم و هیچیان نەبێت و پاشان گریا و وتی: ڕۆڵەکانم من خێرێکی زۆرم بۆ جێهێشتوون، ئێوە بڕۆنە لای هەر موسڵمان و ئەهلی ذیمەیەك ئەوە کۆمەڵە مافێکتان پێ ڕەوا دەبینن، منیش لە نێوان دوو ڕێگەدام:

یان ئێوە دەوڵەمەند بن ومن بچمە دۆزەخەوە، یاخود هەژار بن هەتاوەکو دوایەمین ڕۆژ و من بچمە بەهەشت، منیش هەژار بوونتانم پێ خۆشترە، هەستن خوابتانپارێزێت، هەستن خوا ڕۆزیتان بدات [2].

---

[1] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٤٧).

[2] - سيرة عمر، لابن عبدالعزيز، ل: ١١٥، ١١٦، التاريخ الاسلامي(١٦ / ٢٢٠).

لەڕیوایەتێکی تریشدا هاتووە: کە عومەر وەسیەتی کردوە بۆ مەسلەمە کەلەسەرە مەرگی دا ئامادەبێ و سەرپەرشتی شۆردن و کفنکردنی بکات و لەگەڵیدا بچێت هەتاوەکو گۆڕەکەی و دای بهێڵێتە ناو گۆڕەکەی پاشان سەیرێکی کرد وتی: سەیر بکە ئەی مەسلەمە بزانە منت لە چ شوێنێکدا جێ هێشتووە دونیاش بە چ حاڵێکەوە ڕادەستی کردوم، مەسلەمەش وتی: ئەمە سەد هەزار دینار، بە ئارەزووی خۆت وەسیەتی تیادا بکە وتی: بەڵام لەوە باشتر ئەوەیە ئەی مەسلەمە کە بیگێڕیتەوە بۆ ئەو جێیەی کە لێیەوە هێناوتە مەسلەمەش وتی: خوای گەورە لەبری ئێمە پاداشتت بداتەوە ئەی ئەمیر، سوێند بە خوا دڵانێکی ڕەقت نەرم کرد و یادی پیاوچاکانت خستینەوە [1]. لەم دوو ئاسەوار و(أثر) ەشدا چەند وانە و پەندێك هەیە، لە ڕووداوی یەکەم دا نموونەی پارێزگاری ئەمیری باوەڕداران ئەبینین تەنانەت لەوەسیەتی دا بۆ منالەکانی پاش مردنی، ئەوە بوو ڕازی نەبوو کە لە دونیا دەربچێت و شتێك لەگەردنیدا بێت کە نەزانێت بە چ شێوەیەك جێبەجێ دەکرێت و لەوانەیە وا هاتبێت بە هزریدا کە ئەگەر وەسیەتی سەرپەرشتی کردنیان بۆ یەکێك لە خزمەکانی بکات ئەوە لەسەر چاویەیك پارەیان بۆ دابین بکات کە حەلاڵ نەبێت و بەهۆی ئەم کارەشەوە گوناهبار ببێت، بۆیە هانای هێنا بۆ پەروەردگار و کاروباری مندالەکانی پێ سپارد، دیارە پێی وابوو لە مامەڵەکردنی مندالەکانیدا کەوتۆتە نێوان دوو شتەوە: یان دەوڵەمەندیان بکات لە ژیانی دونیادا، ئەمەش بەوەی بەشێك لە ماڵ و سامانی موسڵمانانیان پێ بدات و بەهۆیەوە دوچاری ئاگری دۆزەخ ببێت، یاخود لەو داهاتە کەمە حەلاڵەوە خەرجیان بکێشێت کە دوورە لە گومان ئەمەش لە شنەی بەهەشت بەهرەمەندی دەکات.

ئەوە بووڕێگای دوەمی هەڵبژارد لەگەڵ متمانەی تەواوی بەوەی کە خوا نایانفەوتێنێت و ئاماژەشی بەوەدا وە کە ئەو سومعەت و ناوبانگی چاکی بۆ بەجێ هێشتوون و دەبنە جێی ڕێز و سۆزی هەموو موسڵمانان و ئەهلی ذیمە. ئەمەش میرات و پاشماوەیەکی گرنگە کە بە سامانی دنیا مەزەندە ناکرێت لای خەڵکانی ژیر و ڕۆشنبیر، کاتێ کە ئەشڵێت(کوڕی عومەر لە نێوان ئەم دوو کەسەدایە یان پیاوێکی ساڵح دەبێت و خوا دەوڵەمەندی دەکات یاخود پێچەوانەی ئەوە دەبێت و منیش یەکەم کەسێك نابم کە بە پارەیارمەتی بدەم بۆسەر پێچی کردنی پەروەردگار) ئەمە ئاماژەیەکی

---

[1] - هەمان سەرچاوە، ل: ١٢٢، ١٢٣، التریخ الاسلامي(١٦ / ٢٢٢).

جوانه بۆ لەگەڵدا بوونی خوا و پاراستنی ئەولیاکانی، ئەمەشی لە فەرمایشتی: ﴿وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ﴾ الأعراف: ١٩٦). وە هێناوە و ئاماژەیەکیشە بەوەی کە گرنگ ئەوەیە کە باوك هەموو هەوڵێکی بخاتە گەڕ بۆ پەروەردەکردنی منداڵەکانی بەشێوەیەکی باش هەتاوەکو خوای گەورە بیانپارێزێت.

هەرگیزیش گرنگ نیە کە هەوڵ بدات بۆ دەوڵەمەندکردنیان دوای خۆی، چونکە ئەگەر ساڵح و چاك نەبن ئەوە ئەو پارەیە دەبێتە هۆکار و پشتیوانێك بۆ سەرپێچی کردنی خوای گەورە [1] لە ئاسەواری دووەمیشدا ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی عبدالعزیز مەسلەمەی کوڕی عبدالملك ی ئامۆزای ڕێنمایی دەکات بۆ ورد بوونەوە لە پەیدا کردنی پارەدا و بۆی ڕوون دەکاتەوە کە بەخشینی ماڵ وەك خێر یان دیاری حەلاڵی ناکات، بەڵکو پێویستە ئاگامان لەشێوازی پەیدا کردنی بێت، چونکە ئەگەر مرۆڤ مافی لەو سامانەدا نەبوو ئەوە دەبێت بیگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکەکانی و هەرگیز بەخشینی ئەو ماڵە وەك خێریان دیاری ئەستۆی ئەو کەسە پاك ناکاتەوە لە تاوان [2].

٦- **وەسیەتی بۆ ئەو کەسەی کە دەیشوات و کفنی دەکات:** لە رافیعی کوڕی حفصی مەدەنیەوە کە عومەر بە ڕەجائی وت: ئەگەر من مردم و شتمتان و کفنتان کردم و نوێژتان لەسەر کردم دا تان هێلامە ناو گۆڕەکەم، ئەوە ئەو خشتە ڕاکێشە کەلای سەرم دایە، جا ئەگەر بینیتان ڕوم لە قیبلەیە ئەوە سوپاس و ستایشی خوا بکەن، ئەگەر بینیشتان کە لە قیبلە ترازاوم ئەوە بڕۆ دەرەوە بۆ ناو موسڵمانان وداوایان لێ بکە کە نەڕۆن هەتاوەکو لای خوا تکام بۆ دەکەن، ئەڵێ: کاتێ خستمانە گۆڕەوە خشتەکەمان لە ژێر سەری دا لابرد بەلای قیبلەدا وەرگەڕا و ئێمەش سوپاس و ستایش خوامان کرد [3].

٧- **حەزنەکردنی لە ئاسانکردنی مردن بۆی:** عومەری کوڕی عبدالعزیز(ﷺ) ئەڵێ: حەز ناکەن گیان کێشانم ئاسان بێت، چونکە دوایەمین شتێکە کە باوەڕ دار پاداشتی تیادا دەست

---

[1] - التاريخ الاسلامي(١٦ / ٢٢٢).

[2] - هەمان سەرچاوە( ١٦ / ٢٢٢).

[3] - الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٦٤٤، ٦٤٥).

دەكەوێت [١]. لە ڕیوایەتێكی تریشدا هاتووە: پێم خۆش نیە گیان كێشانم ئاسان بێت، چونكە دوایەمین شتێكە كە مرۆڤ بەهۆیەوە گوناهی هەڵبوەرێت [٢].

٨- **بارودۆخی لەكاتی سەرەمەرگدا:** لەكاتی سەرەمەرگیدا عومەری كوڕی عبدالعزیز وتی: بڕۆنە دەرەوە كەس لێرە نەمێنێت، لەو كاتەشدا مەسلەمەی كوڕی عبدالملكی لەلابوو، ئەوانیش چوونە دەرەوە و مەسلەمە و فاتیمەی خێزانی كە خوشكی مەسلەمە بوو لەبەر دەرگاكەیدا دانیشتن و گوێیان لێ بوو ئەیوت: مەرحەبا لەم دەم وچاوانە كە دەم و چاوی مرۆڤ و جنۆكە نین [٣].

لە ڕیوایەتێكی تریشدا هاتووە:... فاتیمەی كچی عبدالملك وتی: گوێم لە عومەر بوو لە ڕۆژانی نەخۆشیدا ئەیوت: خوا یە مردنیان لێ وەك خۆی! بشارەوە ئەگەر بۆی یەك كاتژمێریش بێت.

كاتێ ڕۆژی گیان كێشانی هات من لەلای دەرچوم و لە ژورێكی تردا دانیشتم كە ئەكەوتە نێوان ژورەكانمانەوە و گوێم لێ بوو ئەویت: ﴿ تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴾ القصص: ٨٣). واتە: ئەو ماڵی دوا ڕۆژە(بەهەشت) دەیدەین بەو كەسانەی نەبەرزی و خۆ بە زل زانی یان دەوێت لە زەوی دا نە دەست درێژی و خراپەكاری وە سەرئەنجامی چاك بۆ خۆپارێزانە.

پاشان بێدەنگ بوو و منیش هیچ دەنگ ورتەیەكم نەدەبیست و وتم بە خزمەتگوزارەكەی: بڕۆ سەرێك بدە لە ئەمیری باوەڕداران، ئەویش چووە ژوورەوە هاواری كرد، منیش هەستام و چوومە لای و ڕووی بەرەو قیبلە وەرچەرخاندوو و چاوی بە دەستێكی نوقاندو و دەمیشی بە دەستەكەی تری داخست، بەم شێوە مرد ڕەحمەتی خوای لێ بێت [٤].

لە ڕیوایەتێكی تریشدا هاتووە: عومەری كوڕی عبدالعزیز لەنەخۆشی مەرگیدا وتی: دامنیشێنن، ئەوانیش دایاننیشاند و وتی: من ئەو كەسەم كە فەرمانت پێكردم و كەمتەرخەمیم كرد و نەهیت لێكردم و سەرپێچیم كرد بەڵام هیچ خوایەك نیە جگە لە الله پاشان سەری بەرزكردەوە و بەوردی

---

[١] - هەمان سەرچاوە( ٢ / ٦٤٨).

[٢] - هەمان سەرچاوە( ٢ / ٦٤٨).

[٣] - هەمان سەرچاوە( ٢ / ٦٥٢).

[٤] - هەمان سەرچاوە( ٢ / ٦٥٣).

سەرنجی دەدا و وتیان: تۆ زۆر بە وردی سەرنج دەدیت، وتی: من ئامادە بوانێك دەبینم کە نەمرۆژن و نەجنۆکە پاشان گیانی سپارد [1]. نەخشی سەر ئەنگوستیلەکەشی عومەری کوڕی عبدالعزیز باوەڕدارە بەخوا بوو.

٩- **بەرواری کۆچی دوایی:** خەلیفەی زاهید عومەری کوڕی عبدالعزیز لە ڕۆژی هەینی بیستەمین ڕۆژی ڕەجەبی ساڵی ١٠١ ك کۆچی دوایی کرد بە پێی ڕاستترین ڕیوایەت و بیست ڕۆژ بەنەخۆشی مایەوە و لە دێر سەمعان لەناوچەی مەعەڕڕە لە شام کۆچی دوایی کرد، دوای تێپەڕ بوونی دوو ساڵ و پێنج مانگ و چوار ڕۆژ بەسەر خەلافەتی دا و لە تەمەنی سی و نۆ ساڵی و پێنج مانگی دا، بەڵام لە ڕاستترین ڕیوایەتدا هاتووە کە تەمەنی چل ساڵ بووە [2].

١٠- **ئەو ماڵ و سامانەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بە جێی هیشت:** ڕیوایەتەکان جیاواز لەسەر ئەو برە سامانەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز بە جێی هێشت بەڵام هەموو ڕیوایتەکان هاوڕان لەسەر کەمی بڕەکەی [3]، لەو ڕیوایەتانەش ئەو ڕیوایەتەی کە عومەری کوڕی حفصی معیطي گێڕاویەتیەوە ئەڵێ: عبدالعزیزی کوڕی عومەری کوڕی عبدالعزیز بۆی باسکردین ئەڵێ: وتم: چەند پارەی بۆ جێهشتن؟ ئەویش زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: خزمەتگوزارێکمان بۆی باسکردم کە سەرپەرستی خەرجی دەکرد وتی: عومەری کوڕی عبدالعزیز لەسەرەمەرگیدا پێی وتم: چەند پارەت لایە؟ وتم: چوار دە دینار، وتی: ئەتوانن لە ماڵێکەوە پێی بگوێزنەوە بۆ ماڵێکی تر، وتم چەندێك میراتی بە جێهێشت لە بنەماڵەکەیەوە وتی: شەشە سەد دینارمان لە عومەرەوە بۆ جێ مابوو بۆ دوازدە پیاو شەش ئافرەت ئێمەش بەسەر پازەدەدا دابەشکان کرد، چونکە پشکی شەش ئافرەتەکە یەکسانە بەسێ پیاو [4]، ڕاستەکەشی ئەوەیە کە پیاوەکان یازدە کەس بوون، چونکە عبدالملك ی کوڕی پێشتر مرد بوو [5].

---

[1] - هەمان سەرچاوە( ٢ / ٦٥٤).

[2] - تاريخ القضاعي، ل ك ٣٦٣.

[3] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٥٠) تذكرة الحفاظ(١ / ١١٨).

[4] =سيرة عرم بن عبدالعزيز لابن الجوزي، ل: ٣٣٧.

[5] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٥٥).

ئیبن الجوزی ئەڵێ: پێم گەشتووە کە مەنصور بە عبدالرحمانی کوڕی قاسمی کوڕی محمدی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی صدیق(ﷺ)ی وتووە ئامۆژگاریم بکە، ئەویش وتی: عومەری کوڕی عبدالعزیز مرد و لە پاش خۆی یازدە کوڕی جێهێشت و میراتەکەشی حەڤدە دینار بوو کە بە پێنجیان کفنیان کرد و دوو دینارشی درا بە شوێنی گۆڕەکەی و ئەوی تری بەسەر منداڵەکانیدا دابەش کرا و هەر یەکێیان نۆزدە درهەمی بەرکەوت، هشامی کوڕی عبدالملك یش کۆچی دوایی کرد و یازدە کوڕی بە جێ هێشت و میراتەکەی دابەش کرا و هەر کوڕێکی هەزار هەزاری بەرکەوت ،بەلام کوڕێکی عومەری کوڕی عبدالعزیزم بینی لە ڕۆژێکدا سەد ئەسپی بەخشی بۆ جیهاد کردن لە پێناو خوا دا و کوڕێکی هشامیشم بینی خێریان پێ دەکرد [1]. لەمەی پێشەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو پارەی زۆرەی کە عومەری کوڕی عبدالعزیز لە باوکیەوە بۆی جێما – کە بڕێکی زۆر بوو – بەرەبەرە کەم بوویەوە هەتاوەکو کۆچی دوایی کرد ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

١١- **ستایشکردنی عومەری کوڕی عبدالعزیز دوای کۆچی دوایی کردنی:**

أ- **مەسلەمەی کوڕی عبدالملك:** کاتێ عومەر کۆچی دوایی کرد و بە داپۆشراوی بینی وتی: ڕەحمەتی خوات لێ بێت بەڕاستی دڵانێکی ڕەقت نەرمکرد و پیاو چاکانت بیرخستینەوە [2].

ب- **فاتیمەی کچی عبدالملك:** لە وهەیبی کوڕی ئەلوەردەوە، ئەڵێ: بۆیان باسکردین کە عومەری کوڕی عبدالعزیز کاتێ کۆچی دوایی کرد، زانایان هاتنە لای خێزانەکەی و دڵنەواییان دەکرد و پێیان وت: هاتوین سەرەخۆشیت لێ دەکەین، چونکە ئەمە کۆستی ئوممەتە، کەمێك باسی عومەرمان بۆ بکە ڕەحمەتی خوات لێ بێت: لەماڵەوە چۆن بوو؟ چونکە شارەزاترین کەس دەربارەی پیاو خێزانەکەیەتی، فەرمووی: سوێند بەخوا عومەر نوێژ و ڕۆژی لە ئێوە زیاتر نەبوو، بەلام کەسم نەبینەوە هێندەی عومەر لەخوا بترسێت، سوێند بەخوا لە خۆشترین کاتی پیاودا کەسەر جێگەیە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا یادی خوای دەکەوتەوە وەك باڵندەیەك کە بکەوێتە ئاوەوە هەڵدەپەڕی، پاشان بە دەنگی بەرز دەگریا هەتاوەکو ئەمووت: ئێستا گیانی دەردەچێت و پێخەفەکەم پێوە لادەبرد، بۆیە ئەمووت: خۆزگە ئەم پۆستی خەلیفەیە هێندەی

---

[1] - سیرة عمر لابن الجوزي ن ل: ٣٣٨.

[2] - فقه عمر بن عبدالعزیز(١ / ٥٦).

دووری نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا لە ئێمەوە دوور دەبوو، سوێند بەخوا لەو کاتەوەی کە چووینەتە ناویەوەی خۆشیمان نەبینیوە [1].

ج- **حەسەنی بەسری:** کاتێ حەسەن ئاگادار کرایەوە لە کۆچی دوایی عومەری کوڕی عبدالعزیز وتی: ﴿إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّا إِلَيْهِ رَاجِعُونَ﴾ ئەی خاوەنی هەموو [2] جۆرە چاکەیەك.

د- **مەکحول:** کەسم نەبینیوە هێندەی هێندە عومەری کوڕی عبدالعزیز لە خوا ترس و دنیا نەویست بێت.

هـ- **یەزیدی کوڕی حوشب:** کەسم نەبینیوە هێندەی حەسەنی بەسری و عومەری کوڕی عبدالعزیز [3] لە خوا ترس بن، وات دەزانی کە ئاگر تەنها بۆ ئەوان دروستکراوە [4].

و- **گریانی ڕاهیب و قەشەکان بۆی:** لە ئەو زاعیەوە ئەڵێ: لە بەخاکسپاردنی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا بەشداریم کرد، پاشان بەرەو شاری قنسرین بەڕێ کەوتم و بەلای ڕاهیبێکدا تێپەڕیم وتی: ئەی فلانەکەس وابزانم ئاگات لەکۆچی دوایی ئەو پیاوە بوو؟ وتم بەڵێ: پاشان چاوی داخست و گریا وتم: بۆ دەگریت خۆ تۆ لەسەر ئاینی ئەونیت؟ وتی: من بۆ ئەو ناگریم بەڵکو بۆ چرایەك ئەگریام کە لەسەر زەویدا بوو کوژایەوە [5].

ز- **پاشای ڕۆم و بەتریارکەکانی:** عومەری کوڕی عبدالعزیز وەفدێکی نارد بۆ پاشای ڕۆم بۆ چەند کاروبارێکی موسڵمانان و حەقێك کە بانگهێشتی دەکرد بۆی، کاتێ چوونە ژوورەوە بینیان وەرگێڕێك بۆی دەدوێت و ئەویش لەسەر تەختەکەی پاڵی داوەتەوە و تاجی بەسەرەوەیەوە بەتریارکەکانیش لەلای ڕاست و چەپی یەوە دانیشتوون و خەڵکانی تریش بە پێی پلەوپایە یان لە دەوروبەریدان، ئەوانیش مەبەستی خۆیان پێی گەیاند ئەویش بە جوانی و باشی وەڵامی دانەوە و لەو ڕۆژەدا گەڕانەوە و ڕۆژی دواتر نێردراوی پاشا هات بە شوێنیاندا و ئەوانیش گەڕانەوە بۆلای پاشا ئەویش لە تەختەکەی دابەزیبوو تاجەکەی لەسەر لابرد بوو

---

[1] - سيرة عمر بن عبدالعزيز لابن الجوزي ل: ٣٢٩.

[2] - البداية والنهاية، له ملامح الانقلاب، ل: ٥٦.

[3] - فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٥٣).

[4] - تاريخ الخلفاء للسيوطي، له ملامح الانقلاب، ل: ٥٥.

[5] - صفة الصفوة(٣ / ١٥٦).

سەر و سیمای گۆڕا بوو ئەتوت کۆستی کەوتووە، ئەوە بوو پاشا وتی: ئەزانن بۆچی بانگم کردوون؟ وتیان: نەخێر، وتی ئەو کەسەی کە چاودێری بەرژەوەندیەکانمان دەکات لە نزیك وڵاتی عەرەب نامەیەکی ناردووە و ئەڵێ پاشای عەرەب ئەو پیاوە چاکە کۆچی دوایی کردووە، ئەوانیش خۆیان پێ ڕانەگیرا و گریان پاشاش وتی: بۆ خۆتان ئەگرین یان بۆ ئاینەکەتان یان بۆ ئەو؟ وتیان: بۆ خۆمان و ئاینمان و بۆ ئەویش، وتی: بۆ ئەو مەگرین، بەڵام بۆ خۆتان هەتادەتوانن بگرین، چونکە ئەو بۆ شوێنێك چووە باشتر لەوەی کە جێی هێشتووە، ئەو دەترسا لەوەی کە لە گوێڕایەڵی خوا دەربچێت و خواش هەرگیز ترسی هەردوو دنیای لەدڵدا کۆناکاتەوە، من هێندە چاکە و خواناسی و ڕاستگۆییم بۆ باس کراوە ئەگەر کەسێك هەبوایە دوای عیسای مردوی زیندوو بکردایەتەوە ئەوە وام دەزانی کە ئەو مردوو زیندوو دەکاتەوە، هەروەها من هەواڵی ئاشکراو نهێنیم پێ دەگەشت و بۆم دەرکەوتووە کە نێوان خۆی و خوای پاکتر و چاکتر بوو لە ڕواڵەتی، هەرگیز سەرسام نەبووم بەم ڕاهیبەی کەوازی لە دونیا هێناوە لە کێوێك داخوا پەرستی دەکات، بەڵکو بەو پیاوە سەرسامم کە دونیا لە ژێر دەستیدا بوو دڵی بۆی لێ نەدا هەتاوەکو وەك ئەو ڕاهیبەی لێ هات، بێگومان خەڵکانی باش تەنها ماوەیەکی کەم لەگەڵ خەڵکانی خراپدا دەمێننەوە [1].

١٢- **ئەو کەراماتانەی کە دراونەتە پاڵی لەکاتی سەرەمەگیدا:** لە حسەینی قصارەوە [2] ئەیگێڕنەوە و ئەڵێن وتویەتی: لەسەردەمی عومەری کوڕی عبدالعزیزدا مەڕم دەهێنا و ڕۆژێکیان بەلای شوانێکدا تێپەریم کە لە مەڕەکانیدا نزیکەی سی گورگ هەبوو وامزانی سەگن. بۆیە پێم وت : ئەی شوانی ئیشت چیە بەم هەموو سەگە؟ وتی کوڕم، ئەمانە سەگ نین، بەڵکو گورگن وتم: " سبحان الله " گورگ لەناو مەڕدایە و زیانیان پێ ناگەیەنێت. ئەڵێ وتی: کوڕم ئەگەر سەرباش بوو ئەو لاشە هیچ خەمی ناوێ [3]. وا پێدەچێت کە ئەم چیرۆکانە زیادەڕەویان تیادا کرابێت ئەگینا لەسەردەمی پێغەمبەری خوا و(ﷺ) دروستبوونی دەوڵەت لە

---

[1] - مروج الذهب(٣ / ١٩٥) فقه عمر بن عبدالعزيز(١ / ٥٤).

[2] - لەوانەیە جسر القصاب بێت: جیاوازی هەیە لەسەری و زۆرینە بە لاوازی دەزانن.

[3] - الكتاب الجامع لسيرة عمر بن عبدالعزيز(٢ / ٦٧٠).

مەدینە دا و لەسەر دەمی خەلافەتی راشیدینـشدا نەبیستراوە کـە گـورگ لەگـەڵ مـەڕدا لـە وەڕابێت.

ئەمە و چەندین خەوی باش بە عومەرەوە بینراوە(ﷺ) خەڵکی بە هەموو توێژەکانیانەوە بەگـشتی و، زانا و خواناس و پیاوچاکان بەداخ بوون بۆ لە دەستدانی [1].

**١٣- ئەوشیعرانەی کە لە شیوەنی دا وتراوە:**

أ- أثير عزة دەربارەی ئەڵێ :

عمّت صنائعه فعم هلاكه    فالناس فيه كلهم مأجور

والناس مأتمهم عليه واحد    في كل دار رنّه و زفير

يثني عليك لسانك من لم توله    خيراً لأنك بالثناء جدير

ردَ صنائعه عليه حياته    فكأنه من نشؤها منشور [2]

ب- جەریریش ئەڵێ:

ينعي النعاة أمير المؤمنون لنا    يا خير من حج بيت الله و اعتمرا

حملت أمراً عظيماً فاضطلعت به    وقمت فيه بأمر الله يا عمرا

الشمس كاسفة ليست بطالعة    تبكي عليك نجوم الليل و القمرا [3]

ج- هەروەها محاربی کوڕی دثار ئەڵێ:

لو أعظم الموت خلقاً أن يواقعه    لعدله لم يصبك الموت يا عمر

كم من شريعة عدل قد نعشت لهم    كادت تموت و أخرى منك تنتظر

يا لهف نفسي و لهف الواجدين معي    على العدول التي تغتلها الحفر

و أنت تتبعهم لم تأل مجتهداً    سقيا لها سنن بالحق تفتقر

لو كنت أملك و الأقدار غالبة    تأتي رواحاً و تبياناً و تبتكر [4]

---

[1] - البداية و النهاية(١٢ / ٧١٨).

[2] - البداية و النهاية(١٢ / ٧١٨).

[3] - البداية و النهاية(١٢ / ٧١٨).

[4] - البداية و النهاية(١٢ / ٧١٨).

ڕەحمەتی خوا لە ئەمیری باوەڕداران عومەری کوڕی عبدالعزیز و خوای گەورە پلەی بەرز بکاتەوە لە ناو پیاو چاك و موصلیحەکاندا، ئەمە ڕوخسارەکانی ژیاننامەی ئیصلاح خواز و نوێگەرانەو راشیدانەی عومەری کوڕی عبدالعزیز بوو کە تیایدا لەسەر ڕێبازی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڕۆشت. خوای گەورەش ئەم ژیاننامەیەی بۆ پاراستین و دوری کات و سەردەمەکان لەبیر خەڵکی نەبردەوە، ئومێد دەکەین کەسانێك پەیدا بین لەناو سەرکردەکانماندا کە شوێن پێی هەڵبگرن ئەمەش بەلای خواوە زەحمەت نیە چ لەم سەردەمەدا بێت یان لەسەردەمانی دواتردا.

﴿... وَآخِرُ دَعْوَانَا أَنْ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴾

" وَصَلِّ أللهُمَّ وَسَلِّم على مُحَمَّد وَ على آله وَ صَحبه وَ سَلَم "

## پێـــڕس



# سەردەمی ئەمیری باوەڕداران

# " عومەری کوڕی عبدالعزیز( رضي الله عنه )"

ژمارەی سپاردنی (١١٤٦)ی ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە